# سەرجەم بەرهەمەکانی





# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی شەشەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر    دکتۆر دڵشاد مەحموود
دکتۆر ئازاد عوبێد    دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

# سەرجەم بەرهەمەكانی
# دكتۆر كەمال مەزهەر

## بەرگی شەشەم


ئامادەكردنی

دكتۆر جەبار قادر      دكتۆر دڵشاد مەحموود

دكتۆر ئازاد عوبێد      دكتۆر كامەران محەمەد



هەولێر ٢٠٢٢

* ناوی کتێب: سەرجەم بەرهەمەکانی - دکتۆر کەمال مەزهەر- بەرگی شەشەم
* ئامادەکردنی: لیژنەی کۆکردنەوەی نووسین و بەرهەمەکانی پ. د. کەمال مەزهەر
* گشت کارە هونەرییەکان و سەرپەرشتی چاپ: عوسمان پیرداود کواز
* وێنەی سەر بەرگ: هونەرمەند نورەدین جاف
* چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٢٢
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە
* چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەر- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٨) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.
* نرخ (٦٠،٠٠٠) دینار

## بەرگی شەشەم:

ئەم کتێبە لەخۆ دەگرێت:

* کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا - بەرگی دووەم".

## پێشەکی

مایەی شانازی لێژنەی تایبەتی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی مێژووناسی ناودار و پەروەردەکاری گەورەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەرە، سەرجەم بەرهەمەکانی لە (١٠) بەرگدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بخاتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان. لەو دە بەرگە شەشی یەکەمیان بە زمانی کوردیین و ئەوانی دیکەشیان، واتا لە حەوتەمەوە تا دەیەم بە زمانی عەرەبیین. ئەمە بەشی یەکەمی ئەو پرۆژە گەورەیەیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ لە چاپیان بداتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەنگی لێکۆڵەرانی مێژووی نوێی کورد و کوردستانە و بگرە بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەتیی مێژوویی کورد دەژمێردرێت؛ چونکە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە چەندین نەوە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ئەوەوە سەبارەت بە کورد و کوردستان ئاشنای میتۆدی زانستی بوون لە بواری مێژوودا، کە پێشتر پێی ڕانەهاتبوون. تا ئەو ڕۆژانە خوێنەرانی کورد بەو چیرۆک و ئەفسانانە ڕاهاتبوون کە باسیان لە مێرخاسی و ئازایی میر و سەرکردە خۆجێیەکانیان دەکرد و ئەوانەیان بە سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی دادەنا. کتێب و وتارە مێژووییەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کارێکی وایان کرد، خوێنەرانی ئاسایی و ڕووناکبیرانی نەوەی نوێی کورد، مێژوویان لە لا خۆشەویست بێت و هەوڵبدەن توانای خۆیان بۆ لێکدانەوەی مێژووی نەتەوە ستەملێکراوەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی کە دکتۆر کەمال دەورێکی گەورەی هەبوو لە هاندانی چەندین خوێندکار لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە بواری مێژوودا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق. جگە لەوەش وانەکانی بۆ قوتابیان کە زۆربەیان کوردیش نەبوون هەمان دەوریان هەبوو لە ڕووکردنە خوێندنی باڵا بۆ خوێندنی مێژوو بە ڕێبازێکی زانستی، ئەو شاگردانە بە درێژایی تەمەنیان و کاروانی زانستییان

به دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مامۆستای گەورەیان مانەوە. ئەم کارانەی تەنیا خوێندکارانی کوردی نەدەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەو خوێندکارانەشی دەگرتەوە کە سەرپەرشتی نامە و تێزەکانی کردوون یان بۆ پرس و ڕاوێژ ڕوویان لێی ناوە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە و پڕۆژەی توێژینەوە زانستییەکانیان.

دکتۆر کەمال بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کەوا بواری مێژووی کورد وەک کێڵگەیەکی نەکێڵراو و نەچێندراوە، بۆیە ئەو ئەرکە مەزنە پێویستی بە چەندین نەوەی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بەشێکی بەجێبێنن. دکتۆر کەمال زۆر بەوە دڵخۆش بوو کاتێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە بەرهەمی کاری پەروەردەیی خۆی دەبینی، کە چەندین توێژەر و پسپۆڕ لە بواری مێژووی کورددا لەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە پێگەیاندنیاندا کردبوو خەریکی کارکردنن لەسەر مێژووی کورد و کوردستان. ئەوانەی سەرپەرشتی نامە و تێزە زانستییەکانیانی کردبوو یا لە ڕێی کتێب و وتار و توێژینەوە مێژووییەکانییەوە کاریگەری لەسەر دانابوون. بەرهەمی زانستیی دکتۆر کەمال مەزهەر جێی بایەخی کۆڕ و ناوەندی بەرفراوانی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کورد و عێراقییەکان بوو.

گومان لەوەدا نییە کە کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مێژووناسێکی پڕ بەرهەمی وەک کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر پێویستی بە پاڵپشتی و هاوکاریی چەندین توێژەر و ڕووناکبیر هەیە، تەنانەت ئەوە ئەرکی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندە لەگەڵ چەندین کادیری زانستی و کارگێڕی تەرخانکراو بۆ ئەو کارە، نەک ئەرکی لێژنەیەکی خۆبەخشی چوار کەسیی، کە لێرە و لەوێ کار دەکەن و سێ کەسیان لە هەمان کاتدا مامۆستای زانکۆن و دەبێ سەرقاڵی وانە وتنەوەو و کاری زانستیی خۆیان بن.

ئەم لێژنەیە بەر لە کۆچی دوایی زانای گەورەمان بە چەند ڕۆژێک پێکهات، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی و

پۆلێنکردنیان و پاشان لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان. لێژنەکە پێی باشە کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەر شەش بەشدا دابەش بکات:

**بەشی یەکەم:** کە بە خۆشحاڵییەوە وا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، کە هەموو کتێبە بڵاوکراوەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە دە بەرگدا دەگرێتە خۆ. سەرلەبەری لاپەڕەکانی ئەم بەشە حەوت هەزار و دوو سەد و پەنجا لاپەڕەن.

**بەشی دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و وتارانەن کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. لێژنەکەمان بەشێکی لەو وتارانە بەدەستهێناوە و وێنەیانی گرتووە، بەڵام لەم بوارە هێشتا کاری زۆر ماوە، پێویستی بە هاوکاری ژمارەیەکی زیاتر لە ئەندامانی لێژنەی سەرپەرشتیار هەیە.

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە ئەو کارە زانستی و رۆژنامەوانییانەی دکتۆر کەمال مەزهەر دەگرنەوە کە بە زمانی ڕووسی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە و خۆیان لە هەزار و پێنج سەد لاپەڕە دەدەن. ئەمانەیان پێویستە بکرێن بە کوردی، لێژنە هەنگاوی یەکەمی بۆ ئەمە ناوە. لە بەسەرکردنەوەی لیستی دانراو و توێژینەوەکانیدا بۆ لێژنەکە دەرکەوت کە هەندێ لەم توێژینەوە و وتارانە لە کاتی خۆیدا خوالێخۆشبوو کردوونی بە کوردی یان عەرەبی یانیش لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری خۆیدا بەکاری هێناون.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشەیان تەرخانکراوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو پێشەکییانەی بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێب و دانراوی توێژەرانی کورد و عەرەب نووسیوونی، وێڕای ئەو یادداشتنامانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردوون و پێشەکی بۆ نووسیون. ئەو پێشەکییانە زانیاری و لێکدانەوەی گرنگیان تێدان و وا پێویست دەکات بایەخ بە کۆکردنەوەیان بدەین لە زیاتر لە بەرگێکدا.

**بەشی پێنجەم:** لیژنە هەوڵدەدات ئەم بەشە بۆ ئەو دیمانە و دیدار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیانە تەرخان بکات کە لەگەڵ دکتۆر کەمالدا کراون، کە تێیاندا بیروبۆچوون و لێکدانەوەکانی بۆ زۆر پرسی زانستی و هزری و ڕووناکبیری دەربڕیون. ئەمانە شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئاگاداریی بەرفراوانی لەمەڕ پرسەکان هەبووە و ڕاستیی و دروستیی گەلێ لە بۆچوونەکانی و قووڵیی لێکدانەوەکانی دەردەخەن. ئەمەشیان بابەتگەلێکی دەوڵەمەندن؛ بۆ توێژینەوە و لێکدانەوە لە بیروبۆچوونە هزری و ڕووگە ڕووناکبیرەکانی.

**بەشی شەشەم:** بە ئومێدی ئەوەین ئەم بەشەیان هەموو ئەو نووسینانە بگرێتەخۆ کە لەبارەی کۆچکردووەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، جا چ کتێب و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بن یان لێکۆڵینەوە و وتار کە لە سەروبەندی کۆچکردنی یان لە بیرەوەری یەکساڵەی کۆچی دوایی گوتران. پێمانوایە ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانە کە پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرپەرشتی کردوون و بەپێی ڕێنماییەکان توێژینەوەی هاوبەشن، لەم بەشەدا جێیان بکەینەوە. کۆچکردوو لە داڕشتنی کاری زانستی خوێندکارانیدا داهێنەر بوو، لە پرۆژەی ماستەرنامە و کارنامەکانی دکتۆرا لە بیرۆکە و ناوونیشانی بابەت و پلانی لێکۆڵینەوە بگرە تا دەگەیشتە لێکدانەوە و ڕێکخستنیان، بۆیە بە پێویست زانرا پێڕستێک بە ناوونیشانی ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانەی کە سەرپەرشتی کردوون و ناوی خوێندکار، و ئاستی کارەکە و مێژووەکەیان لەم بەشەدا جێگە بکرێنەوە. جێی خۆیەتی لێرە ئاماژە بە بەشداریی پڕجۆش و دەوڵەمەندانەی دکتۆر کەمال بکەین لە گفتوگۆی دەیان نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرادا کە پڕ بوون لە زانیاری دەگمەن و بیرۆکەی هێژا. لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیانە بە وێنە و دەنگ تۆمار کراون؛ هەوڵدەدەین پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە بکەین بۆ ئەوەی ئەو تۆمارانە دەست بخەین، لە داهاتوودا بخرێنە سەر کاغەز و لە چوارچێوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا

بڵاو بکرێنەوە. هەروەها لێژنەی تایبەت پەیوەندی بە خوێندکارە بەتواناکانی کۆچکردووەوە دەکات بۆ ئەوەی وتاری بابەتیانە سەبارەت بە شێوازی وانەوتنەوەکانی بنووسن.

لێژنەی تایبەت کە لەم بەڕێزانە پێکهاتووە: پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر، پرۆفیسۆر دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر کامەران محەمەد حاجی، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیبلیۆگرافیایەکی سەرەتایی بۆ سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر ئامادە کردووە، ئەوە وێڕای ئامادەکردنی کتێبە دانراو و وەرگێڕانەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بۆ چاپ، کە ئەم بەشەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

خۆشبەختانە ئەندامانی لێژنەکە دەستیان گەیشت بە بەشێکی گرنگ لە نووسین و بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیدا پارێزراون. ئەوەی لەوێدا کەوتە بەرچاویان وێنەیان گرتن و هەندێ کاریان لەسەر کراوە. هاوڕێ و دۆستانیش لە دەرەوەی لێژنەکە لە هەبوونی کۆمەڵێ وتار و توێژینەوە و کتێب کە پەیوەندییان بە کۆچکردووەوە هەیە ئاگاداریان کردینەوە. بەشێکیش لەو توێژینەوە، وەرگێڕان، لێدوان یان ئەو نووسینانەی خوێندکارەکانی و مامۆستاکانیان و هەڤاڵانی کۆچکردوو لەبارەی ژیانی تایبەتی و زانستی ئەوەوە نووسیوویانە دۆسیی تایبەتییان بۆ ڕێکخراون. لێژنە ژمارەیەک وتار و توێژینەوەی مامۆستای کۆچکردوویان تایپ کردووەتەوە و بە وردی پێیانداچوونەوەتەوە و هەڵەچنیان بۆ کردوون.

لێژنەکە دوابەدوای بڵاوکردنەوەی سەرجەمی کتێبەکانی بە کوردی و عەرەبی، کە ئەم بەشەی پرۆژەکە پێکدێنن، کۆشش بۆ تەواوکردنی بەشەکانی دیکەی ئەم پرۆژە زانستی و ڕووناکبیرییە گەورەیە دەکات؛ ئەم کارە بۆ خزمەتی ڕاستی و مێژووە و بەرز ڕاگرتنی بەخششی ئەم مرۆڤە مێژووزان و پەروەردەکارە مەزنەی نەتەوەی کورد کە بەدەگمەن هاوشێوە و هاوتای دووبارە دەبێتەوە. لێرەوە لێژنەی سەرپەرشتیار داوا لە توێژەران

و ئەو خوێنەرانە دەکات کە بایەخ بە بەرهەم و داهێنانەکانی ئەم پیاوە مەزنە دەدەن دەستی یارمەتی بۆ لیژنەکە درێژ بکەن و هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەکیان لە لا پەیدا دەبێ کە لێکۆڵینەوە، وتار یان دیدار و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی بڵاوکراوەی کۆچکردوویان لە لایە، بیخەنە بەردەستی لیژنەکە. بێگومان هاوکاری و یارمەتی هەمووان لەم بارەیەوە دەبێتە بنەما و بناغە بۆ دامەزراندنی کتێبخانەیەکی مێژوویی و مۆزەخانەیەکی تایبەت بە کۆچکردوو کە دەکرێ هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت تێیدا کۆبکرێتەوە و بپارێزرێت. دابەشکردنی کتێب و بەرهەمەکانی کۆچکردووی گەورە لە ڕووی بابەت و ژمارەی لاپەڕەکانەوە بەسەر بەرگەکانی ئەم چاپەدا کێشەیەکی هەندێ ئاڵۆز بوو لە بەردەم لیژنەکەدا، لەم بارەیەوە گفتوگۆی زۆر کرا تا ئەوەی لە کۆتاییدا لەسەر ئەم شێوە دابەشکردنەی خوارەوە گیرساینەوە:

**بەرگی یەکەم:** "کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا"، "مێژوو- کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو"، "خەباتی ڕزگاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێراندا".

**بەرگی دووەم:** "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا"، "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد - بەرگی یەکەم".

**بەرگی سێیەم:** "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد - بەرگی دووەم".

**بەرگی چوارەم:** وەرگێڕانی کوردیی کتێبی: "وردبونەوەیەکی مێژوویی دەربارەی مەکیاڤیللی و مەکیاڤیلیزم"، "ڕێنیسانس لەگەڵ باسێکی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ"، "ئافرەت لە مێژوودا- کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی"، "چینی کرێکارانی عێراق - دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی".

**بەرگی پێنجەم:** "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا - بەرگی یەکەم".

**بەرگی شەشەم:** "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا - بەرگی دووەم".

**بەرگی حەوتەم:** وەرگێڕانی عەرەبیی کتێبی: "كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى" و کتێبی "كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير- دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق".

**بەرگی هەشتەم:** "دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر"، "أضواء على قضايا دولية في الشرق الأوسط"، "النهضة".

**بەرگی نۆیەم:** "صفحات من تاريخ العراق المعاصر- دراسات تحليلية"، "الطبقة العاملة العراقية- التكون وبدايات التحرك"، "ثورة العشرين في الإستشراق السوفيتي"، "رأي للمناقشة: الإطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر".

**بەرگی دەیەم:** "دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية"، "إنتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا - دراسة تحليلية"، "حول مسألة الإقطاع بين الكرد"، "ميكافيلي والميكافيلية"، "محاضرات في تاريخ الدول الكبرى بين الحربين العالميتين". وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، شەش بەرگی یەکەمی بە زمانی کوردین و چوار بەرگی دواییش بە زمانی عەرەبیین.

لە کۆتاییدا لیژنەکەمان سوپاسی هەموو ئەو ناوەند و بەڕێزانە دەکات کە ئامادەییان دەربڕی پشتگیری مادی یا مەعنەوی لە پرۆژەکە بکەن، دیارە بە ژمارە زۆرن، لە پێشەوەشیان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ ئەم لیژنەیە لە ئەکادیمیا تەرخان کرد. هەروەها سوپاسی دۆستی هێژا پرۆفیسۆر دکتۆر عیماد جەواهیری دەکەین کە تێبینی و سەرنجەکانی ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە زیادکردنی تەوەرێکی نوێ بۆ بەشی شەشەمی پرۆژەکە. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە ئەرکیان کێشا و لیژنەکەیان لە وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆچکردوو ئاگادار کردەوە. هەروەها لیژنەکە سوپاسی مامۆستا جەلال زەنگابادی دەکات کە دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی پڕۆژەکە بە باشترین شێوە کار دەکات.

**لیژنەی تایبەت بە کۆکردنەوە و**
**بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر**

کەمال مەزهەر

# کورد و کوردستان

لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی

حوکمەتی بەریتانیادا

بەرگی دووەم

هەولێر ٢٠١٤

# کورد و کوردستان

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی
## حکومەتی بەریتانیادا

کەمال مەزهەر

# کورد و کوردستان

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا

بەرگی دووەم

ئامادەکردنی

شەهلا تاهیر حەیدەری

هەولێر ۲۰۱٤



* ناوی کتێب:کورد و کوردستان له بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا.
* نووسەر: کەمال مەزهەر.
* ئامادەکردنی: شەهلا تاهیر حەیدەری
* بەرگ: محەمەد زادە.
* سەرپەرشتی هونەری و چاپ: عوسمان پیرداود.
* نەخشەسازی: رزگار موحسین.
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٢٩٣).
*چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
* له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(      )ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.

## پێشەکی

شانبەشانی کارکردنم لە کاتی ئامادەکردنی بابەتەکانی بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا بێ وچان لە سەر خوێندنەوە و وەرگێڕان و تەتەڵەکردن و لێکدانەوەی بەشێکی دیکەی بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەرشیڤی نیشتیمانی حوکمەتی بەریتانیدا بەردەوام بووم و هەموو ڕۆژێك دیسانەوە بە هەگبەیەکی پڕ لە مرواریییە دانسقەکانییەوە دەگەڕامەوە و بڕواشم بە نرخ و بایەخی بێ ئەندازەی ئەو بەڵگەنامانە بەتینتر دەبوو.

لە بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا، بە پێی توانا، هەوڵمان داوە ڕۆشنایی بخەینە سەر دەزگای کەمهاوتای ئەرشیڤی نیشتیمانی بەریتانی، بەڵام ئەوساکە ئەوەم نەدەزانی کە بەشی کارگێڕیی ئەرشیڤ جار جارە ژمارەیەك کتێبی بە نرخ و دەگمەن لە پیشانگایەکی بچووکدا بۆ توێژەران بە خۆڕایی دادەنێت، لەوساوە توانیم هەر لە لەندەنەوە کتێبخانەیەکی خنجیلانە لەو



وێنەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا

بەرهەمە دانسقانە بۆ خۆم بنێرمەوە عیراق، کەوا لەخوارەوە وەك نموونە باسی چەند کتێبێکیان دەکەم.




وێنەی ٤

ئەمانە کێن ١٩٨٠ ناوی کتێبی یەکەمیانە کە ناوەڕۆکەکەی بۆ کورتە پێناسەیەکی گشت ئەو ناودارانەی بەریتانیا کە دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشایان خواردووە و هێشتا لە ژیاندان، تەرخان کراوە، هی وەك ساڵی لەدایکبوونی ئەو کەسە و بنەماڵەی و پلەی خوێندنی و ئەو زمانانەی دەیانزانێت و کار و چالاکییە کۆمەلایەتییەکانی و نووسین و بەرهەمە بلاوکراوەکانی ئەگەر نووسینی هەبووبێت و ئێدرێسی تەواوی، ئەم کتێبەش ساڵانە چاپ دەکرێتەوە و ناوی ناودارانی نوێی دەخرێتە سەر و ئەوانەیش کە کۆچی دوایی دەکەن ناوەکانیان لادەبرێت.

دوای ئەم کورتە پێناسەیە دێینە سەر شیکردنەوەی ناوەڕۆکی کتێبی ئەمانە کێن ١٩٨٠ کەی خۆم – ژمارەی لاپەڕەکانی ٢٩١٤ لاپەڕەیە کە ٥٦ لاپەڕەیان بۆ پێشەکی و چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست تەرخان کراون و ٢٨٣٦ لاپەڕەیشیان بۆ ناوەڕۆکی سەرەکیی کتێبەکە تەرخان کراون و ئینجا دوا ٢٢ لاپەڕەیشی بۆ پاشکۆکانی تەرخان کراون و وەك گوتمان هەموویان بەسەر یەکەوە دەکەنە ٢٩١٤ لاپەڕەی قەوارە گەورە[1].

[1] (Who's Who 1980. An Annual Biographical Dictionary), Adam and Charles Black, London, 1980, 2914PP.

ئەمە بە تەنها بۆخۆی دیاردەیەکی شارستانیی دەگمەن و لە هەموو ڕوویەکەوە سەرنجڕاکێشە، بەڵام لەوەیش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە هەر یەك لەو ٢٨٣٦ لاپەڕەیەی باسمان کرد تەرخان کراوە بۆ پوختەی ژیننامەی حەوت تاوەکو دوازدە ناو لەو ناودارانەی بەریتانیا کە ساڵی ١٩٨٠ هێشتا لە ژیاندا بوون و بە پشتیوانی زانیارییەکانی ناو ئەم کتێبە ناوازەیە گەلێك لە پەراوێزە پێویستەکانی بەرگی یەکەمی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادام دارشتووە، ئەوەیش تنۆکێکە لە دەریای بێ بنی ئەو کتێبە، چونکە ئەگەر بێت و حسێبی ڕێژەیەکی گشتیی ئەو ناودارانەی ناوی بکەین دەڵێین کتێبی ئەمانە کێنی ساڵی ١٩٨٠ بە لایەنی کەمەوە، پوختەی ژیننامەی بیست و هەشت هەزار ناوداری بەریتانی پێشکەش بە توێژەران و سیاسەتمەداران دەکات، هیچ جۆرە زێدەڕۆییەکیش لەوەدا نابینم ئەگەر بڵێم ئەو زانیارییانە لە نرخاندن نایەن، لێرەشدا وەك بەڵگە و نموونە ئاماژە بۆ دوو ڕاستی دەکەم:

یەکەم: لە ڕێگەی پوختەی ئەو ژیننامەیەی لەم کتێبەدایە دەربارەی سێر ویلسن کۆمبسی هاوڕێی نزیکی کەسایەتی کورد محەمەد سەعید خەفافەوە سەرباری زنجیرەیەك زانیاریی پێویست[٢]، ناوونیشانی تەواو و ژمارەی تەلەفۆنی تایبەتی ئەو بنەماڵەیەم زانی و بەو جۆرە هەر کاتێك بمەوێت دەتوانم پێوەندی بە خاتوو کۆمبسی هاوسەری خوالێخۆشبوو، یان بە کچەکەیانەوە بکەم[٣].

دووەم: ئەمیان دەربارەی عاشقەکەی کوردستان لۆرد کیلبراکێن جۆن ڕایموند گۆدلییە[٤]، کە ساڵی ١٩٦٦، لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارفدا، دوو جار بە بەرگی کوردییەوە سەردانی ناوچە ئازادکراوەکانی

---

[٢] دەربارەی بڕوانە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ل.٥٠٤ — ٥٠٧.

[3](Who's Who 1980. An Annual Biographical Dictionary), P.526.

[٤] دەربارەی بڕوانە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ل٥١٠ — ٥١١.

کوردستانی کردووه و پازده ساڵی ڕەبەق ئەندامی کۆمەڵەی دۆستایەتی بەریتانی _ کوردی بووە و لە هەر بوارێکدا بۆی لوابێت بە دڵ بەرگری لە کورد کردووه، دەڵێم ئەگەر کتێبی ئەمانە کێنی ساڵی ١٩٦٦ نەبووایە من وەك توێژەرێك ئەو هەموو زانیارییە دەگمەنانەم دەربارەی ژیان و بەرهەم و چالاکییەکانی ئەو زاتە نەدەزانی[٥]، وێڕای ئەوەیش ئێمەومانان لە هیچ ڕێگەیەکەوە نەماندەتوانی ئەوە بزانین ئەو عاشقە گەورەیەی کورد و کوردستان ڕۆژی ١٤ی ئابی ساڵی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووه.

ئەم وڵاتە پێشکەوتووە بێ ئەندازە ڕێز لە مردووە دڵسۆزەکانی دەنێت، تەنانەت لە زیندووەکانیشیان زۆرتر، ئەمەیش بووەتە ماکی سەرەکی دەرچوونی زنجیرە کتێبی ساڵانە لە هەمان بواردا، بەڵام بە ناونیشانێکی دیکەوە – ئەمانە کێ بوون کە هاوتەمەنە لەگەڵ کتێبی ئەمانە کێن[٦].

لە زنجیرەی ئەمانە کێ بووندا ئیتر هەموو جارێك ڕۆژ و مانگ و ساڵی کۆچی دوایی ئەو ناودارە و دوا ناونیشانی لەگەڵ ناوی هاوسەرەکەی و منداڵەکانیدا و ژمارەی تەلەفۆن و ئیمێڵی تۆمار دەکەن، بە وێنە هەر کەسێك عەودالی هەر زانیارییەك بێت دەربارەی یەکێکی وەك لۆرد کیلبراکین بە ئاسانی دەتوانێت یەکسەر پێوەندی بە جۆنی کوڕییەوە لە ئایرلەندە بکات.

ئینجا بابێینە سەر باسی کتێبێکی دیکە کە لە ڕێگەی ئەرشیفەوە من دەستم کەوت و بەر لە گەڕانەوەم لە ڕێگەی برای نزیکمەوە دوکتۆر ئەمین موتابچییەوە پێشکەشی دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵای دڵسۆز و چالاکم لە پاریس کرد، چونکە ئەمیان بە زوبانی فەڕەنسییە و ساڵی ١٩٦٤ لە برۆکسلی پایتەختی بەلجیکا بەم ناونیشانەوە چاپ کراوە ئەمانە کێن لە ئەورووپا[٧].

---

[5] (Who's Who 1966. An Annual Biographical Dictionary), London, 1966, P.1693.

[6] (Who Was Who 1897 – 2006. An Annual Biographical Dictionary), London, 2006.

[7] (Who's Who in Europe), Bruxelles, 1964.

قـەبارەی ئـەم کتێبـە ٢٨٦٠ لاپـەڕەی گەورەیـە و پوختـەی ژیننامـەی دەوروبەری ٣٠ هەزار ناوداری ئەوروپایی تێدایە[٨]، بـە وێنـە نـاوی ژمارەیـەك نـەوەی کـارل مارکسـی تێـدا تۆمـار کـراوە، کـە پرۆفیسـۆر جۆلیـۆس کـارل مارکسـی لـەدایکبووی شـاری میـۆنیخ لـە ڕۆژی دوازدەی مـانگی تەشـرینی دووەمی ساڵی ١٨٩٧ دا یەکێکیانە[٩].

زۆر جـار کتـێبی مێـژوویی تایبـەت دەخرێتـە پیشـانگاکەی ئەرشـیڤەوە، لێرەیشدا وەك نموونە بە کورتی باسی یەکێك لەو کتێبانە دەکەم کە ئێستا لە کتێبخانەکەی خۆمدایە.

ناوی دانەری ئەم کتێبە دەبل یو.م.برادییە کە سـاڵی ١٨٩٠ لـە لەنـدەن بەم ناوونیشانەوە بلاوی کردۆتەوە ئەوراقەکانی ئەنگلۆ _ ڕۆمان[١٠] و لـە ٢٨٠ لاپەڕەدا باسی گـەلێك ڕووداوی سـەدە ناوەنجییـەکانی ئـەوروپا بـە گشـتی و ئینگیلتەرە بەتایبەتی دەکات، تاوەکو دەگاتە سەرەتای مێـژووی نـوێی ئـەو وڵاتانە[١١]. من بۆ خۆم لە کۆتـایی حـەفتاکانی سـەدەی ڕابـردووەوە تـاوەکو نەوەتـەکانی ئـەو سـەدەیە، وانـەی ئـەو قۆناغـەی مێـژووی ئـەوروپام بـە قوتابییـانی بەکـەلۆریۆس و ماجسـتێر و دوکتـۆرا گوتووەتـەوە و لەسـەریم نووسیوە، بۆیەکا تاوەکو ڕادەیەك ئاگاداری بایەخ و سەختیی ئەو مێژووەم.

باسـی ئەرشـیڤی نیشـتیمانیی بـەریتانی و بایـەخی بـێ ئەنـدازەی ئـەو ملیۆنەها بەڵگەنامانەی بـە ئەوپـەڕی دڵسـۆزییەوە تێیـدا پـارێزراون، ئـاو زۆر

---

(8) Ibid, Editorial.

(9) Ibid, P.1725.

(10) W.U.Brady, Anglo Roman Papers, London, 1890.

(11) بە وێنە لە گێڕانەوەی هەندێك ڕووداوی (بزووتنەوەی چاکسازی ئـایینیی ئـەوروپا)دا (حرکـة الاصـلاح الـديني الاوروبـي) کـە یەکێکـە لـە لاپـەڕە هـەرە بایەخـدارەکانی مێـژووی سـەدە ناوەنجییەکان و ڕێگەی بـۆ سـەرهەڵدانی ڕژێمـی سـەرمایەداری خـۆش کـرد، (بـرادی) باسـی یەکێك لە بڕیارەکانی لویسی هەژدەی پاشای فەڕەنسا دەکات لە بـواری پووچـەڵکردنەوەی پاشماوەکانی بڕیارە دواکەوتووەکانی کڵێسەی کاسۆلیکی. بڕوانە: Ibid, P.152.

دەكێشـێت، پێموایـە ئـەو چـەند نموونەیـەی سـەرەوە بـۆ خوێنـەر وێنـەی گەورەیی ئەو دەزگا بەرزە بە دروسـتی دەكێشـن و بـەر لـەوەی بچینە سـەر باسی لایەنێكی دیكەی مێژووی هاوچـەرخی كـورد و كوردسـتان لـە دووتـوێی بەشێكی دیكەی بەڵگەنامەكانی ئەم ئەرشیڤەدا بە پێویسـتی دەزانـین كورتـە روونكردنەوەیەك بكەینە پاشكۆی ئەم پێشەكییە.

## کورتە ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی لایەنە زەحمەتە، خۆشەکانی، کارکردنم لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا کردووە، ئێستاش بە نیازی پتر ڕوونکردنەوەی لایەنەکانی ئەم بابەتە لەم پاشکۆیەدا بە کورتی باسی یەکێك لە فایلەکانی ئەرشیف دەکەم.

هەر فایلێك گەورە بێت یان بچووك هەر ئەوەندە ناوی کورد یان کوردستان یان ڕەهبەرێکی کوردی تێدا هاتبێت ژمارەی ئەو فایلەت لەسەر کۆمپیوتەر، یان لەو لیستانەدا کە کارمەندە شارەزاکانی ئەرشیف دەتدەنێ بۆت تۆمار دەکرێت، لەو کاتەدا تۆیش دەبێت سەیری گشت بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلە بکەیت بۆ ئەوەی ئەو شتانەی بە پێویستیان دەزانیت وێنەیان بگریتەوە. دوای تەواوبوونی کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرەیە بە ماوەیەکی کورت لە ناو لیستی فایلەکاندا قەبارەی فایلی ژمارە ٣٧٠ / ٢٧٢٠ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی [12]، سەرنجی ڕاکێشام و ماوەیەکی باش پێوەی خەریك بووم و ئەمەی لای خوارەوە پوختەی ناوەڕۆکی ئەو فایلەیە.

فایلی ناوبراو یەکجار گەورەیە، ژمارەی لاپەڕەکانی خۆی دەدات لە دەوروبەری پێنج سەد (٥٠٠) لاپەڕەی گەورە کە هەردووك دیوی بەشی هەرە زۆری لاپەڕەکانی بە چاپکراوی یان بە دەستخەت نووسراونەتەوە، بەو جۆرەیش ژمارەی دروستی لاپەڕەکانی لە پێنج سەد لاپەڕە زۆر تێپەڕ دەکات، بابەتی سەرەکیی فایلەکە بریتییە لە باسی سیاسەتی حوکمەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا و بەسەر دە بەشی سەرەکیدا بەم جۆرەی لای خوارەوە دابەش کراوە:

---

[12] N.A., F.O., 370/ 2720.




نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

١- بەشی یەکەم بریتییە لە ڕاپۆرتێکی چوار لاپەڕەیی و نەخشەیەکی گەورە و ژمارەیەك نامەی دیپلۆماسی، سنووری نێوان ئەفغانستان و چین ناوونیشانی ئەم بەشەیە کە مێژووی ڕۆژی بیست و حەوتی مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٣ ی بەسەرەوەیە[١٣].

٢- بەرەوپێش چوونی ئابووریی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨وە ناوونیشانی بەشی دووەمی ئەم فایلەیە[١٤]، کە پڕییە لە خشتە و سەرژمێری و ژمارە و ڕاپۆرت و لێدوانی شارەزایانی هەمەجۆر.

٣- هەرچی بەشی سێیەمە بریتییە لە یەك بەڵگەنامە کە ئەویش نامەیەکی بچووکی باڵوێزخانەی بەریتانییە لە قاهیرە کە ڕۆژی بیست و

[13] Ibid, Research Department Memorandum, The Afghan – Chinese Fron – tier, 27 August, 1963.

[14] Ibid, The Development of Israel's Economy since 1948.

چواری مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن [١٥].

٤- بەشی چوارەم بە پێچەوانەی بەشی سێیەمەوە زۆر گەورەیە و سۆشیالیزمی عەرەبی و کۆمۆنیزم و ئیسلام ناوونیشانی سەرەکییەتی [١٦]، یەکەم بەڵگەنامەی ئەم بەشە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی چوار لاپەڕەیی دەربارەی سۆشیالیزمی عەرەبی و کۆمۆنیزم و ئیسلام لە عیراق، ڕاپۆرتی ناوبراو ئاماژەی بۆ کتێبی سۆشیالیزمی عەرەبی- الاشتراکیة العربیة ی نەقیبی پارێزەرانی عیراق عەبدولڕەزاق شبیب کردووە کە بەر لە کودێتای هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ چاپ کراوە، لە هەمان ڕاپۆرتدا کەمێکیش باسی کورد هەیە.

٥- لە بەشی چوارەمدا گەلێك باسی سۆشیالیزمی عەرەبی لە میسر لە ڕۆژگاری جەمال عەبدولناسڕدا کراوە، وێڕای ئەوەیش سەرجەمی بەشی پێنجەمی هەمان فایل، کە بریتییە لە بیست و یەك لاپەڕەی چڕوپڕ و بەشێکی زۆریان لە هەردووك دیویاندا چاپ کراون، بۆ هەمان بابەتی سۆشیالیزمی عەرەبی لە میسر لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی جەمال عەبدولناسردا تەرخان کراون.

٦- بەشی شەشەمی ئەم فایلە بچووکە، بەڵام سەرنج ڕادەکێشێت، گشت لاپەڕەکانی ئەم بەشە شەش لاپەڕەن، بەڵگەنامەی یەکەمی بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە بۆ بەشی لێکۆڵینەوە لە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی ئەو لێکۆڵینەوەیەی بەشی ناوبراو بەم ناوونیشانەوە پارتییە سیاسییە سوورییەکان لە ساڵی ١٩٤٦وە و ڕۆڵی

---

(15) Ibid, From: British Embassy, Cairo,June 4, 1963, To: The Foriegn Office, London, S.W.1.

(16) Ibid, Arab Socialism, Communsim and Islam.

سوپای سووری له سیاسەتدا [١٧] ئامادەی کردووە. شایانی باسە باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە لە نامە نهێنییەکەی خۆیدا داوا دەکات وەزارەت ڕێگەی بدات وێنەیەك لە لێکۆڵینەوەکەی بەشی لێکۆڵینەوەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بنێرێت بۆ لێپرسراوانی پەیمانی سێنتۆ [١٨].

٧- بەشی حەوتەم بریتییە لە تەنها نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران کە ڕۆژی بیست و دووی مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٣ دەربارەی پارتی بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی ناردوویەتی بۆ بەشی لێکۆڵینەوەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن [١٩].

٨- بە دەستووری بەشی حەوتەم بەشی هەشتەمی هەمان فایل بریتییە تەنها لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی حوکمەتی بەریتانی لە کابول کە ڕۆژی یەکی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی دەربارەی چاکسازییەکانی حوکمەتی ئەفغانستان [٢٠].

٩- بەشی نۆیەم لە بیست و شەش لاپەڕە پێکهاتووە کە سەرجەمیان بۆ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی باری سیاسی ئەفغانستان تەرخان کراون، یەکێك لە بابەتە بایەخدارەکانی ئەم بەشە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی نهێنیی سێ

---

[17] Ibid, The Syrian Political Parties since 1946 and the Role of the Army in Syrian Politics.

[18] Ibid, Confidential, No.22515/1, From British Embassy, Ankara, September12, 1963, To: Research Department, Foreign Office, London, S.W.1.

[19] Ibid, From British Embassy, Tehran, August 22,1963 To: Research Department, Foreign Office, King Charles Street, London, S.W.1.

[20] Ibid, Confidential, From: British Embessy, Kabul, October1, 1963, To: Foreign Office, London, S.W.1.

لاپەڕەیی کە هەردووك دیویان چاپ کراون و بەم ناوونیشانەوەیە: یادداشتی بەشی لێکۆڵینەوە، پارتییە سیاسییەکانی ئەفغانستان ١٩٤٣ – ١٩٥٣ (٢١).

١٠– بەشی دەیەم لە سی و پێنج لاپەڕە پێکهاتووە کە زۆربەیان لە هەردوو دیوەوە چاپ کراون و هەمووشیان تەرخان کراون بۆ یادداشتی دوورودرێژی بەشی لێکۆڵینەوەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە ساڵی ١٩٦٤دا بەناوونیشانی داواکردنی عەدەن لە لایەن یەمەنەوە، کورتەیەك (٢٢).

١١– بەشی یازدە کە دوا بەشی ئەم فایلەیە لە بیست و یەك لاپەڕەی گەورە و چڕوپڕ پێکهاتووە و بریتییە لە دوو بیبیلۆگرافیای گرنگ دەربارەی ئەو کتێب و وتارانەی لەنێوان ساڵانی ١٩٦١ و ١٩٦٣دا بە ئینگلیزی و جار جارەش بە فەرەنسی دەربارەی وڵات و گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست چاپ کراون و لەم بەشەدا چەند جارێك ناوی کورد و کوردستانیش هاتووە، لێرەدا دەگەمە مەبەستی سەرەکیی ڕوونکردنەوەکەم کە ئەویش ئەوەیە کە ئەو حەوت سەد – هەشت سەد لاپەڕەیەی فایلی ژمارە ٣٧٠ / ٢٧٢٠ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا تەنیا لەم دوا بەشەی فایلەکەدا چەند جارێك، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ناوی کورد و کوردستان هاتووە، بەڵام ئەوە ماوەی چەند کار و لێکدانەوەی پێویستە کە هەڵبەت هەرچەند ئەزیەت بێت گەلێك زۆرتر دڵخۆشکەر و سوودمەندە.

جا لێرەدا با بگەڕێینەوە سەر لیستی ناوی کتێب و وتارەکان بە پێی ناوەرۆکی خودی بەڵگەنامە و چەند نموونەیەکیان لێ پێشکەش بکەین:

ئەم بەشە باسی بیست کتێب دەکات کە لە نێوان ساڵانی ١٩٦١ و ١٩٦٣دا بە زوبانی ئینگلیزی، یان جارجارە بە زوبانی فەرەنسی چاپ کراون،

---

(21) Ibid, Secret, Research Department Memorandum, Political Parties in Afgahnistan 1949 – 1953.

(22) Ibid, Confidental, Research Department Memorandum, The yemeni Claim to Aden, Summary.

چوارەم کتێبیان کتێبەکەی کونسوڵی بەریتانی لە تەوریز ولیام ئیگلتنە کە بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی دەکات:

٤- کۆماری کوردیی ساڵی ١٩٤٦، لەندەن، ١٩٦٣، کتێبێکی باش داڕێژراوە و بە شێوازی سەرکەوتوو باسی تەمەنی کورتی کۆمار دەکات[٢٣].

هەروەها یەکێك لە کتێبەکانی ئەم بەشە کتێبە نایابەکەی ئەلبێرت حۆرانییە بەناوی وریابوونەوەی عەرەب (يقظة العرب) کە راپۆرتەکە بەرز دەینرخێنێت[٢٤].

بە هەمان دەستور راپۆرتەکە باسی چاپی سێیەمی کتێبە بەناوبانگەکەی جۆرج لینچۆفسکی - ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پرسە جیهانییەکان دەکات[٢٥].

لاپەڕەیەکی سەربەخۆی هەمان لیستە بۆ ناوی ئەو کتێب و وتارانە تەرخان کراوە کە لە سەر عیراق نووسراون و بریتین لە ناوی دوو کتێب و یەك وتار، کتێبی یەکەمیان ستیفن هێمسلی لۆنگریگی شارەزا و ف. ستۆکس بەناونیشانی عیراق دایاننـاوە و ساڵی ١٩٦٣ لە نیویۆرك چاپ کراوە[٢٦]، پێموایە ئەو کتێبە نەکراوەتە عەرەبی. کتێبی دووەم دەربارەی عیراق بە زوبانی فەرەنسی یە[٢٧]، وتارەکەیش، وەك گوتمان، بە زوبانی ئینگلیزییە ل.م. وێنەر بەناونیشانی ناکۆکییەکانی نێوان عەرەب و کوردی عیراقەوە لە ژمارەی زستان - بەهاری ساڵی ١٩٦٣ی گۆڤاری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

---

[٢٣] دەقی ئینگلیزییەکەی بەم شێوەیەیە:

(Eagleton W., The Kurdish Republic Of 1946, London, 1963. A Well-written and interesting account of the Republic's Short life (N.A.,F.O.,370/2720).

[24](Arabic Though in the Liberal Age, 1789 – 1939), London, 1962.

[25] G.Lenczowski, The Middle East in World Affairs, Third Edition, New York, 1962.

[26] S.Longrig Longrigg and F.Stoakes, Iraq, New York, 1963.

[27] B.Vernier, L' Iraq d'Aujourd'hui, Paris, 1963.

بلاوی کردووەتـەوە[٢٨]، بێ گومـان وتـاری لـەو جـۆرە سـەرنجی نـەك تـەنها ڕوونــاکبیرانی کــورد، بــەڵکو گــەلێك لایــەنی هەمــەجۆری ناوچــەکە و ڕۆژئاواییەکان ڕادەکێشێت.

لاپەڕەی دواتر بۆ ئوردون تەرخان کراوە و ناوی تەنها دوو کتێبی تێدایە کە یەکێکیان لە نووسینی خوالێخۆشبوو مـەلیك حسـینە[٢٩]، لاپـەڕەی دوای ئەویش بۆ لوبنان تەرخان کراوە کە ناوی تەنها وتارێك و کتێبێکی بە زوبـانی ئینگلیزی تێدایە، وتارەکە دەربـارەی بنـەما و پێکهاتـەکانی ژیـانی ئـابووریی لوبنانە، کە هەمیشە ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لـە ژیـان و ئاڵوگۆڕەکـانی ئـەو وڵاتـەدا، کتێبەکـەیش هـی مێژوونووسـی ناسـراوی لوبنـانی و عـەرەب فلیـپ حەتی یە بە ناوونیشانی لوبنان لە دێرزەمانەوە تاوەکو ئیمڕۆکە[٣٠].

دوا بەدوای لوبنان لاپەڕەیەك تەرخان کـراوە بـۆ عەرەبسـتانی سـعوودی کە ئەویش ناوی وتارێك و کتێبێکی بە زوبانی ئینگلیزی تێدایـە، کتێبەکـەیان دەربارەی (ناوچەی بێلایەن – المنطقة المحايدة)ی نێوان عەرەبی سعوودی و کوێتە[٣١].

دوای ئەوە نۆرەی (الخليج العربي) دێت کە ناوی پێنج کتێب و دوو وتاری بە زوبـانی ئینگلیـزی تێدایـە، هەڵبـەت ئـەو بایەخ پێدانـە لـە ئـاڵۆزیی بـاری سیاسی ناوچەکەوە هاتووە، شایانی گوتنیشە کتێبی یەکەمی هـەمان کتـێبی ناوچەی بێلایەنی نێوان عەرەبی سعوودی و کوێتە کە لە سەرەوە ئامـاژەمـان بۆی کردووە.

---

(28) L.M.Wenner,Arab-Kurdish Rivalries in Iraq,-(Middle East Journal), Winter – Spring 1963.

(29) Hussien, King of Jordan, Uneasy Lies The Head, London, 1962.

(30) P.k.Hitti, Lebanon in History from the Earliest to the Present, London,1963.

(31) E.H.Brown, The Sandi Arabia-Kuwait Neutral Zone, Beirut, 1963.

هەرچی لاپەڕەی دواترە بۆ یەمەن تەرخان کراوە و ناوی تەنها یەك کتێبی بە زوبانی ئینگلیزی تێدایە، دوای ئەوەیش لاپەڕەیەك بۆ ئێران تەرخان کراوە و ناوی دوو کتێب و یەك وتاری بە زوبانی ئینگیزی تێدایە، وتارەکەیان بایەخی زۆرە، چونکە باسی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی ئەو ولاتە دەکات[32].

ئینجا نۆرەی ئیسرائیل دێت و لەو لاپەڕەیەدا کە بۆ ئەو ولاتە تەرخان کراوە ناوی چوار کتێب و چوار وتار بە زوبانی ئینگلیزی هەیە، کتێبی یەکەمیان دەربارەی یاسای سەرەکیی دەوڵەتی ئیسرائیلە کە ساڵی ١٩٦١ لە نیویۆرك چاپ کراوە و دەوڵەت و سیاسەت لە ئیسرائیلیش ناوونیشانی کتێبی دووەمیانە کە هەمان ساڵ لە لەندەن چاپ کراوە، ئیسرائیل ئیمڕۆکەیش ناوی کتێبی سێیەمیانە کە دیسانەوە لە لەندەن ساڵی ١٩٦٢ چاپ کراوە، هەرچی دوا کتێبیشیانە دەربارەی ژیانی بن گۆریۆنە[33].

وتارەکانیش یەکێکیان دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی ئیسرائیلە، پێوەندی ئیسرائیل بە دەوڵەتە نوێکانی ئاسیاوە [34]ناوونیشانی وتارێکی دیکەیانە، ئیسرائیل بە دوای ئاودا دەگەڕێتیش[35] ناوونیشانی یەکێکی دیکەی ئەو وتارانەیە.

---

[32] A.Hottinger, The Political Struggle in Iran, -(Middle East Forum), March, 1961.

[33] G.Samuel, Ben –Gurion, Fighter of Goliaths, The Story of Ben – Gurion, New York. 1961.

[34] E.Elaths, Israel's Relations with the Emerging States in Asia,- (Royal Central Asian Society Journal), London, january, 1963.

[35] Israel Looks for Water.



وێنەی کەمال مەزهەر لە ئەرشیفخانە

دوای ئیسرائیل لاپەڕەیەکی بیبلیۆگرافیاکە بۆ ناوی چوار کتێب دەربارەی ئەفغانستان تەرخان کراوە، لە کۆتاییشیدا لاپەڕەیەک بۆ سووریا تەرخان کراوە و ناوی تەنها یەک وتاری بە زوبانی ئینگلیزی تێدایە و دەربارەی چاکسازیی کشتوکاڵە لەو وڵاتەدا[٣٦].

هەر چۆن بێت بەشی کورد و کوردستان لەو بیبلیۆگرافیایەی ناو ئەو فایلە گەورەیەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا بەشێکی وەبەرچاو و بایەخدارە چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە و چ لەڕووی سەنگەوە، بێ گومان ناوەکانی دیکەیش سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشن.

(36) "Middle East Journal", Winter- Spring 1963.

هیوادارم ئەم کورتە ڕوونکردنەوەیە مەبەستەکانمی پێکابێت. بەر لە کۆتاییش بە پێویستی دەزانم سوپاسی بێ ئەندازەم بۆ گەورە و بچووکی کارمەندانی ئەرشیڤی نیشتیمانیی بەریتانی دووپات بکەمەوە، ئەوانەی هەتا هەتایە خۆم بە قەرزارباریان دەزانم.

کەمال مەزهەر

لەندەن

حەڤدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٧

**بەشێك لەو وتارانەی دەربارەی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە بڵاوکراوەتەوە**

هەر چەندە پێشتر لەوە دڵنیا بووم کە بەرگی یەکەمی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا دەنگێکی شیاو لە نێو خوێندەوارانی کورددا دەداتەوە، بەڵام ئەوی ڕاستی بێت هەرگیز چاوەڕوان نەبووم ئەو دەنگدانەوەیە بگاتە ئەو ئاستە هەرە بەرزەی پێی گەیشت، وا بۆ مێژوو چەند نموونەیەکی لێ دەخەمە بەرچاوی خوێنەری بەڕێز:

١- زانیار سەردار قرگەیی: دوو وتاری دوور و درێژی لە ڕۆژنامەی خەباتدا بە زوبانی کوردی بڵاو کردۆتەوە و ئەم ناونیشانەی بۆ هەڵبژاردووە: د. کەمال مەزهەر: مێژووی ڕاستەقینە لەو بەڵگەنامانەدایە. بارزانی گەورەیە و دەیزانی چۆن ڕەفتار دەکات. کوردستانییەتی کەرکووك گومانی تێدا نییە، ئەوەی بووە تەوقی نەگبەتی و چووە گەردەنی کوردەوە نەوتەکەیە، من وەك مێژوونووس دەبێت سەیری دوارۆژ بکەم و مێژوو دەڵێت: ڕەوڕەوەی مێژوو هەرگیز ناوەستێ و هەمیشە بەرەوپێش دەچێت، بۆخۆم دڵنیام لەوەی کورد بە هیچ جۆرێ دەست لە بستێ خاکی کوردستان هەڵناگرێ، شایەنی باسە ڕۆژنامەی خەبات وێنەی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی لە هەردوو ژمارەکەی ڕۆژنامەکەدا چاپ کردووە[٣٧].

٢- لە میانی چالاکییە ڕووناکبیری و گشتییەکانیدا و لە پێناوی بایەخدان بە ئەرشیف و بواری دۆکۆمێنتاری مێژوویی کورد سەرلەبەیانیی ڕۆژی نۆی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە لە هۆڵی سەرۆکایەتی و بە ئامادەبوونی قایمقامی کۆیە و سەرۆك و یاریدەدەران و مامۆستایانی زانکۆ و ئەندامانی مەڵبەندی چواردەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە کۆیە و بەرپرسانی تری حزبی و حوکومی و ژمارەیەکی زۆر لە

---

[٣٧] (خەبات)، هەولێر، ژمارە ٣٠٠٨ و ٣٠٠٩، ٢٨ و ٢٩ی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨، ل.٢.

خوێندکارانی کۆلیجەکانی زانکۆی کۆیە لە ژێر ناوونیشانی بایەخی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی بۆ تۆژینەوەی مێژووی هاوچەرخی کورد کۆڕێکی بۆ پرۆفیسۆری مێژوونووس د.کەمال مەزهەر ڕێکخست... بە هۆی کەمی ژمارەی دانەکانی کتێبەکە و زۆریی خوێنەرانی موشتاقی بابەتەکە، بەشێکی زۆر لە خوێنەران و خوێندکاران و مامۆستایان لە خوێندنەوەی کتێبەکە بێبەش بوون و داواکار بوون کە بە پێی پێویست کتێبەکە بگەیەندرێتە زانکۆی شاری کۆیە [٣٨].

٣- لەندەن – مێژوونووسی ناوداری کورد پرۆفیسۆر د.کەمال مەزهەر ئەحمەد لە ئەرشیفخانەی بەریتانی، وێڕای سەفەری بۆ چارەسەر سەرقاڵی گەڕانە بە دوای دەکومێنتەکانی مێژووی کورددا کە بەم زووانە دەیکاتە کتێبێکی مێژوویی دەکومێنتاری. فۆتۆ: کاروان عارف ل.١، بڕوانە ل١٢: سڵاو لە عەمیدی مێژوونووسانی کورد، سڵاو لە شاگردەکانی. ستران عەبدوڵڵا. وێنەی لاپەڕە دوازدە د. کەمال مەزهەر – ڕێگایەك بەرەو ئەرشیفخانەی بەریتانیا [٣٩].

٤- دیدارێ لەگەڵ مێژوونووسی گەورەی کورد د. کەمال مەزهەر ئەحمەددا، سازدانی عەتا موفتی – لەندەن لە گۆڤاری مەڵبەند– لەندەن و ڕۆژنامەی ئاسۆ سلێمانیدا بڵاوکراوەتەوە[٤٠]، وتاری ناوبراو دەڵێت: ئێستاش کتێبێکم بە دەستەوەیە کە ئێوە هاتن کارم دەکرد لەسەر کتێبەکە و ناوم ناوە کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا...

---

[٣٨](کوردستانی نوێ)، سلێمانی، ژمارە ٤٧٢٢، ڕۆژی سێ شەممەی یازدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨، ل.١٤.

[٣٩] (ئاسۆ)، (ڕۆژنامە)، سلێمانی، ژمارە ٤٦٠، ڕۆژی هەژدەی مانگی حوزەیرانی ساڵی٢٠٠٧، ل.١و١٢.

[٤٠](ئاسۆ)، ژمارە ٥٠١، ڕۆژی شەمەی یازدەی ئابی ٢٠٠٧، ل ١–٤ و گۆڤاری (مەڵبەند) لەندەن.

زۆر حەزدەکەم و بە پێویستی دەزانم ئەو کتێبە بە زووترین کات بکرێتە عەرەبی چونکە پێویستە رووناکبیری عەرەب ئاگایان لەو کتێبە بێت [٤١].

بەر لەوە و بە هەمان بۆنەوە نووسەرانی هەمان رۆژنامە وتارێکیان لەگەڵ وێنەیەکی گەورەی خاوەنی ئەم پێشەکییەدا بەم ناوونیشانەوە د. کەمال مەزهەر ئەحمەد هەر ساغ و سەلامەت بن بڵاو کردۆتەوە و کۆتایی وتارە پڕ لە سۆزەکەیان بەم چەند دێرە هێناوە:

دوکتۆر گیان بە هیوای چاکبوونەوە، خوێندەوارانی کتێبەکانت چاوەڕێی بەشەکانی دیکەی مێژووی کورد و چاوەڕێی بەرهەمەکانی ترتانن [٤٢].

٥- هەر لەو دەورووبەرەیشدا نووسەر و رۆژنامەنووسی ناسراو مامۆستا مومتاز حەیدەری لە رۆژنامەی کوردستانی نوێدا ئەم پێشنیازەی لای خوارەوەی بڵاو کردووەتەوە:

پێشنیارێك بۆ: زانکۆکانی سەلاحەددین، سلێمانی، دهۆك، کۆیە، کۆڕی زانیاری کوردستان، وەزارەتی رۆشنبیری، کۆمەڵەی مێژوونووسانی کوردستان، دەزگای ئاراس، ڕیزلێنان لە گەورە مێژوونووسی کوردستان پرۆفیسۆر د.کەمال مەزهەر ئەحمەد ١٩٣٧/٢/١٤- ٢٠٠٧/٢/١٤ [٤٣].

٦- کەمال مەزهەر نەبووایە کورد هەژارتر دەبوو ناوونیشانی وتارێکە رۆژنامەی رێگای کوردستانی ئۆرگانی حیزبی شیوعیی عیراقی رۆژی چوارشەممەی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨ بڵاوی کردۆتەوە و تێیدا دەڵێت:

لە کەلتووری سیاسی و کۆمەڵایەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگا، جا پلە و پایە و ناسنامەیان هەرچییەك بێت و لەسەر ئاستی پۆستێکی دیاریکراودا بن، خۆیان بە قەرزاری نەتەوە و نیشتمان

---

[٤١] هەمان سەرچاوە.

[٤٢] بڕوانە: (ئاسۆ)، ژمارە ٢٦٦، رۆژی سێ شەممەی ٢٢ی ئابی ساڵی ٢٠٠٦.

[٤٣] (کوردستانی نوێ)، سلێمانی، ژمارە٤١٩٠، رۆژی هەینی، نۆی شوباتی ساڵی ٢٠٠٧، ل١٢.

دەزانن، مرۆڤ لەسەر زەمینی ئەم ولاّتەدا هەرچییەك بێت و هەرچی بكا، جا با وەکو فەرهاد ڕەنجی داهێنانی بگاتە ئاستی داتاشینی کێوی بێستوون ئەوا لە ئاستی نەتەوە و نیشتمانەکەیدا خۆی بە بچووك و کورتەبالاّ دەبینێت، بەلاّم من بەپێچەوانەی ئەوەوە دەبینم کە خەڵکانێك هەن گەل و نیشتمان قەرزاری ئەوانن، لەوانە د. کەمال مەزهەرە، ئەو پیاوە دەیان ساڵە بووەتە گەڕیدەیەکی کارا و ماندوونەناسی نێو ڕاڕەوەکانی مێژوو و لۆفە و پێچەکانی ئەو مێژووە و بە وێنەی ڕەشەبا تەی دەکات و بە وێنەی دایکێکی کۆرپە ون بوو لەپێناو ساغکردنەوە و ڕزگارکردنی لاپەڕەکانی مێژووی کورد سەر بە کتێبخانە و ئەرشیفەکانی جیهاندا دەکات، بەڵێ کورد و کوردستان قەرزاری د. کەمال مەزهەر، ئەو نەبووایە کێ دەیتوانی، یاخود کێ وەکو ئەو سەفەری دوور و درێژی بەناو کونج و تونێلە تاریکەکانی مێژوودا دەکرد بۆ ڕزگارکردنی مێژووی کورد لە ژێر سمی ئەسپی سەرمایە و ئیسلامیزم و عەرەبیزم و فارسیزم و تورکیزمدا، دڵنیام ئەگەر بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردستان لە ڕێگای شۆڕش و هێز و چەك ئامادەیی نەتەوەکەمانی بۆ ئازادی نمایش کردبێت، ئەوا د.کەمال مەزهەر لە ڕێگای نووسین و مێژووەوە قۆناغی دووەمی ئەو مێژووەی نمایش کرد، ئەگەر ئەو نەبووایە کورد کلۆڵتر و هەژارتر دەبوو[٤٤].

٧- ڕۆژنامەی ستاندەر لەژێر ناوی بلاّوکراوەی نوێدا وێنەیەکی گەورەی بەرگی یەکەمی کتێبی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادای بلاّو کردووەتەوە[٤٥].

---

[٤٤] بڕوانە: (ڕێگای کوردستان)، سلێمانی، هەفتەنامەیەکی سیاسییە حیزبی شیوعی کوردستان دەری دەکات، ژمارە ٨١٠، چوار شەممەی ٢٢ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨، ل٣.

[٤٥] ستاندار، ڕۆژنامەیەکی حەفتانەی سیاسیی گشتییە، ژمارە ٥٠، ساڵی یەکەم، دووشەممەی ٢٠ی تەشرینی یەکەمی ٢٠٠٨.

٨- كاك كاروان ئەنوەر لە ڕۆژنامەی الأتحاددا بەزوبانی عەرەبی دیدەنییەکی دوور و درێژ لەگەڵ خاوەنی ئەم پێشەکییەدا دەربارەی ئەنفال ساز کردووە و بەو بۆنەیەوە چەند پرسیارێکی دەربارەی کارەکانم لە ئەرشیفی نیشتیمانیی حوکمەتی بەریتانیدا و بەرگی یەکەمی کتێبەکەمی لێ کردووم و منیش بەپێی بۆچوونی خۆم وەڵامی پرسیارەکانیم داوەتەوە[٤٦].

٩- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ تەوەرێکی ئەو دیدەنییەی ڕۆژی سێ شەممەی ڕێککەوتی بیست و یەکی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨ لەگەڵمدا سازی کرد بۆ بایەخی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیا و فەرەنسا و دەوڵەتی عوسمانی تەرخان کردووە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا منیش بە شێوازێکی تایبەتی باسی ئەو سەدان هەزار بەڵگەنامەی ئەرشیفی نیشتیمانیی حوکمەتی بەریتانیم کرد کە دەربارەی کورد و کوردستانن و وێنەیان گرتووە[٤٧].

١٠- فەتحوڵلا حوسەینی بە زوبانی عەرەبی و بەشێوازێکی قووڵ و دانسقە لە ڕۆژنامەی الأتحاددا باسی بەرگی یەکەمی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادای کردووە و دەڵێت: کەمال مەزهەری مێژوونووس بە ڕاشکاوی تیشکی خستووەتە سەر ئەو کۆسپە سیاسییانەی کوردیان لە سەربەخۆیی بێبەری کرد، شایەنی باسە ڕۆژنامەی ناوبراو لەگەڵ وتارەکەی حوسەینیدا وێنەیەکی گەورەی بەرگی دەرەوەی کتێبەکەی پەخش کردووە[٤٨].

١١- ڕۆژنامەی یەکگرتوو کە ئۆرگانێکی ئیسلامییە و لە هەولێر دەردەچێت، ڕۆژی بیست و یەکی تەشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨ لە ژێر

---

[٤٦] بڕوانە: (الأتحاد)، بغداد، العدد ١٩٦٦، الأحد، ٢٦، تشرين الأول ٢٠٠٨، ص٦.

[٤٧] بڕوانە: (کوردستانی نوێ)، ژمارە ٤٧٠٤، سێ شەممەی بیست و یەکی تەشرینی یەکەمی ٢٠٠٨، ل١-٢.

[٤٨] بڕوانە: (الأتحاد)، العدد ١٩٦٤، الخميس، ٢٣ تشرين الأول ٢٠٠٨، ص٧.

ناونیشانی چاپکراوی نوێدا لە دوا لاپەڕەیدا وێنەی بەرگی حەوت چاپکراوی نوێی بلاو کردووەتەوە بە بێ هیچ لێدوانێك و یەکێك لەو حەوت چاپکراوە نوێیە بەرگی یەکەمی کتێبی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادایە[٤٩].

١٢- لە ژمارەی ٤٦٩٧ی ڕۆژی سیازدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٨یدا ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ لە ژێر ناوونیشانی کورد و کوردستان چاوی ڕۆشن کردینەوە هەواڵی دەرچوونی بەرگی یەکەمی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی حوکمەتی بەریتانیادای ڕاگەیاندووە و کۆتایی ئەم هەواڵەی بەم ڕستەیە هێناوە: بەناوی ڕۆژنامەکەمانەوە ماندوو نەبوون و ئومێدی تەمەن درێژی بۆ پرۆفیسۆر د. کەمال مەزهەر دەخوازین و هەمیشە بە ئومێدی کار و بەرهەمی بە برشتین (لێی - ك.م.) و دەستخۆشی و ماندوو نەبوونیش لە هەردوو ئامادەکاری کتێبەکە دەکەین. سەرکەوتووبن، شایەنی باسە کوردستانی نوێ لەو ژمارەیەیدا دیسانەوە وێنەی بەرگی یەکەمی دەرەوەی کتێبەکەی بلاو کردووەتەوە[٥٠].

١٣- الصوت الآخر - گۆڤارێکی ڕووناکبیریی گشتییە کە هەفتەی جارێك لە هەولێر بە زوبانی عەرەبی بلاو دەکرێتەوە، گۆڤاری ناوبراو لە سەر بەرگی دەرەوەی ژمارە دوو سەد و حەڤدەی ڕۆژی پێنجی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨یدا وێنەیەکی نووسەری ئەم پێشەکییە و ئەم ناوونیشانەی بلاوکردۆتەوە مێژوونووسی کوردی گەورە د. کەمال مەزهەر - چەرچلێ لە گەڵ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیدا بوو، لە لاپەڕە ٢٦- ٢٨ی هەمان ژمارەیشدا ڕۆژنامەنووس تاریق کارێزی دەقی ئەو دیدەنییەی لەگەڵمدا سازی کردبوو بلاوی کردووەتەوە و ئەم ناوونیشانەی بۆی هەڵبژاردووە:

---

[٤٩] بڕوانە: (یەکگرتوو)، هەولێر، ژمارە ٧١١، بیست و یەکی تەشرینی یەکەمی ٢٠٠٨.
[٥٠] بڕوانە: (کوردستانی نوێ) ژمارە ٤٦٩٧، سیازدەی تەشرینی یەکەمی ٢٠٠٨.

مێژوونووسی گەورەی کورد د. کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێت – ئەو نهێنییە بە نرخانەی لە بەڵگەنامە نهێنییە بەریتانییەکاندا پارێزراون بێ سنوورن، لە لاپەڕە بیست و هەشتی ئەو ژمارەیەی الصوت الآخریشدا کارێزی وێنەیەکی گەورەی بەرگی دەرەوەی بەرگی یەکەمی کتێبی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادای بڵاو کردۆتەوە و لە ژێریدا نووسیویەتی بەڵگەنامە بەریتانییە نهێنییەکان شتی یەکجار سەیریان تێدایە[٥١].

١٤- لە ژمارە ٤٨٤ی ڕۆژی چواری مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨یدا گۆڤاری هەرێمی کوردستان کە حەفتانە وەزارەتی ڕۆشنبیری لە هەولێر چاپی دەکات، ڕۆژنامەنووس ئیسماعیل خالید گەلاڵی دیمانەیەکی دوورودرێژی لەگەڵ خاوەنی ئەم پێشەکییەدا بڵاو کردووەتەوە و ژمارەیەکیش وێنەیان لەگەڵیدا چاپ کردووە کە فازیل فەرامۆش گرتوونی. لەسەر بەرگی دەرەوەی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری هەرێمی کوردستان دا وێنەیەکی گەورەی خاوەنی ئەم پێشەکییە بڵاو کراوەتەوە، هەرچی دیمانەکەیشە کە بەشی هەرە زۆری بۆ باسی ناوەرۆکی بەرگی یەکەمی کتێبی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا تەرخان کراوە، لە لاپەڕە هەشت و نۆی گۆڤاری ناوبراودا بڵاو کراوەتەوە[٥٢].

١٥- ألأمل کە ڕۆژنامەیەکی حەفتانەی سیاسیی سەربەخۆیە و بە زوبانی عەرەبی لە شاری سلێمانی دەردەچێت. سەرجەمی لاپەڕە پێنجی ژمارە حەفتا و حەوتی ڕۆژی سێی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ی بۆ

---

(٥١) بڕوانە: (الصوت الأخر)، مجلة اسبوعية ثقافية عامة تصدر في (أربيل) باللغة العربيـة، العدد ٢١٧، ٥ تشرين الثاني ٢٠٠٨، الغلاف وص٢٦-٢٨.

(٥٢) بڕوانە: گۆڤاری (هەرێمی کوردستان)، هەولێر، ژمارە ٤٨٤، ڕۆژی چواری مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨، ل٨-٩.

وتارەکەی فەتحوڵڵا حوسەینی[٥٣] تەرخان کردووە و لەگەڵ وتارەکەشدا (ألأمل) وێنەیەکی گەورەی بەرگی پشتەوەی بەرگی یەکەمی کتێبی کورد و کوردستانەکەی کە بە عەرەبی نووسراوە بڵاو کردووەتەوە[٥٤].

١٦- دوکتۆر ئاکۆ شوانی دیدەنییەکی دوور و درێژی لەگەڵ خاوەنی ئەم پێشەکییەدا کردووە و لە دوو لاپەڕەی چڕوپڕی دوو ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا بڵاوی کردووەتەوە و لەوێدا نووسیویە دەڵێت: کەمال مەزهەر پاش ماوەیەکی زۆر لە چاوەڕوانی سەردانی ئەرشیڤی بەریتانیای کردووە و چاوی بەزۆر لە بەڵگەنامەکانی ئەو ئەرشیڤە کەوتووە و لە لای خۆی پاراستوونی، بە پێویستمان زانی پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان ئەم دیمانەیەی لە گەڵدا ساز بدەین سەبارەت بە کار و هەنگاوەکانی و باس کردنی ئەو بەڵگەنامانە و کاریگەری و ڕۆڵیان لە نووسینەوەی مێژووی کورددا، جگە لەمانە هەندێ پرسی تری گرنگ لەم چاوپێکەوتنەی د. کەمال مەزهەردا دەخوێنیتەوە.

هەروەها دوکتۆر ئاکۆ شوانی بە مانشێتێکی گەورە لە زوبان بەندەوە نووسیویەتی دەڵێت: خەونم بەوەوە دەبینی بچمە ئینگلیتەرە و کار لەسەر ئەو بەڵگەنامانە بکەم، کە بەسوودن بۆ مێژووی هاوچەرخی کورد و بەڕێز مام جەلالیش بۆ ئەو مەبەستە چەند جارێك پەیوەندی پێوە کردووم[٥٥].

ئەم شازدە نموونەیەی سەرەوە چەرداخێکن لەو بابەتە زۆر و چڕوپڕانەی دەربارەی بەرگی یەکەمی کتێبی کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە

---

[٥٣] دەربارەی بڕوانە: ژمارە١٠.

[٥٤] بڕوانە: (ألامل) (منبر القلم الحر)، اسبوعية سياسية مستقلة، السليمانية، العدد٧٧، الأثنين، ٣ تشرين الثاني ٢٠٠٨، ص ٥ – فسحات الرأي، الكرد وكردستان في ضوء الوثائق السرية البريطانية للمؤرخ كمال مظهر.

[٥٥] (كوردستانی نوێ) ژمارە ٤٧٠٦ و ٤٧٠٧، پێنج شەممەی ٢٣ی تەشرینی یەکەمی ٢٠٠٨ و هەینی ٢٤ی تەشرینی یەکەمی ٢٠٠٨، ل ١٠.

نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا بڵاو کراوەتەوە و کورد واتەنی مشتێك نموونەی خەرواریکە. بێ گومان ئەو دەنگدانەوە گەورەیە هێندەی دیکە پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی بێ وچان هەوڵ بدەین بەرگەکانی دیکەی هەمان کتێب شان لە شانی بەرگی یەکەمی بدەن و ئەگەر توانرا تەنانەت لەویش باشتر نەك کەمتر بن.

**بۆ بەرگی دووەمیش بە دەستووری بەرگی یەکەم چەند ڕاستییەکی پێویست دەخەمە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیز، هی وەك:**

أ- لە وەرگێڕانی ناوەرۆکی بەڵگەنامەکاندا لە زوبانی ئینگلیزییەوە بۆ سەر زوبانی کوردی هەوڵم داوە چەند بتوانم لە دەقی ناوەرۆکیان لانەدەم، بەڵام وەرگێڕان هونەرێکی دژوار و سەختە و لە وێژەی هەموو کەسێکدا نییە، تایبەت ئەگەر وەرگێڕانەکە لە زوبانی ئینگلیزییەوە بێت کە زوبانێکی گەلێك دەوڵەمەند و فراوانە و لەو بارەیەوە زوبانی یەکەمی جیهانە، چونکە قۆناغی سەرمایەداری لە جیهاندا لە بەریتانیا دەستی پێکرد و کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیش لە ئەمەریکا گەیشتە لقەپۆپە، زوبانی فەرمی ئەو وڵاتەیش و گەلێك دەزگای بەرزی نێودەوڵەتی وەك نەتەوە یەکگرتووەکان دیسانەوە ئینگلیزییە. لەم بوارەدا نابێت ئەوەیش لە یاد بکەین بەشی هەرە زۆری بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی نیشتیمانی حوکمەتی بەریتانیا بەرهەمی خامەی ئەو دیپلۆماسییە لێهاتووانەن کە سەرجەمیان لەوسەری زوبانەکەیان دەهاتنەوە. جا بۆ ئەوەی مەبەستە دوورو نزیکەکانی بەڵگەنامە نهێنییەکان وەك خۆیان ڕابگەیەنم زۆر کەم سڵم لە بەکارهێنانی وشە و زاراوی ئینگلیزی و تایبەت عەرەبی کردووەتەوە.

ب- لە بەرگی دووەمی ئەم بەرهەمەیشدا زۆر پابەندی هاوسەنگیی بابەتەکانی نەبووم، بەڵکو ئەو دیاردەیە زۆر بە بەرگی دووەمەوە دیارە کە

تەنها لە پێنج بابەت پێکهاتووە، بابەتی یەکەمیان دەربارەی هۆزی شێخ بزێنییە لەساڵی ١٩١٩دا[٥٦]، بچووکترین بابەتی ئەم بەرگەیە کە چمکێك لە مێژووی حیزبی شیوعی عێراقی و چالاکییەکانی فەهد و هاوەڵەکانی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا [٥٧]گەورەترین بابەتییە، بە رادەیەك دەشیا بە کەمێك دەستکارییەوە ناوەرۆکی ئەم بەشە بکرایەتە کتێبێکی سەربەخۆی گەورە.

ج- لە بەرگی دووەمی ئەم بەرهەمەدا لەبەر گەلێك هۆ بایەخێکی تایبەتیمان داوە بە هەڵوێستی کورد بە گشتی بەرانبەر شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ لە سەرەتای بەرپابوونیدا[٥٨]. بێ گومان شۆڕشی ناوبراو وەرچەرخانێکی سیاسیی گەورە بوو لە سەرانسەری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا و لە ڕۆژە سەختەکانی سەرەتای دەیەی دووەمی جەنگی ساردداا، بۆیەکا گشت دراوسێکانی عێراق، تایبەت تورکیا و ئێران، وێڕای دەوڵەتە گەورەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات بە پەرۆشەوە عەودالی ئەوە بوون بزانن هەڵوێستی گەلی کورد بەرانبەر شۆڕشی چواردەی تەمموز چۆنە، ئەوەیش کارێکی ئەوتۆی کردووە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی بە نهێنیی نەزانراو، یان کەم زانراو تەنرابن، پێموایە پشتگیری بێ ئەندازەی زۆرینەی نەتەوەی کورد بۆ شۆڕشی ناوبراو تەواو پاکانە بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێی کوردی عێراق لە ساڵی ١٩٦١دا دەکات.

---

[٥٦] (شێخ بزێنی) هۆزێکی نیشتەجێی هەردووك قەراغ زێی بچووکە کە لەو ناوچەیەی کوردستانی باشووردا کە کەوتووەتە نێوان پردێ ئاڵتون کۆپری و تەق تەق و کۆیەوە.

[٥٧] مەبەست بابەتی سێیەمی ئەم بەرگەیە. شایەنی باسە بەنیازی پتر دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆکی ئەم بابەتە پەنامان بردووەتە بەر گەلێك سەرچاوەی دەگمەنی وەك خودی (حیزبی شیوعی عێراقی) و ژمارەیەك سەرچاوەی دەزگا ئەمنییەکان.

[٥٨] مەبەست دوا بابەتی ئەم بەرهەمەیە کە بەم ناونیشانەوەیە: (هەڵوێستی کورد بەرامبەر شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨) لە سەرەتای بەرپابوونیدا لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا).

د- به نیازی ڕوونکردنەوەی هەمەلایەنیی دەقی ناوەرۆکی بەڵگەنامەکان بە پێویستمان زانی چ لە ناوەرۆك و چ لە پەراوێزدا بە کورتی یان تێروتەسەل بە پێی سروشتی بابەتەکە ڕوونکردنەوە پێشکەشی خوێنەر بکەین و بۆ ئەو مەبەستە گەلێك جار پەیوەندیمان بە زۆر کەسی شارەزا و ئاگادارەوە کردووە بۆ ئەوەی هەڵە نەکەوێتە نێوان ئەو ڕوونکردنەوانەوە و ئەوەیش بووەتە هۆی زۆربوونی ژمارەی پەراوێزەکان، تەنانەت ژمارەی پەراوێزەکانی بابەتی سێیەمی ئەم بەرگە، کە دەربارەی حیزبی شیوعی عیراقییە، گەیشتووەتە ٣٦٩ پەراوێز.

هـ- وەك گەلێك جار و لە گەلێك بۆنەدا گوتوومە و دەیڵێمەوە یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی گشت کارەکانم ئەوەیە کە لە ناخی دەروونمەوە عەودالی هەموو ئەو شتانەم کە لەوانەن ببنە وانەیەکی مێژوویی بە کەڵك و پێویست بۆ نەتەوەی کورد بە گشتی و بۆ ڕابەرانی ئیمڕۆ و دوارۆژی نەتەوەکەمان بە تایبەتی، ئەوەی نموونەی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا کە لەم بەرگی دووەمی کتێبەمدا باسیان کراوە کەم نین.

* * *

بەر لەوەی کۆتایی بەم پێشەکییە بێنم بە پێویستی دەزانم جارێکی دیکەش بە دڵ سوپاسی ئەم بەڕێزانە بکەم - جەنابی مام جەلال تاڵەبانی و دوکتۆر تاهیر بەکاء و دوکتۆر فوئاد مەعصوم و دوکتۆر بەرهەم ساڵح و دوکتۆر ئەمین موتابچی و عەبدوڵڵا زەنگەنە و جەلالی عومەری سام ئاغا و فاروقی مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوول و زرنگی کوڕی و کاکە زۆرکی نەوەی نەقشبەندییەکان و کاکە ئاری نەوەی بەرزنجی و بابان و قەزازەکان کە لە بەڵگەنامەکاندا ناوی باو و باپیرانیان زوو زوو دووپات دەبێتەوە، بەڕاستی یاریدە و پشتگیریی دڵسۆزانە و هەمەجۆری ئەو زاتانە و شەهلای

تایەر حەیدەری هاوسەرم نەبووایە ئەم بەرهەمە لە دایك نەدەبوو، لە وێنەیان هەر زۆر بێت.

بە هەمان دەستوور پێویستە سوپاس و نەوازشێکی بێ پایان پێشکەش بە سەرجەمی کارمەندانی ئەرشیفی نیشتیمانی بکەین کە بۆمان بووبوونە کەسوکاری دڵسۆز، ئەوانەی وەك خاتوو جولی Julie و خاتوو جۆ Jo و خاتوو ئیمێلی وارد Emily Ward و ئیمتیاز ڕەفیع Imtiz Rafi [٥٩] و میخائیل لیتل Mchael Little و خاتوو سارا لی Sarah Lee و خاتوو هێلین پای –سمیث Helen Pye - Smith و خاتوو ڕێبیکا ویتال – ولیەمس ( Rebecca Whittal - Williams و میخائیل برێین Michail Brien) و خاتوو لاکمی غادە Lakmi Gadha [٦٠] و گەلێکی دیکەی وەك ئەوان، کە هەرگیز نە خۆیان و نە هاوکارییەکانیان لە یاد ناکەین.

هەمان کات لەناو ئەو توێژەر و زانایانەدا کە زوو زوو دەهاتنە ئەرشیفی نیشتیمانی بەریتانی ژمارەیەك هاوبیر و هاوکاری نوێمان بۆ دروست بوون کە لە کاتی حەوانەوەدا من و شەهلا باسی کورد و کوردستان و عیراقمان بۆیان دەکرد و ئەوانیش باسی وڵاتی خۆیانیان بۆ دەکردین، یەکێکیان باڵوێزێکی بەناوبانگی ژاپۆن بوو کە گەلێك جار لە ئەرشیف و لە دەرەوەی ئەرشیف پێکرا دادەنیشتین، یەکێکی دیکەشیان مامۆستای زانکۆیەکی کەنەدی بوو، وێڕای ژن و مێردێکی ئێسك سووکی ئوستوراڵی کە هەردووکیان پرۆفیسۆر بوون و تەنانەت شەوی بەر لە گەڕانەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان دانیشتنێکی گەرمیان بۆ من و شەهلا سازکرد، هیوادارین ئەو کوردانەی لەمەودوا بۆ کاری

---

[٥٩] وەك لە لاپەڕە چل و هەشتی بابەتی یەکەمی بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمەدا ئاماژەم پێی داوە ئیمتیاز ڕەفیع بە ڕەگەز موسڵمانێکی پاکستانیی بە ساڵاداچووە و بە پیشە ئەندازیارە و چارەکە سەدەیەك دەبێت کارمەندی (ئەرشیفی بەریتانی)یە و بە دڵ کوردی خۆش دەوێت.

[٦٠] ئەمیشیان موسوڵمانە و ناوی دوکتۆر ئەحمەد ئەمینۆ یوسفە (Ahmed Aminu Yusuf).

زانستی وەك ئەمەی ئێمە ڕوو دەكەنە ئەم جۆرە وڵاتانە شڕ و شیتاڵی كوردەواریی لەگەڵ خۆیاندا بهێنن كە نرخیان لای ئەو جۆرە كەسانە زۆر بەرزە.

لە كۆتاییشدا جارێكی دیكە پەنا دەبەمەوە بەر نەقشەبەردێكی باوكی گەورەی مێژوونووسی كوردی شەرەفخانی بەدلیسی و لە زوبان ئەوی پایە بڵندەوە ئێمەیش دەڵێین: لە زانایانی پیاو چاك و دڵپاك و بەوەج دەپاڕێمەوە زۆر بە وردی لە نووسینەكەم ورد ببنەوە و ئەگەر پەشێوییەكیان بەر چاو كەوت بەشێوەیەكی مەردانە بەراوردی بكەن. خۆ ئەگەر هەڵە و لە بیرچوونێكم لەسەر دەدۆزنەوە هەر بە گاڵتە پێكردن و تیز و تەشەر لێم نەقۆزنەوە، پیاوەتیم لەگەڵ بكەن و بە پارچەیەكی چاكتر و بزگوڕێكی تازەتر و پاكژ بۆم پینە بكەن[٦١].

[٦١] بڕوانە: كەمال مەزهەر، مێژوو، كورتەباسێكی زانستیی مێژوو و كورد و مێژوو، بەغدا، ١٩٨٣، ل٢٦٠.

بابەتی یەکەم:

# هۆزی
# شێخ بزێنی لە ساڵی ١٩١٩دا

**بە پێی ڕاپۆرتێکی**
**وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی**

## سەرەتا


کاپتەن سیتی بێل- گووگل

لە هەمان فایلی ژمارە ٢٤٨ / ١٢٤٦ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا راپۆرتێکی بایەخدار دەربارەی هۆزی شێخ بزێنی هەڵگیراوە کە گەلێك زانیاریی دەگمەن و نەزانراوی تێدایە، کاپتەن سی.ت بێلی یاریدەری ئەفسەری سیاسیی سلێمانی ئەو راپۆرتەی نووسیوە[1]، کە بریتییە لە چوار لاپەڕەی چاپکراوی قەوارە گەورە وئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

### تێبینی دەربارەی هۆزی شێخ بزێنی

١- مێژوو:

شێخ بزێنی هۆزێکی نیشتەجێی هەردووك قەراغی زێی بچووکە، هۆزی ناوبراو دەورووبەری سەد ساڵ لەمەوبەر لە لایەن ئەم دوو برایەوە دامەزرێنراوە: مەلا عەبباس و حاجی هەمزە کە لە زاخۆی نزیك مووسڵەوە هاتوون و تاوەکو ئێستایش ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی لە زاخۆ و هەولێر دەژین، گەلێك جار ئەندامانی ئەم هۆزە دژی تورك یاخی بوون؛ ئەوان لە رووی ئاینییەوە شافیعی سوننە مەزهەبو لە رووی زوبانیشەوە سەر بە کرمانجیی باشوورن.

---

[1]N.A., F.O., 248 / 1246, C.T. Beale, Captain, Assistant Political Officer, Sulaimaniyah, Note on the Shaikh Bizaini Tribe,PP. 1-4.

٢- سنووری مەڵبەندی ئەم هۆزە:

بە پێی نەخشەی هاوپێچ[٢] سنووری ناوچەی شێخ بزێنــی بـەم شـێوازەی لای خوارەوەیە:

لە باکوورەوە - ناوچە قەزای کۆیسنجەق.

لە باشوورەوە - هۆزی شوان.

لە ڕۆژهەڵاتەوە - تەق تەق لە لای ڕاستی زێوە و ڕووباری شیوەسووری Shiwah sur نزيك گوند الغاچ- Gundalghach ی لای چەپی زێوە.

لە ڕۆژ ئاواوە - ئاڵتوون کۆپری و هۆزی ساڵەیی.

٣- هێزی ئەم هۆزە:

هـۆزی شـێخ بزێنــی لــە پــەنجا گونـدی هــەر دووك قــەراغی زێ دەژیـن، بەنیازی بەراورد کردن ئامارە بۆ خەملاندنێکی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان - ك.م. دەکەین:

| ناوەکان | لای چەپ<br>ئێستا | لای چەپ<br>بەر لە جەنگ | لای ڕاست<br>ئێستا | لای ڕاست<br>بەر لە جەنگ |
|---|---|---|---|---|
| ژمارەی گوند | ٣٠ | ٣٥ | ٢٠ | ٢٥ |
| ژمارەی ماڵ | ٢٣٠ | ٦٠٠ | ٢٠٠ | ٤٥٠ |
| ژمارەی پیاوی باڵق | ٣٠٠ | ٧٠٠ | ٢٤٠ | ٥٠٠ |
| ژمارەی ولاغ | ٤٠ | ؟ | ٣٠ | ؟ |
| ژمارەی سەر مەڕ | ٢٠٠٠ | ١٠٠٠٠ | ١٥٠٠ | ٧٠٠٠ |
| ژمارەی سەر مانگا | ٢٠٠ | ١٤٠٠ | ٢٠٠ | ٧٠٠[٣] |

[٢] بەداخەوە نەخشەی ناوبراو لەم فایلەدا هەڵنەگیراوە.

[٣] بێ گومان ئەم جۆرە ئامارە دەگمەنانـە بـە ڕوونـی ئامـاژە بـۆ ئـەو کاولکارییـە دەکـەن کـە زۆربـەی ناوچـەکانی کوردسـتان بـە هـۆی جـەنگی یەکـەمی جیهانـەوە گـیرۆدەی هـاتوون،

کۆی هێزی ئەم هۆزە پەنجا گوند و ٤٣٠ خێزان و ٧٠ سوارە و ٥٠٠ پیادە دەبێ.

٤- باری کارگێڕی:

أ- هۆزی شێخ بزێنی سەرۆکی باڵای نییە، هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی کارگێڕیی هۆزەکە لە لایەن حوکمەتی تورکیاوە.

گوندەکانی ئەم هۆزە لە نێوان موتەصەریفییەتی کەرکوك و سلێمانی و قایمقامییەتی کۆیسنجەقدا دابەش کرابوون. بەو جۆرە گەلێك دابەشبوونی دەسەڵات – ك.م. دروست بوو کە هەر یەکەیان لە سێ چوار گوند پێکهاتووە، هەر چۆن بێ ئەم هۆزە هۆزێکی هێمن و گوێڕایەڵە و پەیڕەوی نەریت و پێوەندیی هۆزایەتی[٤] دەکات و کۆی سەرەك هۆزە بچووکەکان دژی دانانی سەرکردە (سەرۆکی باڵا– ك.م.) نین.

ب- هەرچی گوندەکانی لای چەپی زێ فارس ئاغای سەرچناریان وەك سەرکردە دەوێ، فارس ئاغا کوڕی ڕەشید ئاغای سەرۆکی پێشووی هۆزەکەیە.

گوندەکانی لای ڕاستی زێش مەحموود ئاغای سەردك – Sardik یان وەك سەرۆك لا پەسندە، مەحموود ئاغای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حاجی هەمزەیە کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی هۆزەکە (بڕوانە بەشی کەسایەتییەکان) [٥].

---

هەڵبەت ئەگەر ئەم جۆرە زانیارییانە لەبەر دەست خاوەنی کتێبی (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا) بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٥، بە عەرەبی، وەرگێڕانی محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا ١٩٧٧ و ١٩٨٤، بە ئینگلیزی، وەرگێڕانی عەلی ماهیر ئیبراهیم، لەندەن، ١٩٩٤ دەبوو ئەو بەرهەمەی زەنگینتر دەبوو.

[٤] لێرەدا نووسەری ڕاپۆرتەکە زاراوی esprit de corps فەرەنسی بەکار هێناوە کە بە واتای (العصبية القبلية) دێت.

[٥] واتا برگەی پێنجەم لە دامێنی هەمان لاپەڕەدا.

ئەو دووانە هەردووکیان بۆ ئەو شوێنە دەست دەدەن، پێشموایە شێخ مەحموود پشتیان دەگرێت. بە پێی بۆچوونی من دانانی سەرۆکێکی بایەخدار کارێکی باش نییە[٦]، زێی بچووك (کە تەنها لای ساردك و تەق تەق دەتوانرێ ببڕێ) سنوورێکی کاریگەر پێکدەهێنێ و کۆسپیشە لەبەردەم دروستبوونی پێوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان هەر دوو بەشەکەدا.

ج- بە هۆی پەرەسەندنی بایەخی گوندی تەقتەقەوە لەوانەیە دەسەلآتی کارگێڕیی ڕاستەوخۆی ئەو گوندە کارێکی پێویست بێ، لەو حاڵەتەشدا گوندەکانی تاڵەبان (کە دوو گوندن) و گەرمەکیش لە یەکبوونی هۆزایەتی دوور بخرێنەوە، ئێستا ئەم گوندانە لەگەڵ تەق تەقدا بەشێکی بچووك بە سەرۆکایەتی کوێخا ڕەشید پێکدەهێنن و کە گەیشتمە کۆیسنجەق ڕاپۆرتێکی دیکەتان دەربارەی تەق تەق بۆ دەنێرم.

د- دەتوانرێ گوندەکانی لای ڕاستی زێ لە ڕووی کارگێڕییەوە بخرێتە ژێر دەستی یاریدەری ئەفسەری سیاسی کۆیسنجەقەوە، پێویستە گوندەکانی لای چەپی زێش لە ڕووی کارگێڕییەوە لە سلێمانییەوە ببرێن بەڕێوە.

بازرگانی گوندەکانی لای ڕاستی زێ لەگەڵ کۆیەدایە و دەتوانرێ بە ئاسانی بگەنەوە ئەو شارە.

وەك لە برگەی (ب) دا ڕوون کراوەتەوە هیچ کۆسپێك بە هۆی ئەم دابەشکردنی دەسەلآتەوە نایەتە ئاراوە.

٥- کەسایەتییەکان:

کەسایەتی دیاری هۆزی شێخ بزێنی ئەمانەن:

---

[٦] هەڵبەت ئینگلیز سەرەك هۆزێکیان دەویست ئامادە بێت ببێتە بووکەسەماکەرەی دەستیان.

مـــەحموود ئاغـــای ســـەردك، تەمـــەنی حـــەفتا ســـاڵە، پیرەمێردێکـــی چاونەترسی خۆشمەشرەب و بەخشـندەیە، دەتـوانێ کاربەدەسـت (ڕەهبــەر) بێ.

فارس ئاغای سەرچنار، تەمەنی سی ساڵە، کەسێکی ئەسڵزادە و پێزانە، کوڕی ڕەشید ئاغای ڕەهبەری پێشووی هۆزەکەیە.

تۆفیق ئاغای قەسرۆك، تەمەنی چل و پێنج سـاڵە، مـامی فـارس ئاغایـە، ڕووخۆشێکی تەڵەکەبازە و بەرپرسی کوشتنی گەلێك کەسە.

فارس ئاغای پەلکانە[٧].

مەحموود ئاغای کوڕی یووسف ئاغا [٨].

هاوپێچی[٩]درەختی بنەماڵەی سەرەك هۆزەکان کـە ئامـاژە بـە ئەندامـە زیندووەکانیشیان دەکات:

---

[٧] لە بەڵگەنامەکەدا هیچی دەربارە نەنووسراوە.

[٨] مەحموود ئاغایش بە هەمان دەستوور لە بەڵگەنامەکەدا هیچی دەربارە نەنووسراوە.

[9] N.A., F.O., 248 / 1246, C.T. Beale, Captain, Assistant Political Officer, Sulaimaniyah, Note on the Shaikh Bizaini Tribe, P.1.




---

[10] لە ڕاپۆرتەکەی کاپتەن بێڵدا چۆن هاتووە دەقاو دەق وەک خۆی نەقڵمان کردووە.

٦- دووبەرەکیی هۆزایەتی:

من چارەسەری دووبەرەکیی هۆزایەتی نێوان مەحموود ئاغای کوڕی یووسف ئاغای سەدریك و فارس ئاغای سەرچنارم کردووە.

مەحموود ئاغای سەدریك لە کاتی کەوتنی کەرکووکدا[11] دوو گوندی لای چەپی زێی زەوت کرد و شەش کەسی کوشت، مەحموود ئاغا قایل بوو یەکێك لە گوندەکان بگێڕێتەوە و سەد و دە لیرەیش بداتە کەسوکاری کوژراوەکان.

بە پێی نەریتی هۆزایەتی هەر گوندنشینێك لە کاتی دووبەرەکایەتیی هۆزایەتیدا بکوژرێ پێویستە هەزار قرانی ئێرانی و کچێك شیربایی بدەن، خۆ ئەگەر هاتوو یەکێك لە بنەماڵەی شێخ کوژرا ئەوساکە دەبێ فەسڵی نێوانیان گوندێکی ئاوەدان و ئافرەتێکی تێدا بێ، یا ئەگەر هاتوو میراتگرەکان ویستیان لەبریتی ئەوە دوو سەد تا سێ سەد لیرەیان پێ بدرێ، ژیانی گوندنشینێکی پیاویش بە پێنج سەد قرانی ئێرانی دەژمێردرا، ولاغێکیش بە سی تا پەنجا لیرە بە پێی نرخی ڕۆژ.

کچی فارس ئاغای کوڕی مەحموود کە لە بنەماڵەی ئاغاوات بوو چەند ساڵێك لەمەوبەر بە سودفە کوژرا، خوێنبایی سێ سەد و پەنجا لیرە و کیژێك بوو.

٧- لیڤیی هۆزەکە:

پێشنیازەکانی مێجەر نۆئێل دەربارەی لیڤی لە ناو هۆزە (کوردەکاندا — ك.م.) بە ڕێکوپێکی بۆ ئاغایانی شێخ بزێنی ڕوون کراوەتەوە، ئەوان ئەو بیرۆکەیان لا پەسند بوو، بە وێنە بە پێی قسەی[12] فارس ئاغای سەرچنار تەنها شەست کەس لە نێو گوندەکانی لای چەپی (زێ_ ك.م.) دەتوانرێ کۆ بکرێتەوە، هەرچی مەحموود ئاغایە گوتی ئەو دەتوانێ لە گوندەکانی لای

(11) مەبەستی یەکەم داگیرکردنی شاری کەرکوکە لە لایەن هێزە چەکدارە بەریتانییەکانەوە لە ڕۆژی حەوتی مایسی ساڵی ١٩١٨دا.

(12) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لەبریتی فارس ئاغا بە هەڵە فاتیس (Fatis) ئاغا چاپ کراوە.

ڕاستی (زێ_ ك.م.)دا پتر له سه‌د كه‌س له نێو گونده‌كانی لای ڕاستی (زێ_ ك.م.)دا كۆ بكاته‌وه.

من پێم وایه به ئاسانی له هه‌ر دووك به‌ری زێ ده‌توانرێ دوو سه‌د پیاو كۆ بكرێته‌وه.

٨- سه‌رژمێریی گوند:

تێبینی - دوورودرێژ ده‌رباره‌ی هێز و پێكهاته‌ی گونده هه‌ره بایه‌خداره‌كانی ئه‌م هۆزه نیشان دراوه، هه‌روه‌ها نه‌خشه‌یه‌كی گشتیی شوێنی گونده‌كانیش كه ژماره‌كه‌ی (ئای. د. ده‌بل یو. و ١٥٢٢)ه پێشكه‌ش كراوه و تێیدا ژماره‌یه‌ك هه‌ڵه‌یش ده‌رباره‌ی شوێنی گونده‌كان ڕاستكراونه‌ته‌وه[١٣].

---

(١٣) وه‌ك له په‌راوێزی ژماره دوودا ئاماژه‌مان بۆی كردووه به داخه‌وه ئه‌و نه‌خشه‌یه وه‌ك هاوپێچ له ناو ئه‌و فایله‌دا هه‌ڵنه‌گیراوه.

## گوندەکانی شێخ بزێنی (لای چەپی زێ)

گونداڵغاچ– گوندی هەمزە ئاغای کوڕی مستەفایە کە خوارزای فارس ئاغای سەرچنارە. هەمزە ئاغا پەنجا ساڵان دەبێ و بێ گومان پیاوێکی سەربەخۆیە، ئەو هەمان کات گوندی کانی هەنجیریشی هەیە کە گوندێکی بچووکە و چوار میل کەوتۆتە ئەولای ڕۆژهەلآتی گونداڵغاچەوە. کانی هەنجیر ئێستا بریتییە لە چواردە ماڵ و چل جووت لە کاتێکدا بەر لە جەنگ بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و چوار جووت، گشت زەویوزاری دێکەش دێمە و ئیمساڵ ناوچەیەکی فراوانی لێ ڕوێنراوە و چل و حەوت ڕبەی سلێمانی لێ وەشێنراوە.

بە پێی قسەکانی هەمزە لە ساڵی هاتدا بەروبوومی ناوچەکە پێنج بە یەکە، بەلآم من بۆخۆم لە ئاگادارانم بیستووە کە پازدە بە یەکە[١٤]. ژمارەی مەڕو ماڵاتی ئەو گوندە سەد و پەنجا سەر دەبێ، بەر لە جەنگ ئەو ژمارەیە خۆی دەدا لە هەزار تاوەکو هەزار و پێنج سەد سەر.

هەمزە ئاغای فارس ئاغا سەرچنار بە سەرەك هۆز دەزانێ.

سەرچنار– خاوەنی ئەم گوندە فارس ئاغای کوڕی ڕەشیدە کە پیاوێکی لێهاتووی بە توانای سی (٣٠) ساڵەیە، باوکی سەرەك هۆزی گوندەکانی لای چەپی زێ بوو، فارس ئاغا خاوەنی دەوروبەری بیست گوندی لای چەپی زێیە کە لە هەموویان گرنگتر ئەمانەن: قەسرۆك و گردخەبەر و قامیشە (کە ئێستا کاولە) و گونداڵغاچ و توتکەڵ (Tutkal) و چۆخ لیجە (Chukh Lija) و جێلە مۆرد (Jela Mord) و شێخان و مامە لەیسی (Mama Laisis) و ئاسکونە دەرەبەگی (Askuna Darbegi) و کانی هەنجیر و سەرچنار و هەر گوندەی بریتییە لە پازدە ماڵ و پێنج جووت، بەرانبەر حەفتا ماڵ و بیست جووت بەر

---

[١٤] دیارە هەمزە ئاغا ژمارەیەکی کەمتری داوە بۆ ئەوەی باجی کەمتر بداتە میری، ئەوەیش دیاردەیەکی باوی ڕۆژگاری خۆی بوو.

له جەنگ، بە پێی قسەی فارس ئاغا ساڵی ڕابردوو پێنج سەد مانگایەکی ئەم گوندانە بە نەخۆشی مرداربوون.

لەم ناوچەیەدا ئیمساڵ چل و حەوت ڕبەی سلێمانی تۆو وەشێنراوە کە لە ساڵی پار کەمترە، لە ساڵی هاتدا بەروبوومی دەغڵودانی ئەم ناوچەیە پازدە بە یەکە[١٥].

کەرەناو (یاقەرەناو Karanao) – ئەم گوندە لە بیست ماڵ پێکهاتووە و هی جەمیل ئاغای برای مەحموود ئاغای کوڕی یووسفە.

یووسف ئاغا دە کوڕی هەبوو کە حەوتیان تاکو ئێستا (واتا ساڵی ١٩١٩– ک.م.) ماون. یووسف ئاغا بەم جۆرەی لای خوارەوە ماڵ و موڵکی بەسەر کوڕەکانیدا دابەش کردووە:

| | |
|---|---|
| جەمیل نەجیب | گوندی کەرەناو و کەپاناك ( Kapanak) |
| سەعید | گوندی جێگیلە ( Jegila) |
| حەسەن | گوندی سەمەکە (Samaka) |
| مەحموود ئیسماعیل | گوندی مەرزیخە (Marzikha) |
| فارس | گوندی زوڕناسوور (Zornasur) کە ئێستا داڕووخاوە[١٦]. |

چۆغ لیجە – دە ماڵە نزیك قەسرۆکە، شەریف ئاغای مامی فارس ئاغای سەرچنار خاوەنی ئەم گوندەیە.

کەلکانا (kalkana) بیست ماڵەو هی فارس ئاغای کوڕی محەمەدە.

زوڕنا سوور – ئێستا داڕووخاوە، جاران هی فارس ئاغای کوڕی یووسف بوو کە ئێستا لەگەڵ مامیدا لە گوندالغاچ دەژی.

---

(15) N.A., F.O., 248 / 1246, C.T. Beale, Captain, Assistant Political Officer, Sulaimaniyah, Note on the Shaikh Bizaini Tribe, P.2.

(١٦) تکا لە دانیشتوانی ناوچەی شێخ بزێنی دەکەم گشت ئەو هەڵانەم بۆ ڕاست بکەنەوە کە لەوانەیە دەربارەی ناوی کەسایەتی و گوند و شوێنەکانی دیکەی ناوچەکەیان تێی کەوتبم.

شاوگیر (شەوگێڕ) (Shaogir) دەماڵە، هی محەمەد ئاغای کوڕی یووسف ئاغایە.

تولکی (Tulki) بیست ماڵە، هی کوێخا تۆفیقە.

توتەقاڵ (Tuta kal) پێنج ماڵە، یەك دەر چواری میلێك لەولای سەرچنارەوەیە، هی فارس ئاغای سەرچنارە.

جێلە مۆرد – دە ماڵە، سێ میل لە خوارووی سەرچنارەوەیە، هی فارس ئاغای سەرچنارە.

گرد خەبەر – ئەم گوندە لە سێ ماڵ و یەك جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە سی ماڵ دە جووت، شەریف ئاغا خاوەنی ئەم گوندەیە کە جاران گەلێك ئاوەدان بووە.

قەسرۆك – لە دە ماڵ و شەش جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە پەنجا ماڵ و پازدە جووت، هی تۆفیق ئاغای مامی فارس ئاغای سەرچنارە، چل و حەوت ڕبەی سلێمانی تۆوی تێ دەوەشێنرا، بەلام پار هیچی تێدا نەڕوێنرا چونکە لە لایەن حوکمەتی تورکیاوە لەسەر ئەوە سووتێنرا کە خەڵکەکەی قایل نەبوون باجی بدەنێ. لەم گوندەدا دوو سەد سەر مەڕ و بیست سەر مانگا هەیە، بەر لە جەنگ قەسرۆك خاوەنی هەزار سەر مەڕ بوو.

قامیشە– ئەم گوندە کاول کراوە، دەڵێن هی تۆفیق ئاغایە، ناوبراو دەڵێ فەقێ ئەمین قامیشەی سووتاندووە لە کاتی بەرپابوونی کوشتاری نێوان هۆزەکانی ناوچەکەدا دوای کشانەوەی بەریتانییەکان لە کەرکوک [(١٧)].

کانی هەنجیر – سەرۆکی ئەم گوندە کوێخا مستەفای کوڕی هەمزە ئاغای گوندالغاچە، کانی هەنجیر ئێستا بریتییە لە سێ ماڵ و دوو جووت، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە بیست ماڵ و چل جووت.

---

(١٧) دوای یەکەم داگیرکردنی کەرکوك و دەوروبەری لە لایەن بەریتانییەکانەوە لە ڕۆژی حەوتی مایسی ساڵی ١٩١٨دا ناچار بوون لەژێر فشاری عوسمانییەکاندا ڕۆژی بیست و چواری نیسانی هەمان ساڵ بکشێنەوە و تاوەکو ڕۆژی بیست و شەشی مانگی ئابی هەر ئەو ساڵە نەیانتوانی بە یەکجارەکی عوسمانییەکان لە کەرکوك و دەوروبەری وەدەرنێن.

حەمدوون – ئەم گوندە لە بیست ماڵ و شەش جووت پێکهاتووە، تۆفیق ئاغای قەسرۆك ئیدیعای خاوەنییەتی ئەم گوندە دەکات و دەڵێت بەر لە سیازدە ساڵ دوو دەر سێی حەمدوونی بە شەست لیرە کڕیوە، ئەوسا نرخی ماینێك پەنجا لیرە و تفەنگێکی مارکە مارتین بیست لیرە و دەمانچەیەك پێنج لیرە بوو، هەرچی یەك دەر سێی ئەم گوندەیە ئێستایش وەك جاران هی گوندنشینەکانە، تۆفیق ئاغا دانووی لەگەڵ کاربەدەستانی تورکدا لە کەرکووك نەدەکولاَ و کاتی خۆی عەبدولڕەحمان (کوڕی تۆفیق ئاغا– ك.م.) داوای لە قاسم پاشای موتەسەڕیفی کەرکووك کردووە ئەو گوندەی بۆ بگێڕێتەوە کە لێی دەربەدەر کرا دوای ئەوەی پێنج ساڵ بەسەر خاوەنییەتی ئەودا تێپەڕی.

لەو کاتەدا کە تۆفیق ئاغای قەسرۆك دوو دەر سێی حەمدوونی کڕیوە، گوندەکە لە سی تا چل ماڵ پێکهاتبوو، بەرهەمی ساڵانەیشی خۆی دەدا لە سێ تا سەد تەغاری کەرکووکی. عەبدولڕەحمان دوو ساڵ لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد و ئێستاکە تۆفیقی کوڕی لەو گوندە دەژی، ئێستاش وا دەزگا بەرپرسەکان بە بەڵگەنامەکانی تاپۆی حەمدووندا دەچنەوە.

قەرە سەلیم – سی تا چل ماڵ دەبێ، سەرۆکی ئەم گوندە حەمەد ئاغای کوڕی قادر ئاغایە.

مەرزیخاە (Marzikhah) دوو گوند بەم ناوەوە هەیە و هەموویشی بە سەر یەکەوە نیو میل لە یەکدییەوە دوورن، ناوی یەکێکیان مەرزیخاهی گەورەیە و ناوی ئەوی دیکەشیان مەرزیخاهی بچووکە، یەکەمیان لە شازدە ماڵ پێکهاتووە و هی مەحموود ئاغای کوڕی یووسفە کە سەرۆکی گوندەکەیە، بەلاَم گوندنشینەکانیش بەشیان هەیە. هەرچی مەرزیخاهی بچووکە لە پازدە ماڵ پێکهاتووە و هی کەریم ئاغا و دانیشتووانی دێکەیە و حەوت جووت و دوو سەد سەر مەڕی تێدایە.

## گوندەكانی شێخ بزێنی (لای ڕاستی زێ)

تەق تەق – ئەم گوندە لە پازدە ماڵ و سێ جووت پێكهاتووە، بەر لە جەنگ لە پەنجا ماڵ و دە جووت پێكهاتبوو، ئێستا گوندنشینەكانی تەق تەق سەد سەر مەڕ و پازدە مانگایان هەیە، بەر لە جەنگ پێنج سەد سەر مەڕ و سەد سەر مانگایان هەبوو، كوێخا ڕەشید و خزمەكانی خاوەنی تەق تەقن.

تەق تەق سەرەتای قەیاغی هاتوچۆی ناو زێی بچووك پێكدەهێنێ، لە كۆیسنجەقەوە بە كەڵەك توتن و خوری و گەنم و جۆ و كەلوپەلی دیكە دەهێنرێتە تەق تەق و لێرەوە هەر بە كەڵەك دەنێردرێن بۆ بەغدا و تكریت و شوێنی دیكە و زێش ساڵ دوازدەی مانگ بۆ هاتوچۆی كەڵەك كراوەیە. بەر لەجەنگ لە نێوان بەغدا و تەق تەقدا بیست كەڵەك بەردەوام لە هاتوچۆدا بوون. گوندنشینەكانی ئەم ناوچەیە ئێستا چالاكانە خەریكی دروستكردنی كەڵەكی نوێن و بەم زووانە جووتێك لەو كەڵەكە نوێیانە بە بارە توتنەوە لە كۆیسنجەقەوە بەرەو بەغدا دەكەونە ڕێ. هەر كەڵەكێك چوار سەد و پەنجا ڕبەی سلێمانی هەڵدەگرێ، كە دەكاتە دەوروبەری دوازدە تۆن. بەر لە جەنگ نرخی گواستنەوە بۆ باری هەر ئێسترێك (واتا بۆ هەر دوو سەد و پەنجا كیلۆ) نیو لیرە بوو، بەڵام ئەوە هێشتا دەستنیشان نەكراوە چونكە تازە بە تازە بزووتنەوەی بازرگانی دەژێتەوە، لە تەق تەق چوونە بەغدایش بە كەڵەك حەوت تاوەكو هەشت ڕۆژ دەخایەنێ و دوای گەیشتن كەڵەكەكان هەڵدەوەشێنرێنەوە و دارەكانیان هەر لەوێ دەفرۆشرێن و پێستەكانیش بە ئێستر دەهێننەوە تەقتەق، دروستكردنی هەر كەڵەكێكیش نزیكەی هەزار ڕوپێی[18] تێدەچێ.

وا چاوەڕوان دەكرێ تەق تەق لەمەودوا جۆرە بایەخێكی ببێ، وا پێدەچێ ببێتە مەڵبەندێكی لەبار بۆ دامەزراندنی دایەرەی باج و كۆنترۆڵ،

---

(۱۸) ڕوپێ پارەیەكی هندییە، ئینگلیزەكان هێنایانە عیراقەوە و تاوەكو ساڵی ۱۹۳۱ بەكار دەهێنرا، هەر ڕوپێیەك بەرامبەر حەفتاو پێنج فلس بوو، لەك ڕوپێش هەبوو كە بریتی بوو لە سەد هەزار ڕوپێ.

وێڕای عەماری هەڵگرتنی شتومەك.

سەرتو قەلاّ – جاران گوندێکی سەرەکیی هۆزایەتی شێخ بزێنی بوو، ئێستا وا نەماوە، سەرۆکی ئەم گوندە کوێخا سەعیدی والییە کە لە ناو دێکەدا موڵکی هەیە، بەلاّم زۆربەی موڵکەکان هی گوندنشینەکانن. سەرتو قەلاّ ئێستا لە حەوت ماڵ و چوار جووت پێکهاتووە، بەلاّم بەر لە جەنگ بریتی بوو لە پەنجا تا شەست ماڵ و بیست جووت، ئێستا لە سەرتو قەلاّ سەد سەر مەڕ و دە سەر مانگا هەیە و خەڵکەکەی ئیمساڵ شەست ڕبەی سلێمانی تۆویان وەشاندووە، بەلاّم پار لەبەر ئەوەی گوندەکەیان کاول کرابوو هیچیان نەوەشاند(١٩).

سەیگرداغ (Saigirdagh) سەرۆکی ئەم گوندە محەمەد ئەمینی کوڕی حاجی قادرە کە موڵکیشی لە ناو دێکەدا هەیە، بەلاّم دانیشتووانی دێکە بۆ خۆیان خاوەنی بەشی زۆری موڵکی سەیگرداغن کە لە چل و پێنج ماڵ و حەڤدە جووت پێکهاتووە، بەلاّم بەر لە جەنگ ئەم گوندە لە سەد و بیست ماڵ و بیست و سێ جووت پێکهاتبوو، لەم گوندەدا چوار سەد سەر مەڕ و چل سەر مانگا هەیە و کشتوکاڵیشی دێمە و ئیمساڵ خەڵکەکەی گەلێك لە پار زۆرتر تۆویان وەشاندووە، ئیمساڵ سەد و پەنجا ڕبەی سلێمانی تۆویان وەشاندووە، واش چاوەڕوان دەکرێ بەروبوومی ئیمساڵ باش بێ و بگاتە پێنج بەیەك چونکە زەویوزاری سەیگرداغ زۆر بەپیت نییە.

محەمەد ئەمین دەیەوێ ببێتە سەرۆکێکی سەربەخۆ و دەڵێ دانیشتووانی سەی کانی و عەومە گومەت (Auma Gumat) و سەمەکە و میرکە وەك سەرۆك هەڵیانبژاردووە، ناوبراو مەحموود ئاغای سەردیکی وەك سەرۆکی (بالاّی _ ك.م.) هۆز لا پەسندترە وەك لەوەی وەك ناوچەیەکی بێ هۆز لە لایەن کۆیسنجەقەوە ببرێ بەڕێوە.

---

(19) N.A., F.O., 248 / 1246, C.T. Beale, Captain, Assistant Political Officer, Sulaimaniyah, Note on the Shaikh Bizaini Tribe, P.3.

سەیکانی – بەر لە چەند مانگێک کوێخای سەیکانی لە هەرایەکی دانیشتووانی گوندەکەدا کوژرا، دانیشتووانی سەیکانی چوونە کۆیسنجەق بۆ چارەسەری کێشەی دانانی کوێخایەکی نوێ بۆ گوندەکەیان. سەیکانی لە سی ٣٠ ماڵ و چوار جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و نۆ جووت. ژمارەیەك لە دانیشتووانی ئەم گوندە کە لەگەڵ کوێخادا ناکۆك بوون ماڵی نوێیان لە دووری چارەکە میلێك لە سەیکانییەوە دروست کرد و بەو جۆرە بەناوی گورگەوە دروست بوو.

شەیتانییە (Shaitania) ئەم گوندە هی مەحموود ئاغای سەدریکە، لە دە ماڵ و دوو جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە بیست ماڵ و هەشت جووت.

عەومەل (Aumal) گوندی عەبدوڵڵا ئاغای کۆیسنجەقە، لە بیست ماڵ و شەش جووت پێکهاتووە.

ئۆمەر گومبەت (Auma Gumat) گەورە پیاوی ئەم گوندە محەمەدی کوڕی حاجی قادرە، براکەی کوێخای سەیگردکانە (Saigirdkan)ە، عەومە گومەت لە بیست ماڵ و یازدە جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و بیست و دوو جووت.

سەردیك_ گوندی مەحموود ئاغایە و لە دە ماڵ و حەوت جووت پێکهاتووە، بەر لە جەنگ بریتی بوو لە سی (٣٠) ماڵ و دە جووت، لەم گوندەدا چوار سەد سەر مەڕ هەیە و خەڵکەکەی ئیمساڵ نەوەت ڕبەی سلێمانی تۆویان وەشاندووە، دەڵێن لە ساڵی هاتدا بەروبووم یەك بە پێنج تا حەوتە و نرخی بەرخێکی قەڵەو دوو لیرەیە، وەك گوتمان سەردیك هی مەحموود ئاغایە کە سەنەدی تاپۆی بە دەستەوەیە، بۆیەکا خەڵکی دێکە خاوەنی هیچ نین.

**کاپتەن سی.ت.بیل**
**یاریدەری ئەفسەری سیاسیی سلێمانی** [٢٠].

---

[20] Ibid, P.4.

### کورتە ڕوونکردنەوەیەکی پێویست:

وا دیارە خۆشبوونی ئاگری جەنگی سارد[1] بۆتە هۆیەکی کاریگەری بزواندنی پرسی کورد بە گشتی لە سەر ئاستی پێوەندییە نێو دەوڵەتییە ئاڵۆزەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی دا، بەو پێیەش ئەو پرسە پتر لە جاران سەرنجی دیپلۆماسییە زلهێزەکانی ڕاکێشاوە و هەمان کات سایۆنیزم لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە بووەتە هێزێکی بزوێنی نوێی دیاردەکانی جەنگی سارد تایبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەوەی پێموایە بە ڕوونی لە بەڵگەنامەکانی ناو فایلی ژمارە ٣٧١ / ٦٨٤٣٨ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی[2]دا هەستی پێدەکەین و بەم جۆرەی لای خوارەوە.

## هەواڵی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی
## لە یەریڤانی پایتەختی ئەرمینیا

فایلی ناوبراو بریتییە لە بیست لاپەڕە کە گشتیان تەرخان کراون بۆ بابەتی دەنگوباوی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی لە یەریڤان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٨دا. سەرچاوەی ئەو دەنگوباوە هەواڵێك بووە کە ئێزگەی دەنگی ئیسرائیل ڕۆژی سێی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ پەخشی کردووە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەرۆکی لاپەڕەی یەکەمی ئەو فایلەیە:

دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردیی ئازاد لە یەریڤان بە نیازی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردیی سەربەخۆ لە ژێر سایەی سۆڤیەتدا.

---

[1] دەربارەی جەنگی سارد بڕوانە پەراوێزی ژمارە حەفتا و هەشتی بابەتی هەشتەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە، ل ٣٨٥.

[2] N.A., F.O.,371 / 68438, Eastern 1948, General, File No.14575.

ڕاپۆرتێـک کـە ڕۆژی سـێی تەشـرینی دووەم لـە ئێزگـەی (دەنگی ئیسرائیل)ەوە وەرگیراوە:

سـێ کـەس لـە کارمەنـدانی وەزارەتـی هەنـدەرانی حوکمـەتی بەریتانی تێبینی خۆیانیان لە سەر ئەو ڕاپۆرتـە نووسیوە، یەکـەمیان ڕۆژی هـەژدە و دووەمیـان ڕۆژی نۆزدە و سێیەمیان ڕۆژی بیستی تەشرینی دووەم و بە کورتی تێبینییـەکانی خۆیانیـان نووسـیوە و ئیمزایـان کـردووە، بـەڵام بـێ ئـەوەی نـاوی خۆیـان بنووسن، تـەنها یەکـەمیان بـەم جۆرەی لای خـوارەوە ئامـاژەی بۆ بایـەخی بابەتەکە کردووە:



لۆگۆی دەنگی ئیسرائیل لە سەرەتای دامەزرانییەوە تاوەکو ئێستاکە

پێشنیاز دەکەم وێنەی ئەم نامەیە بنێردرێ بۆ مۆسکۆ چونکە دەربارەی ڕووداوەکانی [3] یەکیەتی سۆڤیەتە [4].

دووەم بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل پتر تیشك دەخاتە سەر ئـەم بابەتـە، ئەمەی خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەرەو (دامەزراندنی _ ك.م.) کۆمارێکی کوردی.

---

[3] شایانی باسە وشەی ڕووداوەکان "events" لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە خراوەتـە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

[4] وا دیارە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەنـدەرانی حوکمـەتی بـەریتانی ئـەم پێشنیازەی بـە لاوە پەسند بووە بۆیەکا نامەیەکی تایبەتی ناردووە بۆ باڵوێزخانەی بـەریتانی لـە مۆسـکۆ و ئەوەیش دەبێتە هۆی کردنەوەی فـایلێکی سـەربەخۆی دیکـە دەربارەی هـەمان بابـەت وەك دوایی بە درێژی باسی دەکەین. بڕوانە:

N.A., F.O.,371/68438, Eastern 1948, General, File No.14575, Eastern Department, No.E14575/ 65, Minute Mr. Watson, 12th November, 1948.

ئیزگەی دەنگی ئیسرائیل ڕۆژی سێی تەشرینی دووەمی ١٩٤٨ سەعات پێنجی ئێواریێ بە زوبانی عەرەبی و لەسەر زاری سەرچاوە عەرەبییەکانەوە ڕایگەیاند کە لە یەریڤانی پایتەختی کۆماری ئەرمینیای ڕووسیا حوکمەتێکی کوردیی ئازاد دامەزرێنراوە بە نیازی دامەزراندنی کۆمارێکی سەربەخۆی کوردی لە ژێر سایەی سۆڤیەتدا کە نیاز وایە ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران و ڕۆژهەلاتی تورکیا و باکووری عیراق بگرێتەوە، ڕاپۆرتەکە دەشلێ ئەم حوکمەتە نوێیە بڕیارە لە شێوازی یەکیەتییەکی سەربازیدا بێ و مەلا مستەفای بارزانیشی تێدا بەشداربێ کە ماوەیەك لەمەوبەر ڕەهبەری شۆڕشێك بوو لەعیراق (٥). ژمارەی ئەندامانی هۆزی بارزان دە هەزار کەس دەبن، زۆربەیان جەنگاوەرن و لەم دواییانەدا زۆر ئازایانە دژی هێزەکانی سوپای عیراق جەنگین و سێ سەد سەربازیان لێ کوشتن، دوای ئەوەی هاتیشنە نزیك سنووری ئێران، حوکمەتی ئێران ڕازی نەبوو پەنایان بدات، بۆیەکا ناچار بوون بچنە شارێکی نزیك ئێران (٦) و تاوەکو ئیمڕۆکەش هەر لەوێن(٧).

دوا بەدوای ئەوە بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی یەکسەر ناوەرۆکی ئەو ڕاپۆرتەی سەرەوە دەکاتە نامەیەك و

---

(٥) لە دەقی بەلگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

"... and included mulla Mustafa Barzani, who was at one time head of the revolution in Iraq" .

هەلبەت بەکارهێنانی وشەی شۆڕش سەرنج ڕادەکێشێ چونکە، بە داخەوە، سەرجەمی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی کورد لەو جۆرە بەلگەنامانەدا بە یاخیبوون وەسف دەکرێن.

(٦) لە دەقی بەلگەنامەکەدا بەو جۆرە ئەو ڕستەیە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانەوە:

"When Approached Iran, The Government refused them refuge and they were thus compelled to go to "a town near Iran", where they are still to be found".

کە دیارە مەبەستییە بلێ پەنایان بردە بەر شارێك لە ناو خاکی یەکیەتی سۆڤیەتدا.

(7) N.A., F.O.,371/68438, Eastern 1948, File No.14575, Middle East, Towards a Kurdish Republic.

دەینێرێتە باڵیۆزخانەکانی حوکمەتی بەریتانی لە هەریەك لە تاران و بەغدا و ئەنقەرە، وێڕای مفەوەزییەتی حوکمەتی بەریتانی لە دیمەشق کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی سەرەتاکەیەتی:

وەزارەتی هەندەران:

سی دەبل یو.١،

ژمارە إی ١٤٦٥٨/١٤٥٧٥/٦٥٠

باڵوێزی خۆشەویست.

ئایا دەتوانن هیچ تیشکێك بخەنە سەر ئەم ڕاپۆرتە ئێزگەییە دەربارەی دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردیی ئازاد؟.

دوای ئەوە، وەك گوتمان دەقی ناوەرۆکی بەڵگەنامەکەی پێشوو دەربارەی هەواڵەکەی ئێزگەی دەنگی ئیسرائیل وەك خۆی دەنووسێتەوە(٨).

ئەمیر کامەران عالی بەدرخان ئەم هەواڵە یەکسەر دەقۆزێتەوە و ڕۆژی بیست و نۆی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ بە ناوی (وەفدی کورد لە پاریس)ەوە یادداشتێکی چڕوپڕ بە زوبانی فەڕەنسی دەربارەی (مافی چارەنووسیی نەتەوەی کورد) دەداتە سێر ئێرنست بێڤنی(٩) وەزیری هەندەرانی بەریتانی و سەرۆکی وەفدی حوکمەتەکەی لە ڕێکخراوی نەتەوە

---

(8) Ibid, Foreign Office, S.W.1. 15th November, 1948. No.E 14658/14575/65, from: Eastern Department, To: The Chencery, British Embassy, Tahran, The Chencery, British Embassy,Angora, The Chencery, British Legation, Damascus.

(٩) دەربارەی پوختەی ژیانی سێر ئێرنست بێڤن بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٨٦ی بابەتی «دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی لە ساڵی ١٩٤٩و ساڵی ١٩٥١ لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بۆ کوردستان لە دوو فایلی نهێنیی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا».



ئێرنست بێڤن

یەکگرتووەکان کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی[١٠].

پاریس،

٢٩ی تەشرینی دووەمی ١٩٤٨،

لە وەفدی کوردەوە،

شەقامی دوبروس،

پاریس،

تەلەفۆن: کلێبێر ٢٨/٩٧،

بۆ جەنابی بەڕێز و زۆر شکۆمەند ئێرنست بێڤنی

وەزیری کاروباری هەندەران و سەرۆکی وەفدی بەریتانی لە نەتەوە یەکگرتووەکان،

پاریس.

ڕێزدار جەنابی وەزیر.

وەفدی کوردی شەرەفی ئەوەی هەیە کۆپیی یادداشتنامەیەکتان بخاتە بەردەست کە هەر ئێستاکە پێشکەش بە جەنابی بەڕێز سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی «نەتەوە یەکگرتووەکان»ی کردووە. ناعەدالەتی، چەوساندنەوە و ئەو دەرد و ئازار و مەینەتەی گەلی کورد لە ماوەی ئەو چەند گرێ دە ساڵییەی دوایی چێشتوویە، کە زۆربەیان لە سۆنگەی هەڵوێستی پێکناکۆك و نیوەچڵەوە سەرچاوەیان گرتووە، کە لە برێك لە ناوچە کوردییەکاندا پیادە کراون و لە دوایین جاریشدا بە هۆی دەستبەرداربوونی ئەوانەی کە بە گوێرەی گفت و بەڵێنەکانیان بەرپرسیارییەتی بەڕێوەبردنی سیستەمێکی نوێیان لە ئەستۆ گرتبوو، کە لە سەر بنەمای ئازادی و دادپەروەری بۆ گشت

[١٠] سوپاسی زۆرم بۆ برای دڵسۆزم دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلا کە دیسانەوە لە پاریسەوە ئەرکی وەرگێڕانی ئەم یادداشتەی گرتە ئەستۆی خۆی، خوا لە وێنەی زۆر بکات.

گەلان و بە تایبەتیش بۆ گەلانی چەوساوە دامەزرابوو. هەردووک جەنگی جیهانی و جەنگی نوێی پیرۆزی مرۆڤایەتی لە پێناوی مافدا، بوونە هۆی لەدایکبوونی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی نوێ کە بنەماکانی «مافی گەلان لە بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان» و «ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنچینەییەکان» ڕابگەیێنێ. لەم دۆخەدا مافی کورد هەر بە فەرامۆشکراوی و نەزانراوی ماوەتەوە.

لە ترسی ئەو ڕووداوە کارەساتبارانەی کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٨ تاوەکو ١٩٤٨ لە عیراق و تورکیا و ئێران ڕوویان دا و لە لایەن بەرپرسەکانەوە هێندە حیسابیان بۆ نەکرا، وەفدی کوردی بڕوای وایە کاتی ئەوە هاتووە و ئەرکی ئەوە، یادداشتنامەیەکی ڕوونکەرەوە بۆ بەرچاوی بەرپرسانی «نەتەوە یەککگرتووەکان» لە بارەی ڕەوشی ڕاستەقینەی کوردستان بنووسێ، لە ڕابردوودا بێدادییەکی ئاوەها بە جۆرێك دەتوانرا بکرێت، بەڵام ئیدی چیتر ناشێ ئەوە بهێنرێتە بەرچاو کە لە ژێر سایەی بنەماکانی یاسادانانی نوێی دەوڵەتیدا چارەنووسی کورد بتوانرێ لە ژێر هیچ جۆرە بڕوبیانوویەکدا چیی دی چاوی لێ بپۆشرێ.

کەوابوو کێشەی کورد چیتر هەر تەنها لەسەر شانۆی سیاسی خۆی نانوێنێ، بەڵکو ئەوە (بەشێکە — ك.م.) لە مافەکانی مرۆڤ کە وان لە ئارادا. کوردی عیراق لە ئەنجامی قاتوقڕی و نەخۆشی و نەبوونی داو و دەرمانەوە، لەناو دەچن و لە ژێر ستەمی ڕژێمێکی پۆلیسیی بێ وێنەدا و بێبەشبوونیان لە گشت چەشنە ئازادییەکی شارستانی و سیاسی هەناسەیان لەبەر بڕاوە. لە تورکیا و ئێرانیش هەمان میتۆد و هەمان ڕەفتار (لەگەڵ کورددا — ك.م.) دەکرێ، خۆ ئەگەر دەستتێوەردانی هێزی ئاسمانیی شاهانشاهی بەریتانی لە عیراق نەبووایە، ئەگەر یاریدەی مادی و مەعنەوی نەبووایە بۆ تورکیا و ئێران، ئەوا کورد دەیانتوانی هەر بە چەك داکۆکی لە خۆیان بکەن، بەڵام



کامەران بەدرخان

وەك چۆن ڕووداوەکانی نێوان هەردووك جەنگ بۆیان سەلماندین کە تەنانەت مافی شۆڕشکردنیش[11] لە کورد سەندرایەوە.

ئەو بارودۆخە چونکە تەواو پێچەوانەن لەگەڵ ئەو بنەمایانەی لە ئارادان ئێستاکە نا ئارامییەك و ڕەوشێکی دڕدۆنگ لە ئارادایە کە لەوانەیە هەژموونێکی ئەسەفبار بخاتە سەر ڕەوتی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەر بۆیەش وەفدی کوردیی باوەڕکردوو بە هەستی خەمخوازانە و هەستی بەرزی ئەو بەرپرسانەی کە وەفدی بەریتانی بەڕێوە دەبەن، شەرەفی ئەوەی هەیە داوا لە جەنابی بەڕێزی سەرۆکی وەفدەکە بکات کە شێلگیرانە بە دەخالەتی بەرزی خۆی هاوپشتی لە داخوازینامەکانی کورد بکات.

لەگەڵ سوپاسی بێ پایانمان، جەنابی بەڕێز، تکایە ڕێزی گەلێك بەرزمان قەبووڵ بفەرموون.

ئیمزا

میر کامەران عالی بەدرخان[12]

دکتۆر کامەران عالی بەدرخان بەم کارەی چمکێکی سەنگینی نوێی خستە سەر خەرمانی لە بن نەهاتووی خزمەتەکانی بنەماڵەی بەدرخان. هەر لەو ساڵەیشدا، وەك دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلاّ پێی ڕاگەیاندم.

---

[11] ئەم هێلکێشانە لە لایەن نووسەری یادداشتنامەکە دانراوە – وەرگێڕ.

[12] N.A., F.O.,371 / 68438, Eastern 1948, General, File No.14575, No. E15407 / 15407 / 15575, Memorandum on the position of the Kurds in the Middle East communnicated To the Secretary – General of the United Nations by the Kurdish Delegation.

کامەران عالی بەدرخان یادداشتنامەیەکی دووورودرێژی داوەتە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرك و هەمان کاتیش لە نامیلکەیەکی چل و حەوت لاپەڕەییدا لە پاریس بڵاوی کردۆتەوە.

لەو یادداشتنامە و نامیلکەیەدا دوکتۆر کامەران باسی مێژووی دێرینی گەلی کورد و جوگرافیای کوردستان و سامانی بێ شومار و (پەیمانی سیڤەر) و سیاسەتی کەمالیزم و خەباتی بێ وچانی کورد و شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و ئاگری داغ و شێخ مەحموود و بارزان و دامەزراندنی کۆماری کوردستانی ساڵی ١٩٤٦ و چەند بابەتێکی دیکە دەکات و لە دوایین سەرئەنجامی یادداشتنامەکەدا نووسەر مافی چارەی خۆنووسی و مافەکانی مرۆڤ وەبیر کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەهێنێتەوە و داوا دەکات ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە چارەسەرێکی عادیلانە بۆ کێشەی کورد بدۆزێتەوە.

هیوادارین دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلا بەزووترین کات چاو و دڵی ڕووناکبیرانی کورد بەو بەرهەمە ناوازەیە ڕووناك بکاتەوە کە بێ گومان دەبێتە دیارییەکی بەهاداری دیکەی بۆ کتێبخانەی کوردی.

دوای ئەم ناوبڕە کورتە دەگەڕێینەوە سەر خودی فایلەکە.

دوای یادداشتەکەی بەدرخان یەکسەر یادداشتێکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە لە هەمان فایلدا هەڵگیراوە کە باڵوێزخانەی ناوبراو ڕۆژی شەشی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی و وێنەی لێ داوەتە باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە هەر یەك لە بەغدا و تاران و دیمەشق و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

باڵوێزخانەی بەریتانی،

ئەنقەرە،

نهێنی،

ژمارە ٤٥/٤/٤٠٦،

٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨.
بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست.

ئامـاژە بـە نامـەی ژمـارە إی ١٤٦٥٨/١٤٥٧٥/ ٦٥ی ڕۆژی پـازدەی تەشرینی دووەمتان دەربارەی هەواڵە ئیزگەییەکە سەبارەت بە دامەزرانـدنی حوکمەتێکی کوردیی ئازاد.

ئێمە هیچمان دەربارەی ئـەو ڕاپۆرتـە نەبیستووە بۆیـەکا نـاتوانین هـیچ تیشکی بخەینە سەر. بە هەر حاڵ کونسوڵی ڕاگەیاندنمان دەمێك ساڵە بایـەخ دەداتە کورد و تێبینیی ئەو بەم جۆرەیە:

«دەمێکە[١٣] لەو باوەڕەدام ڕۆژێك دێ زایۆنیستەکان پرسی کورد دەکەنە کوتەکی دەستیان بۆ لێدانی سورییایی و عیراقییەکان.

سـۆڤیەتییەکانیش دەمـێ ساڵە ناوچـەیەکی ئۆتۆنـۆمیی کـوردیی (ڕایۆن)[١٤]یان لە چوارچێوەی ئەرمینیای سۆڤیەتیدا هەیە، وێڕای ئامۆژگای کـوردیی لـە تفلـیس[١٥] و یـەرێڤان، بـەڵام ئەمـە یەکـەم جـارە گـوێم لـە حوکمەتێکی کوردی بێ، لەوانەیە (ئەو دەنگوباوە — ك.م.) ڕاست بێ، مـەلا مستەفایش هەر چەندە پیـاوێکی بزێـوە، بـەڵام هـەرگیز بـارێکی بـەو ڕادەیـە سـەختی نەخسـتۆتە ئەسـتۆی کـوردی عیراقـەوە، هـۆزی بـارزانیش، کـە براکەی[١٦] نەك خۆی ڕەهبەری دەکات، هۆزێکی بچووك و هەژارە و هۆزەکانی ناوچەکەیش ڕقیان لێی دەبێتەوە».

---

[١٣] شایەنی باسە گشت قسەکانی کونسوڵی ڕاگەیانـدنی باڵیۆزخانـەی حوکمـەتی بـەریتانی لـە ئەنقەرە بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش لە دەقی بەڵگەنامەکەدا چاپ کراون.

[١٤] ڕایۆن (Rayon) وشەیەکی ڕووسییە و مانای ناوچەیە.

[١٥] تفلیس یان تبلیس پایتەختی جۆرجیایە کە یەکێك بـوو لـە پـازدە کۆمـارە سـەرەکییەکەی یەکیەتی سۆڤیەت و ستالین و هەروەها شیڤەرنادزەی دوایـین وەزیـری هەنـدەرانی یەکیـەتی سۆڤیەت خەڵکی جۆرجیان، دوای کـەوتنی یەکیـەتی سـۆڤیەت شـیڤەرنادزە ماوەیـەك بـووە سەرەك کۆماری جۆرجیای سەربەخۆ، ژمارەیەکی کەم لە کورد لە جۆرجیا دەژین، من تـەنها دوکتۆر کەرەم ئەنقۆسیم دەناسی کە هەستی کوردایەتی زۆر بە تین بوو.

[١٦] مەبەستی شێخ ئەحمەدی بارزانە.

ئێمە دەربارەی ئەم بابەتە هیچ پرسیارێکمان لە بەرپرسیارە تورکەکان نەکردووە، بەڵام ئەگەر ئارەزووتان لێ بێت بۆ خۆتان دەتوانن لێیان بپرسن.
وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە بەغدا و تاران و دیمەشق.
ئیمزا
دڵسۆزتان باڵوێز[١٧]
لە ناو هەمان فایلدا و یەکسەر دوابەدوای ئەمە نامەیەکی باڵوێزی بەریتانی لە تاران هەڵگیراوە و ڕۆژی بیست و دووی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی هەمان بابەت و ئەویش ڕۆشنایی دەخاتە سەر چەند لایەنێکی دیکەی مەسەلەکە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامەیەیە:
باڵوێزخانەی بەریتانی،
تاران،
٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨،
ژمارە: گ ٤١٧/٢٠/٤٨،
نهێنی.
بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست.
دەربارەی ڕاپۆرتەکەی ئێزگەی ئیسرائیل کە سەبارەت بە دامەزراندنی کۆمارێکی سەربەخۆی کوردییە و ئێوە لە نامەی ژمارەی إی ٤٥٦٦/١٤٥٧٥/٦٥ی ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمتاندا ئاماژەتان بۆی کردووە، ئێمە لە تەورێز و خورەمشەهرمان[١٨] پرسی و تەورێز پێی ڕاگەیاندین

[17] N.A., F.O., 317/68438, British Embassy, Ankara, Confidential, No. 406/ 4/ 48, 6 th December 1948, To: Eastern Department, Foreign Office, London S.W.1.

[١٨] مەبەستی هەردوو کونسوڵخانەی بەریتانییە لە تەورێز و خورەمشەهر.

ئێزگەی باکۆ و ئێزگەی نهێنیی دیموکرات[١٩]ەکان لەم چەندانەی دواییدا ئاماژەیان بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی لەو جۆرە کردووە، بەرپرسە سەربازییەکانی ئێران سێ مانگ لەمەوبەر گوێیان لە ڕاپۆرتێکی وەها بووە.

تەورێز دەربارەی ئەم بابەتە داوای زانیاریی دیکە دەکات، ئێمەش هەر شتێکی دیکەی دروستمان بیست ئاگادارتان دەکەینەوە.

وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ بەغدا و ئەنقەرە و مۆسکۆ.

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز

ئیمزا[٢٠].

دوای ئەوان نۆرەی نامەی موفەوەزییەتی بەریتانی لە دیمەشق دێ کە ڕۆژی بیست و یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ئەم نامەیەی لای خوارەوەی ناردووە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن:

نهێنی،

موفەوەزیەتی بەریتانی،

---

[١٩] مەبەست ئەو ئێزگە نهێنییەیە کە سۆڤیەتەکان لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجان بە ناوی دیموکراتەکانی ئێرانەوە دایانمەزراند و ناوەندی چلەکانی سەدەی ڕابردوو پرۆگرامەکانی خۆی پەخش دەکرد، ڕاگەیاندنی بەشێکی ئەو ئێزگەیە بە زوبانی کوردی بوو، خوالێخۆشبووان دوکتۆری مێژوونووس ڕەحیمی قازیی برای سەیفی قازیی وەزیری جەنگی کۆمار و ئامۆزای قازی محەمەدی سەرەک کۆمار و دوکتۆر عەلی گەلاوێژی ئابووریناس کە لە بەگزادەی فەیزوڵڵا بەگیی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو، ئەو بەشەی ئێزگەی ناوبراویان بەڕێوە دەبرد، دیارە ئەوسا ئەو ئێزگەیە لە ناو کورددا دەنگێکی گەورەی دابۆوە.

[20] N.A., F.O., 317/68438, British Embassy, Tahran, 22 December 1948, No.G.417/ 20/ 48, Confidential, To: Eastern Department, Foreign Office, London S.W.1.

دیمەشق،

٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨،

ژمارە ١٩/٤٧/٤٨.

بەشی ڕۆژهەلاتی خۆشەویست.

ئامـاژە بـە نامـەی ژمـارە إی ٦٥/١٤٥٧٥/١٤٦٥٨ی ڕۆژی پـازدەی تەشرینی دووەمتان دەربارەی دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردیی ئازاد.

هەرچـەندە (لێـرەیش – ك.م.) دەنگوبـاوێکی لـەو جـۆرە بـڵاو بـۆوە و گوتیان سەرچاوەکەی ئێزگەی ئیسرائیله، بەڵام بەڕێوەبـەری گشتیی بەشی سیاسی وەزارەتی هەندەرانی سووریا بە هیچ شێوازێك هیچی دەربـارەی ئـەو ڕاپۆرتە نەبیستووە.

ئێزگـەی جووەکـان لـە ڕابردوویشـدا ڕاپـۆرتی سەرلێشـێوەری دیکـەی دەربارەی بابەتی ناوخۆیی وەها پەخش کردووە، دوایش ساغ دەبێتەوە کـە ئەم دەنگوباوەی باسـی (کۆمـاری ئـازادیی کـوردی – ك.م.) دیسـانەوە هـەر شتێکە لەو شتانە.

ئێمە وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ تاران و ئەنقەرە و بەغدا.

هەمیشە دڵسۆزتان

وەزیر موفەوەز

ئیمزا [٢١].

بەڵگەنامەی دواتر نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانییە لـە ئەنقـەرە دەربـارەی هەڵوێسـتی ڕۆژنامـە تورکییـەکان بەرانبـەر هـەواڵی دامەزرانـدنی کۆمـاری ئـازادیی کـوردی لـە یـەرێڤان کـە ئەمـەی خـوارەوە دەقـی وەرگێڕانەکەیەتی:

---

[21] Ibid, Confidential, British Legation, Damascus, 21th December, 1948, No.19/ 47 / 48, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

بالۆێزخانەی بەریتانی،
ئەنقەرە،
٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨،
نهێنی،
ژمارە ٤٨/٨/٤٠٦.
میخائیلی[٢٢] خۆشەویست.

ئامــاژە بــە نامــەی ژمــارە إی ٦٥/١٤٧٥٧/١٤٦٥٨ی ڕۆژی پــازدەی تەشــرینی دووەمتــان دەربــارەی دامەزرانــدنی حوکمــەتێکی کــوردیی ئــازاد و وەڵامی ڕۆژی شەشی کانوونی یەکەمی باڵۆێزمان.

ڕۆژنامە تورکییەکان زۆرن ئەوانەی کە کەوتوونەتە باسی ئێزگەی مۆسکۆ و ئێزگــەی (ئازەربایجــانی ئــازاد) و ( قســەکانیان – ک.م.) دەربــارەی کوردســتانی ســەربەخۆ و ئــەو یادداشــتەیە کــە لــە لایــەن چــەند هەتیمچەیەکەوە[٢٣]، کە دەست بۆ پارەی هەمووان پان دەکەنەوە دراوەتە ترایڤللی. ڕۆژنامە تورکییەکان هەمان کات بەم بۆنەیەوە کەوتوونەتە لێدانی قەوانە کۆنەکەیان، ئەوەی دەڵێ لە تورکیادا کێشەیەك نییە بە ناوی کێشەی کوردەوە، هەمووی بە سەریەکەوە یەك – دوو حەفتە نابێ کە بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامــەی ئۆلــوس Ulusی نیمچــە فــەرمیی لای یــەکێك لــە کارمەنــدەکانی باڵۆێزخانەکــەمان ســووك و باریــك کــوردی شــوبهاندبوو بــە Berg Leute[٢٤]،

---

[٢٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا میخائیل کێللی (Michael Kelly) بە دەستخەت نووسراوە، هەروەها ئیمزاکەشی، دیارە یەکێکە لە کارمەندە گەورەکانی بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی.

[٢٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێ "afew vagabonds" کە هەتیمچە و دەمڕووتی لای خۆمان و (صعلوك)ی عەرەبی دەگەیێنێ و مەبەستییە بلێت کورد بە لای تورکە توندڕەوەکانەوە دەمڕووت و صەعلوکن، لێرەیشدا مەبەستی تورکە توندڕەوەکان دوکتۆر کامەران عالی بەدرخانە کە وەك وتمان یادداشتێکی دەربارەی مافی چارەنووسی کورد دابووە سکرتێری گشتیی ئەوسای نەتەوە یەکگرتووەکان ترایڤللی (Trygvie Lie).

[٢٤] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە (Berg Leute) هاتووە.

(تورکی شاخاوی)ش ناووناتۆرەیەکی دیکەی لەو بابەتەیە. ئەم جۆرە قسە قۆڕانە[٢٥]یش نیشانەی فەشەلی ئەو ڕاستییەن کە کێشەکە (واتا کێشەی کورد — ک.م.) هێشتا لە ئارادایە، ئەو ڕاستییەی لەم دواییانەدا بۆم ساغ بۆوە.

وەك بەشێك لە هێرشێکی گشتیی دژ بە حوکمەت، ڕۆژنامەی بەناوبانگی تەسویر Tasvir کە ئۆرگانی ئۆپۆزسیۆنە ئەو مەسەلەیەی (ورووژاند — ک.م.) کە لە بەردەم (ئەنجوومەنی نەتەوەیی باڵا)دا باسی کرابوو دەرحەق کوشتنی بێ دادگاییکردنی سی و دوو تورکی ناوچەکانی ڕۆژهەلات، ئەوانەی بە پێی قسەی کەسوکاریان لە سەر ئەوە کوژراون، چونکە کوردن و هەڵهاتبوون بۆ ناو خاکی ئێران و گەڕابوونەوە تورکیا تەنها بۆ تالانیی مەڕوماڵات. هەرچەندە خاوەنی ڕۆژنامەی «تەسویر» بە ڕەگەز کوردە، بەڵام پێموایە هەرگیز زاتی نەدەکرد شتێکی لەو بابەتە بلاّو بکاتەوە ئەگەر بهاتایە و ئەو بابەتە بێ بنەما بووایە. لەوەیش بەولاوە سەرۆکی پارتی گەلی کۆماری کە ڕۆژنامەنووس فالح ڕفقی ئەتایە — Falih Rifki Atay بە یەکێك لە کارمەندانی ڕۆژنامەکەمانی گوتووە گەلێك لە سی و دوو کەس زۆرتر لە سێدارە دراون لەسەر کێشەیەکی کوردیی توندوتیژ.

ئەو گوتوویە کورد تیرۆر دەکران و تیرۆر دەکرێن و تەنها بە هۆی سیاسەتی دڵڕەقانەی جەنەڕاڵ موگلالی مستەفا — Gneral Muglali Mustafa کە دەسەلاّتی فراوانی پێ بەخشراوە هەر سیخوڕێکی ڕووسیا سنوور ببەزێنێ نەیدەهێشت کارەکەی بەرێتە سەر. ئەتای ئەوەشی گوتووە کە هەر شتێك لە ڕۆژنامەکاندا دەربارەی کێشەی کورد بلاّو بکرێتەوە پێویستە وەك بوختان لە قەڵەم بدرێ.

دڵسۆزتان

---

(٢٥) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە زوبانی ئینگلیزی وا هاتووە"This obvious Nonsense" (Nonsense) یش بە واتای (قسەی قۆڕ — کلام فارغ) دێ، (obvious)یش ڕوون یان ئاشکرایە.

میخائیل کێللی
ئیمزا [٢٦].

لێرەدا ئەم فایلە کۆتایی دێ، بەڵام وەك لە کۆتایی لاپەڕەی یەکەمیدا هاتووە یەکێك لەو دیپلۆماسییە بەریتانییانەی خوێندوویانەتەوە ئەم پێشنیازەی کردووە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی حوکمەتی بەریتانی:

(پێشنیاز دەکەم وێنەی ئەم نامەیە بنێردرێت بۆ «باڵوێزخانەی بەریتانی لە - ك.م.» مۆسکۆ چونکە دەربارەی ڕووداوەکانی یەکیەتی سۆڤیەتە).

هەرچی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیشە ئەم پێشنیازە پەسند دەکات و نامەیەکی تایبەتی دەنێرێ بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە مۆسکۆ، ئەوەی دەبێتە هۆی کردنەوەی فایلێکی دیکە بۆ هەمان بابەتی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی لە یەرێڤان کە ئەمەی لای خوارەوە ژمارە و ناونیشانییەتی:

(وەزارەتی هەندەران، ١٨١/١٠٤٤، باڵوێزخانەی بەریتانی، مۆسکۆ، ژمارە ٧٢٦، ناوی فایل: کورد) [٢٧].

فایلی دووەمی ئەم بابەتە لە یازدە لاپەڕە پێکهاتووە، بە پێی مێژووی بەڵگەنامەکانی ناو فایلەکە ئەم نامەیەی لای خوارەوەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی کە ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە تاران و بەغدا و ئەنقەرە و موفەوەزییەتی هەمان حوکمەت لە دیمەشق یەکەم بەڵگەنامەیە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

---

(26) N.A., F.O., 371/68438, British Embassy, Ankara, Confidential No.406/8/48,20 th December 1948, To:M.R. Wright, Esq.,C.M.G., Foreign Office, London S.W.1.

(27) N.O., F.O., 181/1044, British Embassy, Moscow, No:726, Name of File: Kurds.

وەزارەتی هەندەران،
١٥ی تەشرینی دووەمی ١٩٤٨،
ژمارە إی ٦٥/١٤٥٧٥/١٤٦٥٨،
بۆ:
باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران،
باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا،
باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە،
موفەوەزیەتی بەریتانی لە دیمەشق.
باڵوێزی خۆشەویست.

ئایا دەتوانن هیچ تیشکێك بخەنە سەر ئەم ڕاپۆرتە ئێزگەییە، دەربارەی دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردیی ئازاد؟

دوا بەدوای ئەمە دەقی هەواڵەکەی ئێزگەی دەنگی ئیسرائیل بەو جۆرەی کە لە فایلی ژمارە (٦٨٤٣٨/٣٧١)دا هاتووە تۆمار دەکات و دەڵێ:

(دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردیی ئازاد لە یەرێڤان بە نیازی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردیی سەربەخۆ لە ژێر سایەی سۆڤیەتدا. ڕاپۆرتێك کە ڕۆژی سێی تەشرینی دووەم لە ئێزگەی «دەنگی ئیسرائیل»ەوە وەرگیراوە) [٢٨].

بەڵگەنامەی دواتری فایلی دووەم بریتییە لە نامەیەکی باڵوێزی بەریتانی لە مۆسکۆ کە ڕۆژی چواردەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ باڵوێزخانەی فەرەنسی لە مۆسکۆ کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

باڵوێزخانەی بەریتانی،
مۆسکۆ،

[28] N.A., F.O., 371/68438 Eastern 1948 General, File: No: 14575 Middle East, Towrds a Kurdish Republic.

١٤ی كانوونی یەكەمی ١٩٤٨،
بۆ: م.كاسین،
باڵوێزخانەی فەرەنسی،
مۆسكۆ.

لە بەردەمی گفتوگۆكانی ئەم دواییانەماندا دەربارەی چالاكییە كوردییەكان بە پێویستی دەزانم سەرنجتان ڕابكێشم بۆ ئەو ڕاپۆرتە ئێزگەییەی باسی دامەزراندنی حوكمەتێكی كوردیی ئازاد دەكات. ئێزگەی «دەنگی ئیسرائیل» ڕۆژی سێی تەشرینی دووەمی ١٩٤٨ سەعات حەڤدە (واتا پێنجی ئێواری- ك.م.) بە زوبانی عەرەبی و لەسەر زاری سەرچاوە عەرەبییەكانەوە ڕایگەیاند كە لە یەرێڤانی پایتەختی كۆماری ئەرمینیای ڕووسیا حوكمەتێكی كوردیی ئازاد دامەزرێنراوە بە نیازی دامەزراندنی كۆمارێكی سەربەخۆی كوردی لە ژێر سایەی سۆڤیەتدا كە بڕیار وایە ناوچەكانی باكووری – ڕۆژئاوای ئێران و ڕۆژهەڵاتی توركیا و باكووری عیراق بگرێتەوە. ڕاپۆرتەكە دەشڵێ ئەم حوكمەتە نوێیە بڕیارە لە شێوازی «یەكیەتییەكی سەربازی»دا بێ و مەلا مستەفای بارزانیشی تێدابێ كە ماوەیەك لەمەو بەر «ڕەهبەری شۆڕشێك بوو لە عیراق»[٢٩]، ژمارەی ئەندامانی هۆزی بارزان دە هەزار كەس دەبن. زۆربەیان شەڕكەرن و زۆر ئازایانە لەم دواییانەدا دژی هێزەكانی سوپای عیراق جەنگین و سێ سەد سەر سەربازیان لێ كوشتن، دوای ئەوەیش كە هاتنە نزیك سنووری ئێران حوكمەتی ئێرانی ڕازی نەبوو پەنایان بدات، بۆیەكا ناچار بوون «بچنە شارێكی نزیك ئێران» و تاوەكو ئیمڕۆكەیش هەر لەوێن.

---

[٢٩] لەبەر ئەوەی بەشی زۆری ناوەڕۆكی ئەم بەڵگەنامەیە لە ناوەڕۆكی دووەم بەڵگەنامەی فایلی یەكەمی ئەم بابەتەدایە و لەوێ لە شوێنی پێویستدا پەراوێزی ڕوونكەرەوەی پێویستمان داناوە، بۆیەكا بە پێویستمان نەزانی ئەو پەراوێزانە لێرەدا دووپات بكەینەوە.

ئەم راپۆرتە بەلای تۆوە شتێکی سەیر نییە چونکە سەد دەر سەد وەك زانیارییەکانی لای خۆتن.

ئیمزا

دڵسۆزتان

گێلۆنیستریج[٣٠][٣١].

دوا بەڵگە نامەی بەشی دووەمی ئەم فایلە بریتییە لە نامەیەکی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

باڵوێزخانەی بەریتانی،

تاران،

٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨،

ژمارە: گ ٤١٧/٢٠/٤٨،

نهێنی.

بەشی ڕۆژهەلاتی خۆشەویست .

دەربارەی راپۆرتەکەی ڕادیۆی ئیسرائیل لە مەڕ کۆمارێکی کوردیی سەربەخۆ کە لە نامەی ژمارەی إی ١٤٦٥٥/١٤٥٧٥/٦٥ی ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمتاندا ئاماژەتان بۆی کردووە داوای ڕوونکردنەوەمان لە تەوریز و خوڕەمشەهر کردووە.

[٣٠] ئەو کارمەندەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە مۆسکۆ، کە لەوانەیە خودی باڵوێز بێ ، ناو و ئیمزای خۆی بە خەتێکی یەکجار تێکەڵ و پێکەڵ نووسیوە، بە یاریدەی ژمارەیەك لە کارمەندانی ئەرشیفەوە توانرا ئەوەی لێ هەڵبکرێنرێ: Gelunistrudge.

[31] N.A., F.O.,181/1044, British Embassy, Moscow, 14 th December, 1948, No.726/3/48, To: W.Cassin, French Embassy, Moscow.

تەوریز پێیان ڕاگەیاندین کە ئیزگەی باکۆ و ئیزگەی نهێنیی دیموکرات[٣٢] باسی کۆمارێکی کوردیی وەهایان کردووە، هەرچی بەرپرسانی سەربازیی سوپای ئێرانیشە چوار مانگ لەمەوبەر گوێیان لە ڕاپۆرتێکی لەو جۆرە بووە.

تەوریز داوای زانیاریی دیکە (دەربارەی ئەم بابەتە — ك.م.) دەکات، ئێمەیش لە گشت ئەنجامێکی پۆزێتیڤ ئاگادارتان دەکەین.

وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ بەغدا و ئەنقەرە و مۆسکۆ.

ئیمزا

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز[٣٣].

بەم جۆرە ئەم فایلەش کۆتایی دێ و ناوەرۆکی بەڵگەنامەکانی زیندوویێتی پرسی کورد لە سەرەتای قۆناغی جەنگی سارددا دەسەلمێنێ، وێڕای پەلهاویشتنی زیرەکانەی ئیسرائیل وەك هۆکارێکی نوێی کاریگەر لەو بوارەدا.

---

[٣٢] دەربارەی ئەو ئیزگەیە بڕوانە پەراوێزی ژمارە نۆزدەی ئەم بابەتە.

[33] N.A., F.O., 181/1044, British Embassy, Tehran, 22 December 1948, No-G.417/ 20/48, Confidential, To:Eastern Department, The Foreign Office, London, S.W.1.

بابەتی سێیەم:

# چەمكێك لە مێژووی حیزبی شیوعیی عیراقی و چالاكییەكانی «فەهد» و هاوڕێكانی

لە بەڵگەنامە
نهێنییەكانی حوكمەتی بەریتانیدا



د. موکەڕەم تاڵەبانی



عەزیز محەمەد



د. ئەمین موتابچی



کەمال شاکیر

## پێشکەش بێت بە هەریەك لە بەڕێزان

«عەزیز محەمەد» و «کەریم ئەحمەد» و «مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی» و «دوکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی» و «سالم عوبێد ئەلنعمان» و «عەبدولڕەزاق سافی» و «کەمال شاکیر» و «دوکتۆر ئەمین موتابچی» و گیانی هەمیشە زیندووی «نەبەن»ی کوڕی و هەردووك برا «کەمال» و «عەلی مەحموود» و خوشکە «پاکین»ی هاوسەری کاك عەلی!.

## سەرەتا

یـەکێك لـەو بابەتانـەی لـە سـەرەتاوە بڕیـارم دابـوو لـە «ئەرشـیفی نیشتیمانی»ی بەریتانیدا بە دوای فایلەکانیدا بگەڕێم چالاکییەکانی «حیزبی شـیوعیی عیراقـی» بـوو، چـونکە لـە گـەلێك ڕووەوە بابـەتێکی بایەخـدار و پێویستە و لەوە دڵنیابووم کە زانیاریی دانسقە لـەو فایلانـەدا پـارێزراون. بـێ گومـان ئـەوەیش لـە خـۆڕا نـەهاتووە، «یەکیـەتی سـۆڤیەت» لـە سـەرەتای دامەزراندنییەوە سەرنجی شۆڕشگێڕانی ڕۆژهەڵاتی ڕاکێشا، لەوانەیش عەرەب و کورد و کەمینەکانی «عیراق»، بە وێنە ڕەهبەرانی شۆڕشی بیست و تایبەت ڕۆژنامــەی «الفــرات»ی «نەجــەف»ی، کــە «محەمــەد بــاقر ئەلشــبیبی» سەرنووسـەری بـوو، بـە گـەرمی باسـی شۆڕشـی ئۆکتۆبـەری کـردووە، دوای نوشوسـتی شۆڕشـی بیسـتیش، «محەمـەد ئەلصـەدر» لـە ڕێگـەی ئێرانـەوە پێوەندی بە چیچێرینی وەزیـری هەنـدەرانی «سـۆڤیەت»ەوە کـرد، «مێجـەر سۆن»ی بەناوبانگیش ساڵی ١٩١٩ نووسیویە «بـە داخـەوە کوردەکـان وایـان لێ هاتووە لە واتای بەلشەڤیزم تێبگەن»، «شێخ مەحموود»یش لـە گـەرمـەی خەباتیدا دژی «بەریتانی»یەکان، «ڕەشید جەودەت»ی نـاردە لای کونسـوڵی «سۆڤیەت»ی لە تەورێز و داوای تۆپ و فڕۆکەی لە «سۆڤیەت» کردبوو.

ئەم ڕاستییانە و گەلێکی دیکەیش ئـەوە ناگـەیێنن کـار گەیشـتبووە ئـەو ڕادەیــەی وەك خوالێخۆشــبوو دوکتــۆرە صــبیحة الخطیــب [1] ســەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو نووسیبووی یەکێك لە ئیمامەکانی نەجەف وێنەی لێنینی لە ژوورەکەی لە مزگەوت هەڵواسیوە و گوایە گوتوویـە «ئەگـەر مـن و

---

[1] خوالێخۆشبوو دوکتۆرە «صبیحة الخطیب »م لە نزیکەوە دەناسـی، خـەڵکی «کەربەلایـە» و ساڵی ١٩٥٧ بەشـی مێـژووی لـە «دار المعلمین العالیـة» تـەواو کـرد و دوایـش دوکتـۆرای لـە «یەکیەتی سۆڤیەت» وەرگرت، هاوسەری «دوکتۆر نـوری لـەتیف» کـە ئێسـتا لـە «لەنـدەن» نیشتەجێیە و چ خۆی و چ خوالێخۆشبوو هەمیشـە دۆسـتی نزیکـی «کـورد» بـوون، پێموایـە کچێکیان شووی بە کوردێك کردووە.

لێنین یەك بگرین ئازادی بۆ هەموو جیهان دێنین». لەوەڵامدا کاتی خۆی لە کورتە وتارێکدا ئەو بۆچوونەم ڕەت کردبۆوە، چونکە هیچ ئیمامێکی شیعە تەنانەت وێنەی ئیمامی عەلیش لە ژووری خۆیدا هەڵناواسێ چ جای لێنین.

وێڕای ئەوانەی گوتمانن نەك هەر شیوعییەکان بەڵکو گشت چەپڕەوانی عیراق شوێنپەنجەیان لە گۆڕەپانی خەباتی سیاسی و ڕزگاریخوازیی گەلی عیراقدا زۆر دیارە، ئەوەی دوژمنەکانیشیان ناتوانن نکۆڵی لێ بکەن، دیپلۆماسییە بەریتانییەکانیش بە چرای ڕۆنگەرچەکەوە دووی ئەو جۆرە هەواڵانە دەکەوتن.

وەك چاوەڕوان بووم گەلێك فایلی سەربەخۆ لە «ئەرشیڤی نیشتیمانی»ی بەریتانیدا بۆ باسی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراون و بە ڕاستی زانیاریی هەمەجۆر و یەکجار دانسقەیان تێدا هەڵگیراوە، کە گشتیان سەرچاوەی ڕەسەن و دەگمەنن بۆ تێگەیشتنی قووڵی مێژووی ئەو حیزبە، ژمارەی فایل و بەڵگەنامەکانیش لەوە زۆرتر دەرچوون کە من چاوەڕوانی بووم. شایانی باسە لە ناو گشت ئەو فایلانەی ئەرشیڤدا کە بۆ بابەتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراون بینینی تەنها فایلێکی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی قەدەغەیە و لە خودی وەزارەت هەڵگیراوە، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام و پێموابوو ئینگلیزەکان ئەندامێکی حیزبیان کڕیوە و باسوخواسی ئەو کەسە لەو فایلەدا هەڵگیراوە، کە لە بەرپرسانی ئەرشیڤم پرسی گوتیان دەتوانی نامە و ئەدرێسی خۆت بۆ خودی وەزارەت لە لەندەن بنێری و داوای ئەو فایلە بکەیت، پاش دەوروبەری سێ حەفتە وێنەی بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلەم بە ئەدرێسی خۆم پێ گەیشت کە یەکێك لە بەشەکانی ئەم بابەتەی بۆ تەرخان دەکەم، شایانی گوتنە وەزارەتی ناوبراو داوای هیچ پوولێکیشیان لێ نەکردم چ وەك حەقی وێنەگرتنەوەی بەڵگەنامەکانی ناو فایلەکە و چ پۆست کردنیان.


حەمید مەجید مووسا


موفید جەزائیری

لێرەدا گلەییەکی زۆر دێتە سەر کۆمۆنیستە ڕووناکبیرە دڵسۆزەکانی عیراق کە دەبوو لە دەمێك ساڵەوە ئاوڕ لەو سامانە گەورەیەی مێژووی حیزبەکەیان بدەنەوە، تایبەت یەکێکی وەك ئەندامی مەکتەبی سیاسیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» خوالێخۆشبوو «عامر عەبدوڵلا» کە لە دوا قۆناغی ژیانیدا لە «بەریتانیا» پەنابەر بوو.

ژمارەی ئەو فایلانەی تەنها بۆ باسی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراون و من دیومن بریتییە لە ٤٥ فایل کە هی ئەوتۆیان تێدایە تەنها یەك بەڵگەنامەی تێدایە[٢]، فایلی ئەوتۆشیان تێدایە مامناوەندی[٣]، یان یەکجار گەورەیە[٤]. هەڵبەت من بە پێی توانا هەوڵ دەدەم سەرنجی خوێنەر بۆ ناوەڕۆکی گشتیی و لایەنە هەرە سەرنجڕاکێشەرەکانی ناو بەڵگەنامەکانی ئەو

---

(٢) بڕوانە:

N.A., F.O., 371/128042, Communism in Iraq.

(٣) بڕوانە:

N.A., F.O., 371/75130, Communism in Iraq.

(٤) بڕوانە:

N.A., F.O., 371/75131,Top Secret, The Iraqi Communist Party, Supplementary Paper.

فایلانــە ڕابکێشــم، چــونکە لــە ڕاســتیدا وەرگێــڕان و لێکدانــەوەی گشــت بەڵگەنامەکان پێویستییان بە ژمارەیەك کتێبی وەك ئەم کتێبە هەیە و دیارە ئەوەیش ئەرکی من نییە، هەر لە بەر ئەوەیشە چەمکێك، واتا بەشێك، لە مێژووی «حیزبی شیوعیی عیراقی»م کردۆتە ناونیشانی ئەم بابەتە، بەڵام وێنەی سەرجەمی بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلانەمان گرتۆتەوە و ئەو وێنانە لەسەر وێبسایتی خۆم و سیدییەکانیشیان لە کتێبخانەکانی گشت زانکۆکانی کوردستان و کتێبخانەی کۆلێجی ئادابی زانکۆی «بەغدا» دادەنرێن، نیازیشمە دانەیەکیشیان بە دیاری بدەمە بارەگای «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە «بەغدا» و تایبەت بەڕێزان «حەمید مەجید موسا»ی سکرتێری گشتیی حیزب و دوکتۆر «موفید جەزائیری» ئەندامی مەکتەبی سیاسی، دیارە هەردووکیشیان دوو دۆستی نزیکی کوردن، جا با کۆمۆنیستەکان بۆ خۆیان بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلانە وەرگێڕنە سەر زمانی عەرەبی و کوردی و بەو جۆرە خزمەتێکی فیکری و زانستیی گەورە پێشکەشی هەمووان دەکەن و لەوانەیە زۆر لایەنیان وانەی پێویست بن بۆ ئیمڕۆی عیراق و دوارۆژی. لێرەدا یەك نموونە دەهێنمەوە یاد، ئاگادارانی بەڕێز لە گەرمەی خەباتی ڕەوای گشت نیشتمانپەروەرانی عیراق بە گشت پێکهاتەکانی گەلەکەمانەوە «حیزبی شیوعیی عیراقی» بەر لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا بابەتێکی بە شێوازێکی «ستالین»ی ورووژاند کە ئایا «کورد» نەتەوە «ئوممە» یە یاوەخود هێشتا «نەتەوە» نییە، ئەوەی بووە وێردی سەر زوبانی گشت نیشتمانپەروەرانی وڵات و لەو ڕۆژگارە ناسکەدا دەلاقەیەکی ترسناکی خستە نێوان ئەندامانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و «پارتی دیموکراتی کوردستان»ەوە، ئەوەی دوژمنانی هەردووك لا لە ئاسمانەوە قۆستیانەوە.

هەر چۆن بێ بایەخی مێژوویی و سیاسیی ئەو بەڵگەنامانەی من لە چوارچێوەی ئەم بابەتەدا دەیانخەمە ڕوو کەم نین و پاش و پێشخستن و

دووپاتبوونەوەی ژمارەیەك ڕووداو ڕاستیی سروشتی بەڵگەنامەكان فەرزیان كردوون. ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەیەكی ناوەڕۆكی بەشێك لەو فایلانەیە:

فایلی ژمارە ١١٦/٦٢٤

ناونیشانی ئەم فایلە بەم جۆرەیە «باڵوێزخانەی بەریتانی، «بەغدا»، ژمارە ٣٠٠، ناوی فایل: كۆمۆنیزم» [٥]. ئەم فایلە ژمارەی لاپەڕەكانی لە سەر نییە، بەڵام بە پێی ژماردنی خۆم ٣٠ لاپەڕەیە و دوو بەیاننامەی «حیزبی شیوعیی عیراقی»ی بە زوبانی عەرەبی تێدا هەڵگیراوە، یەكەمیان بەم ناونیشانە و بە ناوی «فەهد» ەوەیە:

«الحزب الشيوعي يدعو الشعب العراقي الى مقاطعة الانتخابات المزورة والى إسقاط وزارة نوري السعيد عميل الاستعمار البريطاني وبطل مشاريعه»، لە ژێر بەیاننامەكەشدا نووسراوە: «فەهد» سكرتير عام «الحزب الشيوعي العراقي»، ١٩٤٦/١٢/٢١.

چاپی بەیاننامەكە زۆر باشە و عەرەبییەكەشی ڕێكوپێكە و ناوەڕۆكی لە هەردووك دیوی كاغەزەكەدا چاپ كراوە.

هەرچی بەیاننامەی دووەمیشە بریتییە لە یادداشتێكی حیزب بەم ناونیشانەوە:

«مذكرة الحزب الشيوعي العراقي» لە ژێریشیەوە نووسراوە «اللجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي»، ١٩٤٧/٦/٢٧.

یەكەم بەڵگەنامەی نهێنیی ناو ئەم فایلە لە ئەفسەری فڕۆكەوانی بەریتانی هێزی ئاسمانیی مەلەكیی عیراقییەوەیە بۆ سكرتێری یەكەمی باڵوێزخانەی بەریتانی لە «بەغدا» كە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

---

(5) N.A.,F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No. 300, Name of file: Communism.

«لە:
ئەفسەری فڕۆکەوانەوە ب.أ.فرێزەر [٦]،
بنکەی فڕۆکەوانی،
هێزی ئاسمانیی مەلەکی،
حەبانییە،
هێزەکانی بەریتانیا لە عیراق،
٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٧،
ژمارە س. ٤٨٠٦/١/فڕۆکەوانی،
بۆ:
میستەر ج.ف.برێویس [٧]،
سکرتێری یەکەم،
باڵوێزخانەی بەریتانی،
بەغدا،
خۆشەویستم،

هیوادارم ئەمە ئەوە بێت کە تۆ دەتەویست، پاشکۆی (أ) بریتییە لە کۆششێك بۆ وەڵامدانەوەی نامەکەی وەزارەتی هەندەران، ئەوەی دیکەش، کە بەلای منەوە شتێکی ساکارە دەترسێم لە هەر شت پێویستتر بێ بۆ ڕاپۆرتەکانم. زۆر بەختەوەر دەبم بەرانبەر هەر لێدوانێکتان.

---

(٦) وەك لە دەقی بەڵگەنامەکەوە دیارە ساڵی ١٩٤٧ «ب.أ.فرێزەر B.A.Fraser » ئەفسەری فڕۆکەوان بووە لە هێزی ئاسمانیی بەریتانی لە عیراق.

(٧) «جۆن فێنویك برێویس» (John Fenwick Brewis) ڕۆژی بیست و شەشی نیسانی ساڵی ١٩١٠ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی «کەمبریج»ە، لە بیستی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٣وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی «بەریتانی» و ماوەی سیازدە ساڵ لە گەلێك شاری «چین» دیپلۆماسی بووە تاوەکو لە ڕۆژی شەشی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦وە کراوەتە سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەی «بەریتانی» لە «بەغدا»، بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1947", London, P.153.

دڵسۆزتان

ئیمزا» [٨].

بەڵگەنامەی دووەمی ناو هەمان فایل بریتییە لە یادداشتێکی نهێنیی هەمان ئەفسەری فڕۆکەوان «فریزەر» دەربارەی ڕێکخراوە سیاسییە عێراقییەکان و ڕادەی کاریگەریی «حیزبی شیوعیی عێراقی» لە سەریان و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«نهێنی،

یادداشت،

ڕێکخراوە عێراقییە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان کە کاریگەریی شیوعی لە سەریان ئاشکرا یان نهێنییە.

١- دانانی لیستێك دەربارەی ئەو ڕێکخراوە عێراقییانە کە بڕگەی یەکەمی نامەی ژمارە ٣٨١ی ڕۆژی سی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٦ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی باسیان دەکات کارێکی هەر وا ئاسان نییە.

٢- تاوەکو ئێستا ژیانی سیاسی لە عیراق لە قۆناغێکی یەکجار دواکەوتوودایە چ جای ئەوەی بگاتە ئاستی دووبەرەکیی سیاسی لە پێناو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵدا. ئەو پارتییە سیاسییانەی لەم بوارانەدا هاتوونەتە گۆڕێ هێشتاوەکو زۆریان ماوە بگەنە ئاستی کامڵبوونی وەك وڵاتە دیموکراسییە پێشکەوتووەکان.

٣- فیکری سیاسیی «عیراق»ی تازە پێگەیشتوو بەر لە هەر شت فیکرێکی نەتەوەییە لەگەڵ بۆچوونێکی شێواو و نادروستی چەپڕەو کە

---

(8) N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No. 300, Name of File: Commonism, From: Wing Commander B.A.Fraser, Air Headquarters, Royal Air Force, Habbaniya, British Forces in Iraq, 24 January 1947, Ref: S. 4806/ Air Int, To: Mr.J.Brewis, First Secretary, British Embassy Baghdad.

ئۆباڵی دیاردەکان دەخاتە ئەستۆی ڕژێمی کۆمەڵایەتیی «کۆنەپەرست» و بەردەوامبوونی «دەسەڵاتی بیانی» [(٩)] و بە ئاسانی دەڵێن دسەڵاتی بەریتانییە داگیرکەرەکان تاکە بەرپرسی بەردەوامیی ئەو بارودۆخەیە. هەمان کات عیراقییەکان لە سیاسەتی ئێمە بەرانبەر پرسی «فەلەستین» یەکجار نارازین.

٤- بە ڕاستی دیماگۆگییەت لە عیراق گەیشتووەتە ڕادەیەك بەر لە هەر شت بەریتانییەکان لە گشت ڕووداوێك تاوانبار بکەن، بۆیەکا بەشێکی زۆر لە «کۆمۆنیستە دڵسۆزەکانی ئیمرۆ ماوەیەك لەمەوبەر پشتی دوژمنە «نازی» یان «فاشیست» ەکانی ئێمەیان دەگرت و ئێمەیش لەوەدا هیچ لۆمەیان ناکەین».

٥- وابزانم دەتوانین بڵێین ئیمرۆ لە «عیراق» ژمارەیەکی کەم شیوعیی تەواو هەیە کە وەك فاشیستەکان پتر میزاجین وەك لەوەی مەبدەئی بن، بەڵام هەمان کات ئەوەیش ڕاستە کە ئێستا «ڕووسیا» تاکە هێزە کە بتوانن پشتی پێ ببەستن لە بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی «بەریتانی» لە «عیراق» و ئارەزووی لاوانی «عیراق»ی ئیمرۆکە وەهایان لێ دەکات مەیلداری پڕوپاگەندەی شیوعی بن.

٦- گومان لە وەدا نییە کە ڕووسیا لە عیراق چالاکە و کاریگەریی سیاسی لە بەهێزبووندایە، هەروەها لەوانەیە زێدەڕۆیی بێ ئەگەر بڵێین نفوزی ئاشکرا یان داپۆشراوی حیزبی شیوعی لە ناو ئەو ڕێکخراوانەی لە پاشکۆی ژمارە (أ)دا ناویان هاتووە هێندە زۆر بێ ڕێگە بۆ نفووزی ڕووسیا لە دواڕۆژدا خۆش بکات.

---

(٩) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا هەردووك زاراوی کۆنەپەرست و دەسەڵاتی بیانی بەو جۆرە خراونەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە "foreign domination" و "reactionary".


ڕەشید عالی کەیلانی

٧- لە «عیراق» هیچ ڕێکخراوێکی فاشستی نییە، تەنها لەوانەیە «دوکتۆر سامی شەوکەت»ی لێ دەربکەیت کە نەتەوەپەرستێکی یەکجار توندڕەوی بەعسیی قەومییە.

ئیمزا
ب.أ. فریزەر،
فرۆکەوان،
ئەفسەری ئیستیخباراتی سەرەکی
هێزی ئاسمانیی مەلەکی لە «عیراق»،
٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٧»[١٠].

دوابەدوای ئەم نامە نهێنییە یەکسەر پاشکۆی ژمارە (أ) دەست پێدەکات کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ناوەرۆکەکەیەتی:

«پاشکۆی أ،
بۆ:
ئیستیخباراتی عیراق،
نیشانە بە نامەی ژمارە س. ٤٨٠٦/١/ فرۆکەوانی،
ناونیشان: حیزبی ئیستیقلال،
وەسفی: حیزبێکی سیاسییە لە عیراق.

سیاسەتی یان ئامانجی: گەلێك نەتەوەپەرستە، باڵی ڕاستی لە پارێزەران و پیشەگەران «حیرەفی» پێکهاتووە، گەلێکیان یاریدەدەری «ڕەشید عالی کەیلانی» بوون، بنەمای سیاسەتی دەرەوەی پان ئەرەبیزم و دژایەتیی

---

(10) N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Bagdhad, No. 300, Name of File: Communism, Secret, Memorandum, National or International Organisations in Iraq in which Communist influence is overtly or covertly prodominant.

بەریتانیایــە هــی وەك «پێداچــوونەوەی پــەیمانی بــەریتانی – عیراقــی»، بایەخــدانێکی زۆر بــە پرســی فەلەســتین، یەکیــەتی عەرەب...هتــد»، لــە سیاسەتی ناوخۆدا دژی کۆمۆنیزم و پارتییە چەپڕەوەکانە، زۆر دژی «نووری سەعیدە»، لە لایەن ڕەهبەرە کۆمارییەکانەوە تاوانبـار کـراوە، زۆر ئامادەیـە بۆ یاریدەدانی گیراوەکان.

مێژووی: مارتی ساڵی ١٩٤٦ لە «بەغدا» دامەزرێنرا و نیسانی هەمان ساڵ میری ئیجازەی پێدا و دەستوبرد لـە مـاوەی چـەند مانگێکدا چـەند لقێکـی دامەزراند، یاریدەی ئەندامەکانی دەدا و بایەخ بـەو ئەندامانەیشـی دەدات کـە سـەر بـە چـینی کرێکـارن، ژمارەیـەك نامیلکـەی دەربـارەی «فەلەسـتین» و سیاســەتی «فەرەنســا» لــە «بــاکووری ئەفــەریقا» و سیاســەتی «ئێــران» لــە «خۆزستان» و هێز و ڕاوێژکارە «بەریتانی»یەکان بلاّو کردۆتەوە، حـوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦یش لەگەڵ پارتییە چەپڕەوەکان ئەو داوایەی مۆر کرد کـە درایـە موفەوەزییــەتی ســۆڤیەتی «لــە «بەغــدا»– ك.م.» دەربــارەی یاریــدەدانی فەلەستین، بەلاّم قایل نەبوو بەشداری ئەو خۆپیشاندانانە بکات کە چەپڕەوە توندڕەوەکان دژی حوکمەت سازیان کرد و تەنانەت لەسەر داوای حوکمەتیش حوزەیرانی ١٩٤٦ بـە ئاشـکرا دژیـان وەسـتا. لـە تەشـرینی یەکـەمی هـەمان ساڵیشــدا لەســەر هێــرش بردنــە ســەر وەزارەتەکــەی «ئەرشــەد عومــەری» ڕۆژنامەی «لواء الاستقلال» قەدەغە کرا و سەرنووسەرەکەیشی گـیرا، یـەکێك لە کارە هەرە گرنگەکانی حیزبی «ئیستیقلال» بانگکردنی ژمارەیـەکی زۆر لـە ڕێکخراوەکانی جیهانی عەرەبی بـوو بـۆ دامەزرانـدنی یەکیەتییـەکی شـەعبیی عەرەب" Arab Popular League" کە پشتگیرییەکی بەرچاوی لێ کرا. کۆتایی ساڵی ١٩٤٦ قایل نەبوونی ئیستیقلال کە هاوکاری لەگەڵ هێزە چەپڕەوەکاندا

بکات بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەك لە ئەندامەکانی ئیستیقالە بکەن، لە ڕۆژانی هەڵبژاردنەکەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧دا ئەندامانی ئیستیقلال لە گەڵ ئەندامانی «حیزبی ئەحرار»دا کەوتنە هاریکاری.

لقەکانی: «مووسڵ»، «حلە»، «بەسرە»، «شەترە»، «تکریت»، «کفری»، «دلێم».

ژمارەی ئەندامانی: ٣٥٠ کەس.

ئۆرگانی: «لواء الأستقلال».

ڕەهبەرەکانی: «محەمەد مەهدی کوبە» و «صدیق شەنشەل» و «عەبدولڕەزاق ئەلزاهر» و «داود ئەلسەعدی» و «شوکری ساڵح زەکی».

تێبینی: بە ناوی ڕەهبەرەکانی ئێستایدا وەها پێدەچێ کۆمۆنیستەکان جۆرە دزەیەکیان کردبێتە نێو ڕیزەکانییەوە، هەر چۆنێك بێ، بەشێك لە ئیستیقلالییەکان بە باشی دەزانن بە مەبەستی بەهێز کردنی حیزبەکەیان، هاریکاری لەگەڵ چەپدا بکەن، بەڵام ئاخۆ هاریکارییەکی وەها دەبێتە هۆی گۆڕینی سەرکردایەتی حیزب و ڕێگە خۆش دەکات بۆ «نوێخوازەکان» بتوانن چاکسازییەکی وەك ئەوەی حیزبی تودەی ئێران بکەن. ئەوەی لێرەدا پێویستە بگوترێ ژمارەیەك لە پارتییە چەپڕەوەکانی «عیراق – ك.م.» نامەیان لە «خالید بەگداش»ی «حیزبی شیوعی سووری»یەوە پێگەیشتووە کە تیایدا هانیان دەدات پێوەندیی خۆیان لەگەڵ حیزبی ئیستیقلالدا بە تین بکەن «چونکە ئامانجەکانمان لە بەرهەڵستیی ئیمپریالیزمدا یەکمان بخەن».

هەر چەندە لەوانەیە «لە بابەتی دیکەدا» جیاوازی لە نێوانماندا هەبێ، ئێستا «حیزبی ئیستیقلال» پێوەندیی نزیکی لەگەڵ بەعسی قەومیی «دوکتۆر سامی شەوکەت»دا هەیە کە لەوانەیە تاکە ڕێکخراوی فاشستی بێ لە «عیراق دا»[11].

---

(11) Ibid, Appendix A to Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1/ Air Int., Title: Hizb al – Istiqlal.

بەشێکی دیکەی پاشکۆی (أ) بە هەمان دەستوور بۆ باسی «پارتی ڕزگاریی نیشتیمانی» «الحزب التحرر الوطني» تەرخان کراوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«پاشکۆی أ،

بۆ: ئیستیخباراتی «عیراق»،

نیشانە بە نامەی ژمارە س ١/٤٨٠٦/فرۆکەوانی،

ناونیشان: پارتی ڕزگاریی نیشتیمانی –الحزب التحرر الوطني»،

وەسفی: کۆمەڵەیەکی عیراقی نهێنی یە،

سیاسەتی یان ئامانجی: ئامانجی سەرەکی بریتییە لە چاکسازیی کۆمەڵایەتیی گشت لایەنە چەپڕەوەکان. دروشمی سیاسیی سەرەکی بریتییە لە وەدیهێنانی سەربەخۆیی و سیادەی عیراق لە ڕێگەی دەرکردنی گشت بیانییەکان و نەهێشتنی دەسەڵاتی بێگانە. وەها پێدەچێ ئەو ئامانجانە وەك ئامانجەکانی پارتێکی «فەلەستین»ییە بە هەمان ناوەوە.

مێژووی: یەکەم داوای ڕێگەپێدانی بۆ کارکردنی ئاشکرا ڕۆژی بیستی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ پێشکەش کرا، بەڵام ڕەفز کرا، چەند جارێکی دیکە ئەو داوایەیان دووپات کردەوە و هەمان کاتیش داوایان دەکرد ڕێگەیان بدەن ڕۆژنامەیەك بەناوی «ألتحرر»ەوە دەربکەن، بەڵام هەموو جاران ئەو داوایانە ڕەت دەکرانەوە.

ئەم پارتییە بە خێرایی تەشەنەی سەند، تایبەت لە «دیوانییە» و «نەجەف» و ساڵی ١٩٤٦یش هەوڵیاندا لقێك لە «بەسرە» بکەنەوە و لە حوزەیرانی هەمان ساڵیشدا ویستیان لقێك لە «مووسڵ» دابمەزرێنن.

نیوەی دووەمی ساڵی پار پارتی «تەحەڕوڕ» سەرقاڵی ڕێکخستنی ژمارەیەك مانگرتن و خۆنیشاندان بوو، تایبەت مانگرتنی کرێکارانی پۆستە و تەلەگرافی ڕۆژی سیازدەی ئەیلوول و خۆنیشاندانی ڕۆژی بیست و هەشتی حوزەیران.

لقەکانی: بارەگای فەرمی لە «بەغدا» و لقەکانی لە دیوانییە و بەسرە و

نەجەف و مووسڵ.

ژمارەی ئەندامەکانی: ٥٠٠٠ پێنج هەزار ٠.

بڵاوکراوەکانی «تەحەڕوڕ» کە تەنها یەك جار چاپ کرا. وتارەکانی لە چاپخانەکانی «حیزبی شیوعیی لوبنان»ی چاپ کراون، وێڕای «القاعدە» و نامیلکەی دیکە.

ڕەهبەرەکانی: «حەسوون عەیاش چەلەبی» و «شێخ عەزیزی شێخ کاظم– دیوانییە» و «سەلیم عوبید ئەلنعێمی» و «محەمەد حسەین ئەلشەبیبی»[١٢].

تێبینی: پارتی تەحەڕوڕ قوتابییانی ڕاکێشاوە، بەڵام زۆربەی ئەندامەکانی کرێکار و سەر بە چینە هەژارەکانن. «شیوعییەکان»[١٣] زۆر هەوڵیان دا بۆ دامەزراندنی بەرەیەك لە نێوان «پارتی گەل – حزب الشعب» و «پارتی نیشتیمانیی دیموکراسی – الحزب الوطني الديمقراطي» و «پارتی یەکیەتی نیشتیمانی – حزب الاتحاد الوطني» و «پارتی ڕزگاریی نیشتیمانی – حزب التحرر الوطني»دا دابمەزرێنن، بەڵام ئەو هەوڵانە هیچ ئەنجامێکیان نەبوو، هەرچەندە هاریکارییەکی دیار لە نێوانیاندا لە بواری مانگرتن و خۆنیشاندانەکاندا هەیە. «پارتی ڕزگاری نیشتیمانی» تا ڕادەیەك لە بواری دامەزراندنی نەقابە کرێکارییەکاندا سەرکەوتووە. وەها دیارە ئەم پارتییە ژمارەی ئەندامەکانی لە پارتییەکانی دیکە پترە و یەکێکە لەو ڕێکخراوە سەرەکییانەی سەر بە کۆبەندن»[١٤]. پاشکۆی أ،

---

[١٢] تەنها ناوی «محەمەد حسەین ئەلشەبیبی» بە دەستخەت نووسراوە.

[١٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی «شیوعییەکان» «Communists» خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

[14] N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A To Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1/Air Int., Title: Hizb Al Taharrur al Watani.

بۆ: ئیستیخباراتی عیراق،

نیشانە بە نامەی ژمارە س. ٤٨٠٦/ ١/ فرۆکەوانی،

ناونیشان: «ڕێکخراوی دژی زایۆنیزم – عصبة مکافحة الصهیونیة»،

وەسفی: کۆمەڵەیەکی عیراقی نهێنییە،

سیاسەتی یان ئامانجی: خەبات دژی زایۆنیزم و بەشداری کردووە لە گشت ئەو چالاکییەنەدا «کە لە «عیراق» – ک.م.» دژی زایۆنیزم ئەنجامدراوە. هەمیشە بە بیرو بۆچوونەکانیدا دیارە کە ڕێکخراوێکی چەپڕەوە.

مێژووی: مانگی ئەیلولی ١٩٤٥ ئەم ڕێکخراوە «کۆمەڵەیە» لە لایەن هەشت لاوی جوولەکەوە دامەزرێنراوە کە گشتیان چەپڕەون و «حەمدی پاچەچیی» سەرەك وەزیرانیش پشتی گرتوون، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو داوایەی پێشکەشیان کرد بۆ ئەوەی ڕێگەیان پێ بدرێ بە ئاشکرا کار بکەن ڕەفز کرا، ئەوانەی ئەو داوایەیان ئیمزا کردووە شیوعیی توندڕەوی دژ بە بەریتانیایان تێدایە. مارتی ساڵی ١٩٤٦ ڕێگەی کاری ئاشکرایان پێ درا، بەلام لەوانەیە ئەوە لەبەر خاتری «کۆمیتەی داخوازیی «فەلەستین» بووبێ، ئەم ڕێکخراوە، «کۆمەڵە»یە دژی سایۆنیزم یەکەم کۆنفرانسی خۆی لە مانگی نیساندا بەست و کەوتە دەرکردنی ڕۆژنامەی «العصبة» و مانگی مایسیش لقێکی لە «بەسرە» دامەزراند و بە هۆی بڕیاری خۆنیشاندانی هەشتی حوزەیرانەوە لە «بەغدا» ئەندامە سەرەکییەکانی ڕێکخراوی ناوبراو بەند کران و ڕۆژنامەی «العصبة»یش بۆ ماوەی یەك ساڵ داخرا. خۆنیشاندانەکە ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی حوزەیران سازکرا، هەشت تاوەکو سەد پۆلیسێك ئامادە کران بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەن خۆنیشاندەرەکان بگەنە بارەگای باڵوێزخانەی بەریتانی لە «بەغدا»، پۆلیسەکان ناچار بوون تەقە لە خۆنیشاندەران بکەن، ئەو دروشمانەیش کە بەرزیان کردبوونەوە بوونە هۆی دروستبوونی جۆرە گەرەلاوژێیەك.

ئابی ساڵی ١٩٤٦ عصبه قەدەغە کرا، بەڵام خۆنیشاندان بەردەوام بوو، دوا خۆنیشاندانیش «تاوەکو ئامادەکردنی ئەم راپۆرتە– ك.م.» رۆژی سیازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ ساز کرا.

لقەکانی: بارەگای سەرەکیی لە «بەغدا» و لقی «بەسرە».

ژمارەی ئەندامەکانی: هەزار کەس.

بڵاوکراوەکانی: رۆژنامەی «العصبة» کە قەدەغە کرا، وێڕای ژمارەیەك پەخشە و نامیلکەی وەك «زایۆنیزم دژی عەرەب و جووە» کە لە نووسینی «یۆسف هاروون زەلخا»یە.

تێبینی: عوصبە هەمیشە هاوپەیمانێکی نزیکی «پارتی رزگاریی نیشتیمانی – حزب التحرر الوطني»ی نهێنی بوو، هەروەها عوصبە ئەڵقەیەکی دیاری کۆڕی دژ بە ئیمپریالیزم «دژ بە بەریتانیا» بوو، «کشانەوەی هێزە بیانییەکان»یش لە «عیراق» هەمیشە یەکێك لە دروشمە سەرەکییەکانی بوو، هەمان کات میری و چینە بەرزەکان لە بابەتی هێرشەکانی بوون.

بە گشتی پرۆپاگەندەی عوصبە زۆر لەو پرۆپاگەندانە دەچن کە لە «مۆسکۆ»وە دەردەچن»[١٥].

بابەتی دواتری هەمان پاشکۆی (أ)ی هەمان فایل بۆ «پارتی نیشتیمانیی دیموکراسی» «الحزب الوطني الديمقراطي» تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«پاشکۆی أ،

بۆ:

ئیستیخباراتی عیراق،

---

[15] Ibid, Appendix A To Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1/Air Int., Title: Anti Zionist League.


کامل الچادرچی

نیشانەبە:

نامەی ژمارە س. ٤٨٠٦/ ١/ فرۆکەوانی،

ناونیشـــــان: «پـــــارتی نیشـــتیمانیی دیموکراسی» «الحزب الوطني الديمقراطي»،

سیاســـەتی یــان ئامــانجی: پارتییــەکی سۆشــیالیزمی چــەپڕەوە کــە خوێنــدەوارە چــەپڕەوەکانی ڕاکێشــاوە، لــە سیاســەتی دەرەوەیدا دژ بە «بەریتانیا»یە «وەك داواکردنی پێداچــوونەوە بــەو پەیمانــەی «عــێراق»دا کــە لەگەڵ «بەریتانیا»یە و ئەو جۆرە دروشمانە». هەمیشە مەیلی بە لای چەپدا زۆر بووە و تەنانەت وەك پارتێکی «شیوعی» ناوی هێنراوە.

مێــژووی: ســەرەتای ســاڵی ١٩٤٦ وەك پارتییــەکی سۆشــیالیزمی دامــەزرێنرا، ڕەهبــەرانی لــە ســەرەتاوە ئاگاداری ئــەوە بــوون ڕێگــە نەدەنــە شیوعییە دوورخراوەکان، بەتایبەتی ئەندامانی «پارتی ڕزگاریی نیشتیمانی — حزب التحرر الوطني» بە نهێنی کێشەیان بۆ دروست بکەن، ئەوانەی لە کۆبوونــەوە زووەکــانی «پــارتی نیشــتیمانیی دیموکراســی»دا کێشــەیان بــۆ نانەوە، لە ژێر فشاری بڕیارەکانی کابینەکەی «ئەرشەد عومــەری»دا پارتییــە چەپڕەوەکان ناچار بوون لە نزیکەوە هاریکاری لەگەڵ یەکدا بکەن هەر چەندە هــەوڵ و کۆششــی هــەر کەسێك لــە پارتییــە مۆڵــەت پێدراوەکان بۆ کۆبوونەوەیان لە یەك بلۆکدا سەری نەگرت و یەکێکیش لە هۆکانی ئــەو ســەر نەگرتنە بریتــی بــوو لــە خۆپــەرستیی ڕەهبــەرەکانیان و ئــەنجامیش «پــارتی نیشتیمانیی دیموکراســی»دەیدی کــە ئــەو پێویســتە نــزیکتر لەگــەڵ «پــارتی تەحەڕوڕ»دا هاریکاری بکات و بەو جۆرە «پارتی نیشتیمانی دیموکراسی» تــا دەهــات خێراتــر بــەرەو چــەپ دەڕۆیشــت و ئــەوەیش کــارێکی ئــەوتۆی کــرد «کامیل چادرچیی» سەرۆکی حیزب بەند بکرێ، بــەڵام کاتێك کۆتــایی ســاڵی ١٩٤٦ «نــووری ســەعید» وەزارەتــە هاوپەیمانەکــەی خــۆی پێکهێنــا «پــارتی

نیشتیمانیی دیموکراسی» قایل بوو لەو وەزارەتەدا بەشدار بێ و ئەوە بوو «محەمەد حەدید» بووە وەزیر، بەڵام زۆری نەخایاند کاتێك ئیستیقالەی کرد، چونکە ئەو پەیمانەی نەبردە سەر کە دەربارەی سازکردنی هەڵبژاردنێکی ئازادی «ئەنجوومەنی نوێنەران- ك.م.» دابووی، ڕاستییەکەیشی بڕیاری بەشداریکردنی «محەمەد حەدید» لەو وەزارەتەدا بە لای ئەندامە توندڕەوەکانی «پارتی نیشتیمانیی دیموکراسی»یەوە کارێکی پەسند نەبوو، بۆیەکا بەشێکیان دایانە پاڵ پارتییە چەپڕەوەکانی دیکە.

لقەکانی: لە «بەغدا» و مووسڵ و بەسرە و ناسرییە و حیللەن.

ژمارەی ئەندامەکانی: هەزار کەس دەبن.

بڵاوکراوەکانی: ڕۆژنامەی «صوت الأهالي».

ڕەهبەرەکانی: «کامیل چادرچی» و «محەمەد حەدید» و «حسەین جەمیل» و «زەکی عەبدولوەهاب».

تێبینی: هەڵوێستی «پارتی نیشتیمانیی دیموکراسی» تاوەکو ئێستا دەربارەی پرسی «شیوعی»یەك نییە، بەرپرسە سەرەکییەکانی دژی ئەوەن حیزبەکەیان لەگەڵ پارتییە چەپڕەوەکاندا هاریکاری بکات، تایبەت ئەوانەیان کە ئەندامەکانیان سەر بە چینی جیاوازن و زۆرتر شەلاتییانە ڕەفتار دەکەن، هەر چۆن بێ با بزانین ئەو جۆرە کەسانە یاخود «شیوعییەکان» (١٦) دەست بەسەر «پارتی نیشتمانی دیموکراسی»دا دەگرن(١٧).

---

(١٦) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی (شیوعییەکان) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

(17) N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A to Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1/Air Int, Title: Hizb al Watani al Demokrati.


عەزیز شەریف

دوابـــــەدوای «پــــارتی نیشـــــتیمانیی دیموکراسی» لە هەمان پاشکۆی هەمان فایلدا نۆرەی «پـارتی گـەل» «حـزب الشـعب» ەکـەی «عەزیز شەریف» دێت، کە یەکێك بوو لە دۆستە هەرە نزیکەکانی کورد، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو بابەتەیە:

پاشکۆی أ،

نیشـــانە بەنامـــەی: ژمـــارە س. ٤٨٠٦/١/ فرۆکەوانی،

ناونیشان: «پارتی گەل — حزب الشعب»،

وەسفی: پارتێکی سیاسیی عیراقییە.

سیاسـەتی یـان ئامـانجی: پارتییـەکی چـەپڕەو و توندڕەوە، پێوەنـدیی نزیکی لەگـەڵ «پـارتی تەحـەڕوڕی نیشـتیمانی» نهێنـی و حیزبـی «شـیوعیی سـووری»دا هەیـە. لـە بـواری دامەزرانـدنی نەقابـەی کرێکارانـدا چـالاکە، ڕێکخراوێکی یەکجار نیشتیمانپەروەر و دژ بە بیانییە.

مێـژووی: سـەرەتا لـە کـانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٤دا دامـەزرێنراوە و مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٦ میری ئیجازەی کارکردنی پێدا، سیاسـەتی زووی بە لای چاکسازیی کۆمەڵایەتی و سۆشیالیزمێکی میانڕەودا دەیشـکاندەوە و ڕەهبـەرەکانی ڕۆڵێکـی چـالاکیان لـە بـواری دامەزرانـدنی نەقابـە کرێکارییـە زووەکـانی عیراقـدا بینـی. کاتێـك «کامیـل چادرچـی» «پـارتی نیشـتیمانیی دیموکراسی»ی دامەزراند گەلێك لە ڕەهبـەرە بەرپرسـەکانی «پـارتی گـەل»ی ڕاکێشا بۆیەکا ئیتر ئەم پتر بووە پارتی کارمەندە بچووکەکان و قوتابییـان و ئەو جۆرە دەستە و دایەرانە و ئەوەیش زۆرتر بەرەو چەپ پاڵی پێوەنا. ئـەو هەوڵە زۆرەی ساڵی ١٩٤٦ بۆ یەکگرتنی پارتییە چەپڕەوەکان دران گشتیان بـە فـیڕۆ چـوون، هـۆی سـەرەکیی ئـەوەیش خۆپەرستیی ڕەهبـەرانی ئـەو پارتییانە بوو، هەرچەندە «پارتی گەل» بۆ چـەند هەفتەیـەك لەگـەڵ «پـارتی

یەکیەتی نیشتمانی» «حزب الأتحاد الوطني»دا یەکیان گرت و لە نزیکەوە هاریکارییان لەگەڵ «پارتی تەحەڕوڕ»دا لە بواری ڕێکخستنی خۆنیشاندان و مانگرتنەکانی کرێکاراندا دژی میری و «بەریتانی»یەکان کرد.

لقەکانی: لە «بەغدا» و «بەسرە» و «عەممارە» و «کوت» و «حیللە» و «مووسڵ»ن.

ژمارەی ئەندامەکانی: هەزار و پێنج سەد کەس دەبن.

ئۆرگانی: ڕۆژنامەی نیشتمان «الوطن».

ڕەهبەرەکانی: «عەزیز شەریف» و «کەمال عومەر نەزمی» (١٨) و «تۆفیق مونیر» و «عەبدولڕەحیم شەریف».

تێبینی: «عەزیز شەریف» پێوەندیی بە شیوعییەکانی «سووریا»وە هەیە کە وەك ئاشکرایە پێوەندییان لەگەڵ «مۆسکۆ»دا هەیە.«پارتی گەل» بڵاوکراوەی هەیە کە وا دیارە لە ««ڕووسی»یەوە وەرگێڕدراون، هەر چەندە لە ڕاستیدا «پارتی گەل» ڕێکخراوێکی شیوعیی نییە، بەڵام بێگومان کەوتووەتە ژێر کاریگەریی پڕۆپاگەندەی شیوعییەوە و ژمارەیەکی کەم لە ئەندامەکانی وەها هەست دەکەن کە ئەوان ئێستاکە شیوعین» (١٩).

---

(١٨) «کەمال عومەر نەزمی»، کوڕی «عومەر نەزمیی» بەناوبانگە کە، بە ڕەگەز«کورد»ە و چەند جارێك لە ڕۆژگاری پاشاییدا بووە بە وەزیر، برای «جەمال» و «دوکتۆر وەمیض عومەر نەزمی»یە، «کەمال عومەر نەزمی» چەپڕەو بوو، دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ لە «دادگای گەل» «محكمة الشعب» کاری دەکرد، ئەو بنەماڵەیە لە دانیشتوانی شاری «کفرین»، دوکتۆر «فارس»، کە خاتوو «نارین صدیق» هاوسەریەتی کوڕی «کەمال عومەر نەزمی»یە، هەن بە هەڵە ئەو بنەماڵەیە بە «تورکمان» دادەنێن.

(19) N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A to Iraq Intelligence, MEMO, S.4806/1/Air Int, Title: Hizb al Shaab.

وا بـه دوای بابـەتی «پـارتی گـەل» و «عـەزیز شـەریف»ی ڕەهبـەری بـە ناوبانگی، نۆرەی «پارتی یەکیەتی نیشتیمانی» «حزب الأتحاد الـوطني» دێـت کە لە هەمان فایلدا بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی دەکات:

«پاشکۆی أ،

بۆ: ئیستیخباراتی عیراقی،

نیشانە بە: نامەی ژمارە س ٤٨٠٦/١/ فرۆکەوانی،

ناونیشانی: «پارتی یەکیەتی نیشتیمانی – حزب الأتحاد الوطنی»،

وەسفی: پارتێکی سیاسیی عیراقییە،

سیاسـەتی یـان ئامـانجی: پارتییـەکی چـەپڕەوی نیشـتیمانییە، گـەلێك چالاکی لە پێنـاو پێکهێنـانی بەرەیەکدا لـە نێـوان ڕێکخـراوە چـەپڕەوەکاندا نواندووە.

مێژووی: ئەم پارتییە مـانگی نیسـانی سـاڵی ١٩٤٦ لـە لایـەن ژمارەیـەك چەپڕەوی ناسراوی «بەغدا»وە دامەزرێنرا، تا ڕادەیەکی زۆر مێژووی «پـارتی یەکیەتی نیشتیمانی» لە مێژووی «پارتی گەل» دەکات کە بەپێی ڕاپۆرتـەکان هەوڵێکی زۆر بۆ یەکگرتنیان دراوە.

لقەکانی: لە «بەغدا» و «مووسڵ».

ژمارەی ئەندامانی: سێ سەد کەس دەبن.

ئۆرگانی: ڕۆژنامەی «صوت السیاسة».

ڕەهبەرانی: «عەبدولفەتاح ئیبراهیم» [٢٠] و «عەبدوڵڵا مەسعوود» و «نـازم زەهاوی» و «محەمەد ساڵح بەحر العلوم».

---

[٢٠] لە دوا قۆناغی ژیانیدا زۆر لەنزیکەوە خوالێخۆشبوو «عەبدولفـەتاح ئیـبراهیم»م ناسی و زوو زوو دەچوومە خزمەتی، پیاوێکی خوێندەوار و ساکار بوو، بە دڵ کوردی خۆشدەویسـت، بـە هەموو جۆر یاریدەی شـاگردانی خوێنـدنی بـالای دەدا و هـەوڵی دەدا ئامـادەی تۆژینـەوەی نامەکانیان بێت، تاوەکو ئێستا یەك نامەی ماجستێری دەربارەی نووسراوە، پـێم وایـە «مـام جەلال» یەکێك بوو لە هەرەتی لاویدا بۆچـوون و دیـدەکانی «عەبدولفـەتاح ئیـبراهیم» کاریـان

تێبینی: گەلێك لە ئەندامانی «پارتی یەکیەتی نیشتیمانی» هەر شتێك ڕووسی بێ بە لایانەوە پەسندە، بەلام زەحمەتە بە حیزبێکی شیوعی لە قەڵەم بدرێ، هیچ نەبێ لەم قۆناغەی ژیانیدا» [٢١].

لێرەدا و لە ناو هەمان فایلدا نۆرەی «پارتی ڕزگاری کورد» دێت کە ئەم زانیارییە بە نرخانەی لای خوارەوەی دەربارەی تێدایە[٢٢]:

«پاشکۆی أ،

بۆ:

ئیستیخباراتی عیراقی،

نیشانە بە:

نامەی ژمارە C ٤٨٠٦/١/فڕۆکەوانی،

ناونیشان: «پارتی ڕزگاری کورد»،

وەسفی: پارتێکی نەتەوەپەروەری کوردییە و مەیلی کۆمۆنیستی هەیە،

سیاسەتی یان ئامانجی: وێڕای داواکردنی چاکسازیی کۆمەلایەتیی گشتی ئامانجی سەرەکیی «پارتی ڕزگاری کورد» دامەزراندنی «دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی»یە کە «کوردی» «ئێران» و «عیراق» و «تورکیا» و «سووریا» بگرێتەوە.

---

تێی کردبوو، دوورنییە ئەوە ڕەنگی خۆی لە هەڵبژاردنی ناوی «پارتی یەکیەتی نیشتمانی»دا دابێتەوە.

(21) N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A To Iraq Intelligence, MEM، S.4806/1/Air Int, Title: Hizb al- Ittihad al Watani.

(٢٢) دەربارەی «پارتی ڕزگاری کورد» لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا بڕوانە ل ٢٠٥– ٢٠٩ی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە.



تۆفیق وهبی

مێژووی: سەرەتای دروستبوونی «پارتی ڕزگاری کورد» تەواو نەزانراوە، لەوانەیە ناوی ئەم پارتییە لە ناوی ئەو کۆمەڵەیەوە هاتبێ کە لەساڵی ١٩٣١دا موتەسەرِیفی پێشووی «هەولێر» «تۆفیق وەهبی»[٢٣]، دایمەزراند و وەك دەڵێن «ماجید مستەفا» و «عەلی کەمال» دایانە پاڵی. «پارتی ڕزگاری کورد» دوای ئەوەی یادداشتێکی پێشکەش بە کۆنفرانسی وەزیرانی هەندەرانی وڵاتە هاوپەیمانەکان کرد، کە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ لە «مۆسکۆ» بەستیان بە بوونی ئەو پارتییە زانرا، هەمان «پارتی ڕزگاری کورد» یادداشتێکی دیکەی لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا پێشکەش بە «نەتەوە یەکگرتووەکان» کرد و لەوساوە بەوە زانرا کە لقەکانی «پارتی ڕزگاری کورد» لە «بەغدا» و شارەکانی باکووری «عیراق» هەن، بە درێژایی ساڵی پاریش «ڕزگاری» ژمارەیەکی زۆر پەخشە و نامیلکەی زاخاودراو بە بیر و بۆچوونی چەپڕەوی دژی «بەریتانییەکان» و حوکمەتی «عیراق» بڵاو کردەوە.



ماجد مستەفا

لقەکانی: لە «بەغدا» و «کەرکووك» و «سلێمانی» و «هەولێر» و «ڕەواندز» و «عەمادییە» و زاخۆ.

ژمارەی ئەندامەکانی: ژمارەی ئەندامەکانی «پارتی ڕزگاری کورد» بە تەواوی نەزانراوە.

ئۆرگانی: «پارتی ڕزگاری کورد» وەك بۆخۆی دەڵێ ڕۆژنامەی «ڕزگاری» ئۆرگانییە.

---

[٢٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە بریتی وەهبی بە هەڵە وەهاب (Wahab) چاپ کراوە، وێڕای ئەوەیش سەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابردوو خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی موتەسەرِیفی سلێمانی بوو نەك هەولێر.



عوني يوسف



سالح حەیدەری



ئیسماعیل حەقی شاوەیس

ڕەهبەرەکانی: «ماجید مستەفا»(؟) و «تۆفیق وەهبی» (؟) و «عەلی کەمال» (؟)[1] و «عەونی یوسف» و «ڕۆستەم جەبار» و «ئیسماعیل شاوەیس»[2] و «جەمال عەبدوللا» و «ڕەمزی عەبدولکەریم» و «سالح حەیدەری».

تێبینی: چالاکییەکانی «پارتی ڕزگاری کورد» لەم قۆناغەدا تەنها بریتییە لە بڵاوکردنەوەی پەخشە و نامیلکە و هەرچەندە «ڕزگاری» بە ڕێکخراوێکی شیوعی لە قەڵەم دەدرێ و پتر پشتی بە «ڕووسیا» ئەستووره وەك «بەریتانی»یەکان بۆ هێنانە دی ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی یەکگرتوو لە کوردستانی «ئێران» و «عیراق» و «تورکیا» و «سووریا»، بەلام «ڕزگاری» لە ڕاستیدا پتر ڕێکخراوێکی نەتەوەپەرستە وەك لەوەی ڕێکخراوێکی چەپڕەوی توندڕەو بێ. ئەوی ڕاستی بێ کۆمۆنیزم بە واتای وشە زۆر لای «کورد» پەسند نییە»[3].

---

[1] لە دەقی بەلگەنامەکەدا ئەو پرسگەیە لە تەنیشت ناوی ئەو سێ کەسەوە دانراوەو تەنانەت ناوی مامۆستا «تۆفیق وەهبی»ش بە خەتێکی سوور کوژێنراوەتەوە، هەڵبەت ئەو سێ کەسایەتییە ئەندامی «پارتی ڕزگاری کورد» نەبوون و زۆریش مەیلیان لەگەڵ ئەو پارتەدا نەبوو، چونکە بە ڕێکخراوێکی شیوعییان لە قەڵەم دەدا.

[2] دیارە مەبەستی خوالێخۆشبوو مامۆستا «ئیسماعیل حەقی شاوەیس»ە کە کوردێکی دڵسۆزی چەپڕەو بوو.

[3] N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A to Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1 Air Int, Title: Rezgari Kurd Party.

وەها دیارە هەر ڕێکخراوێك لە دوور و نزیکەوە هەر جۆرە پێوەندییەکی بە بیرو بۆچوونی کۆمۆنیزمەوە هەبووبێت، یان بە هەر شێوازێك لە شێوازەکان پێوەندی بە «یەکیەتی سۆڤیەت»ەوە هەبووبێت دیپلۆماسییە بەریتانییەکان بە چرای ڕۆنگەرچەکەوە کەوتوونەتە عەودالّی و زانیاریی ئەوتۆیان دەربارەی کۆکردۆتەوە کە لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نین و دلّنیام کەسێك لە ئێمەومانان بە هیچ کلۆجێك نەمانبیستوون، بەلّگەی سەلمێنەری ئەم بۆچوونەیش ئەم ڕاستییانەی لای خوارەوەن کە دوا بەشەکانی پاشکۆی (أ) ی فایلی ژمارە ١١٦/٦٢٤ی وەزارەتی هەندەرانی «حوکمەتی بەریتانیایا»ن بۆ تەرخان کراون و ئەمەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«پاشکۆی أ،

بۆ:

ئیستیخباراتی عیراقی،

نیشانە بە:

نامەی ژمارە س. ٤٨٠٦/١/فرۆکەوانی،

ناونیشان: «کۆمەلّەی لاوانی ئەندەنووسیا – جمعیة الشباب الأندنوسیین»،

وەسفی: کۆمەلّەیەکی سیاسیی نێونەتەوەیی «أممي»یە «؟»[27]،

سیاسەتی یان ئامانجی: کۆمەلّەیەکی نێونەتەوەییە لە لایەن ئەو «ئەندەنووسی»یانەوە دامەزرێنراوە کە لە «عیراق» دەژین بۆ هێنانە دیی ئامانجەکانی نەتەوەپەرستانی «ئەندەنووسیا».

مێژووی: ئەم کۆمەلّەیە لە سەر بنەمای کۆمەلّەیەکی دیکەی «ئەندەنووسی» لە «بەغدا» بە ناوی «کۆمەلّەی ماکیندۆم»ەوە[28]

---

[27] لە دەقی بەلّگەنامەکەدا ئەو پرسگەیە لە تەنیشت وشەی نێونەتەوەیی بەو جۆرە دانراوە. "International?"

[28] بە داخەوە نەمتوانی بزانم «کۆمەلّەی ماکیندۆم» "Makindom Society" مانای چییە.

دامـەزرێنراوە، سـەرەتا، لـە کـانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٥دا، «حوکمـەتی عـێراق»ی قایـل نـەبوو مۆڵـەت بداتـە ئـەم کۆمەڵەیـە، کـە بـەردەوام وەك کۆمەڵەیـەکی نهێنـی کـاری دەکـرد، تـاوەکو مـانگی ئـەیلوولی سـاڵی ١٩٤٦ مۆڵـەتی پێـدرا و ئەوسـاکەیش ژمـارەی ئەندامـەکانی چـل پـەنجا کەسێکی «ئەندەنووسی» دەبوون. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیـە، دژی ئەڵـەمانیا و تایبـەت «بـەریتانیا» کارییـان دەکـرد و ئەمـەیش سـەرنجی پارتییـە چـەپڕەوەکانی «عێراق»ی ڕاکێشا، بەڵام ئەم دیاردەیە زۆری نەخایاند ڕەوییەوە و کۆمەڵەکە خۆیشـی ڕووی لـە کـزی کـرد بـە ڕادەیـەك ژمـارەی ئەندامـەکانی لـە مـانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧دا هاتە سەر دەوروبـەری تـەنها پـازدە ئەنـدام، «عـەمران ڕەشـیدی» [٢٩] ڕەهبـەری کۆمەڵەکـە و ژمارەیـەك لـە ئەنـدامانی کۆمیتەی ناوەندی کە لە لایەن ئەو «ئەندەنووسی»یانـەوە دامـەزرێنرا کـە لـە وڵاتە «عەرەبی»یەکان دەژیان دەیانویست لە کۆنفرانسی لاوانـی «عـەرەب»دا بەشـدار بـن کـە سـاڵی ١٩٤٦ بەسـترا، خـودی «عـەمران ڕەشـید» جـۆرە پێوەندییەکی پچڕ پچڕی بـە موفەوەزییـەتی «سۆڤیەت»ییـەوە لـە «بەغدا» هەبوو.

لقەکانی: لە «بەغدا» و «نەجەف» و «ئینگلتەرە» و «هۆڵەنـدە» دوو لـق و «ئەمەریکا» دوو لق و «هندستان» دوو لق و «قاهیرە».

ژمارەی ئەندامەکانی لە «عێراق»: پازدە کەس.

بڵاو کراوەکانی: «ئەندەنووسیا» — گۆڤارێکە جاروبار لە لایـەن «عـەمران ڕەشیدە»وە بڵاو دەکرێتەوە.

ڕەهبەرەکانی: «عەمران ڕەشید» کە قوتابیی کۆلێجی یاسایە لە «بەغدا» و ئەندەنووسییە.

---

[٢٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نـاوی سـەرۆکی ئـەو کۆمەڵـە ئەندەنووسـییە بـەم جـۆرە هـاتووە: Umran Rachid

تێبینی: تاوەکو ڕادەیەکی زۆر کۆمەڵەیەکی کەم بایەخە و هیچ ڕۆڵێکی لە ژیانی سیاسیی «عیراق»دا نەبینی لەوە بەولاوە کە هەوڵی دا هەستی «عیراق»ییەکان بۆ پرسی «ئەندەنووسیا» ڕابکێشێ و تەنانەت ئەوەیش بە تەواوەتی نەزانراوە کە ئایا «کۆمەڵەی لاوانی ئەندەنووسیا» کۆمەڵەیەکی نێودەوڵەتییە و دەربارەی کاریگەریی سۆڤیەتیش لەم بوارەدا شتێکی ئەوتۆ نەزانراوە[٣٠].

دوا بەدوای ئەمە لە هەمان پاشکۆی (أ)ی هەمان فایلدا باسی کۆمەڵەیەکی ئەرمەنی لە عیراق بەم جۆرەی لای خوارەوە دەکات:

«پاشکۆی أ،

بۆ:

ئیستیخباراتی عیراقی،

نیشانە بە:

نامەی ژمارە س. ٤٨٠٦/١/فڕۆکەوانی،

ناونیشان: «کۆمیتەی ئەرمەنە موهاجیرەکان – الجمعیة الأرمنیة للمهاجرین»[٣١]،

وەسفی: کۆمیتەیەکی حەل کراوە،

سیاسەتی یان ئامانجی: ناونووسکردنی ئەو ئەرمەنانەی دەیانەوێت بگەڕێنەوە «ئەرمینیای سۆڤیەت»ی.

مێژووی: لە مانگی ئابیساڵی ١٩٤٦دا دامەزرێنرا.

لقەکانی: لە «بەغدا» و لقی پێشنیازکراوی لە «کەرکووک».

---

[30] N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A To Iraq Intelligence, MEMO, S.4806/1 Air Int, Title: Jamita al Shubban al Indonesia.

[٣١] ناوەکەی لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرەیە:
"Armenian Emigration Committee".

ژمارەی ئەندامەکانی: نۆ کەس.

بلاوکراوەکانی: هیچ.

ڕەهبەرەکانی: «هەمبەر سۆم[۳۲] ئەتاشیان» و «ستراك دایەغیان» و «سەرکیس زۆلۆمیان» و «ئاکۆب وەرتابیدیان» و «ئیسرائیل زۆکیان» و «ئۆڤانیس ئێسپێریان» و «ئۆڤانیس جیڤانیان» و «کۆستان چاکاسیان» «یان چێرکەسیان» و «تۆرۆس بەسماغمیان».

تێبینی: «کۆمیتەی ئەرمەنە موهاجیرەکان» بە فەرمی پێوەندیی لەگەڵ موفەوەزییەتی «سۆڤیەت»ی لە «بەغدا» و کۆمیتەی ناوەندیی ئەرمەنە موهاجیرەکان لە «یەریڤان» هەیە»[۳۳].

هەرچی پاشکۆی (ب)ی هەمان فایلی ژمارە ٦٢٤/١١٦ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی «بەریتانی»یە تەرخان کراوە بۆ بابەتی نەقابەکانی «عیراق» لە ناوەندی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا و دیسانەوە گەلێك زانیاریی نەزانراو یان کەم زانراو لە دووتوێی ئەو پاشکۆیەدا هەڵگیراون کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ئەو زانیارییانەیە:

«پاشکۆی ب،

نەقابەکان،

بزووتنەوەی نەقابی لە «عیراق» هێشتا لە سەرەتای سەرەتاکانیدایە، ئەو جۆرە نەقابانەیش ئەگەر هەبن ئەوا لە ڕادەیەکی یەکجار نزمدا ڕێك خراون یان بەشی هەرە زۆریان هەر ڕێك نەخراون.

ئەمەی لای خوارەوە بەشێکی وەرگیراوە لە ڕاپۆرتی «بەغدا»ی ژمارە ب.د/١٧/٤٦ی ڕۆژی «بیست و شەشی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٦»ە دەربارەی

---

[۳۲] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە هەڵە نووسراوە هەمبێرسۆن (Hamberson).

[33] N.A., F.O., 624/ 116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A To Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1 Air Int, Title: Armenian Emigration Committee.

ناوی ژمارەیەك لەو پارتییانەی پێوەندییان بە نەقابەكانەوە هەیە و هەر چۆن بێت ئەو نەقابانە لە لایەن پارتییەكانەوە بۆ مەبەستی سیاسی و پتر مەبەستی ئابووری دامەزرێنراون.

ڕەهبەرانی ئەم شەش نەقابەیەی لای خوارەوە پێوەندیی نهێنییان بە «حیزبی شیوعیی عیراقی»یەوە هەیە:

١- نەقابەی كرێكارانی شەمەندەفەر «سكك».

٢- نەقابەی كرێكارانی پۆستە و تەلەگراف.

٣- نەقابەی كرێكارانی چاپخانەكان.

٤- نەقابەی كرێكارانی كارەبا.

٥- نەقابەی جلدرۆكان.

٦- نەقابەی كرێكارە میكانییەكانی بەسرە.

ئەو نەقابانەیش كە بە پێی ڕاپۆرتەكان پێوەندییان بە «پارتی گەل» «حزب الشعب» ەوە هەیە ئەمانەن:

١- نەقابەی ئاسنگەران.

٢- نەقابەی میكانیكییەكان.

٣- نەقابەی خانووكەرەكان «نقابة البنائين».

٤- نەقابەی شۆفێرەكان.

دەشڵێن ئەم دوو نەقابەیە پێوەندییان بە «پارتی نیشتیمانیی دیموكراسی - الحزب الوطني الديمقراطي»یەوە هەیە:

١- نەقابەی كەوشدرووەكان.

٢- نەقابەی دەستچنەكان «نقابة النساجين»

لە كاتێكدا تاكە نەقابە كە دەڵێن لەوانەیە پێوەندیی بە «پارتی یەكیەتی نیشتیمانی «حزب الأتحاد الوطني»یەوە هەبێ «نەقابەی كرێكارانی جگەرەن»[٣٤].

---

(34) Ibid, Appendix B, Trade Unions.

دوا بەدوای ئەمە لە هەمان فایلدا دەقی بەیاننامەیەکی «فەهد»ی سکرتێری «حیزبی شیوعیی عیراقی» هەڵگیراوە کە ڕۆژی بیست و یەکی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ بە چاپکراوی دەربارەی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بڵاوی کردۆتەوە و تێیدا هێرشێکی زۆری کردۆتە سەر کابینەکەی نووری سەعید». شایانی گوتنە وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی «بەریتانی» نەك تەنها دەقی ناوەڕۆکی ئەو بەیاننامە دانسقەیەی وەرگێڕاوەتە سەر ئینگلیزییەکی ڕەوان بەڵکو هەمان کات دانەیەکیشی بە زوبانی عەرەبیش لێ هەڵگرتووە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«حیزبی شیوعی داوا لە گەلی «عیراق» دەکات لە هەڵبژاردنە ساختەکاندا بەشداری نەکات و وەزارەتە کرێگرتەکەی ئیمپریالیزمی «بەریتانی» و پاڵەوانی پرۆژەکانی «نووری سەعید» برووخێنێ.

ڕۆڵەکانی گەلە شەرەفمەندەکەمان:

ڕۆژی بیست و شەشی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ بەیاننامەیەکمان دەربارەی «هەڵوێستمان بەرانبەر وەزارەتەکەی نووری سەعید» بڵاو کردەوە و تێیدا سروشتی ئەو وەزارەتە و ئامانجەکانی لە ڕێگەی ئەنجومەنێکی گاڵتە بازاڕەوە و لە ژێر دروشمی «هەڵبژاردنی ئازاد دا» بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە ئیمپریالییە بنیاتنراوەکان، هی وەك یەکیەتی نێوان «عیراق» و «ئوردون» و پرۆژەی «سووریا»ی گەورە و پرۆژەی بەرەی ڕۆژهەڵات بە ڕەهبەری «تورکیا»وە و پیلانە ئیمپریالییە «ئەنگلۆ – ئەمەریکایی» – زایۆنییەکانی دژ بە «فەلەستین» و کردنی «عیراق» بە بنکەیەکی جەنگی «بەریتانی» و هتد...، وێڕای کۆششی بۆ مانەوەی وجودی بیانی و هێزەکانی لە نیشتمانەکەماندا و داسەپاندنی ڕاوێژکارەکانی لە دەزگاکانی دەوڵەتدا و داسەپاندنی پەیمان و ڕێککەوتننامەکانی و دەستداگرتنی بەسەر سەرچاوە ئابوورییەکانی وڵاتەکاماندا و هتد....

گەلۆ: هەقمان بوو کە لە بەیاننامەی پێشووماندا سوور بووین لەسەر ئەوەی مەحاڵە هەڵبژاردنێکی ئازاد لە ژێر سایەی وەزارەتی «نووری سەعید»دا بکرێت، چونکە وەزارەتێکە جڵەوی کاری وا بەدەست باڵوێزخانەی بەریتانییەوە و شیر و تیری ئەو هێزانەی «بەریتانیا» کە وەك مۆتەکە وان لە گەردنماندا دەیپارێزن و وەك گوتمان مەحاڵە هەڵبژاردنێکی ئازاد لە ژێر سایەی ڕژێمێکی گەندەڵی وەك ئەوەی ئێستادا و لە کاتێکدا دەسەڵاتی ئیمپریالیزم سەروبەری «عیراق»ی گرتۆتەوە ساز بکرێ.

گەلۆ: ئێمە بە تەنها دەرکی ئەم ڕاستییانەمان نەکردووە و ڕیسوامان نەکردوون، بەڵکو گشت ڕێکخراوە وریاکان وەك ئێمە دەدوێن و باسی خەونی «هەڵبژاردنی ئازاد» و هات و هاواری «ئازادییە دیموکراسییەکان» دەکەن و تەنانەت خەڵکە ساکارەکانیش باش دەزانن «نووری سەعید» کێیە و چ دەستە و دایەرەیەکی کۆنەپەرست لە دەوری کۆبوونەتەوە و دەزانن ئەوانە پیاوی ئەڵقە لە گوێی ئیمپریالیزمی بەریتانین کە هەر بۆ خۆیشی ئەوانەی دروست کردووە و دەیانپارێزێ.

گەلۆ: وریایی و ڕقی پیرۆزی کۆمەڵانی خەڵك و بارودۆخی جیهان نووری سەعید و دەستەودایەرە کۆنەپەرستە کرێگرتەکەی ناچار کرد بەرگی دیموکراسی بپۆشن و بکەونە باسی بالوورەی «هەڵبژاردنی ئازاد» بۆ هەڵخەڵەتاندنی گەل، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان مەگەر هەر خۆیان فریو بدەن چونکە درۆکانیان لە بنچینەوە ئاشکران و کردارەکانیشیان پتر ڕیسوای کردن. ئەوان گوایە باسی ئازادییە دەستوورییەکان دەکەن کەچی هەمان کات هاوڵاتیان لە کۆبوونەوە و خۆنیشاندان قەدەغە دەکەن و پۆلیسە چەکدارەکان بە خۆیان و ئۆتومبیلەکانیانەوە دەڕژێنە ناو شەقامەکان بۆ ئەوەی بە شێوازێکی دڕندانە بکەونە گیانی خۆنیشاندەران و گرتنی ڕەمەکیی هاوڵاتیان لەسەر شەقامەکان و چایخانەکان و ماڵەکانیان و دەکەونە دارکاری


نووری سعید و وەصی عەبدولئیلاه

کردنیان و جنێو پێدانیان و لە نیوەشەودا دەدەن بەسەر ماڵەکانیاندا و خەڵکە بێوەیەکان زراوەترەك دەکەن و هاولاتیان راپێچی دادگاکانی «بەغدا» و شارەکانی دیکەی «عێراق» دەکەن لەسەر چالاکییە سیاسییەکانیان، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ئینجا بێ شەرمانە دەڵێن ئێمە بۆ «جێبەجێکردنی ئازادییە سیاسییەکان»کار دەکەین.

رۆژنامە «عێراق»ییەکان، دەربارەی دەست تێوەردانی وەزیرە بەرپرسەکان لە ئاراستەکردنی هەڵبژاردندا بەو شێوازەی ئارەزووی ئیمپریالییەکان دابین دەکات، گەلێك وتار بلاو دەکەنەوە، ئێمەیش وا لەلایەن خۆمانەوە چەند نموونەیەك دەربارەی کارەکانی سەرەك وەزیران و چەتەوڵەکانی لەم بوارەدا بلاو دەکەینەوە بۆ ئەوەی پەردە لەسەر درۆ زلەکانیان دەربارەی ئەوەی ناویان لێ ناوە «هەڵبژاردنی ئازاد» هەڵبماڵین و رێبازە نزمەکانیان لە کاری تەزویری هەڵبژاردندا بخەینە روو.

رۆژی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ خوودی سەرەك وەزیران ئەم نامە تایبەتییەی لای خوارەوەی ئاراستەی ئەو بنەماڵانەی بەسرە کردووە کە بە نۆکەری ئەڵقە لە گوێی ئیمپریالییەکان ناسراون، هی وەك «عەبدولقادر باشئەعیان» و «حامید ئەلنەقیب» و «مستەفا تەها سەلمان» و «کاظم شەمخانی» و «حەمەد ئەلزەکیر» و «عەبدولرەزاق ئەلئەمیر»:

«برا بەرێزە سەیدەکانی «بەسرە».

پێویستییەکانی ئێمرۆکە ناچارمان دەکەن یەك بگرین لە پێناو هەڵبژاردنێك کە دەبێ ئێمە رەهبەری بین و دڵنیام لەوەی کاتێك ئەم نامەیەم

دەگاتە دەست بەڕێزتان لەگەڵ موتەسەڕیفی شاردا، کە دەربارەی ڕێبازمان بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتنمان ئاگادارمان کردووە، لەگەڵ ئەودا کۆ دەبنەوە و تکایە ڕێزی زۆرم قەبووڵ بفەرموون.

دڵسۆزتان

نووری سەعید».

دوا بەدوای ئەم نامەیە لە ماڵی «حامد ئەلنەقیب» لە بەسرە دانیشتنێك ساز کرا کە هەڵبەت دانیشتنێکی نهێنی بوو و ئەو کەسانەی لە سەرەوە ناومان هێناون و موتەسەریفی «بەسرە» و بەڕێوەبەری پێوەندییە گشتییەکان «مدیر العلاقات العامة» و کابرایەکی هندی لە باڵوێزخانەی «بەریتانی»یەوە و کەسانی دیکە ئامادەی بوون و موتەسەڕیف ئەو پلانەی سەرەك وەزیرانی شی کردەوە کە بریتییە لە:

١- پێویستە خاوەن زەوییەکانی «بەسرە» پاڵ بە جووتیاران و کەسوکاریانەوە بنێن تاوەکو لەگەڵ کاتبەکانیاندا بچنە هەڵبژاردن بۆ ئەوەی ئەو کاتبانە ناوی خۆیان و لایەنگرەکانیان بنووسن.

٢- پێویستە خاوەن زەوییە گەورەکانی بەسرە لەگەڵ براکانیان لە هەر یەك لە «فاو» و «ئەبی خەسیب» و «هارثە» و «شەتولعەرەب» و «زوبێر» کۆ ببنەوە بۆ دانانی پلانێکی یەکگرتوو.

٣- دەبێ «کازم شەمخانی» و «میرزا محەمەد» و «شعێب»ی و پیاوەکانیان لەگەڵ دانیشتووانی «شەتولعەرەب»دا بنێرنە لیژنەکانی هەڵبژاردن بەو مەرجەی خۆیان و کاتبەکانیان بۆ ناونووسکردنیان لە کاتی هەڵبژاردندا ئامادە بن.

٤- دەبێ سەرەك شارەوانیی «بەسرە» لەگەڵ موختارەکاندا کۆ ببێتەوە تەنها ئەو موختارانە نەبن کە جێگەی بڕوا نین، وەك «موختاری بەحارنە» و

«موختـــاری ریبـــاتی گـــەورە» و «موختـــاری جوبـــەیل» و «موختـــاری شەتولعەرەب».

٥- دانیشتووانی «مەعقەل» و «بەسرە» و «عەشار» جێگەی بڕوا نین، بۆیەکا پێویستە بە حەزەرەوە پێوەندییان پێوە بکەن.

هەمان کات خاڵی دیکەش هەیە کە لەو کۆبوونەوەیەدا باسیان لێوە کراوە بەڵام تاوەکو ئێستا ئێمە بۆمان نەلواوە ڕیسوایان بکەین.

«نووری سەعید» و دەستە و دایەرەکەی بەو نامە و ڕاسپاردانە کە بۆ موتەسەڕیفەکانیان ناردوون نەوەستاون، بەڵکو خودی «ساڵح جەبر» لەگەڵ «وەسی»دا چوونە «بەسرە» و لە ماوەی چوار ڕۆژی یەکەمدا بیست و پێنج کۆبوونەوەیان لەگەڵ بنەماڵە ناسراوەکانی «بەسرە»دا ساز کرد کە «وەسی» ئامادەی هەموویان بوو، وێڕای ئەوەی چوونە «ئەبی خەسیب» و ناوچەکانی دیکە و لە «عجێراوی» گەورەترین کۆبوونەوەی سازکرد کە وەسی ئامادەی بوو، لەوێ وێڕای بابەتی هەڵبژاردن باسی پلانەکانی «قەوامولسەڵتەنە»[٣٥] دژی بزووتنەوەی دیموکراسی لە «ئێران» کراو بەو جۆرە کۆبوونەوە و پیلانەکان درێژەیان کێشا و لە «بەسرە»وە بە تەلەفۆن پێوەندییان بە «نووری سەعید»ەوە کرد و داوایان لێی کرد دەستوبرد بۆخۆی بێتە «بەسرە» چونکە هەموو شتێك «بە قسەی ئەوان» لە بەسرە بە دڵی خۆیانە و «عەبدولقادر باش ئەعیان» و «سەید حامید نەقیب» لەگەڵ موتەسەڕیفدا بەرپرسی جێبەجێکردنی پلانەکانن.

---

[٣٥] «قەوامولسەڵتەنە» یەکێك بوو لە سەرەك وەزیرە هەرە توندڕەوەکانی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی «محەمەد ڕەزاشای پەهلەوی» لە «ئێران».


فەهد

گەلۆ: ئەو شتانەی باسمانکردن هەرچی دەڵێن دەربارەی «سەربەستیی یاسایی» و «هەڵبژاردنی ئازاد» پووچەڵیان دەکەنەوە، بۆیەکا داواتان لێ دەکەین بەشداری لە هەڵبژاردندا نەکەن و برایانە بۆ ڕووخاندنی وەزارەتەکەی «نووری سەعید» هاوکار بن، چونکە ئەو لە ڕێگەی ئەو هەڵبژاردنە ساختەیەوە دەیەوێ کۆتی زۆرداریی ئیمپریالیزم لە گەردنمان بئاڵێنێ و درێژە بە قۆناغی کۆیلایەتیمان بدات، پێویستە خەبات لە پێناو وەدەرچوونی هێزە بەریتانییەکان لە «عیراق» و پووچەڵکردنەوەی پەیمانەکەی وڵات لەگەڵ ئینگلیزدا و تەفروتوونا کردنی دەسەڵاتی بیانی و پڕۆژە ئیمپریالییە بنیاتکراوەکاندا بکەین.

گەلۆ: ئێمە لەوە دەڵنیاین لەگەڵ گشت هەڕەشە و گوڕەشەکانی میریدا بۆ ئەوەی ناچارتان بکات دەنگ بدەن ئێوە بەشداری هەڵبژاردن ناکەن، لەوەیش دڵنیاین کە گشت هەوڵەکانی میری بۆ تەزویری هەڵبژاردن لە ڕێگەی پڕکردنەوەی سندووقەکانی دەنگدانەوە بە ناوی کەسانی درۆوە ڕیسوا دەکەن و بەرەنگاری تیرۆری دەزگاکانی میری دژی هاوڵاتیان و ئازادیی تایبەتی و گشتییان و دژی دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ و حاڵیان دەوەستن.

بژی خەباتی گەلی «عیراق» لەپێناوی ئازادی و بەختەوەریدا، برمێ ئیپمریالیزم و کلکەکانی

«بەغدا»/ ١٩٤٦/١٢/٢١.

«فەهد»

سکرتێری گشتیی حیزبی شیوعیی عیراق».

لە هەمان فایلدا دوا بەدوای ئەم پەخشەیەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە بە ئەمانەتەوە ناوەڕۆکی کراوەتە ئینگلیزی، ئەم تێبینییانەی لای خوارەوە، کە وێنەی لێ دراوەتە میستەر وۆکەر[٣٦]، دەربارەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دانراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«تێبینی:

ژمارە ١٢٠/١١/٨٤،

ڕۆژی هەشتی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧.

١- ژمارەیەکی زۆر لە ڕاپۆرتەکانمان سوورن لەسەر ئەوەی کە «لە «عیراق» کۆمۆنیزم» بە واتای تەواوی ئەو وشەیە نییە.

٢- بە پێی بۆچوونی خۆم هەرچەندە عیراقییەکان شتێکی ئەوتۆ دەربارەی تیۆری «مارکسیزم» نازانن، بەڵام ژمارەیەك لەو کەسانەی پێیان دەڵێن شیوعی و پارتییە چەپڕەوەکان ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر دەکەونە ژێر کاریگەریی ڕووسیاوە.

٣- «ڤاسیلی کراخماڵۆڤ»ی هەواڵنێری تاس لەم مانگانەی دواییدا لەم دوو بوارەدا چالاکیی باشی نواند:

أ- سەردانی پارتییە چەپڕەوەکان و بارەگای ڕۆژنامەکانیان.

ب- ناردنی ڕاپۆرتی ڕۆژانە بۆ موفەوەزییەتی «سۆڤێت»ی «لە «بەغدا» - ك.م.»»، ماوەیەك لەمەوبەریش هەوڵ درا سێ پارتی چەپڕەو لە بەرەیەکدا کۆبکرێنەوە، ئەوەیش خۆی لە خۆیدا بە هاندانی ڕووسەکان بوو، بە پێی

---

[٣٦] مەبەست «مالکۆلم تۆماس وۆکەر» (Malcolm Thomas Walker)ە کە ڕۆژی هەشتی مانگی نیسانی ساڵی ١٩١٥ لە دایك بووە، لە ڕۆژی بیست و نۆی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٨ەوە بووە بە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی «بەریتانی» و یەکسەر کرایە جێگری کۆنسوڵی «بەریتانی» لە «بێروت» و لە ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی تەممووزی ساڵی ١٩٤٣یشەوە کرایە جێگری کۆنسوڵی «بەریتانی» لە بەغدا. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1947", London, P. 323.

راپۆرتەکان «ئەرکادی سەڤارۆف»ی کارمەندی موفەوەزییەتی «سۆڤیەت»ی «لە «بەغدا» — ك.م» لەگەڵ «عەزیز شەریف»دا قسەی کردووە.

٤- پتر لەوەیش ڕۆژنامەنووسە چەپڕەوەکان بە خۆمیان گوتووە «بابەتی یەکگرتنی ڕێکخراوە چەپڕەوە عیراقییەکان — ك.م.» بەرهەمی فیکریی خودی عیراقییەکان نییە، هەرچەندە من بۆ خۆم لەو بڕوایەدا نیم دەستی بیانی لەو کارەدا هەبێ.

٥- ئەو راپۆرتانەی لەم چەندانەی دواییدا لە ناوچەی فوراتی ناوەند (فرات الأوسط)ەوە پێمان گەیشتوون وەها نیشان دەدەن کە ڕەهبەرە «شیعە»کان دژی بیر و بۆچوونی شیوعین، بەڵام دەستەیەك «شیعە»ی ئەو ناوچەیە کە لە گەشەسەندنان چاوەڕوانی یاریدەی «ڕووس»ن و بەشی زۆری ئەو کەسانە دژی «بەریتانی»یەکان و حوکمەتی عیراقن، بەڵام «کاتی خۆی — ك.م.» هەر ئەوانیش سەر بە «نازی»یەکان بوون، ناتوانرێ سەیری ئەو جۆرە کەسانە وەك کۆمۆنیستی تەواو بکرێت، بەڵام هەمان کاتیش ئەوان ئامادەن بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانیان کەڵك لە بەشێك لە بیروباوەڕی شیوعی دژی بەریتانییەکان و حوکمەتی «عیراق — ك.م» وەربگرن. ئەم دەستەیە لە لایەن نوێنەرە ڕووسەکانەوە دەبزوێنرێن، ئەو نوێنەرانەی ڕۆژ بە ڕۆژ لە گشت بوارەکاندا چالاکتر دەبن.

٦- لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە ئەو پێنج پارتییەی لە برگەی سێیەمی نامەکەی «مێجەر ویلکنس»دا[٣٧] ئاماژەیان بۆ کراوە هەر چەندە لە ڕاستیدا شیوعی نین، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ سەرنج و سیاسەتیان و ئامانجیان بە لای شیوعییەتدا دەشکێتەوە، بۆیەکا دەتوانن

---

[٣٧] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە ناوی هاتووە: (Major Wilkins) کە وا پێ دەچێ ئەفسەرێکی بەریتانی بێ، بەڵام سەر بە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی نەبێ، بۆیەکا ناوی لەو سەرچاوانەدا نەهاتووە کە بۆ پوختەی ژیننامەی کارمەندانی وەزارەتی ناوبراو تەرخان کراوە.

کاریگەریی ئەوتۆ بکەن کۆمۆنیستە ڕاستەقینەکان بە ناوی ئەوانەوە کار بکەن.

٧- من نامەوێ تفەنگ بە تاریکییەوە بنێم[٣٨]، بەلأم ئەو بۆچوونەی دەڵێت گوایە «لە «عیراق»دا کۆمۆنیزم نییە» بووەتە بۆچوونێکی نادروست.

ئێمە نابێ چاوی خۆمان لە ئاستی ئەو ڕاستییەدا بنووقێنین کە «ڕووسیا» لەم وڵاتەدا کار دەکات و کاریگەریی لە سیاسەتی ناوخۆدا خەریکە دروست دەبێ.

ئیمزا[٣٩]»[٤٠].

بەڵگەنامەی دواتری ناو ئەم فایلە نامەیەکی دوور و درێژی دەزگا سەربازییە بەریتانییەکانە دەربارەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«نهێنی،

لە:

بارەگای بەرگرییەوە،

«عیراق»،

هێزە «بەریتانی»یەکان لە «عیراق»،

ژمارە س.٩١/ئێکس/١/٦٤،

٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٧[٤١]،

---

(٣٨) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو ڕستەیە بەم جۆرە داڕێژراوە:
"7-I do not want to be the who shots "wolf wolf", but…"

(٣٩) ئیمزاکە بە دەستخەت کراوە و نازانرێ هی کێیە، تەنها لە ژێر ئیمزاکەدا دیسانەوە بە دەستخەت نووسراوە هەشتی کانوونی دووەم.

(40) N.A., F.O., 624/116, British Embassy, Baghdad, No.300, Name of File: Communism, Appendix A to Iraq Intelligence, MEMO S.4806/1Air Int., Title: Minutes, 120/11/84, 8 january, 1947

(٤١) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە هەڵە لە بریتی ساڵی ١٩٤٧ نووسراوە ساڵی ١٩٤٦.

بۆ:
جەنابی «أ.ب ۆكەر»،
باڵوێزخانەی بەریتانی،
«بەغدا».

تكایە بڕواننە ئەو نامەیەتان كە ژمارەكەی «١٥/١٠٣٣/ ٤٦»ە و ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ ناردووتانە بۆ «فرێزەر».

لە عیراق نە كۆمۆنیزم «بە واتای تەواوی وشە»، هەیە و نە ڕێكخراوێكی نەتەوەیی یان نێونەتەوەیی هەیە كە كاریگەریی شیوعیی ئاشكرا یان نهێنی بەسەرەوە بێت. هەر چۆنێك بێت ژمارەیەك ڕێكخراوی ناوچەیی هەن كە بە گشتی بە باشی دەزانن وەك شیوعی بناسرێن هەر چەندە ئەوە وەها ناگەیێنێت ئەندامانی ئەو ڕێكخراوانە لە چەپڕەوە توندڕەوەكانن و لە ڕاسیتدا هیچ جۆرە شارەزاییەكیان دەربارەی تیۆریی ماركسیزم نییە و زۆربەیان وەها بیر دەكەنەوە كە ئەوان زۆرلێكراون و كۆمۆنیزمیش ئەو بارودۆخەیان دەگۆڕێت. ئەو نموونانەی تۆ لە نامەكەتدا هێناوتننەوە وەها لە پیاو دەكەن وەها بزانێت كە تۆ دەتەوێت «یان داوات لێ كراوە» لیستێك دەربارەی ئەو ڕێكخراوە شیوعییە ڕەسەنانە پێشكەش بكەیت كە تەواو سەر بە «مۆسكۆن». ئەوەیش زانراوە كە ڕێكخراوی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی «أممي» لە «عیراقدا» نین.

«پارتی ڕزگاری نیشتمانی – حزب التحرر الوطني» لە هەموو ئەو ڕێكخراوانە گرنگتر و چالاكترە كە ئەندامەكانی بە ناوی شیوعییەتەوە كار دەكەن، ناوبراو تەواو ڕێكخراوێكی نهێنییە و ماوەیەك پێوەندیی نیزیكی لەگەڵ «كۆمەڵەی دژ بە سایۆنیزم – عصبة مكافحة الصهيونية»دا هەبوو، بەڵام ئێستاكە ئەمیان بە جارێك كز بووە هەرچەندە جاران جیاوازییەكی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نەبوو. هەر چۆن بێت ئەم دوو دەستەیە بەرپرسی گشت پڕۆپاگەندەیەك بوون لە نێوان

چینە کرێکارەکاندا و ئەوەیش کارێکی ئەوتۆی کردبوو گومانیان لێ بکرێ کە «ڕووس»ەکان بە دەستووری پارتی «تودەی ئێران» دەیانبزوێنن.

هەر چۆن بێ گشت ئەو هەوڵانەی دران بۆ زانینی پێوەندییەکانی ئەو ڕێکخراوانە بە موفەوەزییەتی «سۆڤیەت»ییەوە «لە «بەغدا» — ک.م.»، یان بە «حیزبی شیوعیی عیراقی» یەوە هەموویان بە فیڕۆ چوون. لەگەڵ ئەوەیشدا لەوانەیە ئەم دەستەیە یان بە ئاشکرا، یان بە نهێنی لە دواڕۆژدا بە ناوی شیوعییەوە بکەونە چالاکی، بەڵام ئێستاکە بریتین لە گرووپێکی سالاری یاخیگەری دژ بە حوکمەت و دژ بە «بەریتانی»یەکان پتر لەوەی سەر بە شیوعییەتی تەواو بن.

دەستەیەکی نهێنیی شیوعی دیکە لە ڕابردوودا سەرنجیان ڕاکێشا، ئەمانە بریتین لەوانەی کە بە «ئەلقاعیدە» ناسراون و ناوەکەیشیان لە ناوی بڵاوکراوەیەکی نهێنییەوە وەرگیراوە کە بەرپرسی بڵاوکردنەوەی بوون. هەر چەندە ئەم بڵاوکراوەیە «ڕۆژنامەیە» لەم چەندانەی دواییدا زۆر بە ڕێکوپێکی دەرناچێت بەڵام ئەم دەستەیە تاوەکو ئێستایش هەر چالاکن. لەم حاڵەتەیشدا دیسانەوە هیچ نەزانراوە دەربارەی پێوەندیی ئەم دەستەیەوە بە دەزگایەکی شیوعیی حەقیقییەوە، هەرچەندە «یووسف سەلمان یووسف — فەهد» کە سەرۆکی ڕاستەقینەی ئەم تاقمەیە، لەوانەیە چەند ساڵێك لە «ڕووسیا»ی «سۆڤیەت»ی ژیابێ و هەرچەندە ئەوا دەچێت بۆ چەند مانگێکی زۆر فەرمانی گرتنی دەرچووە، بەڵام وەها دیارە زۆرزانێکی بەڵایە. دوا هەواڵەکان وا ڕادەگەیەنن کە پۆلیس بەو شوێنانەیان زانیوە کە خۆی تێیاندا حەشار دەدات، بەڵام چاوەڕوانن بەر لە دەستگیرکردنی بەڵگەی تەواو دژی کۆ بکەنەوە. ئەم دەستەیەش وەها دیارە لە دواڕۆژدا ڕاستەوخۆ، یان لا بە لا، لە لایەن مۆسکۆوە بەڕێوە دەبرێت.

«داود سایغ»یش، دوور لەو گرووپانەی باسمان کردن، ماوەیەکی دوور و درێژە سەرکردەی ئەم دەستە یان ئەو دەستەی شیوعیی ولاتە و ئێستاکەیش سەرۆکی «ڕابیتەی شیوعییە عیراقییەکان – رابطة الشیوعیین العراقیین»ە کە تاوەکو دەستەیەکی شیوعیی ڕادەیەك کەم ناسراوە، بەلاّم بێ وەبەرچاوگرتنی ڕادەی کاریگەریی سەرقالّی پڕۆپاگەندەی شیوعییە، لە کاتی نووسینی ئەم ڕاپۆرتەدا هێند دەربارەی ئەم گرووپە نەزانراوە کە تاوەکو چ ڕادەیەك ئێستا کاریگەرییەکی شیوعییانەی ڕەسەنیان هەیە، بەلاّم لەبەر ڕۆشنایی مێژووی ڕابردوودی «داود سایغ»دا دەتوانین بڵێین کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نییە.

لەگەڵ بوونی ئەو هەموو بزووتنەوە شیوعییانەدا لە «عیراق» ئینجا ناتوانرێ حیزبێکی شیوعی هەڵبژێردرێ، یان هیچ جۆرە نیشانەیەکی هاوپەیمانەتی لە نێوانیاندا، یان لەگەڵ «مۆسکۆ»دا وەدی بکرێت. شیوعییەکان ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ یەکتردا ڕێك بکەون و دووبەرەکییەکانی نێوانیان هەمیشە دەبنە هۆی بەردەوامیی سەرهەڵدانی گرووپی نوێی خاوەن سیاسەتێکی زیبەقی[٤٢]. بەو جۆرە هیچ کام لەو دەستانە نەیتوانی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن یەکیەتیی ڕیزەکانی خۆیان بپارێزێت، بۆیەکا ئەوەی زانراوە «مۆسکۆ»یش هەوڵی نەداوە دەست بخاتە ناو هیچ چالاکییەکی دەستە شیوعییەکانی عیراقەوە».

ئیمزا

ئەفسەری بارەگای بەرگری

«گ.ب. وایت[٤٣]»[٤٤].

---

[٤٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

"the communists are Incapable of agreeing with each other for any long period of time and internal jealousis bring about constantly chainging groups with mercurial politics".

[٤٣] لەبەرئەوەی سەر بە «وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی» نییە، ناوی لە نێو ئەو

بەشی دووەمی ئەم فایلە بە هەمان ناونیشانەوەیە و بریتییە لە یازدە لاپەڕە کە یەکێکیان بۆ بەیاننامەیەکی کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراوە، حەوت لاپەڕەی یەکەمی ئەم بەشە بۆ باسی ئەو بەیاننامەیە و وەرگێڕانی بۆ سەر زوبانی ئینگلیزی تەرخان کراون، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی بەیاننامەکەیە کە بریتییە لە نامەیەکی کراوەی کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە ڕۆژی بیست و حەوتی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ ناردوویە بۆ بەرپرسانی «عیراق» و ژمارەیەك لە دەوڵەتە گەورەکان و دەزگا نێودەوڵەتییەکان و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«یادداشتی حیزبی شیوعیی عیراقی[٤٥]،

بۆ:

سەرۆکی دەوڵەتی عیراق خاوەن شکۆ «وەسی و وەلی عەهدی گەورە»،

ڕێزدار سەرەك وەزیرانی «بەریتانی»، بە هۆی ڕێزدار باڵوێزی «بەریتانی»یەوە،

ڕێزدار سەرەك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی «ئەمەریکا» بە هۆی ڕێزدار موفەوەزی «ئەمەریکا»ییەوە،

ڕێزدار سەرەك وەزیرانی یەکیەتیی کۆمارە سۆشیالیزمە «سۆڤیەت»ییەکان بەهۆی ڕێزدار وەزیر موفەوەزی «سۆڤیەت»ییەوە،

---

سەرچاوانەدا نییە کە بۆ پوختەی ژینامەی کارمەندانی وەزارەتی ناوبراو تەرخان کراون.

(44) N.A., F.O., 624/116, Secret, Defence Security Office, Iraq British Forces in Iraq, Ref. S.91/×/1/64, 2nd January 1947, A.T.Walker Esq., British Embassy, Baghdad.

(٤٥) لەم نامەیەی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا دووپاتکردنەوە یەکجار زۆرە و هەڵەی ڕێزمانیشی کەم نییە، تەواو بە پێچەوانەی بەیاننامەکەی «فەهد»ەوە، پێم وەهایە فەهد بۆ خۆی ناوەڕۆکی ئەم نامەیەی دانەڕشتووە.

ڕێـزدار سـەرۆکی حوکمـەتی «چـین» بـە هـۆی ڕێـزدار وەزیـر موفـەوەزی «چین»ەوە،

ڕێزدار سەرۆکی حوکمەتی «فەڕەنسی» بە هۆی ڕێزدار وەزیـر موفـەوەزی «فەڕەنسی»یەوە،

ڕێزدار سکرتێری «گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان»،

ڕێزداران سەرۆکی حوکمەتە «عـەرەبی»یـەکان بـە هـۆی ڕێـزداران وەزیـر موفەوەزەکانیانەوە.

ڕێزدار سەرۆکی ئەنجوومەنی پیرانی «عیراق»ی،

ڕێزدار سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی «عیراق»ی،

گشت دەزگا و پارتییە دیموکراسییەکانی وڵاتە «عەرەبی»یـەکان و وڵاتـە دیموکراسییەکان،

ڕێزداران خاوەن شکۆ و پایەبڵندان:

پارتییەکـــەمان «حیزبـــی شـــیوعیی عیراقـــی» شـــەرەفمەندە بـــە پێشکەشکردنی ئەم یادداشتە:

گەلە ئازادیخوازەکان دژی فاشیزمی تاوانبار جـەنگین و قوربـانی یـەکجار گەورەیان دا لە پێناو دامەزراندنی جیهانێکی دوور لە کۆیلەیی، جیهانێکی پـڕ لە ئاشتی، جیهانێکی نوێ کە تیایدا ئاواتەکانی گەلان لە بواری قوتـاربوون و گەیشتن بە ئازادییە دیموکراسییەکان و دەربڕینـی خواسـتە نیشـتمانییەکانی بە ئازادی و بڕوای گەلان لە ڕنینی بەرووبوومی ئەم سەرکەوتنەدا بە تین بـوو، ئەو ڕێککەوتننامە مێژووییانەیش، کە بناغەیەکی پتەویان بۆ جیهانێکی پاش جەنگ دارشت، بوونە هۆی پتەوکردنی بڕوای گەلان، تایبەت دوای مـۆرکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیـەی نەتـەوە یـەکگرتووەکانی لـێ کەوتـەوە بـۆ پاراسـتنی ئاسایشی جیهان و دابینکردنی یەکسانیی گشت گەلان لە بـواری مافەکانیانـدا و بەرهەڵستیکردنی هەموو دەستدرێژییەك و پاراستنی مافی گـەلان بـە مـافی چارەنووسیانەوە و گەیشتنیان بە ئازادییە دیموکراسییەکان.

گشت گەلە ئازادیخوازەکان و ڕێکخراوەکانیان چوونە ناو جەنگێکی خوێناوییەوە کە شیوعییەکان پێشەنگی خەباتگێڕان و پتر لە هەموان قوربانییان دا و ئازایانە هاتنە دەست و بەو جۆرە بەر لە جەنگ و لە گەرمەی جەنگ و دوای جەنگیش نیشانیان دا تاوەکو چ ڕادەیەك قینیان لە فاشیزم و هاوپەیمانییەکانییە و چەند دڵسۆزن بۆ خواست و ئامانجەکانی گەلەکانیان و چەند بە پەرۆشی ماف و ئازادییە دیموکراسییەکان و پەرە پێدانیانن و تاوەکو چ ڕادەیەك ئاشتیخوازن و حەز دەکەن کۆڵەکەکانی ئاشتی بچەسپێنن، بۆیەکا هیچ سەیر نییە کە شیوعییەکان لە گشت وڵاتانی جیهاندا بە چاوی ڕێز و نەوازشەوە سەیر بکرێن و لە گەلێك وڵاتدا بەشداری حوکم بن و وەك پێویستییەك کە بەرژەوەندی دیموکراسی و بەرەوپێشبردنی وڵات و گەشەسەندنی دەیخوازن.

بۆیەکا هیچ سەیر نییە کە کۆمەڵانی خەڵك لە دەوری شیوعییەکان کۆ دەبنەوە و پشتیان دەگرن و بە چاوی ڕێزەوە سەیریان دەکەن و بە کۆڵەکەی سەرەکیی وڵاتیان لە قەڵەم دەدەن. لە عیراقیش شیوعییەکان بوونەتە یاساوڵێکی دڵسۆزی بەرژەوەندییەکانی گەلەکەمان و ئاواتەکانی و خەباتێکی بێ سنوور لە بارودۆخێکی ناسك و دژواردا دەکەن بۆ پێکەوەنانی پێویستییەکانی بەرەوپێشچوونی و دابینکردنی ئاسوودەیی ژیانی و بۆ جێگیرکردنی سەرکەوتنی گەلان بەسەر فاشیزمدا تاوەکو گەلی عیراقمان بە مافە دیموکراسییەکانی شاد ببێ و نیشتیمانەکەمان لە دەسەڵاتی بیانی قوتار بکات، ئەو دەسەڵاتەی پێوەندیی سیاسی و ئابووریی و لە بارودۆخێکی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی ئەوتۆدا دروست بوو کە بە هیچ جۆر لەگەڵ بارودۆخی ئەم ڕۆژگارەدا ناگونجێن، ڕژێمێکمان دەوێت سوور بێت لەسەر جێبەجێکردنی گفتەکانیدا بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان تاوەکو شانبەشانی ئەو دەزگایە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی تێبکۆشێت. ڕاستییەکەشی ئامانجەکانی حیزبەکەمان بریتییە لە خەباتکردن بۆ جێبەجێکردنی ئازادییە دیموکراسییەکان و ئەو مافانەی کە دەستووری عیراقی بۆ خۆی دانی

پێداناون تاوەکو سەربەخۆیی نیشتیمانەکەمان ببێتە ڕاستییەکی سەلمێنراو، ئەمەیش بەڵگەیەکی تەواوی ئەو ڕاستییەیە کە «حیزبی شیوعی» نایەوێ نە ڕژێم و نە دیاردە سەرەکییەکانی کۆمەڵ بگۆڕێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەیەوێت ڕژێمی دیموکراسیی پەرلەمانی وڵات بپارێزێ و خەبات دەکات بۆ چەسپاندنی ئەو دیاردە سەرەکییانەی دەستوور دانی پێداناون و بریتین لەوەی کە «عیراق» دەوڵەتێکی سەربەخۆیە» وێڕای ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئێمە دروشمی گۆڕینی ڕژێممان بەرز نەکردۆتەوە، بۆیەکا گشت دروشم و داوا و بەیاننامەکانمان داوای خەبات دژی ئیمپریالیزم و لە پێناوی جێگیرکردنی ڕژێمی دیموکراسی و هێنانە دیی مەرجەکانی سەربەخۆیی نیشتیمانیمان دەکەن، ئێمە هەرگیز داوای بەرپاکردنی شۆڕشی جەماوەریی چەکداریمان نەکردووە بەو جۆرەی حوکمەتی «عیراق»ی تاوانبارمان دەکات، وێڕای ئەوەی پشکنینەکانی پۆلیس هیچ جۆرە چەکێکیان لای ئەندامەکانمان نەدۆزیوەتەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا فەرمانڕەوایانی وڵات هەوڵیان دا چ بزووتنەوەی نیشتیمانی و چ حیزبەکەمان لەناو بەرن و پۆلیسیان بەردایە گیانی ئازادیخوازانی وڵات و لەم چەندانەیشدا هاوڕێ «فەهد»ی ڕەهبەری حیزبەکەمان و نیشتیمانپەروەرانی دیکەیان بەند کرد و ڕۆژنامە کۆنەپەرست و بەکرێگیراوەکانیان بەردایە گیانی حیزبی شیوعی و کۆمەڵێك تۆمەتی دەستکردیان دایە پاڵی بۆ ئەوەی سەر لە ڕای گشتی بشێوێنن و پاکانە بۆ هێرشە پڕ لە شەرمەزارییەکەیان دژی حیزبەکەمان بکەن، بەڵام ئەو جۆرە پڕۆپاگەندە درۆیەیان نە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر گەلەکەمان هەبوو وە نە دەشیبێ بۆیەکا ناچار بوو گیراوەکان بداتە دادگە بۆ ئەوەی گوایە پەردە لە ڕووی تاوانەکانیان لای ڕای گشتی ڕامالێ و خۆیشی وەك حوکمەتێکی دیموکراسیخوازیی دەستووری نیشان بدات.

بەڵام خودی ڕووداوەکان پەردە لە ڕووی گشت درۆ و دەلەسەکانی حوکمەت هەڵدەماڵن، چونکە کاتێك تاوانباران پێشکەشی دادگا کران ڕێگە نەدرایە پارێزەرەکانیان بەر لە ڕۆژی دادگاییکردنیاندا و لە خودی هۆڵی

دادگاییکردنەکەیاندا بیانبینن. هەرچی شێوازی دادگاییکردنەکەش بوو وەك شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕ دەهاتە بەرچاو کە پۆلیسی «تەحقیقاتی جینائی»بەشەکانی نووسیون، ئەوە بوو خودی دادوەر ڕێگەی نەدایە تاوانبارەکان قسە بکەن و هەرچییەکیشیان بگوتایە و لەوانە بووایە لە بەرژەوەندییان بێت ئەو یەکسەر قسەکەیانی پێ دەبڕین و ڕاستێکەی پۆلیس بۆ خۆیان کارەکانی دادگایان بەڕێوە دەبرد و هەر بۆخۆشیان پرسیارەکانیان دادەڕشت و جارجارەیش هەر بۆخۆیان لە جیاتی تاوانبارەکان وەڵامی پرسیارەکانی خۆیانیان دەدایەوە، بۆیەکا بڕیاری دادگەی جەزا کە دەعواکە بدرێتە دادگەی باڵا بریتی بوو لە دووپاتکردنەوەی ڕاپۆرتی شوعبەی خاسە و کارمەندانی ئەو شوعبەیە.

کاتێکیش دادگەی باڵا کەوتە ڕوانینی ئەم پرسە بەشێکی دیکەی گاڵتەجاڕییەکە دەستی پێکرد کە پۆلیس بۆخۆیان پاڵەوانی شانۆگەرییەکە بوون، بۆیەکا بڕیاری ئەم دادگەیە دووپاتکردنەوەی قسەکانی داواکاری گشتی و جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی وەزارەتەکەی ئێستا بوو بێ ئەوەی قسە و بەرگرییەکانی تاوانباران بگیرێتە بەر چاو و بەو جۆرەیش یاساکانی «عیراق» و پەیمانە نێودەوڵەتییەکان و هەستی گەلی «عیراق» و ڕای گشتیی جیهانی خرانە ژێر پێوە و ئەوەبوو بڕیاری لەسێدارەدانی هاوڕێ «فەهد»ی سکرتێری گشتیی حیزبەکەمان و هاوڕێ «زەکی محەمەد بەسیم»ی ئەندامی حیزب و «ئیبراهیم ناجی» کە لاوێکی نیشتیمانپەروەرە، وێڕای بڕیاری بەندکردنی قورسی چوار کەسی دیکەیان ماوەی پازدە ساڵ بۆ هەر یەکەیان و بڕیاری بەندکردنی نۆ کەسی دیکەیان بۆ ماوەی چوار ساڵ هەر یەکەیان دەرچوو.

ئەم بڕیارە ناعادیلەی حوکمەت دژی هاوڕێ «فەهد» و هاوەڵەکانی بووە هۆی وروژاندنی ڕق و کینەی بێ ئەندازەی گەل چونکە لە سەرجەمی

مێژووی جیهانی دیموکراسیدا بڕیارێکی لەو جۆر و شێوازە دژی ڕەهبەرانی پارتییەکی نیشتیمانی و خەباتگێڕ دەرنەچووە، تەنانەت یەکێکی وەك هیتلەریش زاتی نەدەکرد کارێکی لەو جۆرە بکات. حوکمەتی «عیراق» بەو کارەی پێڕەوی نەتەوە یەکگرتووەکانی خستە ژێر پێوە، چونکە مافی دەربڕینی ڕەوا و بیرو بۆچوونی گشت گەلان و کەسێکی پاراستووە، حوکمەتی «عیراق» بەم کارەی هەمان ڕێبازی فرانکۆی «ئیسپانیای — ك.م.» لە چەوساندنەوەی شیوعی و نیشتیمانپەروەرانی دیکەدا گرتە بەر بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی ئەم کارەی چۆن ناوی «عیراق» لە ئاستی جیهاندا دەڕزێنێ و چۆن ڕقی ڕای گشتی «عیراق» و جیهان دەوروژێنێ.

گەلی «عیراق» لە «جەنگی دووەمی جیهانی»دا بۆ ئەوە سەرنەکەوت کە دوایی دووچاری چەوساندنەوەیەکی وەها دڕندانە بێت و ڕۆڵەکانی لەسەر خۆشەویستیی نیشتیمان و گەلەکەیان ببرێنە سەر پای قەنارە.

ئەی خاوەن شکۆ و ڕێزداران تکاتان لێ دەکەین داوا لە حوکمەتی عیراق بکەن بڕیاری لە سێدارەدانی هاوڕێ «فەهد» و هاوەڵەکانی هەڵبوەشێنێتەوە.

ئێوەیش ڕەهبەرانی دەزگا و پارتییە دیموکراسیخوازەکان داواتان لێ دەکەین دەنگی ناڕەزایی دژی ئەم بڕیارە دڕندانەیە بەرز بکەنەوە.

کۆمیتەی ناوەندی

حیزبی شیوعیی عیراقی

١٩٤٧/٦/٢٧[٤٦].

دوا بەدوای ئەم بەیاننامەیەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» ئەم تێبینییانەی لای خوارەوەی کۆنسوڵی بەریتانی لە «بەغدا» هەڵگیراون، کە وا

[46] N.A., F.O., 624/116, Secret, Defence Security Office, Iraq British Forces in Iraq, ref. S.91/×/1/64, British Embassy, Baghdad, Communism -Iraq.

دیاره، دەربارەی هەمان بابەت ناردوونی بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە «لەندەن»، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیانە:

«تێبینی،

کۆنسولّ،

ڕۆژی یەکی تەمموزی ١٩٤٧.

١- ئیمڕۆ بەیانی کاتێک بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی هەندەرانی «عیراقیم- ک.م.»دی زانیم کەوا ئەویش بە هۆی ئەو ڕاپۆرتانەوە نیگەرانە کە نێردراون سەبارەت بە بڕیاری لە سێدارەدانی ئەم دواییەی شیوعییەکان لە دەرەوەی «عیراق»ەوە، گوتیشی بە پێی ڕاپۆرتی باڵوێزخانەی «بەریتانی»یەوە لە «لەندەن» پرسیارێك لە پەرلەمانی بەریتانیدا کراوە کە دەڵێ: ئەو تاوانبارانە تەنها لەسەر بیرو باوەڕ حوکم دراون؟، گوتیشی کە ئەو بۆ خۆیشی پێشنیازی کردووە بەندەکانی یاسای عقوباتی «عیراق»ی، کە لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا دادگە بڕیارەکانی خۆی دەرکردوون، بنێردرێن بۆ گشت نوێنەرانی عیراق لە هەندەران، یەکێکیش لەو بەندانە ئاماژەی بۆ «قەدەغە کردنی -ک.م.» بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی شیوعی لە ڕیزەکانی سوپادا کردووە.

٢- دوا بەدوای فەرمانەکانی جەنابتان تەلەفۆنم بۆ «ئەحمەد پاشا» [٤٧] کرد و پێم گوت پێویستە ئەو تەئکیدی ئەوە بکات کە چ وەسی و چ سەرەك وەزیران ئاگاداری ئەوە بوون کە ئەگەر بێت و بڕیاری لە سێدارەکان جێبەجێ بکرێت ئەوە دەبێتە هۆی ناڕەزایی لە دەرەوەی «عیراق».

لە وەڵامدا «ئەحمەد پاشا» گوتی ئەو ئاگاداری ئەو ڕاستییەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دیسانەوە سەرنجیان بۆ ئەو ڕاستییە ڕادەکێشێت.

ئیمزا[٤٨]» [٤٩].

---

[٤٧] مەبەستی «ئەحمەد موختار بابا»نە کە ئەوساکە سەرۆکی دیوانی مەلەکی بوو.

[٤٨] لە دەقی بەلگەنامەکەدا هەر ئیمزاکە، بێ ناوی کەس، دانراوە و لە فایلەکەشدا هیچ

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل ڕاپۆرتێکی نهێنیی شەش خاڵییە دەربارەی کۆمۆنیزم لە «عیراق» و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەر گێڕانەکەیەتی:

«نهێنی:

ژمارە س.ف.٥/٥،

ناونیشان:

کۆمۆنیزم لە «عیراق»،

بە پێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان:

١- وەك زانیومانە بڕیاری دادگەی باڵا دەربارەی لە سێدارەدانی «یووسف سەلمان یووسف - فەهد» و «ئیبراهیم ناجی شومەیل» و «زەکی بەسیم» بووەتە هۆی نیگەرانییەکی زۆر لە نێوان شیوعییەکاندا، شیوعییەکان پەنایان بردووەتە بەر جۆرە حەربێکی ئەعساب دژی ئەندامانی دادگەی باڵا و ژمارەیەك لە وەزیرانی حوکمەت، بەوەی لە ڕێگەی تەلەفۆنی نەزانراوەوە هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوەیان لێ دەکەن، ئەوەیش زانراوە کە وەزیری داد چەند شریتێکی ئەو تەلەفۆنانەی لایە و ئێستا دەیەوێ ئەو کەس و لایەنانە بناسنەوە.

٢- دوای دەرچوونی بڕیاری لە سێدارەدانی کۆمۆنیستەکان زنجیرەیەك دەنگوباو کەوتەوە کە وەك دەڵێن «جوو»ەکان ڕێکیان خستوون، یەکێك لەو دەنگوباوانە دەڵێن کوژانەوەی مەکینەی کارەبای شاری «بەغدا» شەوی بیست و چواری مانگی حوزەیرانی «ساڵی ١٩٤٧- ك.م.» کە بووە هۆی ئەوەی دانیشتووانی شاری «بەغدا» شەوێکی تاریك و نووت بەرنەسەر کرداری شیوعییەکان بووە وەك نیشانەی پرۆتێست. هەمان کات «جوو»ەکان

---

ئاماژەیەك بۆ ناوی خاوەنی ئیمزاکە نەکراوە.

(49) N.A., F.O., 624/116, Secret, Defence Security Office, Iraq British Forces in Iraq, ref. S.91/×/1/64, British Embassy, Baghdad, Communism/ Iraq, Minutes, Consellor, 1.7.1947.

پڕۆپاگەندەی دژی «بەریتانی»یەکان و لایەنگری «سۆڤیەتی»یەکان دەکەن، کە باسی گرانی و بەرزبوونەوەی نرخی شتومەك دەکرێ ئۆباڵی ئەو دیاردەیە دەخرێتە ئەستۆی بەریتانییەکان، وەك یەکێك لە جووە ئاگادارەکان باسی کردووە ئەو جووە تەنانەت وتووشییەتی بەریتانییەکان نیازیانە بە جۆرێك دەست بە سەر ئابووریی «ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست»دا بگرن کە ڕێگە نەدەنە پەرەسەندنی ڕەوای بەرژەوەندییەکانی «ڕووسیا» لە ناوچەکەدا، لە کاتێکدا «ڕووسیا»ی هەژار جەنگی بردەوە و جیهانی لە زوڵمی نازی قوتار کرد و بە مانای گەلانی بەڵکاندا چوو، بەلام ئینگلیز و ئەمەریکاییەکان یەکسەر بەرەنگاری هاتنەوە و کەوتنە هاندانی ئەو گەلانە لە پێناوی جێبەجێکردنی نیازە گلاو و چاوچنۆکەکانی خۆیاندا.

٣- دوای دەرچوونی بڕیارەکانی دادگە دژی شیوعییەکان ئەندامی دادگەی باڵا دادوەر «مووسا ئالووسی» لە لایەن براکەیەوە، کە ئەویش دادوەرە، ڕەخنەی لێ گیرا لەسەر ئەوەی بڕیارەکانی دادگە قاسی بوون. دەنگوباوێکی زۆر بلاوە دەڵێ جووەکان لە ڕێگەی پارێزەر «شالووم دەروێش»ەوە هەوڵیان داوە دادوەر «مووسا ئالووسی» بکڕن.


صالح جبر

٤- ژمارەیەکی زۆر لە جووەکان لەگەڵ «عەبدولفەتاح ئیبراهیم» و «دەروێش شالووم» و «عەزیز شەریف»دا گەلێك هەوڵیان داوە بۆ ئەوەی «ئیبراهیم ناجی شوومەیل» لە پەتی سێدارە قوتار بکەن. دەشڵێن ژمارەیەك جوو گفتوگۆیان لەگەڵ ئەندامانی «مەحکەمەی ئیستیئناف» دا کردووە و هەوڵیان داوە بە پارە حوکمەکان بگۆڕن، هەر چۆن بێ «سالح جەبر»ی سەرەك وەزیران و «نووری سەعید» پاشا سوورن لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دادگە.

لە ڕاستیدا وەك دەشڵێن «سالح جەبر» بە

تایبەتی دادوەران «حەسەن تەتان» و «عەبدولجەبار تەکەرلی»ی ئاگادار کردووە کە کۆشك «بیلاط» سوورە لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دادگە.

٥- تێبینیی ئەوەیش کراوە چۆن «حسەین ڕەحالی» یاریدەدەری ئەمینی «بەغدا» ئێستا بەردەوام پێوەندیی بە چەپڕەوەکانەوە هەیە و گوێیان لێ بووە چۆن ڕەخنەی لە ڕەفتاری دادگەی بالاّ دژی شیوعییەکان گرتووە، «عەزیز شەریف»یش لەسەر ئەوە گیراوە کە ویستوویە شەو بچێتە زیارەتی موفەوەزییەتی «ڕووسیا».

٦- «عەبدوللاّ مەسعوود قورنییش» لە گفتوگۆیەکی ئەم دواییانەیدا گوتوویە «هەمووی یەك دوو مانگ نابات کاتێك گەل دژی میری بە خۆنیشاندان ڕادەپەڕێت». گوتووشییەتی لاوان بە شێوازێکی تایبەتی پەشۆکاون و «ڕووس»ەکانیش مانگی ئەیلوول پیلانەکانی «بەریتانیا» لە «ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست»دا لە بەردەم «ئەنجوومەنی ئاسایش» و «نەتەوە یەکگرتووەکان»دا ڕیسوا دەکات، لە کاتێکدا، وەك گوتوویە، موفەوەزییەتی «ڕووس»ی لە «بەغدا» لەمەودوا نزیکتر ئاگاداری ڕووداوەکانی «عێراق» دەبێت»(٥٠).

لێرەدا فایلی ژمارە ١١٦/٦٢٤ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی تەواو دەبێت و ئینجا نۆرەی گەورەترین فایلی وەزارەتی ناوبراو دێت کە لە هەمان ئەرشیف هەڵگیراوە و بە زانیاریی یەکجار بە نرخ و دەگمەن و کەم زانراو تەنراوە.

---

(50) Ibid, Secret, S.F.515, 27.6.1947, Communism - Iraq.

## گەورەترین فایلی نهێنیی حوکمەتی بەریتانی دەربارەی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»

ژمارەی فایلی ناوبراو «١٠٤٤/١٨١»ە و لە سەری نووسراوە «یەکجار نهێنی، حیزبی شیوعیی عیراقی». ئەم راپۆرتەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە پێشەکییەك و چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە.

نووسەرانی ئەم فایلە لە سێ خاڵی پێشەکییەکەیاندا باسی ئەوە دەکەن چۆن «کۆتایی ساڵی ١٩٤٦ و چەند مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ لە ئەنجامی شاڵاوێکی بەرفراوانی پۆلیسدا دژی شیوعییە عیراقییەکان توانرا دوو پارتی سەرەکی بدۆزرێنەوە- «حیزبی شیوعیی عیراقی» و «عوسبەی شیوعییە عیراقییەکان» "The League of Iraqi Communists"، رەهبەرە سەرەکییەکانی ئەو دوو پارتییە گیران و بزووتنەوەی شیوعیی «لە عیراق- ك.م.» بەو جۆرە گورزێکی کوشندەی لێ وەشێنرا، «عوصبەی شیوعییە عیراقییەکان» لە ناوچوو، بەشێکی زۆر لە ئەندامەکانی دایانە پاڵ «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە دەستوبرد ریزەکانی خۆی رێکخستەوە. کۆتایی ساڵی ١٩٤٧ پۆلیس هێرشێکی دیکەی کردە سەر «حیزبی شیوعیی عیراقی» و بەمەش ژمارەیەکی دیکە لە ئەندامەکانی گیران، بەڵام دیسانەوە حیزبی ناوبراو بە خێرایی ریزەکانی خۆی رێکخستەوە، بۆیەکا پۆلیس کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ چەند هەڵمەتێکی دیکەی دژی ساز کرد» (٥١).

لە خاڵی دووەمی پێشەکییەکەیاندا نووسەرانی فایلەکە رەخنە لە هەندێك لایەنی کارەکانی پۆلیسی عیراقی «وەك دەزگایەکی رۆژهەڵاتی» دەگرن و ئەوە نیشان دەدەن کە پۆلیس نەیتوانیوە «مێژووی تەواوی حیزبی شیوعیی

---

(51) A.N., F.O.., 181/1044, Top Secret, Iraqi Communist Party.

عیراقــی و ســەرەتاکانی ئــەو مێــژووە» نیشــان بــدات بۆیــەکا پێویســتە کاربەدەســتان بگەڕێنــەوە ســەر نــاوەرۆکی ئــەو ڕاپۆرتانــەی دیکــەیش کــە دەربارەی ئەم بابەتە ئامادە دەکرێن، تایبــەت چونکە هێرشــی پــۆلیس دژی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بەردەوامە و دەزگای پــۆلیس نــەیتوانیوە کۆتــایی تەواوەتی بە چالاکییەکانی شیوعییە عیراقییەکان بهێنێت.

بەشی دووەمی پێشەکیی فایلەکە گەورەترین بەشی ئەو پێشەکییەیە و چواردە خاڵی چڕوپڕی لە پتر لە چواردە لاپەڕەدا پــڕ کردۆتــەوە. ئــەو بەشــە باســی ئــەوە دەکــات چــۆن «ســەرەتای ســاڵی ١٩٤٧ پــەلامارێکی ســەرەکیی پۆلیس بۆ سەر هەردووك «پارتی کۆمۆنیستی عیراقی – حیزبی شــیوعی» بــە ڕەهبەریی «یووسف سەلمان یووسف – فەهد» و بە ڕادەی دووەم «عوصبەی شــیوعییە عیراقییــەکان» بــە ڕەهبــەریی «داود ســایغ» کــە لەگــەڵ ئەندامــە دیارەکانی هــەردووك ڕێکخــراودا ئــەو دووانــەیش درانــە دادگــە و حــوکم دران، بــەڵام ئەمــە وەهــای نەگەیانــد کــە پــۆلیس نــەیتوانیوە کۆتــایی تــەواو بــە چالاکییەکانی ئەو دوو حیزبە بهێنێت، «حیزبــی شــیوعیی عیراقــی» تــوانی لــە ماوەیەکی تەواو کورتدا بێتەوە مەیدان، ئەوەبوو سەرەتای مانگی حوزەیرانی ١٩٤٧ ڕۆژنامەی «القاعدة»ی نهێنی کەوتەوە دەرچوون و تەواو بە ڕێکــوپێکی تــاوەکو مــانگی تەشــرینی یەکــەمی ســاڵی ١٩٤٨ چــاپ کــرا. هــەمان کــات لیژنەیەکی ناوەندی نوێی حیزب لەو ئەندامانەی لە هەڵمەتی گرتنی سەرەتای ساڵی ١٩٤٧دا قوتاریان بوو دامەزرێنرا، لەم لیژنە نوێیــەدا «یــەهودا ئیــبراهیم صدیق» وەك ڕەهبەر سەرکەوت و پشتگیریی لە لایەن چەند کەسێکی دیکەوە لێ کرا کە دوایی «مالیك سێف» بووە گرنگیان. ماوەی نێوان هەڵبژاردنی ئــەم لیژنەیە و هەڵمەتی گرتنی مانگی تەشــرینی یەکــەمی ســاڵی ١٩٤٨ ی پــۆلیس ماوەی ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی حیزب و چاپکردنەوەی ئۆرگانە نهێنییەکانی حیزب «القاعدة» و «ئــازادی» بــوو، وێــڕای بڵاوکردنــەوەی نامیلکــە دەربــارەی

باسوخواسی هەمەجۆر و بە مەودایەکی فراوان، هەمان کات و هەر چۆن بێت ژمارەیەك هەنگاوی دیکە بەرەو پێش نرا». لێرەدا نووسەرانی فایلەکە دەڵێن: «بۆ زانینی زیاتر دەربارەی چاپی نوێی «القاعدة» و «ئازادی» دەتوانن بڕواننە پاشکۆی ژمارە أ».

لە خاڵی دووەمی پێشەکییەکەدا ئەم زانیارییە گرنگانە دەخوێنینەوە:

«لە ئەنجامی تاقیبەکانیاندا پۆلیس بەوەیان زانی کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزب کۆبوونەوەکانیان لە چەند ماڵێکی جیاوازدا دەکەن، بەڵام راپۆرت و ڕۆژنامەکانیان لە خانووی ژمارە ١٦٦/١٧ی گەڕەکی بەتاوین، کە هی پیاوێکە بەناوی سەعید سامی نەقشلییەوە هەڵدەگرن، بەوەیش زانرا کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لەم خانووەی دواییدا واتە «خانووەکەی گەڕەکی بەتاوین – ك.م.» ڕۆژی دوازدەی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ کۆ دەبنەوە، هەڵمەتی لە ناکاوی پۆلیس بۆ سەر ئەو ماڵە بووە هۆی دەستگیرکردنی «یەهودا ئیبراهیم صدیق» و «جاسم حەموودی» و «هادی عەبدولڕەضا» و «عەزیز محەمەد». هەروەها لە هەمان ماڵدا چەند ژمارەیەکی «القاعدة» و چەند لاپەڕەیەك بە زوبانی کوردی کە پێوەندییان بە «ئازادی»یەوە هەبوو، هەروەها چەند ژمارەیەکی «ڕزگاری» و دەسنووسی ژمارەیەك وتار و نامیلکەی هەمەجۆر و ئەو کۆدە «ناونیشانە نهێنییەکانی» کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لەگەڵ ڕێکخراوە شیوعییەکانی لیواکاندا بە کاری دەهێنا دۆزراونەتەوە، وێڕای ئەوەی هەموو ئەوانەیش لە هەمان ماڵدا تۆماری ناوی ئەندامانی حیزب و ناوی خواستەنییان «الأسماء المستعارة» و هەمەجۆر کتێب و وتاری کۆمۆنیستی و ٩٠ «نەوەد» دینار و هەشت سەد و پەنجا» ٨٥٠« فلسی کاش «واتا ٩٠ پاوەن و ١٧ پێنس» دۆزراونەتەوە»[٥٢].

---

(52) Ibid.

له خاڵی سێیەمیشدا دەڵێت: «پۆلیس زانیارییان دەستکەوت دەربارەی ئەوەی چاپخانەی «القاعدة» لەوانەیە لەو ماڵەدا دابمەزرێنن کە «جەمال محەمەد»ی سایقی پاس و کارمەندی کۆمپانیای گواستنەوەی «بەغدا» خاوەنییەتی، بەڵام هەمان کات بە وەیش زانرا کە ناوبراو دوو خانووی هەیە، یەکەمیان کەوتۆتە سەر شەقامی «فضوة عەرەب» و ئەوی دیکەشیان وا لە گەڕەکی ئەعزەمییە، پۆلیس لە یەك کاتدا دایان بەسەر هەردووکیاندا و لەوەیاندا کە کەوتۆتە سەر شەقامی فضوة عەرەب ژمارەیەك ڕۆڵی لاستیك کە بۆ کاری چاپ بە کار دەهێنرێن و چەند بەندێك کاغەزی ڕۆنیۆ و چەند تەنەکەیەك مەرەکەبی چاپ دۆزرانەوە. «جەمال محەمەد» کە دەستگیر کراوە دانی بەوەدا ناوە کە چاپخانەکە لە ماڵەکەی ئەودا بووە، بەڵام ماوەیەك لەمەوبەر گوێزراوەتەوە ماڵێکی دیکە کە ئەو نازانێت کەوتۆتە کوێوە، گوتیشی ئەو وتارانەی دۆزراونەتەوە لە ماڵەکەیدا هی چاپخانەی «القاعدة»ن. هەمان کات پۆلیس بەوەیشیان زانیوە «حسەین حاجی تەها» ناوێك کارمەندی بەڕێوەبەرایەتی مەساحەیە و «ئەلیاهو» ناوێك «کە ناوی تەواوی نەزانراوە» پیتچنی چاپخانەکەن، «تەهایان» گیراوە و هەرچی «ئەلیاهو»شە بێ سەروشوێنە»[٥٣].

له خاڵی چواردەی هەمان ڕاپۆرتیشدا بەم جۆرە باسی لقی «کەرکووك»ی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کراوە:

«پۆلیس هەمان کات بەوەیشیان زانی کە لێپرسراوانی لقی «کەرکووك»ی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەگەڵ لێپرسراوانی لیواکانی باکوور کە پارێزەر «نافیع محەمەد عەلی»[٥٤]، بەرپرسیانە، وان لە ماڵی ژمارە ٩ب/٣٧ی سەرشەقامی شاترلوو. پۆلیس لە ناکاو هێرشیان بردە سەر ئەو ماڵەوە

---

[53] Ibid.

[٥٤] مەبەست خوالێخۆشبوو «نافیع یونس» «هەولێری»یە کە یەکێك بوو لە ڕەهبەرە کۆمۆنیستە دیار و هەرە دڵسۆزەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی».


جەمال حەیدەری

«نـــافیع محەمـــەد عـــەلی» و «ئەحمـــەد عەبدولغـــەفوور» [٥٥] و «جـــەمال حەیـــدەر ئەلحەیـدەری» [٥٦] و سـایقێك بـەناوی «تۆمـا شابا»وە و ئەوانەی لەگەڵیان بوون وێڕای خاوەن ماڵەکـە هـەموویان گـیران و دوای پشـکنینی ماڵەکـەیش لـە نێـو وتارەکانـدا ئـەو کـۆدە دۆزرایەوە کە لقی «کەرکووك» لە پێوەندییەکانی خۆیدا لەگەڵ کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعیدا لـە «بەغـدا» بـەکاری دەهێنـا. وێـڕای ئەوانـە چەند ژمارەیەکی «القاعدة» و «ئازادی» لەگـەڵ دەستنووسی چەند وتارێك کە ئامادەکرابوون بۆ چاپ لەو ڕۆژنامانەدا و لیستی نـاوی ئەنـدامانی حیـزب لـە «کـەرکووك» و «سـلێمانی» و «هـەولێر» و ئـەو مانگانانەی دەیاندانە حیزب دۆزرانەوە.

لە لایەکی دیکەوە ئەو پشکنینەی «کەرکووك» بووە هۆی گرتنی «مەجید محەمەد»ی خاوەن چێشتخانە و «یۆنا ولیەم»ی کرێکار و «ئـەلیاس حـەنا»ی قوتابیی قوتابخانەی ناوەندی و «کەمال عیزەدین بەزان» کە ئـەویش قوتـابیی ناوەندییە و «سابیر صدیق»ی حـەرەس مـەخزەنی دایـەرەی ڕەی و «مەجیـد طەباخ». هەمان کات لە ماڵەکانی ئەم کەسانەشدا چەند ژمارەیەکی «القاعدة» و «ئازادی» و «ڕزگاری» دۆزرانەوە، وێڕای دەستنووسی بە دەست نووسراوەی

---

[٥٥] مەبەستی خوالێخۆشبوو «ئەحمەد غەفوور»ە کە لە شیوعییە ناسراو و دڵسۆزەکانی شاری «سلێمانی» بوو.

[٥٦] مەبەستی خوالێخۆشبوو «جەمال حەیدەرییە» کە بەرپرسی «رایة الشغیلة» بوو، بەر لە تیرۆرکردنی لە ساڵی ١٩٦٣دا یەکێك بوو لە ئەندامە هەرە دڵسۆز و چاونەترسەکانی مەکتەبی سیاسیی «حیزبی شیوعیی عیراقی»، هـەر ئـەو کـاتیش مـوهیبی برایشـی تـیرۆر کـرا، خوالێخۆشبوو «ساڵح» و هەروەها «مومتاز» و دوکتۆر «جەمشید» کە ئێستاکە لە ژیاندا ماون برای ئەو «جەمال حەیدەری»یەن.

چەند نامیلکەیەکی حیزب کە بڕیار بووە لەو ڕۆژانەدا بنێردرێن بۆ «سلێمانی» بۆ ئەوەی لەوێ بڵاویان بکەنەوە، جگە لە دەسنووسی نامیلکەیەك بەم ناونیشانەوە «کەی دەست دەکەین بە لێکۆڵینەوەی پرسی نەتەوەیی»، هەروەها ژمارەیەك لە «دەنگی جووتیار – صوت الفلاح»یش دۆزرایەوە کە وێنەی چەکوش و داسی لەسەرە. وەك دەڵێن ئەم نامیلکەیەی دوایی ئۆرگانی کۆمەڵەیەکە بەناوی «یەکیەتی کاسبکاران و جووتیاران»ەوە. ژمارەیەك نامیلکەی دیکەی لەو بابەتانە دۆزراونەتەوە، لەماڵی «یۆنا ولیەم»یش نەخشەیەك دۆزراوەتەوە کە سنووری سیاسیی کوردستانی تێدا دەستنیشان کراوە».

«بڕوانە پاشکۆی ژمارە: ب»، بەپێی نەخشەکە سنووری کوردستان لە کەنداوی فارسەوە دەست پێدەکات و تاوەکو تورکیا دەکشێ و ئەم شارانەیش تێیدا دەکەونە کوردستانەوە – «کرمانشا» و «مەریوان» و «خانەقین» و «سلێمانی» و «کەرکووك» و «هەولێر» و «ماردین» و «ئورفە»[٥٧].

خاڵی دواتری هەمان ڕاپۆرت بۆ چالاکییەکانی شیوعییەکانی شاری «خانەقین» تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«لە کاتی چاودێری ئەو ماڵەدا کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە «بەغدا» تێیدا گیران پۆلیس هەستیان کرد دوو کەس سەر لەو ماڵە دەدەن، یەکەمیان «مالیك سێف»ی قوتابیی دەرکراوی دار المعلمین و ئەوی دیکەشیان ناوی «حەنا تۆماس»ە کە دەڵێن پەیامنێر بووە لە نێوان کۆمیتەی ناوەندی حیزب و ئەندامەکانیدا. زۆری نەبرد دوای ئەمە کاتێك «پۆلیس» هەڵمەتیان بردە سەر «خانەقین» و «باقوبە» چونکە لەو

---

[٥٧] دواتر دێینەوە سەر باسی ئەو نەخشەیەی کوردستان. بڕوانە:
N.A.,F.O., 181/1044, Top Secret, Iraqi Communist Party.

بڕوایەدا بوون کە لقی «حیزبی شیوعیی عیراقی»یان تێدا هەیە. لە «خانەقین» «ڕەشید باجەلان» [٥٨] و «حەسەن محەمەد زەهاوی» و «فلامەرز» ناوێکی میکانیك، کە ناوی تەواوی نەزانراوە، گیران، لە «باقوبە»یش «سالم ئەبو تمەن» و «جەبار ناجی» و «حاتەم داینی» گیران. چەند وتارێکیش کە پێوەندییان بە حیزبەوە هەیە و تاوەکو ئێستا وردەکارییان نەزانراوە لە ماڵەکانیاندا دوای پشکنینیان دۆزراونەتەوە» [٥٩].

خاڵی شەشەمی هەمان ڕاپۆرت گەلێك زانیاریی دەگمەنی دەربارەی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تێدایە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«٦- پشکنینی پۆلیس بووە هۆی دۆزینەوەی بەشێکی بایەخدار لە بەرهەمەکانی حیزب لە ماڵێکی گەڕەکی «سوق ئەلغەزەل»ی «بەغدا»دا، هی وەك ژمارەکانی پێشووی ڕۆژنامەی «القاعدة» و بابەتی تازە ئامادەکراو بۆی و کۆپیی ڕۆژنامەکە و کاغەزی چاپ، وێڕای چەند کتێبێکی کۆمۆنیستی و ژمارەیەك پۆستەری خۆنیشاندانەکانی قوتابییانی «بەغدا» دژی «پەیمانی پۆرتسمۆث» لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا، وێڕای لیستی ناوی ئەندامانی حیزب و کۆدێکی تایبەتیی پێوەندییەکانی کۆمیتەی ناوەندی و تەعلیماتی هەمەجۆر بۆ ڕێکخراوەکانی حیزب.

لە نێو وتارەکانیشدا نامەیەك دۆزراوەتەوە کە ئیمزای «حاج»ی بەسەرەوەیە و مەبەست «یووسف سەلمان یووسف - فەهد»ە، کە ناردوویە بۆ «هاوڕێ ماجید» کە مەبەست «یەهودا ئیبراهیم صدیق»ە. شایانی باسە

---

[٥٨] دادوەر خوالێخۆشبوو «ڕەشید باجەلان» پیاوێکی خوێندەوار و جوامێر و کوردپەروەرێکی ڕەسەن و یەکێك لە دامەزرێنەرانی «پارتی دیموکراتی کوردستان» بوو لە ساڵی ١٩٤٦دا، پێوەندیشی لەگەڵ شیوعییەکاندا زۆر باش بوو، خوالێخۆشبووم زۆر لە نزیکەوە دەناسی و ئاگاداری کتێبخانە ئاوەدانەکەی بووم.

[59] N.A.,F.O., 181/1044, Top Secret, Iraqi Communist Party.

نامەکە بە مەرەکەبێکی نهێنی «نەبینراو» نووسراوە کە دەڵێن ئاوی پیازە، «فەهد» ساڵی ١٩٤٨ ئەو نامەیەی لە بەندیخانەی «کوت»ەوە ناردووە»[٦٠].

ئینجا نۆرەی خاڵی حەوتەمینی ڕاپۆرتەکە دێت کە ئەویش گەلێك زانیاریی دەگمەن و بە نرخی تێدایە و وا لە خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ئەو زانیارییانە پێشکەش دەکەین:

«٧- لە سەرەتای مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا پۆلیس قەناعەتیان هێنا کە چاپخانەی ڕۆژنامەی «القاعدة» لە ماڵی ژمارە ٢٢٤/١/١١ی سەر شەقامی «فضوة عەرەب»دایە بۆیەکا شەوی یازدە لەسەر دوازدەی مانگی تەشرینی دووی ئەو ساڵە هەڵمەتی بردە سەر ماڵی ناوبراو، ئەوەبوو چاپخانەکە لە نهۆمی خوارەوەی ماڵەکەدا دۆزرایەوە، جگە لە ژمارەیەکی زۆر سندوق و دۆڵاب کە تایپ و ئەسبابی دیکەی چاپیان تێدا هەڵگیرابوون، هەرچی چاپخانەکەیە لە وەزعێکی باشدا بوو «بڕوانە پاشکۆی ژمارە: د»، وێڕای ئەوەی لەسەر قاعیدەیەکی کۆنکرێتی بە جۆرێك دانرابوو «لە کاتی پێویستدا- ك.م.» بە ئاسانی بگوازرێتەوە. «حەسانی کوڕی عەلی» لە ماڵەکەدا بوو کە بەرپرسیاری گشت کارەکانی چاپکردن بوو، هەمان کات حەسان چ بە کوردی و چ بە عەرەبی پیتچن بوو، یەکێکی دیکەی لەگەڵدا بوو بە ناوی «کاظم مەلا خەلیفەوە» کە هەم یاریدەی حەسانی دەدا و هەم پاسەوانی ماڵەکەیش بوو، وێڕای ئەو جووتە ئافرەتێکیش لە ماڵەکەدا دەستگیر کرا بەناوی «سەکنە»ی کچی «سەلمان»ەوە. لە کاتی هەڵمەتی پۆلیسدا بۆ سەر ماڵی ناوبراو چاپخانەکە خەریکی چاپی دوازمارەی «القاعدة» بوو «بڕوانە پاشکۆی ژمارە: ی»، ناوەرۆکی ئەو ژمارەیەی «القاعدة» لە لایەن «یووسف سەلمان یووسف»ەوە نووسرابوو لە بەندیخانەی «کوت»ەوە دەرباز کرابوو. لە ئەنجامی پشکنینی ئەو ماڵەدا، ژمارەیەکی زۆر کتێب و بەیاننامەی

---

[60] Ibid, Iraqi Communist Party.

حیزب و دوو دەسنووسی «القاعدة» و «ئازادی» و تۆمارێك بە ناوی ئەندامانی حیزب و مووچەیان کە بە ژمارە و شفرە نووسرابوون، وێڕای تۆمارێکی دیکە کە ناوی گشت ئەو کتێبخانانەی تێدا تۆمار کرابوو کە بڵاوکراوەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەفرۆشن و بارستی ئەو بڵاوکراوانە و ئەو پارانەی کە لە لایانن دۆزرانەوە، سەرباری هەموو ئەوانە وتار و وێنەی ئەندامانی حیزب کە بەشێکی زۆر نەبوو لە بەندیخانەی «کوت» گیرابوون، وێڕای چەند وێنەیەکی بەشدارانی ئەو خۆنیشاندانانەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ «دژی پەیمانی پۆرتسمۆث – ك.م.» سازکرابوون و ژمارەیەك ڕاپۆرتی لقەکانی حیزب لە لیواکانەوە و دەمانچەیەکی براون و پەنجا فیشەك و سێ سەد دینار واتا «سێ سەد پاوەن» ی کاش دۆزرانەوە» (٦١).

خاڵی هەشتەمی هەمان ڕاپۆرت بۆ درێژەی ئەم بابەتە تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«پشکنینی زۆرتری ماڵەکە و ئیعترافاتی گیراوەکان بوونە هۆی ئەوەی بەوەیش بزانرێت کە ژمارەیەك ئافرەت لە نێوان چاپخانەکە و سەرانی لق و ڕێکخراوەکانی حیزب ڕۆڵی پەیامنێر دەبینن، هی وەك «زەکیی مەلا خەلیفە»ی خوشکی «کاظم مەلا خەلیفە» و «کامیلە مەریوش»ی هاوسەری «مالیك سێف» و «سەکنە»ی کچی «سەلمان». دوای گرتنی ئەم ئافرەتانە بەوە زانرا کە ئەوان دەبوو شتە چاپکراوەکان لە چاپخانەکەوە بگەیەننە چەند ماڵێك لە «بەغدا» و لەوێوە لێپرسراوانی ڕێکخراوەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەیانگەیاندە شانە «خلیە» کانی حیزب لە «بەغدا» و ئەو لیوایانەی ئەوان لێیان بەرپرسیار بوون. بە هەمان شێواز ئەوان دەسنووسی وتارەکانیان کۆ دەکردەوە و دەیانگەیاندە چاپخانەکە» (٦٢).

---

(61) Ibid, Iaqi Communist Party.

(62) Ibid, Iraqi Communist Party.

خاڵی نۆیەمی هەمان ڕاپۆرت بە تێر و تەسەلی چەند لایەنێکی دەگمەنی دیکەی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و ژمارەیەك لە کۆمۆنیستی چالاکی ئەو ڕۆژگارە شی دەکاتەوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو خاڵەیە:

«٩- لە کاتی لێپرسینەوەدا «زەکێی مەلا خەلیفە» دانی بەوەدا نا کەماڵێك دەزانێت لە ناوچەی[٦٣] «سینەك» لە «بەغدا» کە سیان لە لێپرسراوانی سێ ڕێکخراوی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەوێ کۆ دەبنەوە بۆ ڕێکخستنی خۆنیشاندانەکانی «بەغدا» و دەوروبەری، شەوی دوازدە لەسەر سیازدەی مانگی تەشرینی دووەمی «ساڵی ١٩٤٨- ك.م.» و لە کاتی هەڵمەتبردنە سەر ئەو ماڵەدا دوو کەس گیران - «عەزیزی حاجی عەلی» [٦٤]کە جاران مامۆستای ناوەندی بوو، لەگەڵ «عەبدولسەلام عەبدولعەزین»دا کە بێکارەیە، دوو ئافرەتیشیان لەگەڵدا بوو «سەنییە عەلی» و «بەدرییە مامداری» کچی و ئەوانیش هەردووکیان گیران.

هەرچی لێپرسراوی سێیەمە کە «عەبدوللەطیفی حاجی عەلی» برای «عەزیز حاجی عەلی»یە بۆ ڕۆژی دواتر دەستگیر کرا. ئەو سێ کەسە وەك زانرا تەنها بەرپرسی خۆنیشاندانەکان نەبوون، بەڵکو هەمان کات ڕۆڵیشیان لە چاپکردنی ڕۆژنامەی «ئازادی»دا بۆ کوردستان هەبوو، هەرچی دوو ئافرەتەکەیشە پەیامنێری سەرەکیی حیزب بوون و مووچەی ژمارەیەك لە ئەندامانیان دەگەیاند و کۆپیی «القاعدة» و «ئازادی» و نامیلکەکانی حیزبیان دەکرد و ڕاپۆرت و فەرمانەکانی ڕەهبەرانی حیزبیان دەهێنا و دەبرد و دەیانگەیاندنە دەست ئەو سێ پیاوەی لە هەمان ماڵدا گیران و سێیەمیان، واتا «عەبدوللەتیفی حاجی عەلی»، دەرچووی قوتابییە لە قوتابخانەی ناوەندی

---

[٦٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە «لەسەر شەقامی سینەك».

[٦٤] مەبەست عەزیز حاجە کە کوردی فەیلییە و ڕەهبەرێکی چالاکی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوو.

«تەفـەیوض» و لـە کـاتی پشـکنیندا دوو نامـەی پـێ گـیرا «بڕوانـە پاشـکۆی ژمـارە:ف»، شـایانی باسـە بەشـێك لـە یـەکێك لـەو دوو نامەیـە بـە شـفرە نووسـراوە. نامـەی یەکـەمیان مێـژووی سـیازدەی مـانگی تەشـرینی یەکـەمی «سالّی ١٩٤٨– ك.م.» و ئیمزای «حەمید»ی بە سەرەوەیە «ساغ نەبۆتـەوە کێیـە، لەوانەیـە نـاوی خواسـتەنیی جـەودەت ئەحمـەد نـاجی بێـت»، دووەم نامەیشـیان ئیمـزای «کـەرخ» واتـا «مـیر یـەعقوب کـۆهین– جوزێـف»ی بـە سەرەوەیە. لە ئەنجامی پشکنینی ماڵەکـەی ناوچـەی «سـینەك»دا گـەلێك لـە ئەدەبیاتی شیوعی و وتاری دیکە دۆزرانەوە، لەوانەیش دەسنووسی وتـار بـۆ «القاعـدة» و «ئـازادی» و نامیلکـەی دیکـە وێـڕای دروشـم و ئـەو پۆسـتەرە نووسراوانەی کە وەك ئاڵا لە کاتی خۆنیشاندانەکانی مانگی کانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٨دا لـە لایـەن خۆنیشـاندەرانەوە هەڵـدەگیران، جگـە لـە چـەند ڕۆژنامەیـەك کـە باسـی مانگرتنـەکانی کرێکـارانی سـکەکیان کردبـوو، لەگـەڵ دەسنووسـی خوتبـەکانی «زاهیـد محەمـەدی واسـطی» [٦٥] کـە کرێکـارێکی سـکەکی لاوە و سـەرکردەی مانگرتنـەکانیان بـوو، وێـڕای پسـوڵەی ئـەو ئەرزوحاڵانەی «زاهید محەمەد واسطی» بە ناوی کرێکارانی سکەکەوە دابوونی بە کاربەدەستان، هـەروەها ژمارەیـەك شـفرەی پێوەنـدی و ١٧٤ دینـار واتـا «١٧٤ پاوەن»ی کاش» [٦٦].

خـاڵی دەیـەمی هـەمان راپـۆرت بـەم جـۆرەی لای خـوارەوە دەربـارەی هەمان بابەت دەڵێت:

«١٠– هـەمان شـەو «ئـەلیاس میللـی»ش کـە خوشـکەزا «یـان بـرازا»ی «عـەزیزی حـاجی عـەلی»یـە گـیرا، ئـەم کـوڕە لـە لایـەن «عـەزیزە»وە بـۆ

---

[٦٥] «زاهیـد محەمـەد» شـاعیرێکی شـەعبیی ناسـراوە، بـە ڕەگـەز کـوردی فەیلییـە و خـەڵکی «کـووت»ە، دوای کۆدێتاکـەی هەشـتی شـوباتی سـاڵی ١٩٦٣پـەنای هێنایـە بـەر «یەکیـەتی سۆڤیەت»، لەوێ من لە نزیکەوە ناسیم.

[66] N.A.,F.O., 181/1044, Top Secret, Iraqi Communist Party.


جەودەت ئەحمەد ناجی

پێوەندیکردن بە رەهبەرانی حیزبەوە لە بەندیخانەی «کووت» و رێکخراوەکانی حیزب، کە یەکێکیان لەسەر شەقامی «تەسابیل – Tasabil»بوو، بەکار دەهێنرا، کاتێك هەڵمەت برایە سەر ئەوماڵەی شەقامی «تەسابیل» «جەودەت ئەحمەد ناجی» کە ناوی خواستەنی «سەلیم»ە و قوتابیی کۆلێجی یاسایە و «حسقێل هاروون حسقێل» کە قوتابیی کۆلێجی بازرگانییە و «ئیبراهیم حەکاکی» دانیشتووی «کاظمیە» و قوتابیی دار المعلمین عالیەیە گیران، ئەمانە بە نووسینەوەی نامیلکەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»یەوە تاوانبار کراون و هەمان کات گەلێك لە ئەدەبیاتی کۆمۆنیستی و وتاری دیکە کە لیستی ناوەکانیان وا لە پاشکۆی ژمارە (گ)دا دۆزرانەوە، ئەم سیانە، تایبەت ناجی یان، دانیان بەوەدا ناوە کە ئەوان بەرپرسی دەرکردنی بڕیارەکانی خۆنیشاندانەکان بوون، وێڕای ئەوە لە رێگەی ناجییەوە پێوەندییان بە رێکخراوە ئافرەتییەکانی حیزبەوە دەکرد»[٦٧].

خاڵی دواتری هەمان بابەت بۆ هەمان بابەت تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکەکەیەتی:

«١١– شەوی سیازدە لەسەر چواردەی مانگی تەشرینی دووەم یەکێك بەناوی «یاقوب کۆهین»ەوە کە ناوی حیزبیی «جۆزێف»ە و ژمێریارە لە بارەگای «کارگەی– ك.م» «فەتاح پاشا» لە تەختانیی «خان مەرجان» گیرا و دانی بەوەدا ناوە کە جاران ئەندام بووە لە «عوصبەی موکافەحەی سەهیۆنی»دا و ئینجا بووەتە ئەندامی «حیزبی شیوعیی عیراقی»و وتاری

[67] Ibid, Iraqi Communist Party.

ئینگلیـزی وەردەگێڕایـە سـەر زوبـانی عـەرەبی و بەسـەر ئەنـدامانی حیزبـدا دابەشــی دەکــردن. لــەو ڕۆژەوەی لــە ناوچــەی «ســینەك»یشــدا کــە «مــیر یەعقوب»ی تێدا دەژیا ژمارەیەك ئەوراقی حیزب دۆزرانەوە کە ئەو شفرانەیان تێدا بوو کە حیزب لە پێوەندییەکانیـدا بـە کـاری دەهێنـان، وێـڕای دوو نامـە «دەربارەیان بڕوانە پاشکۆی ژمارە. ه» کە یـەکێکیان نێـردراوە بـۆ «کـەرخ» «واتا بۆ میر یەعقوب کۆهین – جۆزێف»، ئەوانی دیکەشیان نامەی «ئێلین»ی هاوسەری «ئیبراهیم ناجی شومەیل»ە کە ئێسـتا «واتـا ئیبراهیمـی مێـردی – ك.م.» لە بەندیخانەی «کووت» بەندە» [٦٨].

خاڵی دوازەدە و سیازدەی هەمان ڕاپۆرت تیشك دەهاونە سەر بەشێك لە ئیعترافاتەکانی «مالیك سێف» و ئەمـەی لای خـوارەوەیش دەقـی وەرگێڕانـی ناوەرۆکی ئەو دوو خاڵەیە:

«١٢– لەبەر ڕۆشنایی ئیعترافاتی «مالیك سێف»دا پۆلیس ڕۆژی هەژدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ هەڵمەتی بردە سەر ماڵێك لـە گـەڕەکی «ڕەبــاتی عەشــاری» لیــوای «بەســرە» و «یووســف زەڵــوف» و «کــازم عەبدولڕەزاق» و «ئـەدوەرد یـەفرایم» و «وەرگـیس سـەرکیس گـەڕەبێت»یـان گرت. دوای پشکنینی ماڵەکە گەلێك مەتریاڵی بە شفرە نووسراویان دۆزییەوە کە هی نامە ئاڵوگۆڕکراوەکـانی ئەنـدامانی حیـزب و ڕێکخـەرەکانیانن، وێـڕای دەسنووسی وتار و گەلێك ڕاپۆرتی ئەندامان و ئەو فەرمانانەی لە لایەن لقەوە بۆیان دەرچوون، هەروەها لیسـتی نـاوی ژمارەیـەك لـە ئەنـدامانی حیـزب لـە شاری «بەسـرە» و هەمـەجۆر ئـەرزوحاڵ دەربـارەی داخوازییـەکانی حیـزب و وێنەی خوتبەیەکی «مۆلۆتۆڤ» [٦٩] کە ڕۆژی حەوتی مانگی تەشرینی دووەمی ســاڵی ١٩٤٨ دابــووی، جگــە لــە چــەند ژمارەیــەك کــۆپیی «القاعــدة» و

---

[68] Ibid, Iraqi Communist Party.

[٦٩] ئەوسـاکە «میخائیـل مۆلۆتـۆڤ» وەزیـری هەنـدەرانی «یەکیـەتی سـۆڤیەت» و یـەکێك لـە یاریدەدەرە نزیکەکانی «ستالین» بوو.

بلأوكراوەكـانی «یەكیـەتی قوتابییـان» و كـۆپیی ئیحتیجـاجی «كۆمیتـەی دیموكراسـی قوتابییـانی عیراقـی» [٧٠] و مـانگرتنی برسـییەكان كـە بـە نـاوی ئەوانەوە نێردراوە بۆ «نەقابەی پارێزەران» و «پارتی نیشتیمانی دیموكراسی» و «پارتی ئـەحرار» و ئـەم ڕۆژنامانـە: «صـوت الاهـالي» و «الاحـرار» و «الـرأی العام» و «الزهراء» و «الزمان» دۆزرانەوە، هەروەها ئـەرزوحالێكی دیكـەی لـەو بابەتە دۆزراوەتـەوە كـە نێـردراوە بـۆ وەصـی و سـەرەك وەزیـران و حـاكمی عەسكەریی «بەغدا»، ئەم ئەرزوحاڵەیان لـە لایـەن كەسـوكاری گیراوەكانـەوە ئیمزا كراوە.

١٣– زۆری نەبرد دوای ئەمـە و دیسـانەوە بـە پشـتیوانیی زانیارییـەكانی «مالیك سێف» پـۆلیس هەڵمـەتیان بـردە سـەر مـاڵی «ئۆهـانیس» لـە كـەمپی ئەرمەنی نزیك «سەربازگەی ڕەشید –معسكر الرشید» و وەك چاوەڕوان دەكرا ئەمانــە گــیران – «گریگــۆر بەدرۆســیان»ی مۆســیقا ژەن و «گــەرەبێت هاریتون»ی وێنەگر و «ئەنترانیك جۆهانیانی سەعاتچی» و «ئەنترانیك ستراك» «یان سێتراكیان» ی ژمێریار لە كۆمپانیای گواستنەوەی ئێكسپرێسی «شـام» و «ستیڤان ستراك» «یان سێتراكیان»ی ژمێریار لە كۆمپانیـای نـەوتی «عـەین زاله» . لەم ماڵەیەش دوو ڕۆنیۆ و بڕێك كاغـەز، كـە لـەوەی دەكـرد بـۆ چـاپی نویێ ئامادە كرابن، دۆزرانەوە» [٧١].

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆكی خـاڵی چـواردەمینی هەمان ڕاپۆرتە:

«لـە دوارۆژانــی مـانگی تەشـرینی دووەمـدا پـۆلیس دوو نامیلكـەی بـە دەستخەت نووسراوەی بەم ناونیشانەوە دۆزییەوە– «بەرەو خەبات – بـەرەو

---

[٧٠] لێرەدا لە دەقی بەڵگەنامەكەدا وشەی Sic لە نێوان دووكەوانی گەورەدا دانراوە، (sic) یش وشەیەكی لاتینییە و كاتێك بەكار دەهێنرێت كە خوێنەر گومانی لـە ڕاسـتیی نـاو یـان ژمـارە یان هەر شتێكی دیكەی ناو ڕستەكە هەبێت و بەو جۆرە گومانی خۆی دەردەبڕێت.

[71] N.A.,F.O., 181/1044, Top Secret, Iraqi Communist Party.

شەقامەکان» (٧٢) و «ئەم سیاسەتە لە بەرژەوەندی کێ دایە؟» (٧٣)، وەها پێدەچێت نامیلکەی یەکەمیان هی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بێت، دووەمیشیان لەوانەیە هی جەماعەتی «الحقیقة» بێت کە زۆر نییە لە حیزب جیا بۆتەوە. تاقیبەکانی پۆلیس بوونەتە هۆی دۆزینەوە و گرتنی نووسەری نامیلکەی یەکەم کە دەرچووی «عەزیز سباهی»ی مامۆستای دار المعلمین ریفییە، هەرچی دەربارەی نامیلکەی دووەمیشە تاقیبەکان رێگەیان خۆش کرد بۆ گرتنی «محەمەد عەبدوللەطیف» ناوێک کە مامۆستای کۆلێجی ئەندازیارییە و بە پێی قسەکانی خۆی پیاوێکی نەناسراو نامیلکەکەی داوەتێ (٧٤).

لێرەوە دەگەینە بەشێکی یەکجار بایەخدار و پڕ لە زانیاریی دەگمەن دەربارەی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە کۆتایی چلەکانی سەدەی رابردوودا.

«مێژووی تاوانبارە سەرەکییەکان» (٧٥) ناونیشانی ئەو بەشەی فایلەکەیە و ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو بەشەیە:

یەکەم کەس بە ناوی «مالیك سێف» دەست پێدەکات کە، وەك دەڵێت، «چ لە خۆی و چ لە کەسانی دیکەوە مێژووی ژیانی ئەم تاوانبارەمان زانیوە، کە «کەمال و پرۆفیسۆر» ناوی خواستەنی بووە... ساڵی ١٩٤١ «مالیك سێف» بووە ئەندامی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و لەو کاتەدا لە «عەلی غەربی» مامۆستا بووە، هەر لەو ڕۆژانەیشدا «مالیك سێف» لە ڕێگەی «نەعیم بەدەوی»یەوە ڕۆژنامەی «الشرارة»ی پێدەگەیشت، شایانی باسە «نەعیم بەدەوی»ش وەك خۆی مامۆستا بووە و لەو ڕۆژانەدا چالاکییەکانی حیزب بەر

---

(72) To The Fight – To The Streets.

(73) This Policy – in Whose Interest is it?.

(74) N.A.,F.O., 181/1044, Top Secret, Iraqi Communist Party.

(75) Ibid, III, Histories Of The Main Accused.

له هەر شت ئاراستەی خوێندنەوەی ئەدەبیاتی شیوعیی کرابوون، ئەوانەی لەو ڕۆژگارەدا لەگەڵ ئەو دووانەدا بوون بریتی بوون لە – «نەعیم ڕومی» و «نەعیم سێف» و «سەلیم» «یان سالم» جەودەت و «ڕەشید غالیب». کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٤٢ ئینشیقاق لە ڕیزەکانی حیزبدا ڕووی دا، ئەوەبوو «زەنوون ئەیووب» و دەستە و دایەرەکەی لە حیزب جیا بوونەوە. پایزی ساڵی ١٩٤٢ «مالیك سێف» دیدەنیی «حسەین شەبیبی» کرد، «شەبیبی» لەو کاتەدا لە «نەجەف»ەوە گوێزرابۆوە «عمارە» و زوو زوو «مالیك سێف»، لە کاتی پشووەکانی قوتابخانەدا، دەچووە زیارەتی، ناوەندی ساڵی ١٩٤٣ «حسەین شەبیبی» ئەوەی لای «مالیك سێف» درکاند کە «عەبدوڵلا مەسعوود ئەلقوڕەینی» (٧٦) و دەستە و دایەرەکەی کە ڕۆژنامەی «الشرارة»یان دەردەکرد لە «حیزبی شیوعیی عیراقی»ی «فەهد» جیابوونەتەوە و دەستیانکردووە بە دەرکردنی ڕۆژنامەی «القاعدة». «مالیك سێف» پشتی «حسەین شەبیبی» گرت کە سەر بە «القاعدة»بوو وە پێوەندیی لەگەڵ ئەمانەدا پەیدا کرد – «نەسرەت باهور» و «سالّح باهوری» برای و «جەودەت دووباش» و «محەمەد نۆبش» (٧٧)، «شبیبی» «القاعدة»ی لە ڕێگەی «مالیك سێف»ەوە دابەش دەکرد. هەنگاوی دواتری «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەربارەی چالاکییەکانی حیزب بوو لە نێوان جووتیاراندا و ئەوەبوو «فیصەل صەمەدی» (٧٨) سەر بە هۆزی «ئال ئزێریج» تێکەڵ بەو بوارە بوو، هاوینی

---

(76) Abdulla Mas,ud al- Quraini.

(77) Nasaret Bahur, Saleh Bahur, Jawdat Dubash, Mohammed Nubish.

(٧٨) گەلێك سوپاسی برای دێرینم دوکتۆر «تاریق ئیسماعیل خەلیل» دەکەم کە ئەو ناوەی تێگەیاندم چونکە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Fiil Dhamad" کە بۆ ڕاست خوێندنەوەی ناوێکی ئاسان نییە. شایانی باسە دوکتۆر «تاریق» کە لە پیرۆزەی دایکییەوە کوردە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی دوکتۆر «فوئاد مەجید فەرەج» و «شیروان عەلی ئەمین» و دوکتۆر «عەلی کەریم» و من بوو، ئەویش ساڵێك بەر لە من بەشی مێژووی دار المعلمین العالیەی تەواو کرد، دوکتۆرای لە «کەنەدا» وەرگرت و ئێستا نیشتەجێی ئەوێیە، هەر کە زانیبووی بە هۆی نەخۆشییەوە هاتوومەتە «بەریتانیا» بە تەلەفۆن پێوەندیی پێوەکردم و کە


حسەین شەبیبی

ساڵی ١٩٤٣ «فەیصەل صەمەد» بۆ دیدەنیی «فەهد» نێردرایە «بەغدا»، ئەوەبوو لە ڕێگەی «حسەین شەبیبی»یەوە «فەهد»ی بینی کە پێشنیازی کاری کۆمۆنیستەکانی لە نێو ڕیزی جووتیاراندا بۆ شی کردەوە، بەڵام ڕۆژانی پشووی هاوینەی ساڵی ١٩٤٣ «حسەین شەبیبی» گیرا و ئەوەیش بووە هۆی دروستبوونی کەلێنێکی دیکە لە نێو حیزبدا. هەمان کات «حسەین شەبیبی» «مالیك سێف»ی بە «محەمەد عەلی شەبیبی» برای و «شاکیر مەحموود»، کە ئەوساکە قوتابیی قوتابخانەی «ناوەندی– ك.م.» «عەممارە» بوو، ناساند. زۆری نەبرد کاتێك «حسەین شەبیبی» ئازاد کرا، کە گەڕایەوە «عەممارە» «مالیك سێف»ی بە هەریەك لە پارێزەر «عەبدولڕەزاق ئەلزوبێر» و مامۆستا «عەبدولوەهاب سەعید حەمید» و «جەمیل مەحموود» و «ئیبراهیم مەحموود» و «مووسا نوور» ناساند.

---

بۆ خۆیشی بۆ سێ ڕۆژ ناوەندی شوباتی ساڵی ٢٠٠٨ هاتە لای کاك «خەلیل»ی برای دوو ڕۆژی لەگەڵ مندا بردە سەر، دوکتۆر «تاریق» دەمێکە پرۆفیسۆری «زانستە سیاسییەکانی» زانکۆی «کەلگاریی» "Calgary" «کەنەدی» و سەرۆکی «ناوەندی نێودەوڵەتیی دیراساتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست» و سەرنووسەری «گۆڤاری نێودەوڵەتیی دیراساتی «عیراقی»یی هاوچەرخ»ە لە کەنەدا و گەلێك کتێبی بلاوکراوەی دەربارەی «مێژووی عیراق» و «ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست» هەیە، کە دوا کتێبیان ساڵی ٢٠٠٨ لە «ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا» بەم ناونیشانەوە چاپ کراوە «سەرهەڵدان و کەوتنی حیزبی شیوعیی عیراق» و گەلێك جار باسی ڕۆڵی کورد و سیاسەتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بەرانبەر کورد و کوردستان و پرسی کوردی تێدا کردووە. بڕوانە:

Tareq Y. Ismael, The Rise and Fall of The Communsit Party of Iraq, Combridge University Press, New York, 2008, PP.33,62,83-84, 103-104, 116-117, 134-138, 141-142, 179-180, 205-206, 234-235, 274-276, 290- 291, 305 etc.

دوای ئـەوەی تەشـرینی یەکـەمی سـاڵی ١٩٤٣ «حسـەین شـەبیبی» ئیستیقالەی لە بەڕێوەبردنی خوێندنی «عەممارە» کرد خـۆی بەتـەواوەتی بـۆ کاری حیزب لە عەممارە تەرخان کرد و «مالیـك سـێف» و «مووسـا نـوون» بـۆ بـەڕێوەبردنی کارەکـانی حیـزب لـە «عـەممارە» هەڵبـژێردران و دەبـوو ڕاپۆرتەکانیان لەو بوارەدا بدەنـە «حسـەین شـەبیبی» و هـاوینی سـاڵی ١٩٤٤ «مالیك سێف» «عەبدولحسەین عەبدولکەریم»ی ناسی و ئـەمیش بـە یاریـدەی «شاکیر مەحموود» شانە «خەلییە»یەکی دامەزراند کە «عەبدولوەهاب سەعید «یان «سەید حەمید» و «عەلی شـەمەری» و «شـەهاب ئەحمـەد حسـەین عـەلی موختـار» و «ئـەمین عەبـدولڕەحیم» و «جاسـم محەمـەد» ئەنـدامی بـوون، دوا چوار کەسی ئەمانە شانەیەکی قوتابییانیان دامەزراند، وێڕای ئەوەی «شانەی لایەنگرە ڕووناکبیرەکان»یش دامەزرێنرا کە ئەمانـە ئەنـدامی بـوون: «جـەمال محەمـەد» و «نـاجی کـۆهین» و «عەبـدولڕەزاق شـەمە»[٧٩]، «مالیـك سـێف» ڕاپۆرتی لەم ڕێکخراوانەوە بۆ دەهات و هەموو مانگێك دەیناردن بۆ «حسـەین شەبیبی» لە «بەغدا»، تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤ «محەمەد عـەلی زەرقـا» هاتە «عـەممارە» و لـە ڕێگـەی «کـاظم حەمـدان»ەوە «مالیـك سـێف»ی دی، دواییش «حسەین شەبیبی» هاتە زیارەتیان و « فەیصەڵ صەمەد»ی ڕاسپارد کـە «کۆمەڵـەی هاوڕێیـانی جووتیـاران – عصـبة أصـدقاء الفلاحـین» دابمـەزرێنێت. سـەرەتای سـاڵی ١٩٤٤ «مالیـك سـێف» و «مووسـا نـوون» و «فەیصەڵ سەمەد» لە لایەن حیزبەوە بانگ کران بـۆ «بەغـدا» بـۆ ئـەوەی لـە کۆنفرانسـی حیزبـدا بەشـدار بـن. لـە «بەغـدا» «حسـەین شـەبیبی» دینـی و گەیاندنییە ماڵێکی حیزب لە «کـەرخ». دەورووبـەری بیسـت و پێـنج کـەس لـە کۆنفرانسـی حیزبـدا بەشـدار بـوون، «فەهـد» و «زەکـی بەسـیم» و «یـەهودا

[٧٩] ئەگەر لە بنەماڵەی «نەصیر شەمەی» مۆسیقاژەنی بەناوبانگ بێـت ئـەوا ئـەویش «کـورد»ی فەیلییە، شایانی باسە لە ڕۆژگاری «صەدام حسەین»دا خەریك بوو «نەصـیر» لەسـەر ئـەوەی کوردی فەیلییە لە وڵات دووری بخەنەوە.

صـديق» و «حسـەين شـەبيبی» و «محەمـەد عـەلی زەرقـا» لـە بەشـدارانی کۆنفرانسەکە بـوون. «پێـڕەوی نـاوخۆی حیزبـی شـیوعیی عێراقـی» «النظـام الـداخلی للحـزب الشـيوعي العراقـي» خوێندرایـەوە و پەسـەند کـرا و ئینجـا ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزب هەڵبـژێردران. لـە کۆبوونەوەکانـدا تـەنها ناوی خواستەنیی بەشداران بە کار دەهێنـران و نـاوی ڕاسـتەقینەیان ئاشـکرا نـەکران. لیژنـەی لیـوای «عـەممارە» داوای گەڕانـەوەی «مالیـك سـێف»ی لـە «بەغدا»وە کـرد، لیژنـەی ئـەو شـارە لەمانـە پێکهـاتبوو – «مالیـك سـێف» و «مووسا نوور» و «فەیصەل صەمەد» کە «مالیك سێف» ڕەهبەریان بوو، وێڕای ئەوەیش ئەم کۆمیتانە دامـەزرێنران «کۆمیتـەی قوتابییـان» بـە سـەرۆکایەتی شەهاب ئەحمەد و «کۆمیتـەی کرێکـاران» بـە سـەرۆکایەتیی «کـەریم حـاج» و «کۆمیتەی جووتیاران» بە سەرۆکایەتیی «فەیصەل صەمەد» و «مەلا خەلیفە» و «جـەواد ئەلصـافی» و «کۆمیتـەی ڕووناکبیران» بـە سـەرۆکایەتیی «نـەعیم نـووریی» مامۆسـتا و کـاتبی دادگـە «ئیسـماعیل ئەحمـەد». هـەمان کـات کتێبخانەیەك بە ناوی «کتێبخانەی لاوان» «مكتبة الشباب»ەوە بـۆ کرێکـاران دامـەزرێنرا کـە «محەمـەد سـاڵح ئەلصـەفار» خـاوەنی بـوو وە کتـێبی لـە کتێبخانـەی «دار الحكمـة»ی «بەغـدا»وە و لـە «سـووریا» و «میسـر»ەوە بـۆ دەهات. بەپێی قسەی «مەلا ساڵح» ئەوسا کە ژمارەی ئەنـدامانی لقـی شـاری «عـەممارە» بریتـی بـوو لـە ١٥ مونەیـد. هـاوینی سـاڵی ١٩٤٥یـش «پـارتی تەحەڕوڕی نیشتیمانی – حزب التحرر الوطني» داوای ڕێگەدانی بە فەرمی کرد و «حیزبی شیوعیی عێراقی» یش بڕیاری دا پشـتگیریی بکـات و لـە ئەنجامـدا چالاکییەکی باش بە ناوی ئەوەوە ڕاگەیێندرا. زۆری نـەبرد «مالیـك سـێف» و «مووسـا نـوور» و «نـەعیم ڕومـی» و «نـاجی کـۆهین» و «مـونعیم مـەظلـوم» و «شەنوار عۆدە» (٨٠) لە سلکی مامۆستایی دەرکران. ڕۆژانـی پشـووی هـاوینی

---

(80) Shanuar Oda.

ساڵی ١٩٤٦ «مالیك سێف» گەشتێکی پشکنینی بۆ تاقیبی چالاکییەکانی «پارتی تەحەڕوڕی نیشتیمانی» بە ناو ناوچەکانی «عەممارە»دا کرد و هەستی کرد کە جووتیارانی ناوچەکە بە ڕادەیەکی پێویست نەبوونەتە ئەندامی حیزب و هەڵوێستی کرێکارانیش زۆر لەوان باشتر نییە. ئەوساکە داهاتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە «عەممارە» بریتی بوو لە پازدە دیناری «عیراق»ی «واتا پازدە پاوەن»، ئەوان لە «بەغدا»وە هیچ جۆرە ڕێنومایییەکیان بۆ نەهاتبوو، بەڵام بۆ خۆیان دەستیانکردە دەرسی «القاعدة» و ئەدەبیاتەکانی دیکەی حیزب.

«مالیك سێف» دوای گەشتەکەی عەممارەی هاتە «بەغدا» و زوو زوو سەری کتێبخانەی «دار الحكمة»ی دەدا و لەوێ «یەهودا صدیق» و «نەعیم سەلمان» و «ئەلیاهو داود» «ساسۆن»ی دەدی، وێڕای «ئەلیاهو زەلخا» کە لە کتێبخانەکە کاری دەکرد، هەروەها سەری «یووسف زەلخا» و «سالم عوبێد ئەلنعمان» و «حسەین شەبیبی» دەدا کە ئەوساکە بەند بوون. ساڵی ١٩٤٦یش «مالیك سێف» لە «بەغدا» لە ڕێگەی قوتابی «شاکیر مەحموود»ەوە «فەهد»ی لە ماڵی زەکی بەسیم لە کەڕادەی شەرقی دەدی. «فەهد» فەرمانی دا بە «مالیك سێف» بچێتە بەسرە و ببێتە بەرپرسی حیزب لەوێ، بەو جۆرە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ «مالیك سێف» چووە «بەسرە» و لەوێ لەگەڵ «جاسم محەمەد»دا کە لە ڕێگەی «هادی تووەین»ەوە[81] ناسیبووی پێکڕا دەژیان. لە «بەسرە» کۆمیتەیەك بە سەرۆکایەتی «مالیك سێف» و ئەندامانی هەر یەك لە «ئیسماعیل ئەحمەد» و «ئەحمەد مەهدی» و «جاسم محەمەد» و «زەکەریا»... [82] و «سەبری عەبدولکەریم» و «مەهدی ساڵح» پێکهێنرا. «ئیسماعیل ئەحمەد» و «ئەحمەد مەهدی» بوونە بەرپرسی

---

(81) Hadi Tu`ain.

(٨٢) دیارە ناوی باوکی «زەکەریا»یان نەزانیوە بۆیەکا لە دوای ناوی خۆیەوە چەند خاڵێکیان داناوە.

بەندەری «بەسرە» و دیسان «ئیسماعیل ئەحمەد» و «هادی تـوەین» بوونـە بەرپرسـی میکانیکـەکان و «جاسم حـەموودی» بـووە بەرپرسـی ناوشـاری «بەسرە» و «سەبری عەبدولکەریم»یش بووە بەرپرسی «عەشار» و قوتابییان، دوای ئەوەیش کۆمیتەیەکی سەربەخۆی قوتابییان لە لایەن «کەریم»ەوە[٨٣] دامـەزرێنرا و ئەمانـەیش بوونـە یاریـدەدەری — «عەبـدولوەهاب» و «فەیسـەڵ نەسیر» و «کەمال جەرجیس». هەرچی کۆمیتەی کرێکـارانیش بـوو لـە لایـەن «ئیسماعیل ئەحمەد» و «هادی توەین» و «عەبدولحسەین «یان عەبدولحەسەن «جەبارەوە» دامەزرێنرا.

هـەمان کـات «عەبدولسـەلام عەبـدولڕەحمان» کرایـە بەرپرسـی بەشـی «باشووری عەشار»، «ناجی شـامل» و «نـەعیم مێناشـی» و[٨٤] «ئـەنوەر یۆنـا صدیق ئیسحاق» و «ئەدوارد» «ئیپهرایم»[٨٥] کرانە بەرپرسی «عوسبەی دژ بە سایۆنیزم»، «ئافرەتان»یش لە لایەن «ئەنوەر یۆنا»وە ڕێکدەخران.

دوای گرتنی «فەهد» لە سـاڵی ١٩٤٧دا سـەرکردایەتی «حیزبـی شـیوعیی عیراقی» چووە دەست «یەهودا ئیبراهیم صدیق» کە «کـەریم ڕەشـید»ی نـارد بۆ لیواکان بۆ کۆکردنەوەی ئابوونەی ئەندامانی حیزب. نیسانی سـاڵی ١٩٤٧ «مالیك سێف» لە لایەن «یەهودا صدیق»ەوە، لە ڕێگەی «مووسـا نـوور»ەوە، بانگ کرایە «بەغدا» بۆ لێدوان دەربارەی مەسەلەی چاککردنەوەی چـاپخانەی «القاعـدة». بـە نیـازی داپۆشـینی ئـەم بانگهێشـتنە «مالیـك سـێف» لـە «بەسرە»وە بـە خـۆی و خێزانەکەیـەوە هاتـە «بەغدا» و لـەو ماڵـەدا ژیـا کـە حیزب لە «باب ئەلشێخ» بەکرێی گرتبوو. «حسـقێل ئیـبراهیم صـدیق»[٨٦] بـە

---

(٨٣) دەبێ مەبەستی «صەبری عەبدولکەریم» بێت.

(84) Na`im Manashi

(٨٥) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:. Edward "Ephraem? "

(٨٦) دەبێ برای «یەهودا ئیبراهیم صدیق»ی سەرکردەی نوێی «حیزبـی شـیوعیی عـیراق» بێـت کە جێگەی «فەهد»ی گرتەوە.

یاریدەی ئۆتـۆمبیلی هاوڕێیـەکی ئەرمەنییـەوە چاپخانەکەی گواسـتەوە ئـەو ماڵەی «باب ئەلشێخ» و بۆ ئەو مەبەستەیش چاپخانەکەیان هەڵوەشـاندەوە. زۆری نەبرد، دوای گرتنـی «فەهـد»، «مالیـك سـێف» وتـارێکی «فەهـد»ی پـێ گەیشت بۆ ئـەوەی لـە ڕۆژنامـەی «القاعـدة»دا بـڵاوی بکەنـەوە، وتارەکـە لـە ڕێگەی «ئێلین»ی هاوسـەری «ئیـبراهیم نـاجی شـومەیل»ەوە هێنرابـوو. دوای ماوەیەکی کـورت لـە دەرچـوونی بڕیـاری لـە سـێدارەدانی «فەهـد» لـە سـاڵی ١٩٤٧دا شـەوێکیان «یـەهودا صـدیق» نـاردی بـە دووی «مالیـك سـێف»دا بـۆ جێبـەجێکردنی چـاپی ئیحتیجاجێـك دژی ئـەو بڕیـارە، دوای چـاپکردنی ئیحتیجاجەکـە لـە چـاپخانەی «القاعـدة» وێنەیـەکی لـە ڕێگـەی «کـاظـم ئەلحەسەنی»یەوە لێ نێردرا بۆ «حیزبـی شـیوعیی سـووری»، وێـڕای سـەدان دانەی بۆ هەمە جۆر حیزبی شیوعی لە هەندەران.

دوایی و لە هەمان ساڵی ١٩٤٧دا دەبوو «یەهودا صدیق» خۆی لە پۆلیس بشارێتەوە بۆیەکا سەرکردایەتیی حیزب درایـە «حسـقێل ئیـبراهیم صـدیق»ی بـرای، هـەمان کـات «مالیـك سـێف» لـە لایـەن «یـەهودا صـدیق»ەوە کرایـە «بەرپرسی - ك.م.» «کۆمیتەی کۆمۆنیستیی ئەرمەن» لە کەمپی «گەیلانی»، کۆمیتـەی نـاوبراو لەمانـە پێکهـاتبوو- «گریگـۆر بیدرۆسـیان» سـکرتێر و «ئەنترانیك سێتراك» و «ستیڤان سێتراکی» بـرای و «ئـارام» و کەسـانی دیکـە. ئەم دەستەیە دەبوو «هێمك» «کە هەمان کات وەك هەمك و هەمەك و هیمـك و هێسـك و هێنـك نـاوی هـاتووە[٨٧]» و دوو ڕۆنیۆیـان هـەبوو کـە لـە مـاڵی «ئەنترانیك» دانرابوون.

ساڵی ١٩٤٧ «حسقێل صدیق»، «مالیك سێف»ی ئاگادار کـرد کـە بڕیـارە یـەکێك بنێـردرێ بـۆ «مۆسـکۆ» بـۆ ئـەوەی لەسـەر سـەرکردایەتی ڕابهێنـرێ

---

[٨٧] لە دەقی بەڵگە نامەکەدا وەها هاتووە:

"This group used to Publish (Hemk) (also referred as Hamk, Hamok, Himk, Hesk, Henk".

تـاوەكو جێگـەی «فەهـد» بگرێتـەوە. «مالیـك سـێف» ئـەم بابەتـەی لەگـەڵ «یەهودا صدیق»دا هەڵسەنگاند بەرلەوەی ئەمیان بچێتە «كـەركووك» تـاوەكو لەوێ خۆی بشارێتەوە، «یەهودا تەطەوعی» كرد كە خـۆی بچـێتە «مۆسـكۆ»، بـەڵام داوای لـە «مالیـك سـێف» كـرد بـەر لـە هـەر شـت ڕای موفەوەزییـەتی «ڕووس»ی «لـە «بەغـدا» – ك.م.» لـە ڕێگـەی «گریگـۆر بیدرۆسـیان»ەوە كـە حەلەقەی پێوەندیی حیزب بوو بەو موفەوەزییەتەوە، وەربگرێ، هەمان كـات ڕەزامەندیی «فەهد»یش وەرگیرا، هەرچـەندە لـە كۆتاییـدا «یـەهودا صـدیق» نەرۆیشت بۆ «مۆسكۆ»، هەمان كات «مالیك سێف»یـش پێوەنـدی هـەبوو بـە «گریگۆر بیدرۆسـیان»ەوە و لـە ڕێگـەی ئـەوەوە ئـەدەبیاتی «سـۆڤیەت»ی و پوختـەی هەواڵـە تایبەتییـەكانی وەردەگـرت، سـەرەتای سـاڵی ١٩٤٨ بـە موافەقەتی «فەهد»، «شەریف شـێخ» و «عـەلی طـەعان» و «جاسـم طـەعـان» دایانە پاڵ «حیزبـی شـیوعیی عیراقـی»، ئـەو سیانە پێوەنـدییان بـە «مالیـك سێف» و «زەكـی خـەیری»یـەوە هـەبوو، بـەو بۆنەیـەوە «فەهـد» فـەرمانی دا ڕۆژنامەی «الأساس»ی «شەریف شێخ» بۆ كارەكـانی حیـزب تـەرخان بكـرێ. هەمان كات ئەدەبیات و هەواڵی هەمەجۆری «كۆمیتەی دیموكراسیی عەرەبی» لـە «پـاریس»ەوە بـە هـۆی «سـەلیم فـەخری»یـەوە[88] كـە یـەكێك بـوو لـە

---

[88] خوالێخۆشبوو «سەلیم فەخری» دوای «شۆڕشـی چواردەی تـەمموزی سـاڵی ١٩٥٨» كرایـە بەڕێوەبـەری گشـتیی ئێزگـەی «بەغـدا»، هـەر ئـەو دەوروبـەرەیش «بـارزان»ی لـە یەكیـەتی «سـۆڤیەت»ەوە گەڕایـەوە «عـیراق»، ئـەو ڕووداوەی بـووە جێژنـەی سـەرجەمی دڵسـۆزانی «كوردی عیراق»، «بارزانی» لە «بەغدا» لە ئوتێلی «سەمیرامیس»ی سـەر «شـەقامی ڕەشـید» دابـەزیبوو، ئێمـەی شـاگردانی كۆلیجـەكانی زانكـۆی «بەغـدا» پـۆل پـۆل بـۆ بـەخێرهاتنی دەچـووینە خزمـەتی، مـن بۆخـۆم دیدەنییـەكی تایبـەتیم لـە گەڵیـدا سـاز كـرد و لـە كـاتی دیدەنییەكەدا چەند وێنەیەكیان پێكڕا گرتین، تەنانەت لە كۆتایی دیدەنییەكەشـدا داوام لێـی كـرد بـۆ یادگـار لـە دوا لاپـەڕەی وەڵامەكانیـدا ئیمزایـەكی خـۆیم بـۆ بكـات، یەكسـەر ئـەو دیدەنییەم كردە وتارێكی دوور و درێژ و حەزم كرد لە ڕێگەی «ئێزگەی كوردی»یەوە پەخشی بكەم، بۆ ئەوە چوومە لای خوالێخۆشـبوو «سـەلیم فـەخری» كـە دەبـوو ڕەزامەنـدی ئـەو بـۆ

ئەفسەرانی سوپای «عێراق»ی، دەگەیشتنە حیزب، «یەهودا صدیق» لەگەڵ «سەلیم فەخری»دا باسی دامەزراندنی لقی حیزبی لە ڕیزەکانی سوپای «عێراق»یدا کردبوو، حیزب لە ڕێگەی ئەفسەری خانەنشین «غەضبان مەردان ئەلسەعد»ەوە پێوەندیی بە «سەلیم فەخری»یەوە دەکرد.

سەرەتای ساڵی ١٩٤٨یش «مالیك سێف» دایە پاڵ «شەریف شێخ» و «زەکی خەیری» و «جاسم طەعان» و «عەلی طەعان» لە دەرکردنی ڕۆژنامەی «الأساس»دا وتار و لێکۆڵینەوەی تێدا بلاو دەکردەوە.

دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ زنجیرەیەك موناقەشە لە نێوان «مالیك سێف» و «یەهودا صدیق»دا ڕوویان دا و مەسەلەکە خرایە بەردەمی «فەهد»، لە وەڵامدا «بڕوانە پاشکۆی ژمارە س» «فەهد» «یەهودا»ی تاوانبار کرد بە لادان و قایل بوو «مالیك سێف» ببێتە ڕەهبەری «حیزبی شیوعیی عێراقی»، لەگەڵ ئەوەیشدا «مالیك سێف» بەردەوام ڕاپۆرتەکانی حیزبی بۆ «یەهودا» دەنارد.

هەر لەو دەوروبەرەدا مالیك سێف خانوویەکی لە «بەغدا» بەکرێی ساڵانەی سەدو هەشتا دیناری «عێراق»ی گرت بۆ دوو کۆمۆنیستی «عێراق»ی کە دوور خرابوونەوە «سووریا» - «محەمەد عەلی زەرقا» و «عەبدولقادر ئیسماعیل» کە بڕیار بوو بە نهێنی بگەڕێنەوە عێراق، بەڵام ئەو دووانە وەك

---

پەخش کردنی لە ڕێگەی ئێزگەوە وەربگرم، ئەویش داوای لێ کردم پوختەی ناوەڕۆکی وتارەکەی بۆ وەربگێڕمە سەر زوبانی عەرەبی، بەڵام هەر ئەوەندەی سەرەتای وتارەکەمم بۆ خوێندەوە لەسەر ئەوەی نووسیبووم «ڕەهبەری ناسراوی نەتەوەی کورد بارزانی» چوو بە ئاسماندا و بە تووڕەییەوە گوتی «من ڕێگەی پەخشکردنی ئەو دیدەنییە نادەم چونکە تۆ «بارزانی»ت کردووە تەنها بە ڕەهبەری «کورد» لە کاتێکدا ئەو بە هەمان ڕادە ڕەهبەری عەرەبیشە». پێموایە خوالێخۆشبوو «سەلیم فەخری» کۆمۆنیستێکی دڵسۆز، بەڵام هەمان کات گەلێك توندڕەو بوو. شایانی باسە «بارزانیی» خوالێخۆشبوو «ئەسعەد خۆشەوی» لەگەڵ بوو کە ڕۆڵی سکرتێری دەبینی (بڕوانە وێنەکانی ئەو ڕۆژانە)، لە ڕۆژنامەی «خەبات»دا لەو دیدەنییەدا کە ڕۆژنامەنووس زانیار سەردار قرگەیی لەگەڵمدا لە هەولێر سازی کرد».

بڕیار بوو لە مایسی ساڵی ١٩٤٨دا نەیانتوانی بە هۆی بارودۆخی «عیراق» و ڕاوەدوونانی شیوعییەکانەوە بگەڕێنەوە، بۆیەکا «مالیك سێف» بۆخۆی چووە ناو ئەو ماڵەوە تاوەکو ڕۆژی سیازدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ گیرا» [٨٩].

دوا بەدوای ئەمە سەرجەمی لاپەڕە نۆ و بەشی هەرە زۆری لاپەڕە دەی هەمان ڕاپۆرت تەرخان کراون بۆ نەخشەی ئەو ئەرکانەی «مالیك سێف» لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ەوە تاوەکو ڕۆژی گرتنی لە سیازدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا گرتبوونییە ئەستۆی خۆی[٩٠]، ئینجا بە هەمان دەستوور سێ لاپەڕە و چەند دێرێکی هەمان ڕاپۆرت بۆ ژیننامەی «یەهودا ئیبراهیم صدیق» تەرخان کراون[٩١] کە هەرچەندە دووپاتکردنەوەیان تێدا کەم نییە، بەڵام زانیاریی نوێشیان تێدایە، وەك ئەمەی لای خوارەوە کە بە ماوەیەکی کورت دوای «یاخیبوونەکەی «ڕەشید عالی» «گەیلانی — ك.م.» لە مایسی ساڵی ١٩٤١ دا «یەهودا ئیبراهیم صدیق» بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی «عەبدولڕەحمان عەبدولقادر»ی هاوڕێیەوە کەوتە بایەخدان بە کۆمۆنیزم» [٩٢].

بەو جۆرە ناو و چالاکییەکانی دەیان لە ئەندامە ناسراوەکانی دیکەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە لاپەڕەکانی دواتری هەمان فایلدا تۆمار کراون و هەموویان بە زانیاریی نەزانراو و دەگمەن ئاخنراون، بە وێنە لە لاپەڕە سێدا نووسەرانی ڕاپۆرتەکە بەم جۆرەی لای خوارەوە دێنە سەر باسی «زەکێی مەلا خەلیفە»:

---

(89) N.A.,F.O.. 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professor) from his own and other statements, PP.6-8.

(90) Ibid, PP.9-10.

(91) Ibid, History of yahuda Ibrahim Siddiq (Majid) from his own and other statements, PP.10-13.

(92) Ibid,p.10.

«زەکیّ» خوشکی «کازمی مەلا خەلیفە»یە، ئەیلولی ۱۹٤۷ لەگەڵ براکەی و زڕخوشکێکیدا هاتنە «بەغدا» و لە بارەگای چاپخانەی «القاعدة» لە خانووی ژمارە ۲۲٤/۱/۱۱ی سەر شەقامی «فضوة عەرەب» لە «بەغدا» نیشتەجیّ بوون. لەو ماڵەدا «حەسانی عەلی»یان ناسی کە لە چاپخانەکەدا کاری دەکرد، «زەکیّ» و «کاملە مەریوش» وەك پەیامنێر کاریان دەکرد و ئەو بەرهەمانەی چاپ دەکران ئەوان دابەشیان دەکردن و بەشی هەرە زۆریان لیّ دەبردنە ماڵێك لەسەر شەقامی «قاترخانە»، هەمان کات ژمارە چاپکراوەکانی ڕۆژنامەی «ئازادی»یشیان دەگەیاندە عەزیز -عەزیز حاجی عەلی حەیدەر؟»[۹۳] «لەو ماڵەی حیزبدا - ك.م.» کە کەوتۆتە سەر شەقامی «قهوة شکر»[۹٤].

دوا بەدوای ئەو زانیارییانە سیّ لاپەڕە و نیو بۆ ڕاپۆرتێکی «یەکجار نهێنی» بەم ناونیشانەوە تەرخان کراوە: «چوارەم- مێژووی حیزب» کە لە حەوت خاڵی چڕوپڕدا گەلێك زانیاری دەگمەنمان دەربارەی دامەزراندن و ئاڵوگۆڕە زووەکان و ڕۆڵی «یووسف سەلمان یووسف - «فەهد»»مان لەو بوارەدا بۆ باس دەکات[۹۵]. بە وێنە لە خاڵی دووەمدا دەڵێت: «۲- لە بواری ئیعترافەکانیدا «مالیك سێف» گوتی یووسف سەلمان یووسف «فەهد» ساڵی ۱۹۳٤ لە عیراقەوە چووە «ئەورووپا» و ساڵی ۱۹۳٦ لە «پاریس» نیشتەجیّ بوو وە مانگانەی لە «پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسی» وەردەگرت، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی دیار بە دەستەوە نییە، بەڵام پۆلیسی «عیراق- ك.م.» لەو باوەڕەدان ئەو مووچەیەی «پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسی- ك.م.» تاوەکو گرتنی «فەهد» لە ساڵی ۱۹٤٦دا بەردەوام بوو. لە «پاریس»ەوە «فەهد»

---

[۹۳] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە: "Aziz "Aziz Haj Ali Haidar? "

[94] N.A.,F.O.. 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professor) from his own and other statements, P.30.

[95] Ibid, Top Secret, History of The Party, PP.34-37.

چووه «مۆسکۆ» «ڕۆژ و ساڵی ئەو چوونە نەزانراوە» و دەوروبەری دوو ساڵ لەوێ مایەوە و بە سەرپەرشتی «دیمیترۆف» فێر دەکرا[٩٦]. لە «مۆسکۆ» «فەهد» یان لە «خالید» بەگداش گرنگتر دادەنا. دوای گەڕانەوەی بۆ عیراق «مێژووی گەڕانەوەی نەزانراوە، بەڵام دوور نییە ساڵی ١٩٣٩ بێت» «فەهد» دەستی کردە دامەزراندنی دەستەیەکی شیوعی و ڕۆژنامەیەکی بە ناوی «الشرارة»وە دەرکرد. ساڵی ١٩٤٢ گەڕایەوە «مۆسکۆ» و «دیمیترۆف»دەربارەی گەڕانەوەکەی ئاگادار کرا و وەك سەرۆکی «حیزبی شیوعیی عیراقی» پێشوازی کرد. «فەهد» دوای گەڕانەوەی ئەم جارەیان لە «مۆسکۆ»وە لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤دا کۆنفرانسی یەکەمی حیزبی ساز کرد و ناوەکانی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزب درانە «مۆسکۆ» [٩٧].

لە خاڵەکانی دیکەدا دانەرانی ڕاپۆرتەکە بە تایبەتی باسی چالاکییە هەمەجۆرەکانی دەستە کۆمۆنیستەکان لە ساڵانی ١٩٤١ – ١٩٤٦دا دەکەن و باسی ئینشیقاقەکانی «عەزیز شەریف» و «زەنوون ئەیووب» و «داود سایغ» و «فەرید ئەحمەد» و «عەبدوڵڵا مەسعوود» و دەستە و دایەرەی «شەرارەی نوێ» «الشرارة الجديدة» و «پەیمانی نیشتیمانی» «الميثاق الوطني» و چالاکییەکانی «ساڵح حەیدەری» و «نافیع یونس» و «یەکیەتی تێکۆشین» و ڕۆژنامەی «شۆڕش»ی کوردی دەکەن، لە دوا خاڵیشدا ڕاپۆرتەکە دێتە سەر باسی هەڵوێستی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بەرانبەر پرسی «فەلەستین» کە لەو ساڵانەدا گەیشتبووە لقە پۆپە و دەڵێت:

«کاتێك «حیزبی شیوعیی عیراقی» پشتی دابەشکردنی «فەلەستین»ی «لەنێوان عەرەب و جووودا– ك.م.» دەگرت و تەواو لەگەڵ سیاسەتی «ڕووس»دا بوو لەم بوارەدا، «پارتی گەل» «حزب الشعب» لە کۆشەنیگای

---

[٩٦] لە «فێرگەی چەوساوانی ڕۆژهەڵات» «مدرسة كادحي الشرق» دەیخوێند.

[97] N.A.,F.O.. 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professor) from his own and other statements P.34.

عەرەبییەوە سەیری ئەم کێشەیەی دەکرد و ڕایگەیاند کە دواڕۆژی ئەو وڵاتە پێویستە تەنها لە لایەن ڕۆڵەکانی خۆیەوە دەستنیشان بکرێت و داوای کرد حوکمەتێکی هاوبەشی دیموکراسیی «کۆمۆنیست» بۆ عەرەب و جوو دابمەزرێنرێت. ئەم جۆرە هەڵوێستە لە دوا مانگەکانی ساڵی ١٩٤٨دا بووە هۆی دروستبوونی ئینشیقاق لە نێو ڕیزەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی"دا و ئەوەبوو دەستەیەك کە ناوی «ڕاستی» «الحقیقة» یان لە خۆیان نابوو لە حیزب جیا بوونەوە و دایانە پاڵ «پارتی گەل» «حزب الشعب» (٩٨).

«سیاسەتی حیزب، ئامانج و ئاواتەکان» ناونیشانی بەشی پێنجەمی هەمان ڕاپۆرتە کە بریتییە لە چوار لاپەڕە و هەشت خاڵی چڕوپڕ (٩٩).

خاڵی یەکەمی ئەم بەشە ئەوە دەردەخات کەوا دوا ئاواتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» وەرگرتنی دەسەلات و دامەزراندنی ڕژێمێکی شیوعیی سەر بە «سۆڤیەت»ە لە ڕێگەی شۆڕشەوە یان کۆدێتاوە یان خەباتی «بەرەی نیشتیمانی» هێزە چەپڕەوەکانەوە «الجبهة الوطنیة لقوي الیسار» و پێویستە ئەو حوکمەتە «کتومت وەك حوکمەتە تازە دامەزراوەکانی «ئەوروپای ڕۆژهەڵات» بێت و ئەوەیش گوایە کارێکی ئاسان نییە و «یووسف سەلمان یووسف – «فەهد»ی ڕەهبەری حیزب لە کاتی دادگاییکردنەکەی ساڵی ١٩٤٧یدا گوتی:لە پرۆگرامی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دا بە هیچ جۆر شتێك نییە لەگەڵ یاسا یان دەستووری «عیراق»دا نەگونجێت» (١٠٠).

خاڵی دووەمیش تەرخان کراوە بۆ باسی شێوازی خەباتی ڕۆژانەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بە پێی بۆچوونی «فەهد» و گێڕانەوەی «مالیك سێف»، «فەهد» پێی وەها بوو پێویستە تاوەکو ڕادەیەکی زۆر حیزب پشت بە مانگرتن و خۆنیشاندان ببەستێ کە لەوانەیە ببنە هۆی «شەڕ و پێکدادان

(98) Ibid, P.37.

(99) Ibid, V.party Policy, Aims And Objects, PP.37-40.

(100) Ibid, P.37.

لەسەر شەقامەکان» و دوورنییە ئەو دیاردەیە ببێتە هۆی بەرپابوونی شۆڕشێکی گەورە و کەوتنی «هەروەك چۆن کاتی خۆی لە «ڕووسیا» قەوما»[101]

هەرچی خاڵی سێیەمیشە باسی ئەوە دەکات چۆن «حیزبی شیوعیی عیراقی» دژی ڕژێمی پاشایی عیراقە و دەیەوێت «ڕژێمێکی کۆماری جێگەی حوکمی بنەماڵەی هاشمی بگرێتەوە» و چۆن دژی بڕیاری «وەسیی عیراقی و پاشای ئوردونی عەبدوڵلا» وەستا، ئەو دووانەی «هەزارەها کرێکاری لاوی وڵاتەکانیان کردە خۆراکی ئاگری جەنگ لە فەلەستین»، ئەو ڕاستییەی «یەهودا صدیق» لە ژمارەی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٤٨ی «القاعدة» باسی کردووە و لە «خۆنیشاندانەکانی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا دژی «پەیمانی پۆرتسمۆث» کە حیزبی شیوعیی «عیراق»ی ڕۆڵێکی گەورەی تیایاندا بینی و بەشێکی زۆری دروشمەکانی دژی «وەسی» بوون و دیسانەوە لە کاتی خۆنیشاندانەکانی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ و مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ی قوتابییاندا ڕەنگی دایەوە»[102].

لە خاڵی چوارەمیشدا دەڵێت:

«٤- بە پێی قسەکانی «مالیك سێف» «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە ژێر ڕەهبەریی «فەهد» پێویستی بەوە بوو تەرکیز بخاتە سەر کاری نهێنی، ئەو مەسەلەیەش لە لایەن خودی «فەهد»ەوە کە چووە «مۆسکۆ» لێی کۆڵرایەوە و کاری لەم بوارەدا لە ڕۆژە زووەکانی سەرهەڵدانی حیزبەوە لە «عیراق»دا دەستی پێ کرد. چونکە ئەوساکە پارتییەکی سیاسیی ئیجازە پێدراوی ئەوتۆ لە ئارادا نەبوو حیزب بتوانێت لە ژێر سایەی ئەودا کار بکات. لەم بوارەدا سەرکەوتنی تەواو نەهاتە دی و هەوڵی کەڵك وەرگرتن لە «پارتی

---

(101) Ibid,PP.37-38.

(102) Ibid,P.38.

نیشتیمانیی دیموکراسی « «الحزب الوطني الديمقراطي» و «پارتی گەل» «حزب الشعب»یش سەری نەگرت، بۆیەکا حیزب هەر پشتی بە کاری ڕێکخراوە نهێنییەکانی خۆی بەست بەو هیوایەی پارتییەکی ئاشکرا، یان نیمچە ئاشکرای ئەوتۆ دروست ببێت کە حیزب بتوانێت پشتی پێ ببەستێت»(١٠٣).

لە خاڵی پێنجەمدا بە دوور و درێژی، بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی پلانەکانی خودی «فەهد» دەکات بۆ هێنانەدی ئاواتی کەڵك وەرگرتن لە ڕێکخراوە ئاشکراکان:

«٥- «مالیك سێف» ئاواتە نزیکەکانی حیزبی بە کورتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەربڕی:

أ- دروستکردنی پارتییەکی سیاسیی ئاشکرا و ژمارەیەك نەقابە و یانە و کۆمەڵەی ئاشکرایش لە لایەن حیزبی شیوعییەوە بۆ ئەوەی حیزب لە ڕێگەیانەوە چالاکیی فراوانتر بنوێنێت.

ب- حیزب هەوڵ بدات بڵاوکراوە و چالاکییەکانی ئەو پارتی و نەقابە و یانە و کۆمەڵە ئاشکرایانە بۆ ڕاگەیاندنی پڕۆپاگەندەی خۆی لە مەودایەکی فراوانتردا دەرببڕێت وەك لەوەی بە کاری نهێنی دەبرێتە سەر.

ج- بەکارهێنانی ئەو پارتی و نەقابە و یانە و کۆمەڵە ئاشکرایانە بۆ هاندانی کۆمەڵ بۆ بەشداریکردن لە ژیانی سیاسیدا بەو جۆرەی لە ئەنجامدا کەڵك بگەیێنێتە شیوعییەکان وەك ڕاهێنانێکی لەبار بۆ ئەو کەسانەی لە دواڕۆژدا دەپاڵێورێن «کاندید دەکرێن» بۆ ئەندامێتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» .

د- پشتگیریی کردن و هاندانی دامەزراندنی پارتی سیاسیی ئاشکرا، تەنانەت ئەوانەیش کە لەوانەیە لە گشت ئامانجەکانیاندا لەگەڵ شیوعییەکاندا یەك نەگرنەوە، بەلاّم لە بەشێکی دیکەی ئامانجەکانیاندا لەگەڵ ئاواتە

(103) Ibid,P.38.

شیوعییەکاندا یەك دەگرنەوە، هەر لەبەر ئەو هۆیانەشە ئەو جۆرە حیزبە سیاسییانە هان دەدرێن بۆ رێکخستنی خۆنیشاندان و مانگرتن کاتێك دەتوانرێت کەڵك لە دروشمەکانیان بۆ هێنانە دیی ئاواتەکانی حیزب وەربگیرێت، ئەنجامیش ئەو جۆرە پارتییانە حەز دەکەن بهێنرێنە بەرەیەکی نیشتیمانیی وەك پرۆژەیەك بۆ دوارۆژێکی نزیك»[١٠٤].

خاڵی شەشەمیش بۆ باسی «بەرەی نیشتیمانی» تەرخان کراوە لەگەڵ پێوەندییەکانی حیزب لەو بوارەدا بە ژمارەیەك کەسایەتیی وەك «کامیل چادرچی» و «عەزیز شەریف» کە «مالیك سێف» وەك «دوژمنی باوە کوشتەی «فەهد» ناوی دەبات[١٠٥]. لە هەمان بواریشدا باسی ئەوە دەکات چۆن مایسی ساڵی ١٩٤٨ حیزب «شەریف شێخ»ی کاندید کرد بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەری «سلێمانی» لە «ئەنجومەنی نوێنەران»دا[١٠٦]. هەر دووك خاڵی حەوتەم و هەشتەمیش بۆ بابەتی «تاکتیکەکانی حیزبی شیوعیی عیراقی» لە هەمان رۆژدا تەرخان کراون[١٠٧].

بەشی شەشەمی هەمان راپۆرت بۆ باسی تەوجیهاتی «فەهد» لە بەندیخانەوە لە رۆژی گرتنییەوە لە ساڵی ١٩٤٧دا و باسی بارودۆخی ناو بەندیخانە تەرخان کراوە. ئەم بەشە باسی ئەوە دەکات چۆن «فەهد» گشت کاروباری حیزبی لە بەندیخانەی «کووت»ەوە بەڕێوە دەبرد و دەشڵێ کۆکردنەوەی تەنها «شیوعییەکان» لەو بەندیخانەیەدا «هەڵەیەکی گەورە بوو»، چونکە بەندیخانەی «کووت» بووە «قوتابخانەیەکی گەورەی

---

[104] Ibid,PP.38-39.

[١٠٥] مەبەستی ئەوەیە بڵێت «فەهد» بە چاوی دوژمنی باوەکوشتە سەیری «عەزیز شەریف»ی دەکرد.

[106] N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professor) from his own and other statements, P.39.

[107] Ibid, PP.39-40.

شـــيوعييەكان»، هـــەروەها ئـــەوەيش دەگێڕێتـــەوە چـــۆن كەســـوكاری بەندكراوەكان بووبوونە مەيتەر «پەيامنێر»ی سـەرەكيی لـە نێـوان «فەهـد» و حيـزب و بـەو بۆنەيـەوە دەڵێـت ژمـارەی ئـەو تەوجيهاتانـەی «فەهـد» لـە بەنديخانەی «كوت»ەوە ناردوونی بۆ حيزب يان ناردوونی بۆ ئەو بريتی بـوون لە (١٨) هەژدە تەوجيە، ئەو كەسانەيش كە لەم بوارەدا چـالاك بـوون بريتـی بوون لە «ئيلـينی»ی هاوسـەری «نـاجی شـومەيل» و «ئەموونـە»ی هاوسـەری «يەعقوب مەصری» و هاوسەری «عەلی شـكور» [١٠٨] كـە ناوەكـەيان نـەزانيوە، وێڕای منداڵێكی خزمی «عەزيز حاج» كە بەر لە ئێستا ئاماژەمان بۆ ناوەكـەی كرد [١٠٩].

دوا بەدوای ئەمە دەيان لاپەڕە بۆ لايەنی بايەخداری هەمەجۆری چـالاكی و پێوەنـدی و ئەندامـەتی و كارەكـانی ديكـەی «حيزبـی شـيوعيی عيراقـی» تەرخان كراون. بە وێنە لە لاپەڕە چوار و پێنجدا ڕاپۆرتەكە ناوی چـوار مـاڵی سەرەكيی كۆبوونەوەكانی سەركردايەتيی حيزبی لە زمان «ماليك سـێف»ەوە تۆمار كردووە كە ئەمانە بوون:

دوو مـاڵ لەسـەر شـەقامی قاترخانـە لـە «بەغـدا»، يەكـەميان « كـە لـە شوباتی ساڵی ١٩٤٧وە بە كرێ گيراوە و «عەزيز محەمەد» و «حەسانی كوڕی عەلی»، كە كرێكاری چاپخانەی حيـزب بـوو، تێيـدا دەژيـان، دوايـی «عـەزيز حاج»يش هاتە هـەمان خـانووەوە و «يـەهودا صـديق»يـش زوو زوو بەسـەری دەكردنەوە، مـانگی مايسـی سـاڵی ١٩٤٧يـش «ماليـك سـێف» بـۆ ماوەيـەكی كورت لە هەمان ماڵدا ژيا. لە سەرەتای مـانگی تـەمموزی هـەمان ساڵيشـەوە

---

[١٠٨] «عەلی شكور» يەكێك بوو لە ڕەهبەرە هەرە چالاكەكانی «حيزبی شـيوعيی عـيراق» لـە نێـو كرێكاراندا و بە تايبەتی كرێكارانی سكەك.

[109] N.A.,F.O.. 371/75131, History of Malik Saif..., Top Secret, Vi. Direction of Party by Fahd from Jail since his detention in 1947, and conditions inside the Jail, P.41.

«جاسم حەموودی» و «عەبدولسەلام ناصری» و «هادی عەبدولرەضا» هاتنە ناوی و لەوێوە کاروباری کرێکاران و قوتابییانی کۆلێجی کشتوکاڵ و بازرگانی «کلیة التجارة» و قوتابخانەی پیشەسازی «مدرسة الصناعة» و دار المعلمینی ڕیفی و ژمارەیەك دەزگای خوێندنی دیکەیان بەڕێوە دەبرد.

پاش ماوەیەك جەودەتیش، کە قوتابیی کۆلیجی حقوق و بەرپرسی لیواکانی باشوور و یاریدەدەری «عەزیز حاج» بوو لە بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکانی ئافرەتاندا، هاتە لایان».

دووەم ماڵی سەر شەقامی «قاترخانە» لە «بەغدا» «میر یەعقوب کۆهین» «جۆزێف» کە بەرپرسی کەرخ بوو تێیدا دەژیا، وێڕای «عەبدولعەزیز حاج عەلی» «عەزیز حاج– ك.م.» کە لەنێو قوتابییاندا کاری دەکرد و لەرۆژنامەی «العصور»دا وتاری بەناوی خواستەنیی کەماڵەوە بڵاودەکردەوەو محەمەد عەبدوللەطیفی «برای–ك.م.» کە بەرپرسی کۆلێجی ئەندازیاری و قوتابییانی لیواکانی باکوور بوو وە «ڕەفیق چالاك» [110] کە یاریدەری «جۆزێف» بوو وە «محەمەد عەلی شەبیبی» کە موختەفی بوو».

سێیەم ماڵیش «ماڵی سەر شەقامی «سوق ئەلغەزل» لە «بەغدا» بوو، «زەکی خەیری» لەم ماڵەدا دەژیا و بە نووسینی وتارەوە دەربارەی کشتوکاڵ و وەرگێڕانی بابەتەکانی «پرسی نەتەوەیی» یەوە خەریك بوو، وێڕای نووسین بۆ «القاعدة»، «کازم عەبدولرەضا»یش لە هەمان ماڵدا دەژیا و ئەو خواردنی بۆ برادەرەکانی ئامادە دەکرد وێڕای ئەوەی بەرپرسی ژمارەیەك ڕێکخراوی کرێکاران بوو، هەروەها «هادی عەبدولرەضا» و «وارکیس سەرکیس» گەڕابێت، کە هەردووکیان مەیتەر «پەیامنێر» بوون، لەو ماڵەدا دەژیان.

---

[110] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە هەڵە نووسراوە ڕەفیق جالان ."Rafic Jalan".

دوا ماڵیش باسی ئەو ماڵە دەکات کە کەوتۆتە «سەرشەقامی بە"تـاوین» لـە «بەغـدا». ئـەم ماڵەیـەش وەك بارەگـای «یـەهودا صـدیق» لـە کـاتی گەڕانەوەیەوە لە کەرکووکەوە لە ساڵی ١٩٤٨دا بەکار دەهێنـرا. لـەم ماڵـەوە «یـەهودا» چـووە «پـاریس» و ئینجـا «مۆسـکۆ». لـەم ماڵەیشـدا «یـەهودا» «عەبـدولوەهاب عەبـدولڕەزاق»ی دی و پێکـرا بـە درێـژی باسـی گەشـتەکەی دەرەوەی یەهودایان کرد» [111].

دوای چەند لاپەڕەیەك ڕاپۆرتەکە دێتە سـەر باسـی لقـە نەتەوەییـەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و پـاش ئـەوەی لـە دوو لاپـەڕە و نیـوی چـڕوپڕدا باسی لقەکانی «ئەرمەن» و «ئاشووری» و «جووەکـان» دەکـات [112] دێتـە سـەر باسی لقی کوردی و لە لاپەڕە و نیوێك و چوار خاڵی تێروتەسەلدا دەڵێت:

«کوردەکان:

١- لەم لێکۆڵینەوەیەدا نە دامەزراندنی «حیزبی شیوعیی عیراقـی» و نـە پێوەنـدی و چـالاکییەکانی لـە «کوردسـتانی عـیراق»دا بـە هـیچ ڕادەیـەك دەستکاری نەکراوە، چونکە ئەوە لە گەلێك ڕووەوە جودایە لەگەڵ ڕێکخراوی کۆمۆنیستیی عیراقیدا و تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لەوانەیە کاربەدەستان نیازیان هەبێت بە شێوازێکی سەربەخۆ لێی بکۆڵنەوە، بەڵام هەر چـۆن بێـت هەنـدێك شت لە لایەن تاوانبارەکانەوە لە کاتی لێکۆڵینەوەدا لـە گـەڵیان گـوتراوە کـە ئەمەی لای خوارەوە پوختەی ئەو قسانەیە لەم بوارەدا.

---

(111) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif "Kamal", "professor" from his own and other statements, Use made by the party of Contact Houses, P.45.

(112) Ibid, lx Branch Organizations of the Party, PP.48-50.



هەمزە عەبدوڵلا



نافیع یونس

٢- دەرکەوت بەر لە ساڵی ١٩٤٥ کۆمۆنیزم لە «کوردستانی عیراق»دا سەرنجی چەند گرووپێکی پەرش و بڵاوی ڕاکێشاوە و بە ڕەهبەریی چەند کەسێك ڕێکخراویان دامەزراندووە یان دامەزراندۆتەوە بێ ئەوەی نە هیچ جۆرە دەستتێوەردانێك، نە تەنانەت دەستتێوەردانێکی کەمی خودی کۆمۆنیستی «عیراق»ی لە پشتەوە بووبێت. هەمان کات لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥ و ١٩٤٦دا و دوای ئەوەی تاقمی «یەکیەتی تێکۆشین» «وحدة النضال» هاتنەوە ناو ڕیزەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» ەوە کۆمۆنیستە کوردەکان قایل نەبوون بچنە ناو حیزبی شیوعییەوە و لە بریتی ئەوە «ڕزگاری کورد» یان بە ڕەهبەریتی «هەمزە عەبدوڵلا» دامەزراند، «ڕزگاری کورد دوایی بووە پارتی دیموکراتی کوردستان» و تەنها تاقمێکی بچووك بە ڕەهبەریی «ساڵح حەیدەری» و «نافیع یونس» لەگەڵ ئەم شەپۆلەدا نەڕۆیشتن و چوونە ناو «حیزبی شیوعیی عیراقی» یەوە و بۆ ئەو لە ناو کورددا کاریان دەکرد. بەو جۆرە دوو ڕێکخراوی سەرەکی لە کوردستانی عیراقدا دروست بوو، بەڵام هەردووکیان بە زوبانی کۆمۆنیست دەدوان، ئەوەیان کە دایانە پاڵ «حیزبی

شیوعیی عیراقی» دوای دەرچوونی ڕۆژنامەی «ئـازادی» بـە نهێنـی عادەتـەن هەر بە «ئازادی» یان جارێك وەك لقی «حیزبی شیوعیی عیراقـی» نـاو دەبـرا. ئـەوی دیکەشیان «ڕزگاری کورد» بـوو کـە زۆری نەخایانـد بـوو بـە «پـارتی دیموکراتی کوردستان»، ناکۆکی لە نێوانی ئـەم دوو ڕێکخـراوەدا بـە خێرایـی پـەرەی سـەند، هـەر یەکـەیان ئـەوەی دیکـەی بـە لادان «ئیـنحیراف» و گێرەشێوێن تۆمەتبار دەکرد. هۆی سەرەکیی ئەم ناکۆکییـە لـەوەوە هـاتبوو کە «پارتی دیموکراتی کوردستان» داوای جیابوونەوەی «کوردستانی عیراق»ی لە «عـیراق» دەکـرد و هـەوڵی دەدا بـۆ دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی کـوردی لـە «کوردسـتانی «عـیراق» و «ئێـران» و «تورکیـا» و «سـووریا» بـەو مەرجەی هەمان کـات بـە سروشـت شیوعی بێت، «پـارتی ئـازادی» بـە پێـی ڕێنمایی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دژی ئەمە وەستا لەو گۆشـەنیگایەوە کـە کردارێکـی لـەو جـۆرە زیـان دەبەخشـێ بـە یەکیـەتی «عـیراق» و لایەنـە کۆمۆنیستەکان.

٣- لـە بـواری ڕێکخـراوی «پـارتی ئـازادی»دا دەرکـەوت کـە تەنانـەت ڕەهبـەرانی «حیزبـی شـیوعیی عیراقـی» ش شـتێکی ئـەوتۆ دەبـارەی نـازانن تەنها «فەهد» نەبێت، بۆیەکا وەك لقێکـی تـەواو سـەربەخۆ ڕەفتـاری لەگەڵدا دەکرا هەرچەندە لە ژێر ڕکێفی میکانیزمی ناوەندیی حیزبدا بـوو. هـەر چـۆن بێـت کـە ماوەیـەك «١٩٤٧- ٤٨؟»[١١٣] سـەرۆکی ڕێکخـراوی «ئـازادی» لـە «کوردسـتانی عـیراق» «نـاجی سـەلیم» بـوو، لـە «سـلێمانی»ش ڕێکخـراوی «ئـازادی» بـە سـەرۆکایەتی «ئەحمـەد غـەفوور» هـەبوو کـە کۆمیتەیـەك بـە ئەندامەتی قوتابیی «ئەکرەم» «نـەزانراوە کێیـە»و[١١٤] مامۆسـتایەك بـە نـاوی «عومەر عەلی ئەمین»ەوە یاریدەیان دەدا. ئۆرگانی نهێنیی «ئازادی» لە لایەن

---

[١١٣] لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا بەو جۆرە هاتووە (١٩٤٧ - ٤٨؟).

[١١٤] لـە دەقـی بەڵگەنامەکـە خۆیـدا بـەو جـۆرە هـاتووە، دیـارە مەبەسـتی «دوکتـۆر ئـەکرەم یامولکی» یە کە ئەوساکە قوتابیی ناوەندی بوو لە سلێمانی.

لقەکانی «کەرکووك» و «هەولێر» و «سلێمانی»یەوە بەڕێوە دەبرا و ژمارەکانی لە «بەغدا» لە چاپخانەی «القاعدة» چاپ دەکران و هەر لەوێش لە لایەن «حیزبی شیوعیی عیراقی» یەوە بەسەر کوردی هەمەجۆردا دابەش دەکران. دواتر نەخشەیەك دانرا بۆ ناردنی «فوئاد بەهجەت» لەگەڵ ناردنی ڕۆنیۆیەکدا بۆ چاپکردنی ئەم نامیلکانە: «جوتیار» و «قوتابی» و «ئافرەت». هەرچەندە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم بابەتە بە دەستەوە نییە، بەڵام ئەوە زانراوە کە «پارتی تەحەڕوڕ» لە «کوردستانی عیراق» کاتی خۆی لەگەڵ «پارتی ئازادی"دا یەك بوون و دوایی لێك جیابوونەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە زۆر لە کارەکانی «پارتی تەحەڕوڕ» دەدرانە پاڵ «حیزبی شیوعیی عیراقی».

٤- لەم بوارەدا تا ڕادەیەك دەتوانرێت زۆرتر دەربارەی «پارتی دیموکراتی کوردستان» بگوترێت، چونکە وەك ڕێکخراوێکی موونافیس چ چالاکییەکانی و چ ئەندامەکانی بە ڕادەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و ڕێکخراوە کوردییەکانی نهێنی نەبوون. «پارتی دیموکراتی کوردستان» لقی خۆی لە هەموو کوردستانی عیراق و «بەغدا» و «خانەقین» [115] هەبوو، لقەکەی «خانەقین» لە لایەن «حەسەن زەهاوی» ناوێکەوە بە ڕێوە دەبرێت، «مەلا مستەفا» ڕەهبەری «پارتی دیموکراتی کوردستان»ە و هەر بە سەرۆك ناوی دەهێنن، کە ئەویش لە شوێنێك ئامادە نەبێت هەمزە عەبدوڵڵا جێگەی دەگرێتەوە «دەربارەی سەرکردەکانی دیکەی «پارتی دیموکراتی کوردستان» بڕوانە: پاشکۆی. ڤ.»». «پارتی دیموکراتی کوردستان» «ڕۆژنامەی ڕزگاری» بە نهێنی و بە سەرپەرشتی «هەمزە عەبدوڵڵا» پەخش دەکات، «ڕزگاری» بە ڕۆنیۆ چاپ دەکرێت و دەڵێن لە شاری سلێمانی ئەو کارە ڕادەگەیێنرێت.

---

[115] جیا کردنەوەی «خانەقین» و دەوروبەری لە «کوردستان» هەڵەیەکی سیاسیی گەورەیە، تایبەت لە بوارێکی وەك ئەم بوارەیشدا، بە پێی قسەی نووسەرانی خودی بەڵگەنامەکە «حەسەن زەهاوی» کە بۆخۆی «کوردی خانەقین»ە بەرپرسی لقی خانەقینی «حیزبی شیوعیی عیراقی»بووە.


د.جەعفەرمحەمەد کەریم

گەلێك لە وتارەکانی ڕۆژنامەی «ڕزگاری» بە شێواز و گیانی کۆمۆنیستی دەنووسرێن، بەڵام هەمیشە بە باسی سەربەخۆیی کوردستان زاخاو دراون، هەر لەبەر ئەوەیشە کە چ «ڕزگاری» و چ «ئازادی» لەو بوارەدا تا رادەیەك لەگەڵ «حیزبی شیوعیی عیراقی» دا یەك ناگرنەوە، ئەوان پێویستە پڕۆپاگەندە بۆ سەربەخۆیی کوردستان بکەن تاوەکو لای «خوێنەرانیان– ك.م.» پەسند بن. هەر چۆن بێت وەها دیارە «پارتی دیموکراتی کوردستان» پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ «کوردستانی ئێران"دا هەیە، بەڵام پێوەندیی لەگەڵ «کورد»ی «سووریا"دا گەلێك لەوە کەمترە، ئێستاکەیش وەها بیر دەکرێتەوە کە پارتی لە ڕێگەی دوکتۆر «جەعفەر محەمەد کەریم"ەوە[١١٦]، کە ناوەندی ساڵی ١٩٤٨ هەڵهات بۆ ناو خاکی «ئێران»، بەڕێوە دەبرا، ئێستا ڕۆژنامەی «ڕزگاری» لە «کوردستانی ئێران» چاپ دەکرێت و هەر لەوێشەوە بڵاو دەکرێتەوە هەرچەندە بەڵگەی تەواوی ئەمە بە دەستەوە نییە»[١١٧].

[١١٦] دوکتۆر «جەعفەر محەمەد کەریم» کە دەرچووی کۆلێجی پزیشکیی بەغدا بوو، یەکێك لە دامەزرێنەرانی «پارتی دیموکراتی کوردستان» بوو، ساڵی ١٩٤٨ هەڵهات بۆ ناو خاکی «ئێران» ، شایانی باسە دوکتۆر «جەعفەر» برا گەورەی «حەبیب محەمەد کەریم»ە.

[117] N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (professor) from his own and other statements, Top Secret, 1x. Branch Organization of the party, d- kurds, PP.51-52.



وێنەیەکی دەگمەن: کچەکەی فەهد لە بۆنەیەکی تایبەتیدا

بەشی دواتری ئەم فایلە تەرخان کراوە بۆ بابەتی «ئافرەت و حیزب» و لەم بەشەدا دەڵێت بە پێی گێڕانەوەی «مالیك سێف» حیزب لە ساڵی ١٩٤٤وە چالاکیی لە نێوان ئافرەتاندا نواندووە و وەك دەڵێن «ئامینە ڕەحال» ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بووە، وێڕای ئەوەی ئافرەتانی حیزب بە شێوازێکی وەبەرچاو بەشداریی خۆنیشاندانەکانی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨یان کردووە، دەربارەی هەمان «ئامینە ڕەحال»یش دەڵێت:

«بێگومان «ئامینە ڕەحال» لە نزیکەوە پێوەندیی بە «فەهد»ەوە هەبوو، زوو زوو دەچووە لای، دواییش «فەهد» شووکردنی بە «یوسف جەواد ئەلمیمار» [١١٨] پەسند کرد، ئەوساکە «یوسف جەواد» لە ڕێکخراوی حیزب لە «کۆلێجی حقوق» لە «بەغدا» کاری دەکرد، ئەوساکە، «فەهد» گوتیشی ئەو

---

[118] Yusuf Jawad al Mimar.

شووکردنە «بە پێی مەرجەکانی حیزب کراوە» [119]، هەروەها باسی چالاکی و پێوەندییەکانی هەر یەك لە «حەیات شێخ دەخیل» و خانمە دوکتۆرە «نەزیهە دلێمی» لەو ڕۆژگارەدا دەکات، وێڕای ڕۆڵی «عەزیز حاج» وەك یەکێك لە لێپرسراوانی ڕێکخراوی ئافرەتان و بە تایبەتیش ئاماژە بۆ چالاکیی بەرفراوانی ئافرەتانی کەرکووك دەکات[120].

---

[119] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە: "described as dased on party conditions".

[120] N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), "professor" from his own and other statements, Top Secret, x. women and the party, PP.52-53.

## پێوەندییەکانی حیزبی شیوعیی عیراقی
## بە حیزب و وڵاتە شیوعییە بیانییەکانەوە

دوا بە دوای ئەمانە لە چەند لاپەڕەیەکدا، بە چڕوپڕی، باسی ڕۆڵی حیزب لە خۆنیشاندانەکانی مانگی کانوونی دووەم و شوباتی ساڵی ١٩٤٨دا دژی «پەیمانی پۆرتسمۆث» و پێوەندییەکانی حیزب بە «سۆڤیەت»ەوە دەکات[١٢١]، لە لاپەڕە پەنجاو هەشتیشەوە بۆ بابەتی «پێوەندییەکانی حیزبی حیزبی شیوعیی عیراق» بە حیزب و وڵاتە «شیوعی»یە بیانییەکانەوە تەرخان کراوە[١٢٢] و باسی ئەوە دەکات کە «فەهد» بۆ خۆی بایەخی پێداوە و کە بە قسەی «مالیك سێف» زۆر فراوان نەبوون، بەڵام «حیزب پێوەندی هەبوو بە شیوعییەکانی «سووریا» و «لوبنان» و «ئێران» و «فەرەنسا» و «بەریتانیا»وە» و بە پێی گێڕانەوەی «مالیك سێف» «یەهودا صدیق» ناونیشانی گەلێك حیزبی شیوعیی بیانیی هەبووە، درێژەی ئەم بابەتە نەزانراوە، بەڵام کە ساڵی ١٩٤٧ بڕیاری لە سێدارەدانی «فەهد» دەرچوو وێنەی سەد یادداشتی پرۆتێستی نێردراوە بۆ ئەو ئەدرێسانە، ئەوەی زانراویشە «حیزبی شیوعیی سووری» وێنەی ئەو جۆرە پرۆتێستانەی لە ڕێگەی «کاظم ئەلحەسەنی»یەوە پێ دەگەیشت و لە ڕۆژنامەی «صوت الشعب»ی «لوبنان»یدا بڵاو دەکرانەوە.

لە خاڵی دووەمی ئەم بەشەدا ئەم زانیارییە دەگمەنانە تۆمار کراون:

أ- پێوەندییەکانی حیزب بە «کۆمیتەی دیموکراسیی عەرەب لە پاریس».

---

(121) Ibid,PP.53-58.

(122) Ibid, Top Secret, XIII. Party Contacts With Foreign Communist Parties and Countries, PP.58-60.


جەوامێری

ب- داواکردنی «ڕێکخراوی دیموکراسیی ئافرەتان» لە «پاریس» لە حیزب کە سێ «ئافرەت»ی «عێراق»ی کاندید بکات بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسی «ئافرەتان»دا کە بڕیار بووە لە «کەلکەتا» یان «هێلسنکی» ببەسترێت.

ج- بانگهێشتی شاعیری گەورە «محەمەد مەهدی جەوامێری» بۆ زیارەتی پاریس و بەشداریکردن لە کۆنفرانسی لاواندا کە بڕیار بووە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ لە «وارشۆ»ی پایتەختی «پۆڵۆنیا» ببەسترێت.

د- پێوەندیی «کۆمیتەی دیموکراسیی عەرەب» لە پاریس بە خودی «مالیك سێف»ەوە لە ڕێگەی «سەلیم فەخری»یەوە[١٢٣].

لە خاڵی چوارەمی هەمان بابەتدا باسی پێوەندییەکانی حیزب بە پارتی «تودە»وە لە «ئێران» دەکات و دەڵێت هەرچەندە ئەو پێوەندییانە کاتی دیاریکراویان نەبووە؛ بەڵام لە «تاران» لە ڕێگەی «مەهدی هاشم» ناوێکەوە بووە و لە لایەن «حیزبی شیوعیی عیراقی»شەوە بەرپرسی ئەو پێوەندییانە «عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق» بووە، لەو بوارەدا کۆتایی ساڵی ١٩٤٨ بڕیار وابووە چەند پیتێکی «کوردی» و «ئەرمەنی» «دەڵێن دوازدە پیت» و چاپخانەیەك «لە حیزبی تودەوە- ك.م.» بدرێتە «حیزبی شیوعیی عیراقی»[١٢٤].

ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەی خاڵی پێنجەمە:

---

(123) Ibid, PP.58-59.

(124) Ibid,P.59.

«٥- بەپێی گێڕانەوەی «مالیك سێف» مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٨دوکتۆر «هۆگا» «یان هووکا، یان هەجا- تەواو نەزانراوە» [١٢٥] کە دەڵێن ئەندامی «پارتی کۆمۆنیست»ی «هیند»ە و ڕێکخەری «کۆنفرانسی لاوانی جیهان»ە لە «وارشۆ»وە هاتە «بەغدا» و پێوەندیی بە «عەزیز شەریف» و «کامیل چادرچی» و «شەریف شێخ»ەوە کرد.

دوکتۆر «هۆگا» بە گشتی قسەی لەگەڵ ئەو زاتانەدا کرد و داوای لێ کردن کە لە بواری پرسی «فەلەستین»دا ڕێبازێك بگرنە بەر کە لەگەڵ سیاسەتی «ڕووسیا»دا بگونجێت. «شەریف ئەلشێخ» دانەیەك لە بەیاننامەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەربارەی «فەلەستین» دا بە دوکتۆر «هۆگا»، وێڕای چەند ژمارەیەك لە ڕۆژنامەی «الأساس» کە وتاری دەربارەی پرسی «فەلەستین» تێدا بڵاو کراوەتەوە، ئەوساکە دوکتۆر ناونیشانی «کۆمۆنیست»ێکی «میسری» دایە «شەریف ئەلشێخ» «تەفسیلاتی ئەو ناونیشانە نەزانراوە» و داوای لێی کرد پێوەندیی بەو کابرا «میسری»یەوە بکات و ئەدەبیاتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» ی بۆ بنێرێت و ئاڵوگۆڕی هەواڵەکانی لە گەڵدا بکات، دواییش بەوە زانرا کە بەیاننامەکەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەربارەی پرسی فەلەستین «کە شەریف ئەلشێخ دای بە دوکتۆر هۆگا - ك.م.» لە ڕۆژنامەی «لۆمانیتێی» ئۆرگانی پارتی «کۆمۆنیست»ی «فەڕەنسیی»دا بڵاوکراوەتەوە» [١٢٦].

لە خاڵی شەشەمدا باسی پێوەندییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بە «حیزبی شیوعیی لوبنان»ییەوە دەکات و دەڵێت مامۆستایەکی لوبنانی بەناوی دوکتۆر «ڕیاض»ەوە کە لە شاری «ڕومادی» دەرسی گوتۆتەوەو

---

[١٢٥] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

"Dr.Hoga" or Hooḳa, or Huja, unidentified

[126] N.A.,F.O.. 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professor) from his own and other statements, Top Secret, P.59.

بەرپرسی لقی «طەرابلوس»ی «حیزبی شیوعیی لوبنان»ی بووە کاری ئەو پێوەندییەی پێ سپێردراوەو لە «بەغدا» «مالیك سێف» بۆخۆی لەگەڵی کۆبۆتەوە، ناوبراو مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٤٨ «عیراق»ی جێ هێشتووە»(١٢٧).

(127) Ibid, PP.59-60.

## چالاکییەکانی حیزبی شیوعیی عیراقی لە ناو سوپادا

دوا بەدوای خالّی پێنجەم باسی «چالاکییەکانی حیزب لەناو سوپادا» دێت کە بابەتێکی یەکجار گرنگ و یەکجار کەم زانراوە لە تۆماری مێژووی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دا. لە شەشە خالّی چڕوپڕی ئەو بەشەدا گەلێك زانیاریی دەگمەن دەخوێنینەوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی خالّی یەکەمیانە:

«١- «مالیك سێف» لە ئیعترافەکانی خۆیدا چەند جارێك ئاماژەی بۆ دزەکردنی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بۆ ناو ڕیزەکانی هێزە چەکدارەکانی «عیراق» کردووە، تایبەت بۆ ناو هێزی سوپا و هێزی ئاسمانی. لە سەرەتادا لە بواری ئاماژەکردنیدا بۆ لایەنە گشتییەکانی ئەم بابەتە «مالیك سێف» باسی ئەو پرسیارەی هێناوەتە پێشەوە کە ئەفسەرێکی ئەندامی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بە ناوی «ڕەشید حسەین»ەوە، لە کاتی کۆنفرانسی گشتیی حیزبدا کە سالّی ١٩٤٤ بەسترا، لە خودی «فەهد»ی کردووە. ئەو پیاوە لە «فەهد»ی پرسی: بۆچی لە پێڕەوی بنچینەیی «النظام الأساسي» حیزبدا شوێنێك بۆ «کۆمیتەی سەربازی» تەرخان نەکراوە. «فەهد» لە وەلاّمدا پێی گوت هیچ پارتییەك، تەنانەت پارتە ئاشکراکانیش لە «پێڕەوی بنچینەیی» خۆیاندا باسی چالاکییەکانی خۆیان لە نێو هێزە چەکدارەکاندا ناکەن لە ترسی ئەوەی نەبا خۆیان تووشی لێپرسینەوە بکەن و لێرەدا «حیزبی شیوعیی بەریتانی»ی کردە نموونە کە، وەك گوتی، بەشێکی ڕیشە داکوتراوی لە نێو سوپادا هەیە بێ ئەوەی لە «پێڕەوی بنچینەیی» خۆیدا ئاماژەی بۆ بکات، لەگەلّ ئەوەیشدا حیزب لە بەندی پێنجەمی پەڕەگرافی (ج)ی «پێڕەوی بنچینەیی» خۆیدا ئاماژەی بۆ چالاکییەکانی لە ڕیزی هێزە

چەکدارەکاندا کردووە، بەو جۆرەی کە لەگەڵ خەتی سیاسی و پلانەکانی حیزبدا دەگونجێت»[(١٢٨)].

لە خاڵی دووەمیشدا دەڵێت:

«٢- بەر لە گرتن و دادگاییکردنی «داود صایغ» دەرکەوت کە ئەو وەك سەرکردەی عوسبەی کۆمۆنیستە عیراقییەکان لە «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە هێزە چەکدارەکانەوە نزیکتر بووە و ئەفسەرێکیش بە ناوی «سەلیم فەخری»یەوە وێڕای ئەوەی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی عوسبەی کۆمۆنیستە عیراقییەکان بوو ڕێکخراوێکی شیوعیشی لە نێو ڕیزەکانی سوپادا بەڕێوە دەبرد. دوای گرتن و بەندکردنی ڕەهبەرانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و عوسبە لە ساڵی ١٩٤٧دا «سەلیم فەخری» و جەماعەتەکەی لە ڕێگەی «ساڵح حەیدەر ئەلحەیدەری»یەوە داوایان کرد بدەنە پاڵ «حیزبی شیوعیی عیراقی». دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ «فەهد»دا ئەم پێشنیازە پەسند کرا، بەڵام «سەلیم فەخری» ڕازی نەبوو چیدی لە سەرکردایەتیی ڕێکخراوەکەی نێو سوپادا بەردەوام بێت، بۆیەکا «سالم چەلەبی» ناوێك جێگەی گرتەوە. «سالم چەلەبی» پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە «یەهودا صدیق»ی ڕەهبەری ئەوسای «حیزبی شیوعیی عیراقی» ەوە هەبوو، لەم بوارەدا یەکێك بە ناوی «جارەڵلا عەبدولڕەحمان»ەوە یاریدەی «یەهودا»ی دەدا. لەگەڵ ئەوەیشدا کە «سەلیم فەخری» نەیویست کەرتی سوپا بەڕێوە ببا، بەڵام پێوەندی بە «حیزبی شیوعیی عیراقی» و ڕێکخراوی حیزبی ناو سوپاوە لە ڕێگەی ئەفسەری دوورخراوە «غەضبان مەردان ئەلسەعد»ەوە بەهێز بوو، هەروەك چۆن پێوەندیشی بە «محەمەد عەبدوللەتیف»ەوە هەبوو.

هەمان کات «سەلیم فەخری» پێوەندیشی بە «یووسف ئیسماعیل»ەوە هەبوو، جارێکیشیان لە ڕێگەی ئەوەوە نامەیەکی «کۆمیتەی دیموکراسیی

---

(128) Ibid,Top Secret, XIV, Penetration of the Armed forces, P.60.

عەرەب لە «پاریس»ی پێگەیشت کە دەربارەی دەستبەکاربوونی نەقابە کرێکارییەکانی عیراق بوو، سەلیم فەخری ئەو نامەیەی گەیاندە «حیزبی شیوعیی عیراقی».

دەر کەوت «سەلیم فەخری» هەوڵ دەدات بچێتە «پاریس» و هیوادارە ئەگەر بۆی لوا پێوەندی بە کۆمۆنیستەکانی «فەڕەنسا»وە بکات، هەر چۆن بێت ئەو پلانەی فەخری سەری نەگرت و لە بریتی پاریس بۆ چەند پرسیارێك نێردرایە «فەلەستین»، ئەو عەودالی ئەوەبوو ئاگاداری کارەکانی حیزب بێت لە واقیعدا، ئەو پێشنیازەشی سەری نەگرت کە بنێردرێتە بەرەکانی جەنگی «نێوان عەرەب و ئیسرائیل — ك.م.» [١٢٩].

هەمان کات «نازانرێت کەی، بەلام لەوانەیە کۆتایی ساڵی ١٩٤٧بێت» سەلیم چەلەبی گیرا و بەند کرا و جێگەی وەك ڕێکخەری شانەکانی ناو سوپا لە «بەغدا» درایە «عەبدولوەهاب تاهیر» ناوێك کە قوتابیی فێرگەی سەربازی بوو، مولازم ئەوەلێکی «هێزی ئاسمانیی مەلەکیی عیراقی» بەناوی «عەجیل عەلی»یەوە یاریدەی دەدا. کاتێك «فەخری چەلەبی» بە کاری تەنزیمی قوتابییانی قوتابخانەکانەوە خەریك بوو «عەجیل عەلی» وەك جاران پێوەندی بە ڕێکخراوە بچووکەکانی وەزارەتی بەرگری و تیپی مۆسیقای سوپا و «بەشی تەکنیکی» سەربازییەوە هەبوو، هەمان کات «عەجیل» کۆمەکەکانی ئەفسەرانی «هێزی ئاسمانی مەلەکیی عیراقی» «کە ژمارەیان نەزانراوە» بۆ حیزب کۆ دەکردەوە. هاوینی ساڵی ١٩٤٨ بەشێك لە کارمەندانی «هێزی ئاسمانی مەلەکیی عیراقی» لە «کەرکووك»ەوە گوێزرانەوە بۆ «بەغدا» کە یەکێکیان ناوی محەمەد حەیلان[١٣٠] بوو، «عەقیل» پێوەندیی بەمانەوە کرد. هەر لە «کەرکووك» ئەفسەرێك کە پێدەچێت ناوی «حسەین ئەلدوری» بێت و

---

[129] Ibid,P.60.

[١٣٠] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها نووسراوە: .Mohd. Hailan

کە بە یاریدەی ئەفسەرێك «ناوی دیاری نەکراوە، بەڵام دەڵێن لەوانەیە ئامۆزا یان خاڵۆزای عەبد عەلوان ناوێکی خەڵکی عەممارە بێت» چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەویَ بەڕێوە دەبات، هەروەها دەڵێن ئەو ئەفسەرە یەکێك لە ئەندامانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» ی لە «کەرکووك» فێری دروستکردنی تەقەمەنی کردووە. ئەفسەری ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٥ەوە ئەندامی حیزب بووە و لە لایەن ئامۆزایەکی یان خاڵۆزایەکییەوە پاڵێوراوە و بە جیاش «حسەین شەبیبی» پشتگیریی پاڵاوتنەکەی کردووە، دواییش کە چووە «فەلەستین» راپۆرتی دەربارەی بارودۆخی بەرەکانی جەنگ بۆ حیزب دەنارد. دەوروبەری کۆتایی ئەو ساڵەیش مولازم ئەوەل «عەجیل» چووە «موسڵ» و لەویَ پێوەندیی بە یەکێك لە شانەکانی حیزبەوە کرد، عەجیل فرۆکەوانێکی لەگەڵدا بوو کە کاتی خۆی ئەندامی عوصبەی کۆمۆنیستەکانی عیراق بووە» [١٣١].

لە خاڵەکانی دیکەدا باسی دادگاییکردنی ژمارەیەك لە کۆمۆنیستەکانی ناو سوپای عیراق دەکات و دیسانەوە زوو زوو ناوی «مالیك سێف» و پەیوەندییەکانی لەم بوارەدا دووپات دەبێتەوە [١٣٢].

لە بەشی پازدەمیندا باسی ئەو زوبانە نهێنییە دەکات کە حیزب دایهێنابوو بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی نامەکانی، وەك ئەوەی بەرانبەر هەر پیتێکی عەرەبی ژمارەیەکی دانابوو [١٣٣].

بەشی شازدەمینی هەمان راپۆرت بۆ باسی پەیامنێرەکانی حیزب تەرخان کراوە [١٣٤].

---

(131) N.A., F.O.. 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professor) from his own and other statements, Top Secret, PP.60-61.

(132) Ibid, PP.61-62.

(133) Ibid, XV. Codes,P.62.

(134) Ibid, XVI, Party Conriers, PP.62-63.

## دارایی حیزبی شیوعیی عیراقی

بەشی حەڤدەمینی هەمان ڕاپۆرت بۆ بابەتی «دارایی حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراوە. سەرەتا نووسەرانی ڕاپۆرتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە «باڵوێزخانەی «یەکیەتی سۆڤیەت» لە «بەغدا» کەمێك یاریدەی حزبی دەدا» و وەك دەڵێن بە پێی ئیعترافی زۆربەی گیراوەکان داهاتی سەرەکیی حیزب لە ئەندامەکانی و لایەنگرانی و خەڵك و فرۆشتنی «القاعدة» و ئەو پارە و خۆراکەی بۆ مانگرتووەکان یان خێزانی بەندەکان کۆ دەکرانەوە دەهات، وەها دیارە ئابوونەی ئەندامان مانگی پەنجا فلس بووە بۆ هەر ئەندامێك، بەڵام جاری وایش هەبووە ئەو پارەیە گەیشتووەتە شەش سەد فلس (٦٠٠)، یان هاتۆتە خوارێ بۆ سەر (١٠) دە فلس بە نیسبەت کرێکارانەوە و ئابوونەکانیش لە لایەن ڕێکخراوی پلە دووەوە وەردەگیران و دوایی دەدرانە ڕێکخەری بالاَی لق، یان بەش، جاروبار دیاریی تایبەتیش دەدرایە حیزب، لێرەدا دوو وێنە دەهێنینەوە – لە ئەنجامی ئەوەدا کە «وارگیس سەرکیس گەرەبێت» لە کۆمپانیا نەوتییەکانی باکووری «عیراق» کاری دەکرد توانیی (١٠٠) سەد دیناری عیراقی واتا «سەد پاوەن» لە پاشەکەوتییەکانی خۆی بداتە حیزب، نموونەی دووەمیش دەربارەی فرۆشتنی ئەو ڕۆژنامەیە «القاعدة»یە. جارێکیان (٣٠٠) سێ سەد دانە لە ژمارەیەکی ئەو ڕۆژنامەی لە بەسرە فرۆشرا و داهاتی حیزب لەوە نۆ دیناری عیراقی بوو، شایانی باسە ژمارەی ئەندامانی (حیزبی شیوعیی عیراقی) لە «بەصرە» نزیکەی (٧٠٠) حەوت سەد کەس دەبوون کە هەریەکەیان مانگی پەنجا فلس ئابوونەیان دەدا. هەر چۆن بێت بەشێکی ئەو داهاتە بۆ خەرجیی پەیامنێرەکانی حیزب و مینحە و یاریدەی خێزانی ئەندامە بەندکراوەکان تەرخان دەکران»[١٣٥].

---

[135] Ibid, XVll, Finance, PP.63-64.

## چاپەمەنییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»


القاعدة

بەشــی هــەژدەمینی هــەمان ڕاپــۆرت بــۆ بابــەتی بابەخــداری «چاپەمەنییەکانی حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراوە. لە خاڵی یەکەمی ئەو بەشەدا دەڵێت «بە پێی ئیعترافەکانی «حەسانی کوڕی عەلی» کە لێپرسراوی چاپخانەکەی حیزب بوو، هەر مانگەی سێ هەزار دانە لە «القاعدة» و هەزار و دوو سەد دانە لە «ئازادی» چاپ دەکران، ئەوەیش وەها دەگەیەنێت کە بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکانی حیزبی شیوعیی عیراقی زۆر باش بووە، چونکە ئەوساکە هیچ ڕۆژنامەیەکی عەرەبی بە ئاشکراش لە «بەغدا» پتر لە سێ هەزار دانەی لێ چاپ نەدەکرا».

لە خاڵی دووەمی هەمان بەشدا ئەم زانیارییە دەگمەنانەی لای خوارەوە دەربارەی چاپخانەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تۆمار کراون:

«٢– هەروەك بەر لە ئێستایش ئاماژەمان پێی داوە چاپخانەکەی حیزب لەلایەن «حیزبی تودە»وە ساڵی ١٩٤٣ درا بە «فەهد» لە کاتی گەڕانەوەی دووەمیدا لە «مۆسکۆ»وە، لەوانەیشە یان لە پارەی ڕووسەکان یان بە تەگبیری ئەوان چاپخانەکە درابێتە «فەهد». مەکینەی چاپەکە کە هیچ زانیارییەکی تەکنیکی دەربارەی لە بەردەستدا نییە، بەڵام دەتوانرێت ئەوە

بەدیقەت بگوترێت کە چاپخانەیەکی نەقال بوو وە لە کاتی پێویستدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگوێزرایەوە.

لە قۆناغی یەکەمدا چاپخانەکە لە تارانەوە گوێزرایەوە «بەصرە» و لەوێش خرایە سندووقێکی گەورەوە و بە شەمەندۆفێر لە لایەن «ظافر سالم» «یان سەلیم» ناوێکەوە گوێزرایەوە «بەغدا»، پیتە عەرەبییەکانی چاپخانەکە لە بازاڕ کڕدران، بەڵام هەرچی پیتە کوردییەکانی ڕۆژنامەی «ئازادی» بوون بریتی بوون لە هەمان ئەو پیتانەی کە ڕۆژنامەی «یەکیەتی تێکۆشین» بەکاری دەهێنان. لەنێوان ساڵانی ١٩٤٤ و کۆتایی ساڵی ١٩٤٦دا چەند جارێك چاپخانەکە لە لایەن «جەمیل محەمەد عەلی»یەوە گوێزرایەوە ماڵێکی دیکە و یەکسەر دوای گرتنی «فەهد» چاپخانەکە لە گەڕەکی «ئەرمەن» لە «کەمپی گەیلانی» شاردرایەوە و هەرچەندە بەڵگەی تەواومان بە دەستەوە نییە، بەڵام وەها پێدەچێت ئەندامێکی ئەرمەنیی حیزبی شیوعیی عیراقی ئەو کارەی گرتبێتە ئەستۆی خۆی، لەوسایشەوە تاوەکو گرتنی بارەگای چاپخانەکە کە «حەسانی کوڕی عەلی» تێدا دەژیا سێ جار چاپخانەکە گوێزراوەتەوە ئەو ماڵانەی بە ڕیز ئەمانەیان تێدا دەژیان – «مالیك سێف» و «عەزیز محەمەد» و «سەلیم «یان سالم» صافی». حیزب تەنها ئەم چاپخانەیەی هەبوو، بۆیەکا ماوەیەك کەوتە خولیای پەیداکردنی چاپخانەیەکی دیکە، بەڵام بێ ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی دیار. هەمان کات یەهودا صدیق و حسەین تەها هەوڵیان دا چاپخانەیەك دروست بکەن و حیزب بۆ ئەم مەبەستە سیازدە دیناری عیراقی دانێ[١٣٦]، بەڵام بە پێی گێڕانەوەی «مالیك سێف» ئەو بیرۆکەیە خرایە پشت گوێ و هیچ کارێکی جدی بۆ نەکرا. هەرچیی ڕێکخراوی ئەرمەنیی حیزب بوو، وەك بەر لە ئێستا گوتمان، ڕۆژنامەکەی خۆی «هێمك» کە بە ڕۆنیۆ چاپی دەکرد لەگەڵ پەنجا شەست دانە «بە پێی زانیارییەکی دیکە سەد و بیست دانە» لەو نامیلکە چوار لاپەڕەییەی خۆی خستە بەردەست حیزب، دواتر

---

[١٣٦] ئەو پارەیە بۆ دروستکردنی چاپخانەیەك زۆر کەم دێتە بەرچاو.

نەخشەیەك دانرا بۆ ئەوەی حیزب تایپێکی ئەرمەنی لە «ئێران»ەوە و لە ڕێگەی «عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق»ەوە بهێنێت، بەلاّم وەها دیارە دیسانەوە لەم بوارەیشدا هیچ نەکرا».

لە خاڵی سێیەمی ئەم بەشەی هەمان ڕاپۆرتدا باسی ناوەرۆکی وتارەکانی ڕۆژنامەی «القاعدة» دەکات و «وەك دەڵێن بەشێك لەو وتارانە لە زوبانی دیکەوە وەردەگێڕدرانە سەر زوبانی عەرەبی و بۆ ئەو مەبەستە حیزب «کۆمیتەی وەرگێڕان»ی لەمانە دامەزراندبوو –«مووشی موختار» و «ساسۆن دەلال» و «ئیبراهیم شاوول». دەشڵێن ئەو کۆمیتەیە ناونیشانی ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی ڕۆژنامەی «القاعدة» یان بۆ دەناردن لایان بوو وە ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیەیان بە ناونیشانی خۆیان بۆ دەناردن. هەر چۆن بێت هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەوە نەکراوە چۆن مەتریاڵەکانی موفەوەزییەتی سۆڤیەتی لە «بەغدا» و ئەوانەی لە «پاریس»ەوە دەنێردران دەگەیشتن. سەرچاوەیەکی دیکەی گەیاندنی ئەو جۆرە مەتریالاّنە بە حیزب بریتی بوو لە ماڵێکی جوو لە «بەغدا» کە لێکدانەوە ئینگلیزییەکان و گوزارە شیوعییەکانی دەگەیاند. وەها دیارە نووسینە کوردییەکانیش لە ئەندامانی حیزبەوە لە «کوردستان»ەوە دەهاتن، بەلاّم بە پێی قسەی «مالیك سێف» ڕۆژنامەی (ئازادی) لە چاپخانەی «القاعدة» بە سەرپەرشتیی «مەلا شەریف» [١٣٧] چاپ دەکرا» [١٣٨].

بەشی نۆزدەمینی هەمان ڕاپۆرت بۆ باسی «ژمارەی ئەندامەکان» ی حیزب تەرخان کراوە کە بەشێکی بایەخدارە، بەلاّم گەلێك بچووکە [١٣٩]، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

---

(١٣٧) «مەلا شەریف»، کە خەڵکی «هەولێر»ە، یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی «حیزبی شیوعیی عێراقی»، تەنانەت کوردەواری نازناوی «مەلا عەرووس»یان بۆ هەڵبژاردبوو کە مەبەستیان «مەلای ڕووسی» بوو، خودی «فەهد» زۆر بایەخی پێی دەدا و گەلێك لێوەی نزیك بوو.

(138) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif (Kamal), (Professo) from his own and other statements, Top Secret, XVIII.press, PP.64-65.

(١٣٩) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو بەشە بریتییە لە تەنها لە حەوت دێر و نیو.

«١٩– ژمارەی ئەندامەکان.

هەرچەندە پۆلیس وەهای ئیدیعا دەکرد کە لیستی ناو و ژمارەی ئەندامەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لایە و بڵاویان دەکاتەوە، بەڵام هیچ وردەکارییەکی ئەو بابەتە لە بەردەستدا نییە بۆ ئەوەی «لەم دیراسەتەدا– ك.م.» بڵاویان بکەینەوە و سەرباری ئەم شتانەی لە بەشەکانی ڕابردووی ئەم ڕاپۆرتەدا گوتراون شتێکی ئەوتۆ نییە ئاماژەی بۆ بکەین. پۆلیس بۆ خۆیان ژمارەی ئەندامەکانی حیزب بە نزیکەی دە هەزار کەس لە قەڵەم دەدەن، بەڵام هەر چۆن بێ ئەم تەقدیرە یەکجار گشتییە و لەوانەیە هەموو ئەوانەیش بگرێتەوە کە پێوەندیی لاوەکی، یان هەستی سەرپێییان بەرانبەر حیزب هەیە، یان لەوانەیە گەشتیاری «بیانی – ك.م.» بن»[١٤٠].

لێرەدا نۆرەی پاشکۆی ژمارە (أ) دێت کە تەرخان کراوە بۆ پوختەی ناوەڕۆکی ڕۆژنامەی «القاعدة» لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ەوە تاوەکو مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨، لەو ماوەیەدا شەش ژمارەی ڕۆژنامەکە دەرچووە و پوختەی ناوەڕۆکیان سێ لاپەڕەی ڕاپۆرتەکەی گرتۆتەوە و ئەمەی لای خوارەوەیش لیستی ژمارەکانین:

أ– ژمارەی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧.

ب– ژمارەی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٧.

ج– ژمارەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٧.

د– ژمارەی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧.

هـ– ژمارەی مانگی تەممووزی ساڵی ١٩٤٨.

و– ژمارەی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٨[١٤١].

---

(140) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif.....Top Secret, XIX.Membership Figures, P.65.

(141) Ibid, Appendix (A), Examples of Al Qaida Publications Between June 1947 and October 1948.

## نەخشەیەکی کوردستان



سەرجەمی پاشکۆی ژمارە (ب) تەرخان کراوە بۆ وێنەی نەخشەیەکی «کوردستان» کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی لێدوانەکانی ڕاپۆرتەکەیە دەربارەی ئەو نەخشەیە:

«پاشکۆی ژمارە (ب)

ئەو نەخشەیە لە لایەن یۆنا ولیەمەوە[١٤٢] کەشف کرا و ئاماژە بۆ سنووری سیاسی «کوردستان» دەکات.

تێبینی یەکەم: ئەم نەخشەیە دەقاو دەق لە کتێبی «من عمان الی عمادیة أو رحلة في كردستان الجنوبية» یەی «عەلی سیدۆ گۆران»ی وەرگیراوە کە چەند ساڵێك لەمەوبەر نووسراوە[١٤٣] و بە ڕوونی سنووری سیاسی

(١٤٢) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی بە ئینگلیزی بەم جۆرە نووسراوە: (Yona William)

(١٤٣) «عەلی سیدۆ گۆرانی» «کورد»ی «تورکیا»یە، ساڵی ١٩٠٨ لە شاری «عەممان»ی پایتەختی «ئوردون» لە دایك بووە، باپیرە گەورەی لە هۆزی «دودکان»ی نیشتەجێی دەشتی

«کوردستان» لە گۆشەنیگای ناوچە جیاجیاکانی دیالێکتیکە «کوردی»یەکانەوە نیشان دەدات.

تێبینی دووەم: ئەو شارانەی لە ناو نەخشەکەدا بە ڕەنگی سوور خەتیان بە ژێردا هێنراوە ئەمانەن:

لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات و لە نەخشە تاریکەکەدا ئەمانەن: «سیڤاس»، «قارس»، «میرغەنی»، «دەوڵەتئاباد».

لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات لەڕێگەی باشووری نەخشە تاریکەکەوە ئەمانەن: «حەڵەب»، «مووسڵ»، «بەغدا»، «بەسرە» (١٤٤).

هەرچی پاشکۆی ژمارە (ج)ە بریتییە لەو نامەیەی «فەهد» کە ساڵی ١٩٤٨ لە بەندیخانەی کووتەوە ناردوویە بۆ «یەهودا ئیبراهیم صدیق»، شایانی باسە وەرگێڕدراوی ئەو نامەیە دوو لاپەڕە و نیوی پڕ کردۆتەوە (١٤٥).

---

«گۆران»ی نێوان «دیاربەکر» و «ئەرغەنی»یە و بەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمین هاتوونەتە شاری «سەلط»ی ئوردونی، ساڵی ١٩٢٨ زانکۆی «ئەمەریکی»ی لە «بێروت» تەواو کردووە، لە ڕۆژی پازدەی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٣١وە «عەلی سیدۆ» لە شاری «عەممان»ەوە دەستی کردە گەشتێك کە ڕۆژی پازدەی مانگی ئابی هەمان ساڵ تەواوی کرد و ساڵی ١٩٣٩ گەشتەکەی لە «قاهیرە» لە کتێبێکی ٢٧٢ لاپەڕەییدا بەم ناوونیشانەوە «من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية» بڵاوکردەوە و یەکێك لە پاشکۆکانی ئەو کتێبە بریتییە لە نەخشەیەکی گەورەی کوردستان. دەربارەی بڕوانە: «کەمال مەزهەر»، مێژوو، «بەغدا»، ١٩٨٣، ل١٥٣، ١٨٧، ١٩٣– ١٩٨، ٣٣٨، ٣٣٤، ٣٤٧.

(144) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif... Top Secret, Appendix (B).

(145) Ibid, Appendix (C), Letter(1948) from Yusuf Salman Yusuf (Fahd and Haj) to Yahuda Ibrahim Siddiq (Majid, Salman and Mustafa), Written from Kut jail.

## دوا ژمارەی «القاعدة»
## لە کاتی گرتنی چاپخانەکەی حیزبدا

دوا بەدوای نامەکەی «فەهد» بۆ «یەهودا ئیبراهیم صدیق» نۆرەی پاشکۆی ژمارە (د) دێت کە سەرجەمی تەرخان کراوە بۆ دواژمارەی ڕۆژنامەی «القاعدة» لە کاتێکدا کرێکارانی چاپخانەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» سەرقاڵی چاپکردنی ڕۆژنامەکە بوون، بۆیەکا ئەو بەڵگەنامەیە یەکجار دەگمەن و سەرنجڕاکێشە و دەتوانین بڵێین داستانێکی سەیرە لە کاتی گەرمەی چاپدا لێشاوی پۆلیس و سیخوڕ بدەن بەسەر بارەگای دەستەیەك ڕووناکبیری دڵسۆزدا کە تاکە تاوانیان ئەوە بووە کە لە ئیمانەوە و لەبەر نیشتیمانەکەیان مارکسیزم بەلایانەوە باشترین ڕێباز بووە.

لەگەڵ هێرشی لە ناکاوی پۆلیسدا کرێکارانی چاپخانەکە خەریکی چاپکردنی بەیاننامەیەکی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوون کە بەم ڕستەیە دەستی پێی کردووە:

«ڕۆڵە بەشەرەفەکانی گەلەکەمان:

هاووڵاتیانی بە شەرەفی ئەندامانی پارتی و ڕێکخراوە نیشتیمانییەکان بە «عەرەب» و «کورد» و پیاو و ئافرەت و گشت ئایین و ڕەگەز و کۆمەڵگاکانەوە، ئەی کرێکاران و جووتیاران و قوتابییان و خوێندەوارە ئازادەکان، ئەی نەقابی و پیشەگەرەکان، ئەی بازرگانە بچووکەکان و پاڵەوانە بەرهەمهێنەرەکان.

ئەی هاووڵاتییان، پاڵەوانانی «ڕاپەڕینی ١٩٢٠ – ١٩٢١»، ئەی ئەوانەی خوێنتان لە بەردەم پەیکەری «مۆدی» سیمبوڵی ئیمپریالیزمی «بەریتانی»دا ڕێژرا، ئەی ئەوانەی بە خوێنی پیرۆزتان تەختانیی «گاورباخی»تان سوور کرد، ئەی ئەوانەی کابینەی «سالح جەبر»تان ڕووخاند و پەیمانێکی ناعادیلانەتان پارچە پارچە کرد و گیانتان بەخت کرد، ئەی پیاوان و

ئافرەتان بەرەو خەبات دژی ئیمپریالیستە زۆردارەکان، ئێوە ئەی قارەمانانی شەڕەکانی «بەغدا».

ئەی هاولاتییە بە شەرەفەکان – هێزە ئازادیخوازەکانی جیهان، لە سەروو هەمووشیانەوە «یەکیەتی سۆڤیەت»ی گەورە، ڕۆژ بە ڕۆژ توانا و دەسەلاتتان پەرە دەسێنن و بێ کۆلنەدان و بە ئەوپەڕی پێداگرییەوە بەرەو پێش دەچن بۆ راماڵینی سەنگەرەکانی ئیمپریالیزم و ڕزگارکردنی گشت جیهان بە یەکجارەکی لە نەهامەتی و سەرگەردانی و جەنگ و چەوساندنەوە و پیلان و بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی بگەیێننە ژیانێکی بەختەوەر و ئازاد و سەربەرز...».

دوای ئەوەی «القاعدة» لە بەشی دووەمی ئەو ژمارەیەیدا هێرشێکی توند و تیژ دەکاتە سەر «فەرمانڕەوا کۆنە پەرستەکانی عیراق» ی وەك «نووری سەعید» و «پەیمانی عیراقی – بەریتانیی ساڵی ١٩٣٠» و باسی «ڕمانی نازییەکان لە جەنگی دووەمی جیهاندا» دەکات و تیشك دەخاتە سەر ئەوەی ناوی لێ ناوە «موغامەرەکەی «بێڤن» [١٤٦] لە «فەلەستین» و ئینجا دێتە سەر باسی هەوڵی کۆنەپەرستان و ئیمپریالییەکان «بۆ ئەوەی گیان بکەنەوە بە بەری «پەیمانی پۆرتسمۆث»دا و دایسەپێننەوە بە سەرماندا»، ئا لەم ئاستەدا پۆلیس داوێتی بەسەر بارەگای چاپخانەکەی «القاعدة» دا و داگیریان

---

[١٤٦] «سێر ئێرنست بێڤن»: ڕۆژی حەوتی مارتی ساڵی ١٨٨١ لە دایك بووە، لە هەرەتی لاوییەوە پێوەندی بە نەقابە کرێکارییەکان و سۆشیالیزمەکانی ولاتەکەیەوە هەبووە، ساڵەکانی «جەنگی دووەمی جیهان» وەزیری کار «عەمەل» بوو، لە هەڵبژاردنی گشتیی ساڵی ١٩٤٥دا «سێر ئێرنست بێڤن» ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا بۆ ئەوەی «پارتی کرێکاران» سەربکەوێت، بۆیەکا لەوساوە «ئەتلی» کردییە وەزیری هەندەران لە کابینەکەی خۆیدا، «بێڤن» لە دوای ساڵی ١٩٤٥ەوە تەندروستی تەواو تێکچوو و ڕۆژی چواردەی نیسانی ساڵی ١٩٥١ لە «لەندەن» کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:
(Oxford Dictionary of National Biography), Vol.5, Oxford University press, 2004, PP. 601-611.

کـــردووه و کرێکارەکانیـــان ڕاپێچـــی بەندیخانـــە کـــردووه و ئەمـــەی لای خوارەوەیش دەقی ئەو دوا ڕستەیەی «القاعدة»یە بە زوبانی ئینگلیزی(١٤٧):

"…. Are trying to reimpose The Dead Portsmouth Treaty on us…"

پاشکۆی ژمارە (ف)ی هەمان ڕاپۆرت بۆ ئەو نامانە تەرخان کراوە کە لە ماڵی «عەبدوللەتیف حاج»ی برای «عەزیز حاج»دا گیراون و بریتین لـە حـەوت نامە بەم جۆرەی لای خوارەوە:

أ- نامەی یەکەم: «حامید» ناوێك ڕۆژی سیازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ لەتیف حاج.

ب- نامەی دووەم: لەوە دەکات کە «لەتیف حاج» ناردبێتی بۆ ئەندامێکی «حیزبـی شـیوعیی عیراقـی» بـەڵام پـۆلیس نـەیتوانیوە بزانێـت کێیـە، چونکە بە نهێنی ئاماژە بۆ ناوی ئەو کەسە کراوە.

ج- نامەی سێیەم: وەك نامـەی دووەم وەهایـە، واتـا پـۆلیس نـەیتوانیوە بزانێت بە دروستی لە ناوەڕۆکی نامەکە بگات.

د- نامەی چوارەم: ئەمەی لای خوارەوە دەقی ناوەڕۆکی نامەی چوارەمە کە وەها پێدەچێت لەتیف حاج ناردبێتی بۆ هاوڕێیەکی حیزبیی خۆی:

« من پێشنیاز دەکـەم خۆنیشـاندەران دروشمـەکانیان لەسـەر دیـواری شەقامەکان بنووسن و بەو دەستوورەی ئێمە لەکاتی ڕووداوەکان و بەر لـە ڕووداوەکـانی مـانگی کـانوونی دووەمـی (سـاڵی ١٩٤٨-ك.م.) دەمانکرد».

هـ- نامەی پێنجەم: دیسانەوە لەوە دەچێت ئەم نامەیەش هی لەتیف حاج خۆی بێت کە ناردوویە بۆ هاوڕێیەکی حیزبیی خۆی و پێی دەڵێت:

«دوای نیوەڕۆی ڕۆژی یەك شـەممە کامێرەکـە و دوو فلـیم ئامـادە دەبـن، ئایا تۆ داوای دوو فلیم زیاتر دەکەیت؟».

(147) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif…,Top Secret, Appendix (D), the half – finished of Al Qa`ida found on the press at the time of the Raid.

و- نامەی شەشەم: ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی نامەی شەشەمە کە دیسانەوە لەوە دەکات لەتیف حاج بۆ هاوڕێیەکی حیزبی خۆی ناردبێت و تێیدا دەڵێت:

«من دوێ شەو سەعات نۆ و چارەکێك گەڕامەوە و تاوەکو سەعات دووی شەو دانیشتم، بەڵام نەمتوانی پتر لە چل کۆپی[148] بنووسمەوە چونکە پێویستیم بە سی و پێنج دەقیقەیەك هەبوو بۆ نووسینەوەی هەر پێنج دانەیەك».

«من ئیمشەو دەگەڕێمەوە و هەوڵ دەدەم هێندەی دیکە کۆپی بکەم بە پێی دەرفەتی کاتم، تکایە لە شێواز و کاتی بڵاو کردنەوەیان و هەرشتێکی دیکەی پێوەندیدار ئاگادارمان بکە. سەعات پێنجی بەرەبەیان».

ز- نامەی حەوتەم: هەرچی نامەی حەوتەمیشە دوانامەیە و ئیمزای «کەرخ»ی بە سەرەوەیە کە دیارە ناردوویە بۆ «لەتیف حاج»، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«پێویستە ئەندامانی حیزب ئاگادار بکرێن کە یەکێك لە برادەرانی ئێمە دەچێت «بۆ خۆنیشاندانەکان- ك.م.» بۆ وێنە گرتن، چونکە هەستمان کردووە پۆلیس وێنەی خۆنیشاندەرەکان دەگرن بۆ کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا، بۆیەکا لەوانەیە پۆلیسێك لە نێو خۆنیشاندەراندا وەك پۆلیسی نهێنی خۆی حەشار بدات».

لە کۆتایی دوانامەیشدا ئەم تێبینییە نووسراوە:

«تێبینی دایەرە: بەشێك لە نامەکانی سەرەوە بە شێوازی نهێنی ئامازەیان بۆکراوە دایەرەش نەیتوانیوە لە مەبەستی ئەو ئامازە نهێنییانە بگات[149]»[150].

---

[148] دەبێت مەبەستی بەیاننامەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»بێت.

[149] ئەمەیش دەقی ئەو تێبینییانەی دایەرەیە بە زوبانی ئینگلیزی

بێگومان ئەوەیش نیشانەی وردەکاری و ڕێکوپێکیی کارەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» یە کە لەم بوارەدا هیچ لایەنێکی نهێنیی دیکە نەیدەتوانی شان لە شانی بدات[151].

هەرچی پاشکۆی ژمارە (گ)ی ناو هەمان ڕاپۆرتە تەرخان کراوە بۆ ناوی دە نامەی دۆزراوەی دیکە لەو ماڵەدا کە کەوتۆتە سەر شەقامی «تەسابیل» لە «بەغدا» و ئەم ئەندامانەی حیزبی تێدا بوون– «جەودەت ئەحمەد ناجی» و «حسقێل هارون حسقێل» و «ئیبراهیم محەمەد حەکاك»، ناوەڕۆکی نامەکانیش بریتین لە:

١– لیستی ناوی ڕێکخراوەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە لە ژێر دەستدا نییە.

٢– چەند لاپەڕەیەك دەربارەی ئەوەی چۆن ئەندامانی حیزب وەردەگیرێن.

٣– لیستی ناوی ئەندامانی حیزب و پێنشیازەکانیان کە لە ژێر دەستدا نییە.

٤– ئەو ڕاپۆرتانەی ڕێکخراوەکانی حیزب دەربارەی کاندیدکردنی ئەندامی نوێ نووسیویانن و لە ژێر دەستدانین.

---

"Office Note: Parts of The above messages are in a code which has not been broken".

(150) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif ……,Top Secret, Appndix (F), Two Massages Recovered from the Personal Search of Abdul Latif Haj Ali Arrested on 13.11.1948

(151) لێرەدا دوو کورتە تێبینیم هەیە، یەکەمیان دەربارەی ئەوەیە کەوا لە پەراوێزی ئەو بەڵگەنامەیەدا ژمارەی ئەو نامانەی لای «لەتیف حاج» دۆزراونەتەوە تەنها دوو نامەن لە کاتێکدا لە ناوەڕۆکی خودی بەڵگەنامەکەدا، وەك ئاماژەمان پێی داوە، ژمارەی نامەکان حەوتن، دوور نییە نووسەرانی ڕاپۆرتەکە کەوتبنە هەڵەوە، دووەمیشیان دەربارەی خودی «لەتیف حاج» خۆیەتی کە دوای «شۆڕشی چواردەی تەممون»ی ساڵی ١٩٥٨ بە ماوەیەکی کورت چەند جارێك «لەتیف حاجم» دی و هەستم کرد کوڕێکی لە سەرەخۆ و قسەزان و دڵسۆزی بیروباوەڕی کۆمۆنیزمە.

٥- لیستی ناوی ئەو کەسانەی بۆ کاری یاساولّی «حەراسەت"دادەنرێن و لە ژێر دەستدا نین.

٦- کۆپیی ئەو ئینزارانەی حیزب داونییە ئەو ئەندامانەی بەشدارییان لە خۆنیشاندانەکەی ڕۆژی پازدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا نەکردووە و لە ژێر دەستدانین.

٧- دوو وەسڵی ئەو برووسکانەی لە ڕۆژی شەشی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ حیزب ناردوونی بۆ «وەسی» و سەرەك وەزیران.

٨- دەربارەی پێوەندییەکانی حیزب بە «یەکیەتی فێردراتسیۆنی قوتابییانەوە» [١٥٢] کە لە ژێر دەستدانین.

٩- پارچە کاغەزێك کە ناوی «خەلووق ئەمین زەکی» لەسەرە و تێیدا نووسراوە ئەندامی حیزبە و بەرپرسی دە ئەندامە[١٥٣].

١٠- سروودی ئومەمی کە سروودی حیزبە و بە شێوازێکی عیراقی داڕێژراوە» [١٥٤].

---

[152] "Students` Union Federation".

[١٥٣] لە دەقی ئینگلیزییەکەیدا وەها هاتووە:

"a slip of paper bearing the name of Khaluq Amin Zaki described as a "Sergeant" and member of the Party".

هەرچی وشەی "Sergeant"یشە واتای بەرپرسی دەیان چاوەش ڕادەگەیێنێت.

[154] N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif ……,Top Secret, Appndix (G), List of Articles Recovered from the House in Tasabil Street, Baghdad and in th passession of Jawdat Ahmad Naji, Heskel Haron Heskel and Ibrahim Mohamad Hakkak.

## دیسانەوە دەربارەی
## زەبت و ڕەبتی «حیزبی شیوعیی عیراقی»

هەرچی پاشکۆی ژمارە (هـ)یشە دیسانەوە بە وردی وێنەی زەبت و ڕەبتی ناو ڕیزەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» مان بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش نیشان دەدات. پاشکۆی ناوبراو بۆ «دوو نامە و بەڵگەنامەیەك کە لەماڵی «میر یەعقوب کۆهین–جۆزێف» لە شەقامی «سینەك»ی «بەغدا» دۆزراوەتەوە» تەرخان کراوە. نامەی یەکەمیان لە ڕێکخراوی «کەرخ»ی حیزبەوە ئاراستە کراوە و بەم جۆرە دەستی پێ کردووە:

«ئایا شوێنێکی ئەمینتان بۆ کۆبوونەوەی ڕەهبەران دۆزیوەتەوە؟، دەبێت ئیمڕۆ وەڵامم بدەنەوە»[١٥٥].

دیسانەوە زەبت و ڕەبتی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەو پازدە خاڵەی هەمان نامەی یەکەمدا کە بۆ شوێنێکی ئەمین بۆ کۆبوونەوەی ڕەهبەرانی حیزب تەرخان کراون هەستی پێ دەکرێت. دوو خاڵی ئەو پازدە خاڵە بۆ جۆری ئەو کوتەکە تەرخان کراون کە پێویستە بە دەست یاساوڵەکانی شوێنی کۆبوونەوەکەوە بن و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«٦– فەرمان بدەنە ئەندامان کە پێویستە کوتەکی بەرگری و داری هەڵواسینی پۆستەرەکان ئامادەبن»[١٥٦].

خاڵێکی دیکەشیان دەڵێت:

---

[١٥٥] لە دەقی ئینگلیزییەکەیدا وەها هاتووە:
"Have you get a safe place for meeting of the leaders. Reply today".

[١٥٦] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:
"6- Instruct the members to have defence stricks and poster stricks ready".

«٧- درێژی کوتەکەکانی بەرگری دەبێت لە بیست و پێنج سانتیمەتر کورتتر نەبن و پێویستە ئەستوور بن»[١٥٧].

هەرچی نامەی دووەمیشە لە دوو خاڵ پێکهاتووە، خاڵی یەکەمیان دەڵێت:

«ئێلی» کۆچی دوایی کرد، ئایا ئێوە نامەی «سەرەخۆشیتان-ک.م.» لەگەڵ خێزانەکەی «عەلی شکور»دا بۆ «کەسوکاری -ک.م.» نارد؟».

بەشی دووەمی هەمان نامەیش تەرخان کراوە بۆ «شێخ مەجیدی کاتب» لە دادگای «کەرکووك» کە ماوەیەك لەمەوبەر هاتە «بەغدا» و نامەیەکیم لە رێگەی یەکێك لە ئەندامەکانەوە گەیاندە حیزب، دواییش وەڵامی نامەکەیم لە حیزبەوە گەیشتێ و لە رێگەی هەمان ئەندامەوە ئەویشم پێی گەیاند. دەنگوباوێکی وەها هەیە کە ئەم «سەید مەجید»ە بووە هۆی ئەو کەسانەی لە «کەرکووك» بەندکران چونکە، وەك دەڵێن، لە کاتی گەڕانەوەیدا لە «بەغدا»وە بۆ «کەرکووك» بە سەرخۆشی ناوی چەند کەسێکی لای پشکنەرێکی پۆلیس درکاندووە».

هەرچی بەڵگەنامەکەیشە مێژووی ڕۆژی نۆی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ی بە سەرەوەیە و لە شەش خاڵ پێکهاتووە کە گشتیان وەها دیارە لە رێکخراوێکی «حیزبی شیوعیی عیراقی» یەوە ئاراستەی ئەندامێکی کراوە، یەکێکی دیکەی ئەو پرسیارانەش ئەمەی لای خوارەوەیە:

«ئایا مامۆستا «هێربێت - Herbet» تاوەکو ئێستا هەر لە «بەغدا»یە؟[١٥٨] ئایا قابلییات و توانای چۆنن؟»[١٥٩].

---

[١٥٧] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:
"7- the defence sticks should be net less than 25 c.m. long and must be shick".

[١٥٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرەی سەرەوە هاتووە.

پاشکۆی ژمـاره (ئـای) تـەرخان کـراوه بـۆ «لیسـتی ئـەو تەوجیهاتانـەی «فەهد» کە لـە بەندیخانـەی «کووتـەوە–ك.م.» لـە کـاتی گرتنییـەوە تـاوەکو ڕۆژی ئامادەکردنی ئەم دیراسەتە ناردوونی بۆ حیزب و ئەو شتانەی لە لایـەن حیزبـەوە خراونەتـە بـەردەمی»، بـەر لـە پێشکەشـکردنی نـاوەڕۆکی ئـەم پاشـکۆیە دانـەرانی دیراسـەتەکە ئـەم تێبینییانـەی لای خوارەوەیـان تۆمـار کردووە:

«کاتی دەرچوونی ئەم تەوجیهاتانە نەزانراون «تاوەکو بـەو پێیـە ڕیزیـان بکەین ك.م.»، وێڕای ئەمـە ناتوانرێـت هـیچ کـام لـە بەڵگەنامـەکان دیراسـەت بکرێن، تەنها بەڵگەنامەی ژمارە نۆیەمیان نەبێـت».

دوا بـەدوای ئەمـە لـە هـەژدە خاڵدا تەوجیهاتـەکانی «فەهـد» کـە لـە بەندیخانـەی کووتـەوە نـاردوونی بـۆ حیـزب، یـان ئـەو پرسـیارانەی حیـزب خستوونییە بەردەمی «فەهد» بەم جۆرەی لای خوارەوە ڕیزکراون:

«١– نامەیەك بۆ «فەهد» دەربارەی ناوی ئەو کەسانەی پێشنیازیان دەکات بۆ ئەوەی کۆمیتەی ناوەندیی نوێی حیزب پێك بهێـنین بـۆ وەرگرتنـی موافەقەتی.

٢– نامەیەك کە داوای زانیـاری دەکـات دەربـارەی بەنـدەکانی بەندیخانـەی کووت.

٣– نامەیەك دەربارەی ناوی ئەو کەسـانەی لـە حیـزب دەرکـراون و وان لـە «بەندیخانەی کـووت»دا، وێـڕای نـاوی ئەوانـەیش کـە لـەو بەندیخانەیـە ئازاد کراون « ئەوەیش دیار نییە کە ئایا ئەم نامەیە لـە «فەهـد»ەوەیـە بۆ حیزب یـان لـە حیزبەوەیـە بـۆ «فەهـد»، لەوانەشـە لـە «فەهـد»ەوە بێت».

[159] N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif .......Top Secret, Appndix (H), Two Letters and a document Recovered from Meir Ya'qub Cohen (joseph) in Sinak Street Baghdad.

٤- تەوجیهات بۆ ئەندامە بەندکراوەکانی حیزب کە بە هیچ جۆر هیچ بە پۆلیس ڕانەگەیێنن لە حاڵەتێکدا هەوڵیان لە گەڵدا بدەن بۆ ئەوەی ڕایانبکێشن یان بە پێچەوانەوە فشاریان بخەنە سەر.

٥- نامەیەك کە حیزب هان دەدات بۆ دامەزراندنی پێوەندیی لەگەڵ حیزبە شیوعییەکانی «سووریا» و «فەلەستین» و «ئێران» و «لوبنان».

٦- تەوجیهات بۆ ئەندامانی حیزب دەربارەی ئەوەی کاتێك لە لایەن پۆلیسەوە ڕاوەدوو دەنرێن خۆیان نەدەن بە دەستەوە.

٧- نامەیەك دەربارەی موافەقەتی ««فەهد»-ك.م.» لەسەر پێشنیازی چوونی «یەهودا صدیق» بۆ «مۆسکۆ».

٨- تەوجیهاتی «فەهد»- ك.م.» بۆ حیزب بۆ ئەوەی بکەوێتە چالاکییەکی بەرفراوان دژی «پەیمانی پۆرتسموث» و دەرکردنی نامیلکە و دەستکردن بە خۆنیشاندان.

٩- نامەیەکی «یەهودا صدیق» کە تێیدا وەڵامی «مالیك سێف» دەداتەوە»بڕوانە پاشکۆی ژمارە سی یان جیم».

١٠- تەوجیهات دەربارەی پێویستیی ڕێکخستنی ئەندامە حیزبییە دوورخراوەکان بۆ «بەدرە» و «سامەڕا» و «شیفاثە» [١٦٠].

١١- نامەیەك دەربارەی موافەقەتی ««فەهد»-ك.م.» لەسەر داواکردنی «داود سایغ» و جەماعەتە بەندکراوەکەی کە ببنە ئەندامی «حیزبی شیوعیی عیراقی».

١٢- نامەیەك لە ««فەهد»ەوە-ك.م.» دەربارەی ڕێگەدان بە «شەریف شێخ» و جەماعەتەکەی کە بێنە ناو «حیزبی شیوعیی عیراقی» یەوە[١٦١]، هەروەها موافەقەتی ««فەهد»-ك.م.» لەسەر گەڕانەوەی

---

[١٦٠] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە: "Shifatha".

[١٦١] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە لای وشەی (جەماعەتەکەی)یەوە وشەی (Sic) وەك گومانکردن لەوەی جەماعەتی هەبێت و بەم جۆرەی لای خوارەوە نووسراوە:

«محەمـەد عـەلی زەرقـا» و «عەبـدولقادر ئیسـماعیل» لـە مـەنفاوە بـۆ عیراق».

١٣- تـەوجیهاتی «فەهـد» دەربـارەی هەوڵدان بـۆ بەسـتنی کۆنفرانسـێکی ڕەهبـەرە کوردەکـانی نێـو حیـزب بـۆ موناقەشـەکردنی کێشـە کوردییەکان.

١٤- تـەوجیهاتی ««فەهـد»-ك.م.» دەربـارەی ئەگـەری ڕەنگدانـەوەی دامەزراندنی نەقابەیەك بۆ کرێکارانی هێڵی ئاسن.

١٥- تـەوجیهاتی ««فەهـد»- ك.م.» دەربـارەی پشـتگیریکردنی حیـزب بـۆ دابەشکردنی خاکی «فەلەستین» و شیکردنەوەی دروشمەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەم بوارەدا.

١٦- بەیاننامەیەکی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بۆ ڕێکخـراوە حیزبییـەکانی دیکە (دیار نییە ئەو بەیاننامەیە لـە «فەهـد»ەوەیـە بـۆ حیـزب یـان لـە حیزبەوەیە بۆ «فەهد»).

١٧- ژمارەیـەك تـەوجیهاتی گشـتی دەربـارەی ڕێکخراوەکـانی حیـزب و چالاکییەکانیان.

١٨- نامەیەك (دەوروبەری مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٨) دەربارەی ڕێکخسـتنی ئـەرزوحاڵی پرۆتێسـت و مـانگرتن و خۆنیشـاندان دژی بـەردەوامبوونی حوکمی عورفی لە وڵاتدا[١٦٢].

دوا بەدوای ئەمە نۆرەی پاشکۆی ژمارە (J) دێت کە بریتییە لـە بەشـێك لەو نامەی پرۆتێستەی «پارتی گەل» «حزب الشعب» لە بەندیخانەی کووتـەوە

"12- A letter Perrmitting Sharif al Shaikh and his gorup (sic) to join the I.C.p.".

(162) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif …,Top Secret, Appndix (J), Extract from a Letter of Protest from members of the Sha'ab Party in Kut Jail to members of I.P.C also in the Jail.

داویەتە «حیزبی شیوعیی عیراقی». نامەکە بەم جۆرەی لای خوارەوە دەست پێ دەکات:

«بەداخەوە لەو کاتەوەی هێنراوینەتە بەندیخانەی «کووت» هەستمان بە هەڵوێستی دوژمنایەتیتان کردووە، بە ڕادەیەك پەرژینێکتان لە نێوان جەماعەتەکەی خۆتان و دەستە دیموکراسییە نیشتیمانییەکاندا دروست کردووە و بەو جۆرە ڕێگەی هیچ جۆرە پێوەندییەکتان بە ئێمە و کەسانی دیکەوە نەداوە و پێیانتان ڕاگەیاندووە ئەوەی لەگەڵتاندا نین یان تیرۆریستن یان سیخوڕن، لە کاتێکدا پێویستە بەو چاوە سەیری ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان بکرێت». لە دواییشدا چەند نموونەیەك دەهێننەوە کە یەکێکیان تەعەداکردن بووە لە «عەزیز شەریف» ڕۆژی پازدەی مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨[١٦٣].

بە داخەوە ئەوە یەکێك لە هەڵە گەورەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوو کە وەك زۆربەی هەرە زۆری حیزبە شیوعییەکانی دیکە حیزبێکی «ستالین»ی بوو[١٦٤]، بۆچوونی «ستالین»یش بەم جۆرە بوو: «ئەوەی لەگەڵم نییە دوژمنمە» «من لیس معي فهو ضدي» ئەو سیاسەتە ناقۆڵایەی زیانی زۆری گەیاند بە «یەکیەتی سۆڤیەت» و بزووتنەوەی کۆمۆنیزمی لە جیهاندا، ئەوە بوو دوای کۆچی دوایی «ستالین» لە ساڵی ١٩٥٣دا کار کەوتە دەست «خرۆشۆف» و زۆری نەبرد بۆچوونەکەی «ستالین»ی بە شێوازێکی دیکە داڕشت و بەم جۆرەی لێ کرد «ئەوەی دوژمنم نییە لە گەڵمدایە» «من لیس ضدي فهو معي» و تەنانەت سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردووش لاشە

---

(١٦٣) «عەزیز شەریف» تاوەکو کۆچی دوایی لە ڕۆژگاری ڕژێمی صەدامدا سیاسەتمەدارێکی خاوێن بوو، وێڕای ئەوەی هەمیشە هەڵوێستی بەرانبەر پرسی کورد باش بوو.

(١٦٤) هەر چەندە خوا هەڵناگرێت، لەو مەتریاڵە بێ شومارەی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا کە لە فایلەکانی «ئەرشیفی نیشتیمانی» حوکمەتی بەریتانیدا هەڵگێراون و من دیومن، زۆر بە دەگمەن ناوی «ستالین» دێت.

تەحنیتکراوەکەی کە لە تەنیشت تەرمی «لێنین»ەوە لە هۆڵێکی زۆر گەورەی سەر «تەختانیی سوور» «الساحة الحمراء»ی ناوەڕاستی شاری «مۆسکۆ»دا دانرابوو گوێزرایەوە ئەو گۆڕستانە فەرمییەی لای دیواری «کریملن»ەوە بۆ ناشتنی گەورە لێپرسراوانی «یەکیەتی سۆڤیەت» تەرخان کراوە، شایانی گوتنیشە «لێنین» دوای ڕووخانی «یەکیەتی سۆڤیەت»یش هەر لە شوێنەکەی خۆیدا ماوەتەوە و ڕۆژانە بە دەیان هەزار ڕووس و بیانی وەك جاری جاران دەچنە زیارەتی.

پاشکۆی ژمارە (ك) بۆ لیستی ناوی ئەندامە ئافرەتەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراوە کە سەرجەمیان قوتابی یان مامۆستا بوون و ژمارەیان چل و حەوت ئەندام بووە و بەم جۆرەی لای خوارەوە:

١- «ئێتین ڕەحال»، قوتابیی پۆلی دووی «کۆلێجی حقوق»ە.

٢- «سوها ثنەیان»، قوتابیی پۆلی دووی «کۆلێجی حقوق»ە.

٣- «لەمعان ئەلبەکری»، قوتابیی پۆلی دووی «کۆلێجی حقوق»ە.

٤- «ئامینە چادرچی»، قوتابیی پۆلی دووی «کۆلێجی حقوق»ە.

٥- «ڕاشێل زەلخا»، قوتابیی پۆلی دووی شەوانەی «کۆلێجی حقوق»ە.

٦- «عەدەوییە مەحموود ئەدیب»، قوتابیی «کۆلێجی پزیشکی» یە.

٧- «ئەلبێرتین مێنشی»، قوتابیی «کۆلێجی پزیشکی» یە.

٨- «سەلما مەرعی ئەدیب» «یان سەبری؟»، قوتابیی «کۆلێجی پزیشکی» یە.

٩- «ڤایۆلێت هاروون دەروێش»، قوتابیی «کۆلێجی پزیشکی»یە.

١٠- «مونیرە ئیسماعیل»، قوتابیی «کۆلێجی پزیشکی»یە «خوشکی عەبدولقادر ئیسماعیل»ە.

١١- «سەمیرە ئەدیب»، قوتابیی «کۆلێجی پزیشکی» یە.

١٢- «ست نايهه»[١٦٥]، «مامۆستاى قوتابخانەى كچانى ڕەسافە» يە.

١٣- «ئينعـام جـەودەت دلێمـى»، مامۆسـتاى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە[١٦٦].

١٤- «بـەلقيس سـەعيد»، قوتـابيى پـۆلى سـێى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە)يە.

١٥- «فەريـدە سـەعيد،» قوتـابيى پـۆلى سـێى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە.

١٦- «سـاجيدە ئيحسـان»، قوتـابيى پـۆلى يـەكى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە.

١٧- «بێـرتين ئيـبراهيم»، قوتـابيى پـۆلى سـێى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە.

١٨- «سـوعاد زەكـى»، قوتـابيى پـۆلى يـەكى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە[١٦٧].

١٩- «سـوعاد عـەلى»، قوتـابيى پـۆلى يـەكى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە.

٢٠ - «نەجلـە نەصـرەت»، قوتـابيى پـۆلى يـەكى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە.

٢١- «نەجلـە عەبـدولقادر»، قوتـابيى پـۆلى يـەكى «قوتابخانـەى كچـانى ڕەسافە»يە.

٢٢- «ماجيـدە محەمـەد حـەموودى»، قوتـابيى پـۆلى دووى «قوتابخانـەى كچانى ڕەسافە»يە.

---

[١٦٥] لەوانەيە ناوى ناهيدە بێت.

[١٦٦] وەها پێدەچێت خوشكى دوكتۆرە نەزيهە دلێمى بێت.

[١٦٧] دوور نييە كچ يان هاوسەرى زەكى خەيرى بێت.

٢٣- «نەزیرە خەلیل»، قوتابیی پۆلی دووی «قوتابخانەی کچانی ڕەسافە»یە.

٢٤- «نەزیرە ئیبراهیم»، قوتابیی پۆلی دووی «قوتابخانەی کچانی ڕەسافە»یە.

٢٥- «مونیبە» [١٦٨]، قوتابیی پۆلی دووی «قوتابخانەی کچانی ڕەسافە»یە.

٢٦- «سوعاد ئیبراهیم»، قوتابیی «سانەویی مەرکەزیی کچان»ە.

٢٧- «سەلوا» [١٦٩]، قوتابیی «سانەویی مەرکەزیی کچان»ە.

٢٨- «فەوزییە ئەحمەد عوسمان»، قوتابیی «سانەویی مەرکەزیی کچان»ە.

٢٩- «بەتوول ئەحمەد عوسمان»، قوتابیی «کۆلێجی مەلیکە عالییە»یە.

٣٠- «بەتول فەهمی مودەریس»، قوتابیی «کۆلێجی مەلیکە عالییە»یە.

٣١- «خەفیرەی حاجی حەسەن»، قوتابیی «کۆلێجی مەلیکە عالییە»یە.

٣٢- «بەدرییە جەواد، قوتابیی» «کۆلێجی مەلیکە عالییە»یە.

٣٣- «سەلوا سەعید مەدفەعی»، قوتابیی «سانەویی ئەعزەمییەی کچان»ە.

٣٤- «نەوال فەخری خەطیب»، قوتابیی «سانەویی ئەعزەمییەی کچان»ە.

٣٥- «زاهیدە عەبدولکەریم»، قوتابیی «سانەویی ئەعزەمییەی کچان»ە.

٣٦- «ناهیدە عەبدولکەریم»، قوتابیی «سانەویی ئەعزەمییەی کچان»ە.

٣٧- «عادیلە ئەمین زەکی»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.

٣٨- «ئەمەل ئەمین زەکی» [١٧٠]، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.

---

[١٦٨] لەوانەیە مونیبە بێت.

[١٦٩] ناوی باوکی نەنووسراوە.

٣٩- «مەدیحە ڕەئوف»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.
٤٠- «سوعاد حەمید بەیاتی»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.
٤١- «سوعاد زەهاوی»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.
٤٢- «خالیدە زەهاوی»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.
٤٣- «سوعاد ئەلئەوقاتی»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.
٤٤- «ساجیدە عەبدولکەریم»، قوتابیی «کۆلێجی دار المعلمین العالیة»یە.
٤٥- «ڤێرجین ئیشۆ»، قوتابیی «قوتابخانەی زانستە پیشەییەکان» «مدرسة العلوم الحرفیة»یە.
٤٦- «سەلیمە داود»، قوتابیی «قوتابخانەی مناحیم دانیالی ئایینییە» «مدرسة مناحیم دانیال الدینیة».
٤٧- «صەبیحە ئەمین»، قوتابیی «دار المعلمات ئیبتیدائی»یە[١٧١].

دوا بە دوای لیستی ئەم ناوانە پاشکۆی ژمارە (ل) دەست پێدەکات و ئەمیان بۆ لیستی ناوی بەشدارە زانراوەکانی یەکەم کۆنفرانسی «حیزبی شیوعیی عێراقی» لە ساڵی ١٩٤٤دا تەرخان کراوە و بەم جۆرەی لای خوارەوەیە:

١- «یووسف سەلمان یووسف» «فەهد».
٢- «مالیک سێف».
٣- «یەهودا ئیبراهیم صدیق».
٤- «حسقێل ئیبراهیم صدیق».
٥- «زەکی بەسیم».

---

[١٧٠] دیارە «عادیلە» و «ئەمەل» دەستە خوشکن و هەمان کات هەردووکیان خوشکی «خەلووق ئەمین زەکی»ن.

[171] N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif ……,Top Secret, Appndix (K), List of Women Members of the Party, either Students or School Mistresses.

٦- «محەمەد عەلی زەرقا».
٧- «مووسا نوور».
٨- «فەیصەل صەمەد».
٩- «میخائیل پەترۆس».
١٠- «جۆرج مەرقەص».
١١- «حسەین محەمەد شەبیبی»[١٧٢].
١٢- «داود سەلمان» «برای «فەهد».
١٣- «عەزیز عەبدولهادی».
١٤- «سامی نادر»[١٧٣].
١٥- «مەلا شەریف».
١٦- «عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق».
١٧- «حسەین تەها».
١٨- «عەبد تەمر».
١٩- «گریگۆر بیدرۆسیان».
٢٠- «ستیڤان سێتراك»[١٧٤].

---

(١٧٢) دیارە مەبەستی «محەمەد حسەین شەبیبی» یە.
(١٧٣) کورد لەو دەورووبەرەدا ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا نەبوو، تەنانەت یەکێکی وەك دوکتۆر «موکەڕەم تاڵەبانی» ئەوساکە ئەندامی «حیزبی هیوا» بوو، «مەلا شەریف» کورد بوو، بەڵام تۆ بڵێی «سامی نادر» لە بنەماڵەی «فایەق نادر» و «طەلعەت نادر» بێت کە یەکێکن لە بنەماڵە ناسراوەکانی هەولێر و هەر دووکیشیان شیوعیی بوون، برایەکیشیان بە ناوی «تەحسین»ەوە هەیە کە ئەو دەورووبەرە یان قوتابیی ناوەندی یان خوێندکاری کۆلێجی پزیشکی بوو، نەشمبیستووە برایان بە ناوی «سامی»یەوە هەبووبێت.
(174) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif ……,Top Secret, Appndix (L), Name of Members known to have Attended the first Party General Conference early in 1944.

پاشكۆی ژمارە (م) بۆ ناوی ئەندامانی كۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بە پێی هەڵبژاردنی یەكەم كۆنفرانسی گشتیی حیزب سەرەتای ساڵی ١٩٤٤ تەرخان كراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش ناوەكانن:

١- «یووسف سەلمان یووسف».

٢- «زەكی بەسیم».

٣- «حسەین محەمەد شەبیبی».

٤- «گریگۆر بیدرۆسیان».

٥- «حسەین تەها».

٦- «عەبد تەمر».

٧- «یەهودا صدیق».

٨- «مالیك سێف».

٩- «مەلا شەریف».

١٠- «سامی نادر».

بە پێی هەمان پاشكۆ ئەندامانی یەدەگ «ئیحتیات»ی كۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بریتی بوون لەم ناوانەی خوارەوە:

١- «ئیسماعیل حەمید».

٢- «مووسا نوور».

٣- «محەمەد عەلی زەرقا».

٤- «محەمەد عەلی شەبیبی».

٥- «عەبدولوەهاب عەبدولرەزاق».

٦- «داود سەلمان».

٧- حسقێل صدیق» (١٧٥).

(175) Ibid, Appendix (M), Central Committe appointed by the Centerl Conference (early1944).

پاشکۆی دواتر کە ژمارە (ن)ە بۆ ناوی ئەندامانی پۆلیت بیرۆی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش ناوەکانن:

١- «یووسف سەلمان یووسف».

٢- «زەکی بەسیم».

٣- «محەمەد حسەین شەبیبی».

٤- «عەبد تەمر»[١٧٦].

پاشکۆی ژمارە (پ) بۆ ناوی خواستەنیی «حیزبی» ڕەهبەرانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا تەرخان کراوە و بەم جۆرەی لای خوارەوە بوون:

| ژمارە | ناو | ناوی نهێنی |
|---|---|---|
| ١ | یووسف سەلمان یووسف | «فەهد»، یان پرۆفیسۆر، یان حاج. |
| ٢ | زەکی بەسیم | زازیم[١٧٧]. |
| ٣ | محەمەد حسین شەبیبی | صارم. |
| ٤ | حسین تەها | صالح. |
| ٥ | عەبد تەمر | مەحموود. |
| ٦ | «مالیك سێف» | کەمال یان پرۆفیسۆر. |
| ٧ | مەلا شەریف | فوئاد. |

(176) Ibid, Appendix (N), Polit Bureau Appointed by the central Committe (early1944).

مەبەست لە «پۆلیت بیرۆ» یش «مەکتەبی سیاسی»یە.

(١٧٧) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Zazim".

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | سەمیر نادر | سەعید. |
| ٩ | ئیسماعیل ئەحمەد | نەصیر یان هەیکەل. |
| ١٠ | موسا نوور | سامی. |
| ١١ | محەمەد عەلی زەرقا | زیاد. |
| ١٢ | محەمەد عەلی شەبیبی | هاوار یان تەها. |
| ١٣ | عەبدولوەهاب عەبدولرەزاق | ئەدهەم |
| ١٤ | حسقێل صدیق | شجاع. |
| ١٥ | نافیع سەلیم | هەلەو. |
| ١٦ | جاسم حەموودی | مصعب. |
| ١٧ | صەبری عەبدولکەریم | عصام. |
| ١٨ | یوسف زەلوف | یاسم،[١٧٨] یان سالم |
| ١٩ | ئەدوارد ئێپهرایم[١٧٩] | هەشام[١٨٠]. |
| ٢٠ | عەبدولسەلام ئەلناصری | لەهاب[١٨١]. |
| ٢١ | عەبدوللەطیف سامر | ساعی. |
| ٢٢ | هادی تۆەین | مەهدی. |

[١٧٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Yasim".

[١٧٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Ephraim".

[١٨٠] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Hasham".

[١٨١] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Lahab".

| | | |
|---|---|---|
| ٢٣ | عەبدولحەسەن | هومام |
| ٢٤ | جاسم حەسەن | طارق. |
| ٢٥ | ناصر عەبود | جابر. |
| ٢٦ | میر یەعقوب کۆهین | جۆزێف. |
| ٢٧ | وارگیس سەرکیس گەرەبێت | صوبحی |
| ٢٨ | عەبدولهادی عەبدولرەضا | سالم. |
| ٢٩ | زەکی خەیری | سالم یان پرۆفیسۆر. |
| ٣٠ | کاظم مەلا خەلیفە | جاسم. |
| ٣١ | ستیڤان سێتراك، یان سێتراکیان | سال[١٨٢]»[١٨٣]. |

(١٨٢) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "Sal".

(183) N.A.,F.O., 3.71/75131, History of Malik Saif ……,Top Secret, Appendix (P), Party Pseudonym.

# حیزبی شیوعیی عیراقی و کرێکاران

پاشکۆی ژمارە «ن» بۆ ناوی ئەو کەسانەی «یەهودا ئیبراهیم صدیق» کردوونییە بەرپرسی نەقابە کرێکارییە سەرەکییەکان تەرخان کراوە. شایانی باسە گشت ئەو کەسانەی «یەهودا» پێشنیازی کردوون یان ئەندامی «حیزبی شیوعیی عیراقی» یان ئەندامی «حیزبی تەحەڕوڕ» بوون و مێژووی ئەو بڕیارەش نەزانراوە، بەڵام وەها پێدەچێت لە نێوان مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ و ناوەندی ساڵی ١٩٤٧دا بووبێت، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو خشتە تایبەتییەیە:

«١- نەقابەی کرێکارانی سکەك:

«عەلی شکور» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

«عەبدولحەمزە» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

«حەسانی کوڕی عەلی» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

٢- نەقابەی کرێکارانی چاپ:

«محەمەد ئیسماعیل» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

« عەلی تۆفیق شەهرەبیللی» «هیچی لە لاوە نەنووسراوە».

«هادی» «ناوی باوکی نەنووسراوە و هیچیشی لە لاوە نەنووسراوە».

٣- نەقابەی پێڵاو درووان:

«سالم مەنشی» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

«کەریم صەفار» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

«ئەنوەر» (ناوی باوکی نەنووسراوە) «حیزبی شیوعیی عیراقی».

٤- نەقابەی پۆستە و تەلەگراف:

سەلمان وادی «حیزبی شیوعیی عیراقی».

«قەرەغول»ی «ناوی باوکی نەنووسراوە» «حیزبی شیوعیی عیراقی».

٥- نەقابەی بەرگدرووان:

«موشی» «ناوی باوکی نەنووسراوە» «حیزبی شیوعیی عیراقی» (١٨٤).

---

(184) Ibid, Appendix (R), List of persons, named by Yahoda Ibrahim Siddiq, who were either Members of Taharrar Party alone, or in addition Members of the I.P.C. and who worked in trade unions.

شایانی گوتنە خەباتی بێ وچانی کرێکارانی عەرەب و کورد و کەمینەکانی وڵات بە ڕەهبەریی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بووە هـۆی لـەدایکبوونی داسـتانی گـەورەی وەك «گاوربـاغی» لـە «کەرکووك» لە ساڵی ١٩٤٦دا، وێڕای ئەوەی بزووتنەوەی نەقابیی عیراقیش هـەنگاوی باشـی لەم بوارەدا نا، وەها دیارە بەڵگەنامە نهێنییەکانی «حوکمەتی عیراقـی»ش پـڕن لـە بەڵگـەی سەلمێنەری ئەم بۆچوونە و لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ نوێترین بەرهەمی زانسـتیی دوکتـۆر «عـادل تـەقی بەلـداوی» بکـەم کـە بـەم ناونیشـانە: سەرنجڕاکێشـەرە بـڵاوی کردۆتەوە:»تیشك بۆ سەر بزووتنەوەی نـەقابی لـە عیراقـدا. نەقابـەی کرێکـارانی کارگـەکانی جگەرە لە بەغدا وەك نموونە (بەڵگەنامەی ئاسایشی نوێ)- «الدكتور عـادل تقـي البلـداوي»، أضواء على الحركة النقابية في العراق. نقابة عمال معامـل السـكاير في بغـداد النموذجـا «وثـائق أمنية جديدة»، بغداد، ٢٠٠٩، ٦٦ ص.

## ناوی بەرپرسانی حیزب ڕۆژگاری ڕەهبەریی «مالیك سێف»

دوا بەدوای ئەمە نۆرەی پاشکۆی ژمارە (س) دێت کە بۆ لیستی ناوی بەرپرسانی شانە و ڕێکخراوەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» ناوچەکان لە ڕۆژگاری ڕەهبەریی «مالیك سێف»دا تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو پاشکۆیەیە:

١- «کەرکووك»: «یوسف حەنا» و پاشان «نافیع سەلیم» «نافیع یونس؟»[١٨٥].

٢- «سلێمانی»: «ئەحمەد غەفور» و پاشان «حەمید» [١٨٦]کە ناوی خواستەنیی «صابر» بووە.

٣- «باقووبە»: «عەبدولحسەین عەبدولکەریم».

٤- «نافیع سەلیم» [١٨٧]و پاشان «عەزیز محەمەد « و پاشان «جەمال[١٨٨]حەیدەر ئەلحەیدەری».

٥- «مووسڵ»: «یوسف حەنا».

٦- «موسەیەب»: «ئەحمەد حەسوون».

٧- «حللە»: «محەمەد عەبدوللەطیف» و پاشان «جاسم محەمەد حلاوی».

٨- «نەجەف»: «عەلی شەبیبی» و پاشان «مورتەضا فەرەجوڵلآ» و «پاشان ڕەضا».

٩- «دیوانییە»: «عەبدولئەمیر کەریم» و پاشان «عەبدولهادی ئیبراهیم».

١٠- «کووت»: «عەبدولحسەین مەلا خەلیفە» و «عەزیز حاج» [١٨٩].

---

[١٨٥] دیارە لە ناوەکە دڵنیا نەبوون، بەڵام هەڵبەت «نافیع یونس» ناوە ڕاستەکەیە.

[١٨٦] دوور نییە مەبەستیان حەمید عوسمان بێت.

[١٨٧] دیارە دیسانەوە مەبەستیان نافیع یونسە.

[١٨٨] بە هەڵە جەمیل (Jamil) یان نووسیوە.

[١٨٩] لەبەر بەندیخانەی کووت «حیزبی شیوعیی عیراقی» هەمیشە بایەخێکی تایبەتیی بە شاری کووت داوە بۆیەکا لەوێ دوو بەرپرسی داناوە، بەڵام ئەوەی تایبەت سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە دوو کەسی کردۆتە بەرپرسی خۆی- عەرەبێك و کوردێکی فەیلی.

١١- «عەممارە»: «مووسا محەمەد نوور» و «پاشان عەبد عەلوان».
١٢- «ناصرییە»: «ڕەشید حسەین» «ئەفسەرێکی دوورخراوەیە» و پاشان «نووری جابر» و پاشان «مەنهەل».
١٣- «بەصرە»: «ئیسماعیل ئەحمەد» [١٩٠].

هەرچی پاشکۆی ژمارە «ت»یشە بۆ لیستی ناوی بەرپرسانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە ڕۆژانی ڕەهبەریی حیزبدا لە لایەن «مالیك سێف»ەوە تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش ناوەکانن:

| ژمارە | ناو | شوێنی کاری حیزبی |
|---|---|---|
| ١ | ئەنوەر محەمەد | دار المعلمین عالی |
| ٢ | حسەین ئەلوەردی | کۆلێجی پزیشکی |
| ٣ | صالح حەیدەر ئەلحەیدەری | کۆلێجی ئەندازیاری |
| ٤ | یوسف زەلوف | کۆلێجی ئەندازیاری |
| ٥ | کاظم عدبدولرە ضا | کۆلێجی ئەندازیاری |
| ٦ | عەزیز حاج | قوتابییان بە گشتی |
| ٧ | جاسم حەموودی | کرێکاران بە گشتی |
| ٨ | عەبدولسەلام | کرێکاران بەگشتی |
| ٩ | فوئاد بەهجەت | ناوچەی کەرخ |
| ١٠ | میر یەعقوب کۆهین | ناوچەی کەرخ |
| ١١ | مۆریس یەعقوب | باکووری «بەغدا» |
| ١٢ | جەودەت «جەودەت ئەحمەد ناجی؟» | باکووری «بەغدا» |
| ١٣ | ئیبراهیم صالح | باشووری «بەغدا» |
| ١٤ | مووسا نوور | باشووری «بەغدا» [١٩١]. |

(190) N.A.,F.O., 371/75131, History of Malik Saif …….,Top Secret, Appendix (S), Names of Cell or Organization Leaders in the provinces and During Malik Saif's Ladership of the Party.

پاشکۆی ژماره (یو) یش بۆ ئەو ناوانەی دوای گرتنی «یووسف سەلمان یووسف – «فەهد» لە ساڵی ١٩٤٧دا کراونەتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش لیستی ئەو ناوانەیە:

«١– نافیع سەلیم[١٩٢].

٢– جاسم حەموودی.

٣– عەبدولسەلام ناصری.

٤– ئیسماعیل ئەحمەد.

٥– عەبدولڕەزاق مەطەر.

٦– یوسف حەنا» [١٩٣].

---

(191) Ibid, Appendix(T), Malik Saif's trusted Lieutenants in Baghdad at before and during his leadership of the Party.

(١٩٢) دیارە مەبەستیی «نافیع یونس»ە.

(193) N.A.,F.O.,371/75131, History of Malik Saif ......., Top Secret, Appndix (U), Names of Members Aappointed to the Central Committee following the Arrest of Fahd of 1947.

## ڕەهبەرانی «پارتی دیموکراتی کوردستان»

«پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان» وەك ڕێکخراوێکـی چـەپڕەو و چـالاکیی کوردیی نوێ هەر لـە سـەرەتاوە، چ خـۆی و چ ڕەهبـەرە دیارەکـانی، گـەلێك سەرنجی دەزگا فەرمییەکانی «حوکمەتی بەریتانی» یان ڕاکێشاوە و ئەوەیش بـە شـێوازێکی خەسـتوخۆڵ لـە نێـو لاپـەڕەکانی بەڵگەنامـە نهێنییـەکانی «حوکمەتی بەریتانی»دا ڕەنگـی داوەتـەوە، تایبـەت ئـەو لایەنانـەیان کـە بـۆ باسی پێوەندییەکانی «پارتی» بە «یەکیـەتی سـۆڤیەت» و «حیزبـی شـیوعیی عیراقی» یەوە تەرخان کراون.

ئـەم لیسـتی نـاوەی لای خـوارەوەی ڕەهبـەرانی پـارتیش یەکێکـە لـەو بەڵگەنامە زووانە:

«پاشکۆی ژمارە «ڤ»»،

«ڕەهبەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان».

١- مەلا مستەفا «سەرۆکی هەڵبژێردراو».

٢-هەمزە عەبدوڵلا[١٩٤] «جێگری سەرۆك»

٣-عەونی یووسف.

٤-دوکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم.

٥- پارێزەر عومەر (ناوی تەواوی نەزانراوە)[١٩٥].

٦- عەبدولقادر ڕەشید[١٩٦][١٩٧].

---

[١٩٤] «هـەمزە عەبـدوڵلا» کـوردی «کوردسـتانی بـاکوور»ە، لـە سـاڵی ١٩٤٦دا «بـارزانی» لـە «مـەهاباد»ەوە ناردییـە «عـیراق» بـۆ دامەزرانـدنی «پـارتی»، هاوسـەرەکەی خوشـکی خوالێخۆشبوو مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» بوو.

[١٩٥] دیـارە مەبەسـت «عومـەر مسـتەفا»یـە کـە هـەر بـە «عومـەر دەبابـە» ناسـراوە، خـەڵکی «کۆیـە»یـە، «سورەیای مـەلای گـەورە» و خوشـکی خوالێخۆشـبوو «مەسـعوود محەمـەد» هاوسەری بوو، دەرچووی «حقوق» بوو، بەڵام خۆی بۆ کاری «پارتی» تەرخان کردبوو.

## ڕاپۆرتێکی کەم هاوتا دەربارەی ئارشاکی وێنەگر

لە بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمەدا گەلێك نموونەمان دەربارەی وردەکاریی بەڵگەنامە نهێنییەکانی «حوکمەتی بەریتانی» هێناوەتەوە، نموونەی یەکجار سەیر و چاوەڕوان نەکراوی ئەم بەرگەیشمان ئەم ڕاپۆرتە دوور و درێژ و چڕوپڕەیە دەربارەی یەکێك لە پێشەنگانی وێنەگرانی «عێراق» بە ناوی «ئارشاك»ەوە کە کەم وێنەگری بەناوبانگی دیکە دەیانتوانی شان لە شانی بدەن، وێنەگری کۆشك و گەورەپیاوان و ئەفسەران و کیژە شۆخەکانی «عێراق» بە ڕەگەز «ئەرمەنی» بوو، وا دیارە ئەوە پاڵی پێوە ناوە جۆرە مەیلێکی بەرانبەر «یەکیەتی سۆڤیەت» و «حیزبی شیوعیی عێراقی» هەبێت، ئەو دەنگوباوەی پاڵی ناوە بە دیپلۆماسییە «بەریتانییەکان»ەوە لە «عێراق» و خودی کاربەدەستانی «عێراق»یش بکەونە سۆراخی گشت هەڵسوکەوتەکانی «ئارشاك» و هەمەجۆر زانیاریی دەگمەن و وردی دەربارە کۆ بکەنەوە و ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەی ئەو زانیارییانەیە کە لە قوتووی هیچ عەتارێکدا چنگ ناکەون و باوەڕ ناکەم کەسێك لە توێژەران چاوەڕوانی بووبن:

«پاشکۆی ژمارە «دەبل یو»،

---

(١٩٦) «عەبدولقادر ڕەشید» «هەولێری»یە، ئەویش دەرچووی «کۆلێجی حقوق»ە و سەرەتا ئەندامی حیزبی «هیوا» بوو.

(197) N.A.,F.O.,371/75131, History of Malik Saif .......Top Secret, Appndix (V), Leaders of Kurdish Democratic Party (Data unknown).

شایانی باسە «پارتی دیموکراتی کوردستان» لە «ئێران» ساڵی ١٩٤٥ و لە «عێراق» ساڵی ١٩٤٦دامەزرێنرا.

**تێبینی دەربارەی وێنەگر ئارشاك،**

«ئارشاك یوسف یانیكان» «ئەرمەنی»یە، ساڵی ۱۹۰۲ لە «ئەدەنەی توركیا» لە دایك بووە، لە هەرەتیی لاوییدا هونەری وێنەگریی لە «توركیا» و «ئیتاڵیا» خوێندووە، ساڵی ۱۹۱٤ لە «توركیا»وە هاتووەتە «سووریا» و پاش ماوەیەك گەڕاوەتەوە «توركیا» و ساڵی ۱۹۲۱ دیسانەوە گەڕاوەتەوە «سووریا» و ئەمجارەیان ڕەگەزنامەی «سووری» وەرگرتووە، ساڵی ۱۹۲٥ بە پاسپۆرتی «سووری» هاتووەتە «عیراق» و لە «ستۆدیۆی عەبدولكەریم» كاری دەست كەوتووە و لە ساڵی ۱۹۲٦دا بۆ سەردانێكی كورت هاتووەتەوە «سووریا» و دوای ئەوە بە یەكجارەكی لە «عیراق» نیشتەجێ بووە، «ئارشاك» لە لایەن «ستۆدیۆی عەبدولكەریم»ەوە بە تاوانی دزی تۆمەتبار دەكرێت، بەڵام ئەو ببووە هاوڕێی «عەبووش» كە ئەویش ستۆدیۆی خۆی هەبوو و بووە شەریكی، وێڕای ئەوە «عەبووش» یاریدەی «ئارشاك»ی دا تاوەكو بتوانێت خێزانی «لە سووریاوە– ك.م.» بهێنێتە «بەغدا». پاش ماوەیەك «ئارشاك» ستۆدیۆیەكی لەسەر حیسابی خۆی كردەوە و خوشكەكەشی لە ستۆدیۆكەدا یاریدەی دەدا، «ئارشاك» زۆر بە خێرایی لە كارەكەیدا سەركەوت و بووە «وێنەگری كۆشك « و دوایی وەك وێنەگری تایبەتیی «فەیسەڵی یەكەم» لەگەڵیدا چووە «ئێران» و ڕۆژی بیست و شەشی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹٤۰ ڕەگەزنامەی عیراقی وەرگرت.

وەها دیارە «ئارشاك» زۆر خێرا بووەتە جێگەی بڕوای كاربەدەستانی وڵات و بۆ خۆی ئیدیعای دەكرد كە بێ ئەندازە جێگەی بڕوای كاربەدەستانە، دوور نییە لەو قسەیەدا كەمێك زێدەڕۆیی هەبێت، چونكە وەك دەیگوت گەلێك بابەتی بایەخدار لە وجوودی ئەودا عەرز دەكرێن، وێڕای ئەوەی دەیگوت ژمارەیەكی زۆر هاوڕێی لە نێو ئەفسەرە گەورەكانی سوپادا هەیە، وەهایش پێدەچێت ئەو زانیارییانەی بە پارە فرۆشتبێت یان بە حوكمەتی «ئێران»ی، یان بەو «ڕووس»انەی لە «ئێران» دەژین، ئەوە بە تەواوەتی نەزانراوە. دەشڵێن لە ماڵەكەی خۆیدا لە «گەڕەكی سەعدوون» بێتەل «لاسلكی»ی

هەبووە، دەشڵێن پێوەندی بە دوو کەسەوە هەیە، کە گوایە کۆمۆنیستن، یەکەمیان «ڕەشید عارف»ە[(١٩٨)]، ئەوی دیکەیشیان «یارود نەفیسار بەرسومیان»ە[(١٩٩)]کە دیارە ئەویش وەك «ئارشاك» خۆی «ئەرمەنی»یە، دەڵێن «بەرسۆمیان»ی هاوەڵی «ئارشاك» ئەندامی کۆمەڵەیەك بوو بە ناوی «پارتی ئەینچاك»ەوە، یان بە پێی ڕاپۆرتی دیکە ئەندامی «پارتی ئەینچاك»ی «شیوعیی یەریڤان» بووە[(٢٠٠)]. هەمان کات «بەرسومیان» گومانی ئەوەی لێ دەکرێت کە بە کاری قاچاغی تلیاکەوە خەریك بێت.

«ئارشاك» بۆ ماوەیەك بەر لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤١ لە کاری وێنەگریی کۆشك دوورخرایەوە، بەڵام بە پێی ڕاپۆرتێك وەها دیارە دوایی خراوەتەوە هەمان پۆست، گومانیش لەوە دەکرێت کە «ئارشاك» لە ڕێگەی بەرتیلەوە ئەو گێڕانەوەیەی جێبەجێ کردبێت، «ئارشاك» وێنەی جموجووڵە «بەریتانییەکانی» «بە نهێنی —ك.م.» دەگرت بۆیەکا چاودێری خرابووە سەر. بەهۆی ئەو موراقەبەیەوە بەوە زانرا کە «ئارشاك» پێوەندی بە چەند کەسێکی وەك ئەمانەوە هەیە– ئەرمەنییەك بە ناوی «گەرەبێت»ەوە

---

(١٩٨) «ڕەشید عارف» خەڵکی «کۆیە»یە، ئەندازیارێکی ناسراو بوو، سەرەتا لە دایەرەی ئەشغالی «هەولێر» کاری دەکرد، دوایی هاتە «بەغدا» و بە قۆنتەراتەوە خەریك بوو، بارەگای «بانکی ڕافیدەین» لەسەر «شەقامی ڕەشید» ئەو دروستی کرد و بەهۆی کەوتنە خوارەوەی لەکاتی ئەو کارەیدا قاچی سەقەت بوو، خوالێخۆشبوو لەناو خەڵکیدا خۆشەویست بوو، قسەی نەستەق بوو، هەستی «کوردایەتی» بەهێز بوو، پێوەندی نیزیکی لەگەڵ گەورە پیاوی وەك «کامیل چادرچی»دا هەبوو، بەڵام نەمبیستووە شیوعیی بووبێت، بە پێچەوانەوە بە پێی قسەی ئەو کەسانەی لە نزیکەوە دەیانناسی ڕقی لە شیوعییەت دەبۆوە.

(١٩٩) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوی بەم جۆرە هاتووە: "Yaroud Nafisar Barsomyan" کە دیارە ئەویش وەك «ئارشاك ئەرمەن»ی بووە.

(٢٠٠) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

"The latter was described as a fellow member of Arshak's in Society known as the (Anhijak) party, or as another report says the "Hanchak" Communist Party of Erivan".

لەگەڵ خوشکەکەی و دوکتۆرێك بە ناوی «موگیردیچیان»ەوە[٢٠١]، وێڕای چێشتکەرێك و کارمەندێکی دیکەی «کۆمپانیای گواستنەوەی تورووسی تورکی»، هەروەها دوو ئەرمەنیی دیکە، «یازماندجیان»[٢٠٢]، کە لە (؟)« La Mode Parisiennce» لەگەڵ برای «ئارشاك»دا کاری دەکرد، سەرباری ژمارەیەك ناوی دیکەی وەك «عەبدولکەریم قاوەچی»[٢٠٣] و کارمەندێکی «کۆمپانیای گواستنەوەی بیابان»[٢٠٤] و «تۆفیق سالح» و «کازم عەبادی» و «فایەق تۆفیق»ی کۆنە موتەسەریف و «عەلی ئاغا»ی ژمێریار لە موفەوەزییەتی ئێرانی لە «بەغدا» و بازرگانێکی جلی فەردە بە ناوی «سوورێن سەلیبیان»ەوە. گومان هەبوو لە گشت ئەم کەسانە کە ئەندامی ئەم رێکخراوە بن کە ئارشاك دایمەزراندووە بۆ گرتنی وێنە لە ناوچە جیاجیاکانی ولآتدا تاوەکو لە رێگەی «تورکیا»وە بیاننێرێت بۆ «ئەڵەمانیا». فرۆکەوانێکی هێزی ئاسمانیی عیراقیش بە ناوی «کازم عەبادە»وە بینراوە چۆن بە نهێنی چووەتە ستۆدیۆکەی ئارشاك و تەنها «ئەرمین»ی برای ئارشاك ناوەرۆکی ئەم جۆرە دیدەنییانەی چاپ دەکرد.

دەشڵێن ئارشاك لە رێگەی «بەصرە»وە هەواڵەکانی پێدەگات، دەشڵێن ئارشاك پێوەندیی بە «لیما پاشا»[٢٠٥] ناوێکەوە هەیە کە یەکێکە لە رەهبەرانی «داشناق» لە «مووسڵ» و بە پێی راپۆرتەکان پیاوی ئەڵەمانەکانە.

مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٢ «ئارشاك» داوای ڤیزەی کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ «وەصی»دا بچێتە بەرەکانی رۆژئاوای جەنگ، بەڵام ئەو لەگەڵ

---

[٢٠١] ناوی لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە (Mugirdichian) کە دیارە ئەویش ئەرمەنی بوو.

[٢٠٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوی بەم جۆرە نووسراوە : "Mugirdichian" دیارە ئەمەش ئەرمەنی بووە.

[٢٠٣] لەدەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی بەم جۆرە نووسراوە: "Abdul Karim Qewachy".

(204)"Trans – Desret Company".

(205)"Lima Pasha".

دەستە و دایەرەی فەرمیی «وەصی»دا نەڕۆیشت، بەڵکو بە جیا چووە «سووریا»، چونکە لە حەڵەب کچە ئەرمەنییەکی هێنا بە ناوی «لوسین میلاتباچین»ەوە کە هیچ دژی نەزانراوە بۆیەکا وەها پێدەچێت چونەکەی بێ مەبەستی تایبەتیی بووبێت[٢٠٦].

مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٤٣ «ئارشاك» و «ئەلبێرت سەرکیس فەرجیان»ی یاریدەری جارێکی دیکە لەگەڵ کارمەندانی کۆشکدا چوونە سەردانی میسر و گومان دەکرێت ئارشاك لەوێ وێنەی نهێنیی گرتبێت. مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٤ ئەم زیارەتە بۆ «میسر» دووپات کرایەوە و ئارشاك ئەمجارەیان ئەڵماسێکی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە لە گومرگ پێیان گرت، بەڵام دوایی دایانەوە، هەرچۆن بێت ئارشاك لە کاری وێنەگریی کۆشك دوور خرایەوە.

مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٥ ئارشاك چووە زیارەتی موفەوەزییەتی تازە کراوەی «ڕووسیا» «لە «بەغدا»—ك.م.» و پێشنیازی کرد بە خۆڕایی وێنەی ناوەوەی بارەگاکەی بگرێت، ئەو پێشنیازەی «ڕووسەکان» پەسەندیان کرد و مانگی مایسی هەر ئەو ساڵەیش چووە «شام» بۆ زیارەتی کەسوکاری هاوسەرەکەی و بۆ تەداوی.

دوای ئەوە تاوەکو مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٤٧ هیچ دەنگوباوێکی ئارشاك لە ئارادا نەبوو، بەڵام لەو ساڵەدا وەك وێنەگری کۆشك زیارەتی «ئینگلتەرە»ی کرد، وەها پێدەچێت پۆستەکەی جارانی لە کۆشك وەرگرتبێتەوە.

دیارە کارمەندی «هەواڵنێری تاسە» لە بیرۆی نوێی «سۆڤیەت»یدا «لە «بەغدا»—ك.م.» چووە زیارەتی ستۆدیۆکەی «ئارشاك» و لە مانگی نیسانی

---

[٢٠٦] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە داڕێژراوە:
"As he was married in Allepo, at about this time to an Armenian girl called Millatbachinn, against whom nothing is known, his journey may have had no securiby interest".

هەر ئەو ساڵەیشدا «مادام سەفارۆف»ی هاوسەری «ئەرکادی سەفارۆف»ی کارمەندی موفەوەزییەتی «سۆڤیەتی» «لە «بەغدا»—ك.م.» زیارەتی ستۆدیۆکەی ئارشاکی کرد»(۲۰۷).

پاشکۆی ژمارە «ئێکس»یش لەو پاشکۆیەی بۆ ئارشاکی وێنەگر تەرخان کرابوو کەمتر سەرنجراکێشتر نییە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو پاشکۆیەیە:

«پاشکۆی ژمارە «ئێکس»»،

### تێبینی دەربارەی ئارپێت زۆرا ئیسکەندەریان

"ئاربێت زۆرا ئیسکەندەریان» کە کوڕی «زۆرا ئیسکەندەریان»ی «ئەرمەنیی» خاوەن دووکانێکە لە «کەرکووك» و بە پێی ڕاپۆرتەکان گومانی لێ دەکرێت کە لە ساڵی ۱۹۲۹ — ۱۹۳۰ دا سیخوڕی «ڕووس» بووبێت. «ئارپێت» لە لایەن «عەبدولڕەزاق شێخلی»یەوە کرایە بەڕێوەبەری سینەمای «دار السلام» لە «بەغدا». «ئارپێت» لە موفەوەزییەتی بازرگانیی ڕووسی «لە عێراق— ك.م.» فیلمی «ڕووسی» دەکڕی بە «دووسەد دینار» و جارێکیان سینەمای ناوبراو لەسەر ئەوەی زوو زوو فلیمی «ڕووسی» نیشان دەدا بۆ ماوەی مانگێك داخرا، بەڵام وەك دەڵێن «ئارپێت» بە هۆی ئەو دەعوەتە زۆرانەوە کە بۆ بەرپرسانی ساز دەکردن جارێکی دیکە نەیهێشت سینەمای «دار السلام» دابخرێت. لە مانگی مارتی ساڵی ۱۹٤۸دا «ئارپێت» چووە «مووسڵ» و لەوێ پارەی بەسەر کۆمۆنیستەکانی ئەو شارەدا دابەش کرد و بۆ ڕۆژی دوای ئەوە لە «مووسڵ» خۆنیشاندان دژی پەیمانی «ئینگلیزی — ئوردونی» هەڵگیرسا.

---

(207) N.A.,F.O.,371/75131, History of Malik Saif ......., Top Secret, Appendix (W), Notes on the Photographer Arshak.

مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٨ ئارپێت دوور خرایەوە سووریا بە تۆمەتی کاری سیخوڕی بۆ موفەوەزییەتی «سۆڤیەتی» لە «عیراق» (٢٠٨).

## دەربارەی لە سێدارەدانی «فەهد» و هاوەڵەکانی

شایانی باسە «حیزبی شیوعیی عیراقی» زوو زوو شفرە نهێنییەکانی خۆی دەگۆڕین، لەگەڵ ئەوەیشدا دوژمنە کاربەدەستەکانی کۆمۆنیزم لە وڵاتدا توانییان زەفەر بە حیزب بهێنن و گورزی توند بە «حیزبی شیوعیی عیراقی» بگەیێنن بەر لە سێدارەدانی «فەهد» و هاوەڵەکانی و بەندکردنی سەد و دوو کەس کە تەنها دوازدە کەسیان ئازاد کران و هەشت کەسیشیان جۆری حوکمەکانیان نەگوتراون وەك لە پاشکۆی ژمارە (ڤ)ی هەمان دیراسەتدا ئاماژەی بۆ کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقەکەیەتی:

| ژمارە | ناو | جۆری حوکم |
|---|---|---|
| ١ | یووسف سەلمان یووسف | لە سێدارەدان |
| ٢ | زەکی محەمەد بەسیم | لە سێدارەدان |
| ٣ | محەمەد حسەین شەبیبی | لە سێدارەدان |
| ٤ | یەهودا ئیبراهیم صدیق | لە سێدارەدان |
| (هەر چواریان ڕۆژانی چواردە و پازدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩بە ئاشکرا لە سێدارە دران). | | |
| ٥ | عەزیز ئەلحاج عەلی حەیدەر «عەزیز حاج» | موئەبەد |
| ٦ | جەودەت ئەحمەد ناجی | موئەبەد |
| ٧ | میر یەعقوب کۆهین | موئەبەد |

(208) Ibid, Appendix (X), Note on Arpet Zora Iskandarian.

| | | |
|---|---|---|
| ٨ | کاظم مەلا خەلیفە | پازدە ساڵ حوکمی قورس و پێنج ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا[٢٠٩] |
| ٩ | جاسم حەموودی | پازدە ساڵ حوکمی قورس و پێنج ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا. |
| ١٠ | حەسانی کوڕی عەلی | پازدە ساڵ حوکمی قورس و پێنج ساڵیش لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا |
| ١١ | عەزیز محەمەد | پازدە ساڵ حوکمی قورس و پێنج ساڵیش لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا |
| ١٢ | عەبدولسەلام عەبدولعەزیز | پازدە ساڵ حوکمی قورس و پێنج ساڵیش لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا |
| ١٣ | یوسف مەنشی یوسف زەلوف | پازدە ساڵ حوکمی قورس |
| ١٤ | حسقێل هاروون حسقێل | دە ساڵ حوکمی قورس و سێ ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا. |
| ١٥ | ئیسماعیل محەمەد حەکاک | دەساڵ حوکمی قورس و سێ ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا. |
| ١٦ | عەبدولهادی عەبدولرەضا | دە ساڵ حوکمی قورس و سێ ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا. |
| ١٧ | عەزیز سپاهی «یان ئیسپاهی؟» [٢١٠] | دە ساڵ حوکمی قورس و سێ ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا. |

[٢٠٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو سێ ژمارەیەی جۆری حوکمەکان بەم جۆرەی لای خوارەوە لێکدراونەتەوە:

R.I= Rigorous Imprisonment بەندکردنی قورس

S.I.= Simple Imprisonment بەندکردنی سووک

P.S.= Police Sarveillance خستنە ژێر چاودێریی پۆلیسەوە

[٢١٠] عەزیز سپاهی دروستە نەک ئیسپاهی.

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | یوسف حەنا شێر | دە ساڵ حوکمی قورس |
| ١٩ | ئەحمەد حەسون | دە ساڵ حوکمی قورس |
| ٢٠ | محەمەد عەبدوللەطیف | دە ساڵ حوکمی قورس |
| ٢١ | جاسم محەمەد حلاوی | دە ساڵ حوکمی قورس |
| ٢٢ | زەکیی مەلا خەلیفە | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٣ | هاشم عەبدوڵلا ئەربیلی | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٤ | نووری سەلمان | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٥ | ڕۆبێن یەحیا | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٦ | طاریق عەبدولکەریم | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٧ | ناجی سایۆن خەلاشی[٢١١] | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٨ | یەعقوب مەنشی ئیبراهیم | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٢٩ | نەعیم یوسف ئیسحاق شارەبانی | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٣٠ | نەعیم ساڵح سەلمان | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٣١ | فاضل جاسم | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |

[٢١١] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی وەها هاتووە: Naji Saeon Khalashi

| | | |
|---|---|---|
| ٣٢ | ناجی سایۆن | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٣٣ | خالید ئەحمەد | حەوت ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٣٤ | ئیسماعیل ئەحمەد | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٣٥ | کاظم عەبدولرەضا | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٣٦ | ئەدوارد یووسف | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٣٧ | ئەحمەد عەلوان | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٣٨ | ناجی شائول | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٣٩ | ڕەضا مووشی | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٤٠ | وارکیس سەرکیس گەڕەبێت | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٤١ | ئێلین یوسف | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٤٢ | بەهنام تۆماس شەمماس | حەوت ساڵ حوکمی قورس |
| ٤٣ | داود نەمۆ[٢١٢] | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٤٤ | فوئاد ئێلیاس | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٤٥ | یەعقوب یوسف عەبدوڵلا | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٤٦ | ئەلیاهو خەضوری شیرازی | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٤٧ | یوسف داود | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |

[٢١٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی وەها هاتووە: Da'ud Na'mo لەوانەیشە داود نەعمۆ بێت.

| | | |
|---|---|---|
| ٤٨ | عەزیز شائول | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٤٩ | هاشم ئەحمەد | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥٠ | ئیبراهیم داود | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥١ | میخائیل حەنا | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥٢ | حەمید حەمدی مەحموود | پێنج ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥٣ | شاکیر حاجی فەیاض | پێنج ساڵ حوکمی قورس |
| ٥٤ | عەبدولحسەین عەبدولکەریم | پێنج ساڵ حوکمی قورس |
| ٥٥ | گریگۆر پیدرۆسیان | پێنج ساڵ حوکمی قورس |
| ٥٦ | ئەنترانیك سێتراك «یان سێتراکیان» | سێ ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥٧ | ستیڤان سێتراك «یان سێتراکیان» | سێ ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥٨ | شەمشوون پیرە[٢١٣] | سێ ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٥٩ | ئارام بۆغۆص | سێ ساڵ حوکمی قورس و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٦٠ | عەبدولحسەین عەبدولجەلیل | سێ ساڵ حوکمی قورس |
| ٦١ | حەسەن محەمەد زەهاوی | سێ ساڵ حوکمی قورس |
| ٦٢ | کەمال حەمید | سێ ساڵ حوکمی قورس |

[٢١٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی بەم جۆرە هاتووە: Shamshun Pira.

| | | |
|---|---|---|
| ٦٣ | عەبدولرەحیم جەودەت | سێ ساڵ حوکمی قورس |
| ٦٤ | شاول سایۆن شارەبانی | سێ ساڵ حوکمی قورس |
| ٦٥ | مووسا جەعفەر | سێ ساڵ حوکمی قورس |
| ٦٦ | فەیصەڵ ناصر | دوو ساڵ حوکمی قورس و ساڵێکیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا |
| ٦٧ | ساڵح عەبدوڵلا صوفەیر[٢١٤] | دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٦٨ | ئەنترانیك جۆهانین «یان ئۆهانیان؟» | دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٦٩ | گەرە پێت هاریتۆن | دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٧٠ | کەریم سایۆن | دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٧١ | ساڵح حاجی باقر ئەبوتمەن | یەك ساڵ حوکمی قورس |
| ٧٢ | دایم ئوێنی | یەك ساڵ حوکمی قورس |
| ٧٣ | عەبدولجەبار عەبدوڵلا ئەلبێروتی | یەك ساڵ حوکمی قورس |
| ٧٤ | غەضبان مەردان ئەلسەعد | یەك ساڵ حوکمی سووك |
| ٧٥ | ئەلفرێد سەمعان[٢١٥] | یەك ساڵ حوکمی سووك |
| ٧٦ | عەبدولجەبار ناجی | یەك ساڵ بنێردرێتە قوتابخانەی ئیسلاحی[٢١٦] |

[٢١٤] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی بەم جۆرە هاتووە: Salih Abdullah Sofair

[٢١٥] ئەلفرێد سەمعان، کە دیارە گاورە، ماوە و پێموایە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ئێستای «حیزبی شیوعیی عیراقی»یە، دوای کەوتنی ڕژێم بە ماوەیەکی کورت «یەکیەتی نووسەرانی عیراقی» کۆڕێکی ساز کرد، منیش بانگ کرابووم، لە لێدوانێکی خۆمدا چەند لایەنێکی ژیانی یەکیەتی سۆڤیەتم نیشان دا کە بە چاوی خۆم دیبوومن، هاوڕێ ئەلفرێد سەمعان زۆر بە تووڕەیی وەڵامی دامەوە، بەڵام دوکتۆر جەمیل نصەیف، کە ئەویش دەرچووی یەکیەتی سۆڤیەتە و پیاوێکی چەپڕەو و گەلێك کتێبی بە نرخی لە ڕووسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زوبانی عەرەبی و مامۆستایەکی ناسراوی ئەدەبە لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدا، بەگەرمی پشتگیریی لێ کردم.

[٢١٦] دیارە لەبەر ئەوەی تەمەنی لە هەژدە ساڵان کەمتر بووە.

| | | |
|---|---|---|
| ٧٧ | مووسا خەضوری | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٧٨ | شەفیق ئێلیاهو هۆریش[٢١٧] | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٧٩ | یەهودا خەضوری حوری | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٠ | حۆریس سایۆن | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨١ | سەلمان خەضوری عزرا | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٢ | ناجی صاڵح سەلیم | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٣ | عزرا مەنشی | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٤ | یەهودا حسقێل | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٥ | سایۆن شائول حەکاك | ٥٠٠ دینـاری کـاش بارمتـە یـان دوو ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٦ | عەبدوللەتیف ئەلحاج عەلی حەیدەر «لەطیف حاج» | ٢٠٠ دیناری کـاش بارمتـە یـان یـەك ساڵ حوکمی قورس |
| ٨٧ | عەمانوئێل ئەسکەندەر | ئازاد کرا |
| ٨٨ | عۆدە کەریم | ئازاد کرا |
| ٨٩ | حەسان عەباس کەرادی | ئازاد کرا |
| ٩٠ | سەلام صاڵح سەلمان | ئازاد کرا |

[٢١٧] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە ناوی هاتووە: Shafiq Eliahu Harish.

| | | |
|---|---|---|
| ٩١ | جەمیل مەنشی | ئازاد کرا |
| ٩٢ | عەلی محەمەد | ئازاد کرا |
| ٩٣ | جەمال محەمەد | ئازاد کرا |
| ٩٤ | ئیسماعیل عەباس ئەلقەیسی | ئازاد کرا |
| ٩٥ | مەنشی ئیسماعیل | ئازاد کرا |
| ٩٦ | حسەین تەها محەمەد یان «حسەین حاجی تەها» | ئازاد کرا |
| ٩٧ | صامۆئیل هانوکە(٢١٨) | ئازاد کرا |
| ٩٨ | صالّح مەهدی | ئازاد کرا |
| ٩٩ | ڕەشید ئیسماعیل باجەلان | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠٠ | فلامەرز نەصنەر زەینەڵ | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠١ | عەبدولکەریم ڕەفیق | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠٢ | ئەنوەر عەبدوڵلا | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠٣ | ئەحمەد عەبدولڕەحمان ئەلتەمیمی | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠٤ | حەیدەر سلێمان | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠٥ | کاظم محەمەد | حوکمەکەی نەگوتراوە |
| ١٠٦ | ئەدوارد یووسف ئەلیاهو «یان ئەدوارد یوسف؟» | حوکمەکەی نەگوتراوە |

تێبینی:

ژمارەیەك لەم ناوانە بەر لە ئێستا لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژەیان بۆ نەکراوە، لەوانەیە دواتر تێکەڵی هەمان کار بووبن، بەرانبەر بەوانیش کەسانێکی ناسراو هەن کە حوکم دراون بەڵام ناویان لەم لیستەیەدا نییە، بۆیەکا لەم ڕووەوە لیستەکە ناتەواوە. لەوانەیە «مالیك سێف» عەفوی بۆ دەربچێت»(٢١٩).

(٢١٨) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکەی بەم جۆرە هاتووە: Samuel Hanuka.

(219) N.A.,F.O.,317/75131, History of Malik Saif…., Top Secret, Appendix (V), sentences.

## له سێدارەدانی ساسۆن دەلال



١٩٤٨/٢/١٢ الموقف العام -بغداد- من يمين الناظر الواقفون: الشهيد ساسون دلال، المحامي محمود صالح السعيد - عضو الهيأة المؤسسة لحزب التحرر، عبد اللطيف هاشم السعدي، رشيد بكتاش، عبد الحسين.....، المحامي الشهيد توفيق منير، المحامي الشهيد كامل قزانجي، علي الشيخ محمد الشبيبي، موسى شائول، جاسم الجبوري. الجالسون: الياهو حبيب، هاشم الواسطي، فيصل مهدي.

هەرچی لە سێدارەدانی «ساسۆن دەلال»ە چلوپێنج ڕۆژ دوای لە سێدارەدانی «فەهد» و هاوەڵەکانی جێبەجێ کراو بەم جۆرەی لای خوارەوە «بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی» ئەو بابەتەی بۆ پاراستووین:

«بە شفرە،

لە «بەغدا»وە بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

«سێر هـ. ماك».

ژمارە ٤١٤،

٧ی مایسی ١٩٤٩،
وێنەی لێ دراوەتە:
«قاهیرە» و «مۆسکۆ»،
تایبەتی،
نهێنی.

١- نیشانە بە برووسکەی وەزارەتی هەندەرانی ژمارە ٤١٤ی ڕۆژی حەوتی مایسی «ساڵی ١٩٤٩- ك.م.» کە وێنەی لێ دراوەتە قاهیرە و مۆسکۆ و برووسکەی ژمارە ١٤٠ی خۆم دەربارەی شیوعییەکان.

لە «تریڤیلیان»ەوە.

«حوکمەتی عیراقی» بەیاننامەیەکی دەرکرد دەربارەی ئەوەی بڕیاری لە سێدارەدانی «دەلال» لە لایەن دادگایەکی سەربازییەوە بە پێی یەکێك لە خاڵەکانی بەندی یەکەمی یاسای ساڵی ١٩٣٨ی سزاکانی قانونی عقوباتی «بەغدا»دی دەرچووە دوای ئەوەی سەلمێنرا کە «ساسۆن دەلال-ك.م.» پێوەندیی لەگەڵ ڕێکخراوێکی گێرەشێوێنەری پێوەندیداری بە سوپاوە هەبووە، وێڕای پێوەندییەکانی بە هێزە چەکدارەکانی میرییەوە ویستوویەتی ئەو هێزانە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی ڕێکخراوی ناوبراو هان بدات. هەروەها ئاماژەیش بۆ ئەوە کراوە کە تۆمەتی کۆمۆنیستی یان گێرەشێوێنەر «لەم بوارەدا نەدراوەتە پاڵ ساسۆن دەلال -ك.م.» چونکە پتر لە بەڵگەیەکی ئەم بۆچوونە لە ناو هێزەکانی سوپا و پۆلیسدا بە دەستەوە نییە.

٢- هەرچەندە ئەمە وەك ئێمە دەمانویست بەیاننامەیەکی زۆر ڕوون نییە، بەڵام ئێمە ناتوانین شتێك زۆرتر لەوەمان چنگ بکەوێت. ئەم دادگاییەی «ساسۆن دەلال-ك.م» وەك دادگاییەکانی دیکەی بەر لە خۆی لە لایەن دادگاییەکی سەربازییەوە بە نهێنی سازکرا و هیچ ئاگادارییەکی دیکە لە لایەن حوکمەتی عیراقەوە بڵاو نەکراوەتەوە، یان بە ئێمە نەدراوە.

تکا لە وەزارەتـی هەنـدەران دەکـەین وێنـەی ئـەم نامەیـە و برووسـکەی ژمارە نۆم بنێرێت بۆ «مۆسکۆ» [٢٢٠].

شایانی باسـە ئێزگـەی «لەنـدەن» دوو جـار نـاوەڕۆکی بەشـی زۆری ئـەم نامەیەی سەرەوەی هەمان ڕۆژی حەوتی مانگی مایسـی سـاڵی ١٩٤٩ ی بـڵاو کردۆتەوە» [٢٢١].

دوا بەڵگەنامـەی نـاو هـەمان فایـل دەربـارەی لـە «سـێدارەدانی ساسـۆن دەلال» ە و ئەمەی لای خوارەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«لە «بەغدا»وە،

وەزارەتی هەندەران،

«سێر هـ.ماك» ،

ژمارە ٤٩٨،

٢ی حوزەیرانی ١٩٤٩،

وێنەی بۆ:

«مۆسکۆ» و «قاهیرە» .

نیشـانە بـە برووسـکەی ژمـارە ٤٩٨ی ڕۆژی دووی مـانگی حـوزەیرانی «ساڵی ١٩٤٩–ك.م.» کە وێنەی لێ دراوەتە «مۆسکۆ» و «قاهیرە»، هـەروەها نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٤١٤ی خۆم دەربارەی شیوعییەکان.

بە پێی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەکانی ڕۆژی سی و یەکی مانگی مایسی «ساڵی ١٩٤٩_ك.م» «ساسۆن دەلال» لە بەندیخانەی ناوەندیی «بەغدا» لـە سـێدارە درا، بێ ئەوەی تەرمەکەی نیشانی جەماوەر بدرێت.

تکا لە وەزارەتـی هەنـدەران دەکـەین کـە وێنـەی ئـەم نامەیـەمان بداتـە «مۆسکۆ» ، لەگەڵ برووسکەی ژمارە دە مدا» [٢٢٢].

---

[220] Ibid, From Baghdad to Foreign Office, Sir A. Mark, No. 144,7 may, 1949, Reported to Cairo and Moscow, P.42.

[221] Ibid, P.43.

## دەنگدانەوەی لە سێدارەدانی ڕەهبەرانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»



فهد و زەکی بسیم
بەر لە اعدام

لە سێدارەدانی «فەهد» و هاوڕێکانی دەنگێکی گەورەی لە ڕۆژئاوا و تایبەت لە بەریتانیا دایەوە، ئەو ڕاستییەی یەکسەر بووە بابەتێکی سەرنجڕاکێشی بەڵگەنامە نهێنییە بەریتانییەکان. فایلی ژمارە ٣٧١/٧٥١٣٠ی وەزارەتی هەندەرانی «حوکمەتی بەریتانی» کە لە چل و حەوت لاپەڕە پێکهاتووە سەرجەمی بۆ ئەو بابەتە تەرخان کراوە(٢٢٣) و وا لێرەدا پوختەی بەڵگەنامە دەگمەنەکانی ئەو فایلە پێشکەش دەکەین و بەم برووسکەیەی ڕۆژی ١٤ی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ی باڵوێزی بەریتانی لە «بەغدا» دەست پێدەکەین کە ناردوویە بۆ «لەندەن» و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«ئەم برووسکەیە بە شێوازێکی تایبەتی نهێنییە،

لە «بەغدا»وە،

بۆ:

---

(222) Ibid,P.47.

(223) N.A., F.O., 371/75130, This Telegram is of particular secrecy and should be retained by the authorised recipient and not passed on, cypher, From Baghdad to Foreign Office, Sir H. Mark, No.150, 14th February, 1949, Repeated to Cairo, Beirut, Damascus, Moscow, Important, Secret.

«وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی» بە شفرە،
ژمارە١٥٠،
١٤ی شوباتی ١٩٤٩،
وێنەی بۆ:
«قاهیرە» و «بێروت» و «دیمەشق» و «مۆسکۆ»،
بایەخدار،
نهێنی،
نیشانە بە نامەی ژمارە إی، ٩٣/١٠١١٠/٥٨٢،
٨ی شوبات،
دەربارەی دادگاییکردنی شیوعییەکان.

١- «یووسف سەلمان یووسف - «فەهد» و «حەمەد حسەین شەبیبی» و «محەمەد زەکی بەسیم» و «یەهودا صدیق» کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوون ڕۆژی نۆی مانگی کانوونی دووەمی «ساڵی ١٩٤٩ -ک.م» لە لایەن دادگایەکی سەربازییەوە بە نهێنی دادگایی کران و بە پێی بەندی ٨٩ (أ)ی قانوونی عقوباتی «بەغدا»دی بڕیاری لەسێدارەدانیان درا، دوێ شەو یەکەم دوو کەسیان «واتا «فەهد» و «محەمەد حسەین شەبیبی»- ک.م» لە سێدارەدران و تەرمەکانیشیان بۆ چەند سەعاتێك بەرەبەیانی ئیمڕۆ لە دوو شوێنی جیاوازی شاری «بەغدا» بەسەر قەنارەکانیانەوە هەڵواسران، ئەو دووانەکەی تریشیان «واتا «محەمەد زەکی بەسیم» و «یەهودا صدیق» - ک.م.» ئیمشەو لە سێدارە دەدرێن.

٢- سێ کەسی یەکەمیان لە کاتی دادگاییکردنیاندا لە ساڵی ١٩٤٧ دا بە چالاکیی شیوعیی تاوانبار کران، هەرچی چوارەمیشیانە «واتا یەهودا صدیق- ک.م.» لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا دەستگیر کرا.

٣- «حوکمەتی عیراق»ی منی دەربارەی دادگاییکردنی ئەو کەسانە ئاگادار نەکرد و تەنها ڕۆژی ١١ی مانگی شوباتی «ساڵی ١٩٤٩- ک.م.» ئەو هەواڵانەم بیست و هەر کاتێك بە درێژەی ئەم بابەتەم زانی بە زووترین کات بە نامەیەکی «سەربەخۆ -ک.م.» ئاگادارتان دەکەم.

بۆ سکرتارییەتی «ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست»[(٢٢٤)].

لەم بوارەدا نامەی دواتری ناو هەمان فایل کە «وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی» ڕۆژی چواری مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویەتی بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە «بەغدا» کەم نییە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«برووسکە،

بە شفرە،

لە:

وەزارەتی هەندەرانەوە،

بۆ:

«بەغدا»،

ژمارە ١٤،

٤ی مارتی ١٩٤٩،

وێنەی بۆ:

«قاهیرە» ژمارە ١٨٣،

«دیمەشق» ژمارە ٧٢،

مۆسکۆ ژمارە ٢٥١،

نهێنی.

---

(224) Ibid.

١- نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٢١٤ی ڕۆژی چواری مانگی مارتی «سالّی ١٩٤٩ی -ك.م.» «بەغدا»، بۆ ئاگاداری «قاهیرە» و «دیمەشق» و «مۆسکۆ»، برووسکەی ژمارە ١٥٠تان کە ڕۆژی ١٤ی مانگی شوبات دەربارەی دادگاییکردنی «شیوعییەکانی عیراق» ناردووتانە.

من ئێستا ئەو ڕاپۆرتەم دی کە لە پەرەگرافی سێیەمی نامەکەتاندا ئاماژەتان بۆی کردووە کە دەڵێت وێڕای «فەهد» پەنجاو سێ کەسی دیکە دراونەتە دادگا.

ئەگەر بێت و ئەمە ببێتە هۆی لە سێدارەدانی کەسانی دیکە ئەوساکە پێویستە ئێمە تەدەخول بکەین چونکە زۆر بەداخەوە وەها پێدەچێت ئەو ڕووداوە کاری کردۆتە سەر ڕای گشتیی جیهان، من بۆ خۆم تاوەکو ئێستا ژمارەیەك نامەی پرۆتێستی خەڵکی ئەم وڵاتە «واتا بەریتانیا -ك.م.»م وەرگرتووە و هەر چەندە بە پێی یاسای عیراقی ئەوەی ڕووی داوە چ لە بواری دادگاییکردن و چ لە بواری لە سێدارەکاندا کارێکی ڕەوایە، بەڵام وەڵامێکی لەم جۆرە موقنیع نییە و کەس قایل ناکات کە کار بەدەستە عیراقییەکان بە شێوازێکی دڕندانە مافی مرۆڤیان پێشێل نەکردووە.

٢- لەبەر ئەوە بەختەوەر دەبم ئەگەر بێت و ئێوە کەڵك لە دەرفەتی قسەکردنتان لەگەڵ سەرەك وەزیرانی عیراقدا ببینن بۆ ئەوەی هانی بدەن لە سێدارەدانی کەسانی دیکە ڕابووەستێنێت، هەڵبەت ئێوە بە شێوازێکی فەرمی ناتوانن پرۆتێست دژی کارێك پێشکەش بکەن کە تازە قەومابێت، بەڵام پێویستە ئێوە ئەوەی بۆ ڕوون بکەنەوە کە بە پێی بۆچوونی ئێمە زێدەڕۆییەکی تەواوی کردووە و ئێمە لە «لەندەن» چاوەڕوانی پرۆتێستێکی توندوتیژی پەرلەمان دەکەین» (٢٢٥).

---

(225) Ibid, P.12

دوا بەدوای ئەمە دەقی نوسخەی ئەسڵی دەیان برووسکە و نامەی نارەزایی دەزگا و کەسایەتییە پێشکەوتووخوازەکانی بەریتانیا لە هەمان فایلدا هەڵگیراون کە ئەمەی لای خوارەوە چەند نموونەیەکیانن:

«وەزیری هەندەران،

بارەگای وەزارەتی هەندەران لە لەندەن،

کۆمەڵەی سۆشیالیزمیی زانکۆی مانچستەر[٢٢٦] زۆر بە توندی ئەم رەفتارانەی لە «عیراق» لەم حەفتەیەی دواییدا لەگەڵ قوتابییە پێشکەوتووخوازەکان و رەهبەرە سیاسییەکانی عیراق دەکرێن تاوانبار دەکەین و داوا لە حوکمەتی خاوەن شکۆی (بەریتانی –ک.م.) دەکەین هانی «حوکمەتی عیراق»ی بدات ئەو کەسانە بگرێت»[٢٢٧]، شایانی باسە کۆمەڵەی ناوبراو رۆژی بیست و چواری مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ ئەو برووسکەیەی ناردووە.

---

[٢٢٦] زانکۆی «مانچستەر» یەکێکە لە زانکۆ هەرە گەورەو ناسراوەکانی «بەریتانیا» و جیهان، کاك «موفیدی حاجی حەمە نوری» زاوام بە تایبەتی بردمییە زیارەتی بارەگای ئەو زانکۆیە، شایانی باسە لە «مانچستەر» سەرهەڵدانی رژێمی سەرمایەداری لە سەرتاپای جیهاندا دەستی پێکرد و «مارکس» و «ئەنجلز» بایەخی زۆریان بە بزووتنەوەی کرێکارانی ئەو شارە داوە و بە جووتە ماوەیەکی زۆریان لەوێ بردۆتە سەر. ئەوەی پێویستە لەم بوارەدا بگوترێت ئەوەیە کە «شۆرشی سەرمایەداریی بەریتانی» پشتی بە خوری و قوماشی خوری بەست کە پێویستییان بە تەرِوتووشی زۆر زۆرە و لە شاری «مانچستەر» و دەوروبەریشی ساڵ دوازدەی مانگ تەرِوتووشی و سەرماو سۆڵە ئەو شارەو دەوروبەری گرتۆتەوە.

[227] N.A.,F.O., 371/75130, This Telegram is of particular secrecy and should be retained by the authorised recipient and not passed on, cypher, lertter of Protest aginst the excuation of four Communist Leaders by the Iraqi Government, 21th February 1949, P.12.

نامەی دواتری ناو هەمان فایل ئیمزای هەشت کەسی بە سەرەوەیە و ڕۆژی بیست و دووی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ نێردراوە(٢٢٨). لە لاپەڕەی حەڤدەی هەمان فایلیشدا نامەی «ڕێکخراوی لاوانی کۆمۆنیستی لەندەن» هەڵگیراوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«بڕیار،

کۆمیتەی ناوچەی «لەندەن»ی «ڕێکخراوی لاوانی کۆمۆنیست» داوا لە وەزیری هەندەرانی «بەریتانی—ک.م.» دەکات کە «حوکمەتی عیراق»ی لەوە ئاگادار بکات کە بە هەزاران لە کرێکارە لاوەکانی «لەندەن» ئیدانەی لە سێدارەدانی دڕندانەی ڕەهبەرانی گەلی «عیراق»ی دەکەن، ئەوانەی داوای مافە سەرەتاییەکانی خۆیانیان دەکرد و لە پێناوی ئاشتی و ژیانێکی دیموکراسییانە و ژیانێکی باشتردا خەباتیان دەکرد» (٢٢٩).

لە لاپەڕە بیست و یەکی هەمان فایلدا وێنەی نامەی نزیکەی بیست کەس لەو بەریتانییانە هەڵگیراوە کە داوایان لە وەزیری هەندەرانی وڵاتەکەیان کردووە بە وردی بڕوانێتە «ئەو کارە دوور لە دیموکراسییەی «حوکمەتی عیراق»ی پێی هەڵساوە و کە چوار کەسی لە سێدارە داوە و پتر لە سەد و شەست کەسیشی لە سەر بۆچوونە سیاسییەکانیان بەند کردووە» (٢٣٠).

لە لاپەڕە بیست و دوویشدا دەقی وێنەی نامەیەکی دیکەی شازادەی بەریتانی هەڵگیراوە کە بە هەمان دەستوور ئاراستەی وەزیری هەندەرانی حوکمەتی وڵاتەکەیانی کردووە(٢٣١).

---

(228) Ibid, P.13.

(229) Ibid, P.17.

(230) Ibid.P.21.

(231) Ibid,P.22.

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی نامەی داهاتووە، کە شەش بەریتانی ڕۆژی هەژدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویانە بۆ وەزیری هەندەرانی حوکمەتی وڵاتەکەیان:

«٤٢ شەقامی ڕیکواتری،

لە«ندەن»،

ژمارە ١٦،

١٨ی شوباتی ١٩٤٩،

سێر:

ئێمە، ئەوانەی لای خوارەوە ئیمزامان کردووە، بە توندی ئیدانەی کارەکەی «حوکمەتی عیراق»ی لەگەڵ ڕەهبەرانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دا دەکەین و داواکارین ئەو کەسانەی تاوەکو ئێستا لە سێدارە نەدراون ئازاد بکرێن و ئەو مافەی خۆیان وەدەست بهێننەوە کە بە سەربەستی وەك گشت وڵاتە دیموکراسییەکانی جیهان بدوێن، داوای کۆششتان بۆ قوتارکردنی ئەو کەسانە لێ دەکەین.

ئێمەیش ئەمانەین،

ناو و ئیمزاکان» (٢٣٢).

دوا بە دوای ئەمە نۆرەی نامەی «کەسایەتیی ئینگلیزی کۆنرۆی» و هاوەڵەکانی دێت و ئەوانیش بە توندی ناڕەزایی خۆیان دژی حوکمەتی «عیراق»ی لەسەر لە سێدارەدانی هەر چوار ڕەهبەرەکەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەردەبڕن (٢٣٣).

بەشی دواتری هەمان فایل بۆ برووسکەیەکی باڵوێزی بەریتانی لە «بەغدا» تەرخان کراوە دەربارەی بەردەوامبوونی پۆلیسی عیراقی لە ڕۆژانی

---

(232) Ibid, Rectory Rd., London, No.16, 18th February1949, P.23.

(233) Ibid, Letter of protest against the excuation of four communist leaders by the Iraqi Government, 21st February 1949, PP. 24-27.

هەژدە و بیستی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩دا لەسەر گرتنی ژمارەیەك شیوعیی دیکە کە وەك دەڵێن سیانیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی نوێی حیزبن کە چاپخانەیەك و بڕێك بەڵگەنامە لە تەکیاندا گیراون[(٢٣٤)].

شایانی باسە مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩ ڕۆژنامە ئینگلیزییەکانی «بەریتانیا»، تایبەت «تایمس» و «ستەیتسمان ئاند نەیشن»[(٢٣٥)]، باسی لە سێدارەدانی ڕەهبەرانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»یان بڵاو کردۆتەوە و لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە کە ئەو ڕۆژنامانە بە ڕاشکاوی باسی ئەوەیشیان کردووە چۆن حوکمەتی «عیراق»ی ئەو کارەی بە نهێنی ڕاپەڕاندووە و چۆن ئەوەیان لە «کارمەندانی حوکمەتی بەریتانی لە «بەغدا» شاردۆتەوە»[(٢٣٦)].

بەشێکی بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە بۆ ئەو دیدەنییە تەرخان کراون کە باڵوێزی «بەریتانی» لە «بەغدا» ڕۆژی نۆی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩ لەگەڵ سەرەك وەزیرانی عیراقدا کردوویەتی، گرنگترین و سەرنجڕاکێشترین خاڵی ئەو دیدەنییە بریتییە لە وەڵامی سەرەك وەزیرانی «عیراق» دەربارەی گلەییەکانی حوکمەتی بەریتانی کە پێی گوتووە:

«حوکمەتی عیراقی» «ئەو کارەی بە پێی ئەو یاسایەی ساڵی ١٩٢١ ڕاگەیاندووە کە سێر هێنری دۆبس موافەقەتی لەسەر کردووە»[(٢٣٧)]، شایانی باسە ئەوکاتە «سێر هێنری دۆبس» مەندووبی سامیی «بەریتانی» بوو لە عیراق.

ئەم هەراو بگرە زۆرە خودی «ئێرنست بێڤن»ی وەزیری هەندەرانی «بەریتانی» ناچار دەکات بیرو بۆچوونی خۆی دەربارەی ڕەفتاری حوکمەتی «عیراق»ی بەرانبەر ڕەهبەر و ئەندامانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دەربڕێت

---

(234) Ibid, Telehram From Sir H.Mak, Baghdad, 22 February, 1949, Confidential, PP.28-29.

(235) "Statesman and Nation".

(236) N.A., F.O., 371/75130…., PP.30-33.

(237) Ibid, From Badghad To Foreign Office, Sir.H. Mack, No. 213, 8th March, 1949, Secret, PP.35-36.

و باڵوێزی «عیراق»یش لە «لەندەن» ناچار دەبێت ڕۆژی سێی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩ لە نامەیەکی پێنج خاڵیدا بۆ خودی وەزیر تیشک بهاوێتە سەر گەلێك لایەنی ئەو بابەتە[٢٣٨].

لە هەمان فایلدا و لە هەمان بواردا نامەیەکی فەرمیی نهێنیی باڵوێزی بەریتانی لە «بەغدا» هەڵگیراوە کە ڕۆژی بیست و نۆی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ بارەگای وەزارەتی هەندەرانی «حوکمەتی بەریتانی» لە «لەندەن» و بەم جۆرەی لای خوارەوە تیشک دەخاتە سەر ڕۆڵی «ساسۆن شلۆمۆ دەلال» و پێوەندییەکانی لەو ڕۆژگارەدا لەگەڵ «فەهد» «ا» :

«بە شفرە،

لە:

«بەغدا»وە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

«سێر هـ. ماك»،

٢٨ی نیسانی ١٩٤٩.

١- ڕادیۆی «بەغدا» هەواڵی ئەو حوکمانەی دەرهەق ئەو شیوعییانەی مانگی کانوونی دووەم و شوباتی ئیمساڵ لە لایەن دادگایەکی سەربازییەوە دەرچوون ڕاگەیاند کە یەکێکیان حوکمی لە سێدارەدانی «ساسۆن شلۆمۆ دەلال»ە، وێڕای حوکمی موئەبەدی ژمارەیەك و حوکمی قورسی دیکە.

٢- «دەلال»، کە بۆ خۆی جووە، زووتر لە سەر چالاکیی کۆمۆنیستی گیرا و ساڵێك حوکم درا و ئەو ساڵەی لە بەندیخانەی» کووت» بردە سەر و لە نزیکەوە پێوەندیی بە «فەهد»ەوە هەبوو «فەهد» «ڕەهبەری حیزبی شیوعیی عیراقییەکان کە ڕۆژی سیازدەی مانگی شوبات لە سێدارە درا»، لەو ماوەیەدا «فەهد» نەصیحەتی کرد کاتێك کە لە بەندیخانە ئازاد دەکرێت پێویستە خۆی

(238) Ibid, Secret, From: British Embassy, Baghdad, No. 59,3 rd March, 1949, to: Sir Ernest Bevin, PP.37-39.

لە پۆلیس بشارێتەوە و دەستوبرد پێوەندیی بە حیزبەوە بکات، دەلال دوای ئەوەی پایزی ساڵی ١٩٤٨ لە بەندیخانە ئازاد کرا بە پێی ئەو ڕاوێژانەی «فەهد» ڕەفتاری کرد. دوا بە دوای گرتنی «یەهودا صدیق» و ئەوانی دیکە لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا دەلال لەگەڵ دوو کەسی دیکەدا «حیزبی شیوعیی عیراقی»یان دامەزراندەوە و بۆخۆی بووە سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی حیزب و دوای لەسێدارەدانی «فەهد» و هاوەڵەکانی. «ساسۆن دەلال» ڕۆژی بیستی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ لەگەڵ ژمارەیەکی دیکەدا گیرا «بۆ درێژەی باسی گرتنەکەی بڕوانە ڕاپۆرتی ژمارە ٨٤٦٩ی ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩».

٣- پێم وانییە هیچ جۆرە دەست تێوەردانێک لە لایەن ئێمەوە لەم کارەدا هەنگاوێکی لەبار یان کاریگەر دەبێت.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم نامەیەم، وێڕای برووسکەی ژمارە پێنجم، بنێرن بۆ «مۆسکۆ» (٢٣٩).

دوا بەدوای ئەمە باسی ئەو هەواڵەی «ئێزگەی ڕۆژهەلاتی نزیک» «محطة الشرق الأدنی» کە بەریتانییەکان بە عەرەبی پەخشیان دەکرد دەکات کە گوتوویەتی «دادگایەکی سەربازیی عیراقی-ک.م.» حوکمی لە سێدارەدانی «ساسۆن شلۆمۆ (٢٤٠) دەلال» کە ئەندامی ئەو شانە حیزبییە بوو کە دادگایی کران و بیست کەسی دیکەش لەگەڵ ئەودا حوکم دراون، حوکمەکانیان لە دوو ساڵەوە دەست پێدەکات تاوەکو موئەبەد» (٢٤١).

لە نامەی نهێنیی ژمارە ٤٢٦ی ڕۆژی چواری مانگی مایسی ساڵی ١٩٤٩ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیاوە بۆ «باڵوێزخانەی بەریتانی» لە «بەغدا» زۆر بە ڕوونی دیارە کە کاربەدەستانی حوکمەتی «بەریتانی» دژی لە سێدارەدانی

(239) Ibid, Cypher, From Baghdad to Foreign Office, Sir H. Mack, No. 389, 28th April 1949.

(٢٤٠) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە هەڵە لە بریتی شلۆمۆ شالۆن (shalon) نووسراوە.

(241) N.A., F.O., 371/75130, Iraqi Communist to Hang, Sharq Al Adna 12, 30, FBIS Monitoring.

ڕەهبەرەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوون و ئەو کارەیان دژی بەرژەوەندی حوکمەتی «عیراقی» لە قەڵەم داوە، شوبهاندوویانن بە ڕەفتارەکانی «ستالین» و وڵاتە سۆشالیزمەکانی دیکە و ئەوەیش بە توندی ڕای گشتیی جیهانی هەژاندووە[٢٤٢].

لە نامەی دواتری «باڵوێزخانەی بەریتانی» لە «بەغدا» وە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی کە ژمارەکەی ٤١٠یە و ڕۆژی شەشی مایسی ساڵی ١٩٤٩ نێردراوە و بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی دیدەنیی دیپلۆماسیی «بەریتانی» «ترێڤێلیان» [٢٤٣]لەگەڵ سەرەك وەزیرانی «عیراق»یدا دەکات:

«بە شفرە،

لە:

«بەغدا»وە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

«سێر هـ. ماك»،

ژمارە ٤١٠،

٦ی مایسی ١٩٤٩،

وێنەی بۆ:

«قاهیرە» و «مۆسکۆ»،

---

[242] Ibid, Confidnetial, From Foreign Office to Baghdad, No. 426, 4th May, 1949, P.37.

[٢٤٣] «هەمفری ترێڤێلیان Hunphrey Trevelyan» کارمەندێکی دیپلۆماسیی «بەریتانی»یە، ڕۆژی بیست و حەوتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٠٥ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی «کامبریج»ە، لە ساڵی ١٩٢٧ەوە بووە کارمەندی سیڤیلی «هیندستان»، ڕۆژی ٦ی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٨ کرایە «کونسوڵ» لە «باڵوێزخانەی بەریتانی» لە «بەغدا». بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and consular Year Book 1949" London., P.367, "The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1951), London, P.474.

نهێنی.

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٤١٠ی ڕۆژی ٦ی مایسی وەزارەتی هەندەران، دووپات دەکرێتەوە بۆ ئاگادارکردنی «قاهیرە» و «مۆسکۆ».

برووسکەی ژمارە ٤٢٦ تان دەربارەی کۆمۆنیستەکان،

لە «ترێڤێلیان»ەوە

لە غیابی باڵوێزدا قسەم لەگەڵ سەرەك وەزیرانی «عیراقدا-ك.م.»کرد کە گوتی «دەلال» لەسەر ئەوە حوکم نەدرا کە شیوعی بوو، بەڵکو لەسەر ئەوەی کە دەیویست حوکمەت بڕووخێنێت و دەستی وەردایە ناو کاروباری سوپاوەو دەیویست هەرەس بە دڵسۆزیی ئەو دەزگایە بۆ حوکمەت بهێنێت، ئەو تەواو شایانی بڕیاری لە سێدارەدانە و گۆڕینی ئەو بڕیارە کارێکی لە بار نییە، لەسێدارەدانەکەشی لە بەندیخانە دەبێت، بەڵام سەرەك وەزیران بەوە قایل بوو کە بەیاننامەیەك دەربارەی ئەو تاوانانەی دەلال بڵاو بکاتەوە کە لەسەریان تۆمەتبار کراوە»(٢٤٤).

(244) N.A., F.O., 371/75130, Cypher, Diplomatic Distribution, From Baghdad to Foreign Office, Sir H. Mack, No. 410, 6th May 1949, Reported to Cairo and Moscow, Confidential, P.39.

## «کورد و کوردستان»
## لەو بەڵگەنامە نهێنییانەی حوکمەتی بەریتانیدا
## کە بۆ «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەرخان کراون

کورتە پێشەکییەک:

وەک ئاشکرایە یەکێک لە کۆڵەکە پتەوەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کوردە بێ مافەکان بوون و تاوەکو ئێستایش گەلێک جار ناوی ڕەهبەرە کۆمۆنیستەکانی کورد لەم بابەتەدا هاتووە، جاری وا هەیە دیپلۆماسییە بەریتانییەکان تەنانەت کوردە پارتییەکانیشیان بە شیوعیی لە قەڵەم داوە، هی وەک «ڕەشید باجەلان» بە وێنە، وێڕای ئەوەی زۆربەی ڕێکخراوە «کوردی»یەکانی کوردستانی باشوور» دوای جەنگی دووەمی جیهانی بە سروشت و کردار چەپڕەو بوون، هەروەها «فەهد»یش مەبەستی بوو جێ پێی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە سەرجەم ناوچە کوردستانییەکانی عیراقدا پتەو بکات و بۆ خۆیشی چەند جارێک بە شێوازێکی نهێنی سەری لەو ناوچانە داوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی ئەم بۆچوونانە دەگەڕێینەوە بۆ ناوەرۆکی فایلی ژمارە ١٨١ / ١٠٤٤ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی کە وەک لە سەرەتای ئەم بابەتەدا گوتمان گەورەترین و دەوڵەمەندترینی ئەو فایلانەن کە بۆ «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا تەرخان کراون، لەوێدا بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی ژمارەیەک ڕەهبەری کورد و غەیرە کورد کراوە، کە یەکەم ناویان هەمزە عەبدوڵلایە و وا دەقی وەرگێڕانی ئەو بۆچوون و زانیارییە دەگمەن و دانسقانە دەربارەی ئەو و کوردەکانی دیکە پێشکەش دەکەین دوای ناونووسکردنی ئەو بیست و سێ کەسەی ناویان لە ناو لیستەکەدا بەم جۆرە بە ڕیز هاتووە:

١- «هەمزە عەبدوڵلا» .
٢- «محەمەد ساڵح بەحر العلوم» .
٣- «سەلیم چەلەبی» .
٤- «کاپتەن ئەلێکسێی ئیملیانۆڤیچ داڤیدینکۆ» .
٥- «شاکیر فەیاض» .
٦- «سەلمان حسەین هیلالی» .
٧- «ئیلیاهو حوری» .
٨- «ئیسماعیل عەبدولقادر» .
٩- «ڤلادیمێر ئیڤانۆڤ» .
١٠- «یوسف ئیسماعیل» .
١١- «یوسف جەواد میمار» .
١٢- «عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق» .
١٣- «جەلال عەبدولڕەحمان» .
١٤- «غەضبان مەردان ئەلسەعد» .
١٥- «عەبدولڕەحیم شەریف» .
١٦- «مەلا شەریف» .
١٧- «داود سەلمان» .
١٨- «حیکمەت سلێمان» .
١٩- «سەعد صالح» .
٢٠- «وەحید صەفوەت» .
٢١- «عەبدولئەمیر ئەبو توراب» .
٢٢- «محەمەد عەلی زەرقا» .
٢٣- «خەلووق ئەمین زەکی» .

## ١- هەمزە عەبدوڵڵا

لە تۆمـاری کوردایەتیـدا نـاو و شـوێن پەنجـەی خوالێخۆشـبوو «هـەمزە عەبـدوڵڵا» ڕوون و ئاشـکرایە و ئەمـەی لای خـوارەوەیش دەقـی وەرگێڕانـی پوختەی ژیاننامەکەیەتی لە فایلی ناوبراودا:

«پـارێزەرێکی کـوردە، جـاران لـە کارگـەی چـنینی «ئەلئـەهالیی عـەلی کەمال» کاری دەکرد، «هەمزە عەبدوڵڵا» لەساڵی ١٩٤٢ەوە لە«بەغدا» دەژیا و تەمموزی ساڵی ١٩٤٣ بەوە زانرا کە ئـەو لائیحـەی ئیسـتیئنافی بۆ ئـەو لاوە کوردانەی کە لە «هـەولێر» گیرابـوون دەنووسـی و مـانگی تەشـرینی دووەمـی ساڵی ١٩٤٤یش بە پێـی ڕاپۆرتـە هەواڵـەکان چووەتە «ئێـران»، بـۆ دیتـەنیی ئەفسـەرە «ڕووسـەکان» لـە شـوێنێك پێـی دەڵـێن ئوشـنۆ «شـنۆ»، بـە پێـی ڕاپۆرتە هەواڵەکانی مانگی تەشرینی دووەمی سـاڵی ١٩٤٥یش دەرکـەوت کـە لەو ناوچەی باکووری «ڕۆژئاوای ئێران»دا کە بە دەست «ڕووسەکان»ەوە بـوو دەژیا، لە مانگی ئـابی سـاڵی ١٩٤٦یشـدا لەگـەڵ «مـەلا مسـتەفا»دا هـەڵهات، بەڵام زۆری نەبرد هاتەوە «عیراق» و سەرەتا لە «کەرکووك» دەژیـا و دوایـیش چووە «سلێمانی» و بـەپێی ڕاپۆرتـەکان بـەرگی مـەلایی دەپۆشـی و زۆربـەی کاتی بە ناوی «مەلا ئیبراهیم»ەوە دەبردە سەر، بەڵام لە مانگی مارتی سـاڵی ١٩٤٨ەوە لە «بەغدا» لە ژێر چـاودێریی پۆلیسـدا دەژی و هـەمزە یەکێکـە لـە سەرپەرشتیکەرە سـەرەکییەکانی ڕۆژنامـەی «ڕزگـاری» [٢٤٥]، دوایـیش چـەند جارێکی دیکە ناوی «هەمزە عەبدوڵڵا» لە هەمان ڕاپۆرتدا دێت.

---

[245] Ibid, Top Secret, Personality Notes, Abdulla, Hamza, P.1

٢- «مەلا شەریف»

هەرچی «مەلا شەریف»ە لە هەمووان کەمتری دەربارە نووسراوە، وەها دیارە دیپلۆماسییە «بەریتانییەکان» زانیاریی زۆریان دەربارەی ژیان و چالاکییەکانی دەست نەکەوتووە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو سێ دێڕەیە کە لە راپۆرتەکەدا دەربارەی «مەلا شەریف» نووسراوە:

«مەلا شەریف ماوەیەك سکرتێری بەشی کوردیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوو، بەڵام لە لایەن یەهودا صدیقەوە دەرکرا و لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا لەگەڵ غەضبان مەردان ئەلسەعد و چەند کەسێکی دیکەدا جەماعەتی «الحقیقة» یان دامەزراند»(٢٤٦).

راپۆرتەکە کاتێك دێتە سەر باسی «غەضبان مەردان ئەلسەعد»، بێ ئەوەی ناوی «مەلا شەریف» بهێنێت، دەڵێت: «ساڵی ١٩٤٢ مولازم ئەوەل بووە و مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ بووە بەرپرسی جەماعەتی «الحقیقة» و لە کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەدا گیرا»(٢٤٧).

٣- «حیکمەت سلێمان» و «عەبدولقادر» «ئیسماعیل» و «عەبدولڕەحیم شەریف»

لە راپۆرتەکەدا پتر لە هەمووان باسی «حیکمەت سلێمان» و «عەبدولقادر ئیسماعیل» و «عەبدولڕەحیم شەریف» کراوە، دەربارەی «حیکمەت سلێمان» دەڵێت: «دەوروبەری ساڵی ١٨٨٧ لە «بەغدا» لە دایك بووە و لە «ئەستەمبووڵ» خوێندوویە و لە «عیراق» خزمەتی «تورك»ی کرد، سەرەتا وەك بەڕێوەبەری قوتابخانە و دواتر وەك یاریدەری حاکم». هەروەها باسی پێوەندییەکانی «حیکمەت سلێمان» بە «بەکر صدقی» و کۆدێتاکەی ساڵی ١٩٣٦ی دەکات و دەڵێت: «ساڵی ١٩٣٩ نووری سەعید گرتی»، بەڵام وەك

---

(246) Ibid, Sharif, Mulla, P.8.

(247) Ibid, Sa`ad, Ex-Capt. Ghadban Mardan, P.7.

دەڵـێن هـاوینی سـاڵی ١٩٤٥ «نـووری سـەعید» ویسـتی بهێنێتـەوە کـۆڕی سیاسەت «هەر چەندە حیکمەت سلێمان بۆ خۆی هەرگیز لە کۆڕی سیاسـەت و ژیانی ڕووناکبیری دوور نەبووە»، تەنانـەت کـانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٧ ویستوویە خۆی بۆ «ئەنجوومەنی نوێنەران» کاندیـد بکـات، شـایانی باسیشـە هـەر ئـەو سـاڵە دژی پـەیمانی نێـوان «عـێراق» و «تورکیـا» وەسـتا و مـانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ کرایە سەرۆکی کۆمیتەی ئـابووریی «کۆمەڵـەی یـەکگرتووی بـەرگری فەلەسـتین»، هـەروەها سـەرۆکی ئـەو لیژنەیـە بـوو کـە پیتاکی خێزانـی قوربانییـەکانی خۆنیشـاندانەکانی مـانگی کـانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٨ی کـۆ دەکـردەوە، لـە شـوبات و مارتیشـدا بـە وردی بایـەخی یـەکگرتنی گشــت پارتییــە موعاریزەکــان، چ نەتەوەپەرســتەکانیان و چ چـەپڕەوەکانیانی هەڵسـەنگاند. مـانگی نیسـانی هــەمان سـاڵیش بـە پێـی ڕاپۆرتەکان «حیکمەت سلێمان» پشتی سیاسەتی «بەریتانی» لە «فەلەستین» گرت و وەك ئامرازێکی بەربەستکردنی نفووزی «ڕووسیا» داوای لە «عەرەب» و «کورد» و «تـورك» و «بـەریتانی»یـەکان کـرد یـەك بگـرن»، بـەڵام لـەم چـەند مانگەی دواییداو « تاوەکو بیست و پێنجی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ دژی «نـووری سەعید» و «بەریتانییەکان» وەستا» (٢٤٨).

٤- «پارتی دیموکراتی کوردی»

پاش چـەند لاپەڕەیـەك لـە هـەمان فایلـدا «پاشـکۆیەکی ئیزافـی» بـۆ نـۆ بابەتی پێوەندیـدار بـە «حیزبـی شـیوعیی عیراقـی»یـەوە لـە پێـنج لاپـەڕەدا تەرخان کراوە، « پارتی دیموکراتی کـوردی یـان ڕزگـاریی کـورد» ناونیشـانی بابەتی پێنجەمییە و ئەمەی لای خـوارەوە دەقـی وەرگێڕانـی نـاوەڕۆکی ئـەو بابەتەیە:

---

(248) Ibid, Sulaiman, Hikmat, P.9.

«١– وەك بەر لە ئێستا ئاماژەمان پێداوە «بڕوانە نامەی دایەرەکەمان کە ژمارەکەی س. ٩١/٣٠/سی/٢٤٦ و مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩ ئامادەکراوە» لە کوردستانی عیراق دوو ڕێکخراوی شیوعیی هەبوون، یەکەمیان «پارتی ئازادی» کە لقی کوردیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوو کە لەوانەیە لە «کوردستانی عیراق» لەگەڵ «حیزبی تەحەڕوڕ» یەکیان گرتبێت، دووەمیشیان: «پارتی دیموکراتی کوردی» یان «ڕزگاری»یە، ئامانجە سەرەکییەکان و هەڵوێستی «پارتی ڕزگاری « تاوەکو ئێستا بە تەواوەتی نەزانراون.

٢– «پارتی ڕزگاری» و «پارتی دیموکراتی کوردی» هەر چەندە لە ئەسڵدا جیاواز بوون، بەڵام ئێستا لە ئاوات و ئامانجەکانیاندا وەها تێکەڵ بە یەکتری بوون کە دەتوانرێت بە یەك چاو سەیریان بکرێت، هەرچەندە بەڵگەی ئەم بۆچوونە هێشتاوەکو بە تەواوەتی ڕوون نییە، بەڵام وەها دیارە پێوەندی هەردووکیان بەیەکدییەوە وەك پێوەندیی نێوان «حیزبی شیوعیی عیراقی» و «حیزبی تەحەڕوڕی نیشتیمانیی عیراقی» وەهان، «پارتی دیموکراتی کوردی» لەمەودوا ناوی «حیزبی ڕزگاری « ناهێنین چونکە لەگەڵ «پارتی دیموکراتی کوردی» بە یەك چاو سەیریان دەکەین، لە بنەڕەتدا لە لایەن ژمارەیەك لە ئەندامانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»یەوە دامەزرێنرا کە لە یاخیبوونەکەی «مەلا مستەفا بارزانی»ی ساڵی ١٩٤٥دا بەشدار بوون. ئەمانە کە لەگەڵ «مەلا مستەفا»دا هەڵهاتنە «ئێران» و پێوەندییان لەگەڵ هەمەجۆر کۆمۆنیستی «ئێران»یدا دامەزراند و کەوتبوونە ژێر کاریگەریی «ڕووسەکان»ەوە.

لە «ئێران» ئەوان نەخشەی ئەوەیان داڕشت کە لە ناوچە کوردییەکانی عیراقدا هەمان پارتییەکی دیموکراتیی کوردی وەك ئەوەی «ئازەربایجان»[٢٤٩] دابمەزرێنن.

---

[٢٤٩] ئاشکرایە کە بە مەبەستی شۆڤێنییانەی خودی «ڕەزا شای پەهلەوی» لە ڕووی کارگێڕییەوە بەشێکی «کوردستانی ڕۆژهەلات»ی، بە شاری «مەهاباد» و دەوروبەرییەوە، خستبووە سەر «ئازەربایجانی باشوور».

دوایی هەر ئەمانەیش کە گەڕانەوە «عیراق» پارتێکیان دامەزراند و بە هەڵبژاردن مەلا مستەفای بارزانییان کردە سەرۆك هەرچەندە بۆ خۆی لەوێ نەبوو، «هەمزە عەبدوڵلا»یش بووە جێگری، ناوی ئەندامەکانی دیکە لە پاشکۆی ژمارە (گ)دایە، بۆ پێڕەوی نیشتیمانی و پرۆگرام و نیزامی ناوخۆیشی بڕوانە پاشکۆی ژمارە (ه)، و دەست کرا بە بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەك بە ناوی «ڕزگاری»یەوە و دوای ئەمیش یەکێکی دیکە بەناوی «مروق» یان «ماروق»ەوە[٢٥٠] دەستی بە دەرچوون کرد.

ساڵی ١٩٤٧ «پارتی دیموکراتی کوردی» یادداشتێکی پرۆتێستی دایە نەتەوە یەکگرتووەکان، وێڕای پرۆتێستێك بۆ کۆنفرانسی وەزیرانی هەندەرانی هاوپەیمانەکان کە لە «مۆسکۆ» بەسترا و وەك کاتی خۆی گوتیان بە ناوی کۆمیتەی ناوەندی و کۆمیتەی بالای[٢٥١] «پارتی دیموکراتی کوردی» یەوە ناردوویانە.

٣- «پارتی دیموکراتی کوردی» ئامانجەکانی خۆی پتر لە «کوردستانی - ك.م.» «ئێران»ەوە وەك لە «کوردستانی - ك.م.» «عیراق»ەوە دادەڕشت و وەها دیارە سەرەتا هاریکارییەکی کەم لە نێوان پارتی و ڕێکخراوە کۆمۆنیستییەکانی «عیراق»دا هەبووبێت.

هەر چۆن بێت لە مانگی تەشرینی ساڵی ١٩٤٧دا «پارتی دیموکراتی کوردی» قایل بوو کۆمیتەیەکی هاریکاری لەگەڵ «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا

---

[٢٥٠] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

"This was followed later by one called muruq or muraq".

تۆ بلێی مەبەستی (مرۆڤ) یا دەرچوونی ڕۆژنامەی «خەبات» بێت؟.

[٢٥١] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

"these, which were reported on at the time, were signed refictively by the Central Committee and the Enecutive of KDP".

کە لەوانەیە مەبەستیان بارزانی بێت، وەك سەرۆکی بالای پارتی.

دابمەزرێنێت و «ڕەشید عەبدولقادر» بووە نوێنەری پارتی لەو کۆمیتەیەدا. دوا بە دوای ئەوە، وەك لە ڕووداوەکانەوە هەستی پێدەکرێت، زۆربەی چالاکییە کۆمۆنیستییەکان لە «کوردستانی عیراق»دا ئەنجامی ڕاستەوخۆی نەخشەدانانی هاوبەش بوون لەلایەن «پارتی دیموکراتی کوردی» و «حیزبی شیوعیی عیراقی»و «جەماعەتەکانی ئازادی و تەحەڕوڕ»ەوە.

٤- لە پاشکۆی ژمارە(ل)دا وێنەیەکی بەیانی «صورة بیانیة» دەربارەی ڕێکخراوی ناوخۆی «پارتی دیموکراتی کوردی» دەبینن، ئەمەیش پشتی بەو زانیارییانە بەستووە کە لە پاشکۆی ژمارە (هـ)دا هاتوون»[٢٥٢].

دوا بەدوای ئەمە چل و یەك لاپەڕەی هەمان فایل بۆ باسی نامیلکەیەکی «جەماعەتی الحقیقة» و نامەیەکی شەریف ئەلشێخ بۆ فەهد و باسی ڕۆژنامەی «الأساس» و ئەو شتانەی پۆلیس لە کاتی پشکنینی ماڵی «عەبدولڕەحیم شەریف»دا دۆزییەوە و گەلێك لایەنی پێڕەوی ناوخۆی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە زۆربەیان دووپات کراوەن، وێڕای ژمارەیەك لە نامەکانی «فەهد» و کۆنفرانسەکانی ئەو حیزبە و باسی «بەندیخانەی کووت» و ئەو جۆرە بابەتانە تەرخان کراون، دوای ئەوە یەکسەر دێتە سەر باسی ڕاپۆرتێکی سێ لاپەڕەیی دەربارەی کەسایەتییەکانی ئەو ڕۆژگارە و ئەمجارەیان ناوی دە کەسایەتییان بۆ تۆمار کردووین کە چواریان کوردن، ئەو دە کەسایەتییانەش بە ڕیز ئەمانەن:

١- «هاشم ئەلئەعرەجی».

٢- «هەمزە عەبدوڵلا».

٣- «ئیبراهیم ئەحمەد».

٤- «صدیق ئەلفەلاحی».

---

(252) N.A., F.O., 371/75130, Cypher, Top Secret, the Iraqi Communsit Party, Supplementary Paper, The Kurdish Democratic Party or Rezgari Kurd, PP.4-5.

٥- «عەبدولحسەین جاویل ئەلغائب»[٢٥٣].

٦- «زەکی خەیری».

٧- «ڕەشید عەبدولقادر».

٨- «سالّح ڕوشدی».

٩- «ئەلفرێد سەمعان»[٢٥٤].

١٠- «عەزیز شەریف».

دیسانەوە دەربارەی «هەمزە عەبدوڵلا» نووسراوە:

«یەکەم هەمزە عەبدوڵلا:

ناوی لەو ڕاپۆرتەدا کە ژمارەکەی س.٩١/سی/٩/٢٤٦ی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩دا هاتووە کە ئەم فەرمانگەیە ئامادەی کردووە، زانیاریی دیکە دەربارەی بەم جۆرەی لای خوارەوەیە:

بە پێی ڕاپۆرتی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٩ ئێستا لە «کۆیسنجەق» دەژی و لە ڕێگەی ئەفسەرێکی دوورخراوەی سوپای «عێراق»ییەوە پێوەندیی بە «مەلا مستەفا»وە هەبوو، بە پێی ڕاپۆرتەکان ئێستا ئەو «ئەفسەرە»یش لە «کۆیە» لەگەڵ «هەمزە»دا دەژی»[٢٥٥].

---

[٢٥٣] ناوەکەی لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

"Abdull Husain Jaweel al Ghalib".

[٢٥٤] لە ڕاپۆرتی ئەمجارەیاندا ئەمەی لای خوارەوە دەربارەی «ئەلفرێد سەمعان» نووسراوە:
«ئەلفرێد سەمعان» قوتابیی «کۆلێجی حقوق»ە لە «بەغدا»، ناوی لەو ڕاپۆرتەی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٨دا لەسەر بەشداریکردنی لە خۆنیشاندانی شیوعییەکاندا لە «کاظمیة» هاتووە و گیرا و ئازاد کرا، بەڵام لە مانگی تەشرینی دووەمی هەمان ساڵدا تیشک خرایەوە سەر ناوی وەك یەکێکی نزیك لە «غەضبان ئەلسەعد» و ڕەهبەرانی «جەماعەتی الحقیقە»، لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ ڕەهبەرانی ئەو جەماعەتەدا بەند کرایەوە» بڕوانە:

N.A., F.O., 371/ 75130, Cypher, Top Secret, The Iraqi Communist Party, P.3.

[255] Ibid, Hamza Abdulla, P.1.

«ئیبراهیم ئەحمەد»

لە هەمان لیستەدا دوای ناوی «هەمزە عەبدوڵڵا» یەکسەر ناوی هاوڕێی گیانی بە گیانی و هاوبیر و بۆچوونی لە بواری کوردایەتیدا خوالێخۆشبوو «ئیبراهیم ئەحمەد» دێت کە ئەمەی لای خوارەوەی دەربارە نووسراوە:

«دووەم: ئیبراهیم ئەحمەد

ساڵی ١٩١٢ لە دایك بووە، دەورووبەری ساڵی ١٩٣٦ کۆلێجی «حقوق»ی لە «بەغدا» تەواو کرد و تاوەکو ساڵی ١٩٤٤ لە «هەڵەبجە» دادوەر بوو، لەو ساڵەدا گوێزرایەوە «سلێمانی»، بەڵام لێرە لەگەڵ موتەسەریفی «سلێمانی» «مەعرووف جیاوك»دا تووشی ناکۆکی هات لەسەر ئەوەی «جیاوك» دەیوست گۆڤاری «گەلاوێژ»، کە «ئیبراهیم ئەحمەد» پتر لەو بایەخی پێ دەدا، بکرێتە ئۆرگانی سیاسیی «یانەی سەرکەوتنی کوردان»ی میانڕەو. لە ئەنجامی ئەم ناکۆکییەدا «ئیبراهیم ئەحمەد» دەستی لە کاری دادوەری هەڵگرت و بووە پارێزەر لە «کەرکووك» و «سلێمانی»، «ئیبراهیم ئەحمەد» هەمیشە لایەنگری کوردایەتی بووە، بەڵام دوای ئەو ڕووداوە لەم بوارەدا زۆر بە خێرایی بووە کەسایەتییەکی توندڕەو، ساڵی ١٩٤٨ کرایە بەرپرسی «پارتی دیموکراتی کوردی» لە «سلێمانی» و هەر ئەو دەورووبەرەیش بووە سەرنووسەری گۆڤاری «سلێمانی». «ئیبراهیم ئەحمەد» لە دوا دواکانی ساڵی ١٩٤٦و ساڵی ١٩٤٧ دا یەکێك بوو لە هاندەرە گەورەکانی خۆنیشاندانەکانی قوتابیان دژی ڕژێم لە بواری جیاجیادا و خۆنیشاندانەکانی ئەوساکە بوونە هۆی سووتاندنی بارەگای ڕاگەیاندنی بەریتانی لە «سلێمانی»، شوباتی ساڵی ١٩٤٨یش ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ دەورووبەری پەنجا قوتابیی «سلێمانیدا–ك.م.» چووە «بەغدا» بۆ بەشداریکردن لە خۆنیشاندانەکانی بیرەوەریی «ڕاپەڕینەکەی مانگی کانوونی دووەمی ئەو ساڵە–ك.م.» و بە پێی ڕاپۆرتەکانیش لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٨دا پیتاکی بۆ «بارزانی»یە «ئاوارەکان– ك.م.» کۆ کردەوە» [٢٥٦].

[256] Ibid, Ibrahim Ahmed P.1.

**عەبدولقادر ڕەشید**

ناوی حەوتەم کەسایەتی لە هەمان ڕاپۆرتدا عەبدولقادر ڕەشیدە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو قسانەیە کە دانەرانی ڕاپۆرتەکە دەربارەی نووسیویانە:

«عەبدولقادر ڕەشید:

لە ڕاپۆرتێکی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا ئاماژە بۆ «شێخ عەبدولقادر ڕەشید»ێکی پێڵاودروو لە «خانەقین» وەك «نازی»یەکی توندڕەو کراوە، بەڵام هەرچۆن بێت ئەو کەسەی لێرەدا ئێمە مەبەستمانە پارێزەر عەبدولقادر ڕەشیدە کە لە دوو ڕاپۆرتدا مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٦ ناوی هاتووە و لە هەردووکیشیاندا باسی ئەوە کراوە کە چۆن عەبدولقادر ڕەشید کۆمەکی بۆ «پارتی رزگاری کورد» کۆکردۆتەوە. لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا کە ڕۆژی سێی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٤٦ نووسراوە ناوی عەبدولقادر رەشید لەو لیستەدایە کە دەربارەی ئەندامانی «ڕزگاری کورد» لە هەولێر دانراوە، ڕاپۆرتێکی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩یش باسی ئەوە دەکات کە ناوبراو پێوەندیی بە «عەونی یووسف»ەوە هەبووە و کاتێك عەونی بەند بووە داوای لێ کردووە ببێتە پارێزەری.[(٢٥٧)]

**«ساڵح ڕوشدی**

«ساڵح ڕوشدی» دوا کەسایەتیی کوردە کە بەم جۆرەی لای خوارەوە ناوی لە هەمان ڕاپۆرتدا هاتووە:

«ساڵح ڕوشدی:

کوردە، بۆ یەکەم جار لە مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٧دا سەرنجی ڕاکێشا، کاتێك ئەویش یەکێك بوو لە گوتەبێژەکانی ئاهەنگی «نەورۆز»ی لاوە کوردەکانی ئەو ساڵە کە لە هۆڵی «مەلیك فەیسەڵ» لە «بەغدا» سازکرا. بە

---

(257) Ibid, Abdul Qadir Rashid, PP.2-3.

پێی راپۆرتێکی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٨ ساڵح ڕوشدی یەکێك بوو لە یاریدەرانی «کامیل قازانجی» لە بواری رێکخستنی خۆنیشاندانێکدا (لە «بەغدا» —ك.م.) دژی «زایۆنیزم» و «ئیمپریالیزم»[٢٥٨].

«فوئاد بەهجەت»

دوا بە دوای ئەمانە لە هەمان فایلدا نۆرەی راپۆرتێکی حەوت لاپەڕەیی بەم ناونیشانەوە دێت:

«یەکجار نهێنی،

ژمارە:

س/٩١/سی/٢٦٣،

حیزبی شیوعیی عیراقی»

سەرجەمی ناوەرۆکی راپۆرتی ناوبراو بۆ ئاڵوگۆڕەکانی حیزب، تایبەت دوای گرتنی «فەهد»، تەرخان کراوە. لە بەشی (ب)ی خاڵی هەژدەمینی ئەو راپۆرتەدا دەربارەی «کورد» دەڵێت:

«ب.کاتێك «فوئاد بەهجەت» لە «کەرکووك»ەوە هاتە «بەغدا» بڕیاردرا بکرێتە ئەندامی یەدەگ «ئیحتیاط»ی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و پازدە پاوەنی پێدرا و داوای لێ کرا لقی کوردیی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دابمەزرێنێت، دواییش «فوئاد بەهجەت» کرایە سکرتێری رێکخراوی حیزب لە «بەغدا» و «ڕەفیق — ك.م.» «چالاك»یش گوێزرایەوە «کەرکووك» بۆ ئەوەی بکرێتە بەرپرسی ئەو لقە کوردییەی «حیزب —ك.م.» کە نیازە دابمەزرێنرێت[٢٥٩].

---

[258] Ibid, Salih Rushdi, P.3.

[259] Ibid, Top Secret, S.91/C/9/263, The Iraqi Communist Party, P.5.

## سەرنجی «نەتەوەپەرستانی عەرەب» بەرانبەر کۆمۆنیزم

دوا سەد و چوار لاپەڕەی ئەم فایلە بۆ ژمارەیەکی زۆر پاشکۆی چڕوپڕ تەرخان کراون کە گشتیان بێ گومان شایانی توێژینەوە و هەڵسەنگاندنی تایبەتین چ لە لایەن خودی «حیزبی شیوعیی عیراقی» خۆیەوە و چ لە لایەن پسپۆران و شارەزایانەوە. هەر بۆ نموونەیش دەڵێم سەرەتای پاشکۆی ژمارە (أ)ی ئەم بەشە بەم دروشمە دەستی پێکردووە:

«دروشمی ئێمە بریتییە لە: ڕیزەکانی حیزبەکەت پتەو بکە. تیۆریی شۆڕشگێڕانەی حیزبەکەت ئەمانت پێ دەبەخشێت» [٢٦٠].

لە هەمان پاشکۆدا ئەم هەڵسەنگاندنە وردەی پارێزەر و یەکێك لە سەرکردە هەرە چالاك و ناسراوەکانی «حیزبی ئیستیقلال» فایەق سامەڕائی [٢٦١]، دەربارەی کۆمۆنیزم گوتوویەتی:

«جارێکیان فایەق سامەڕائی گووتوویەتی: «ئەگەر کەسێك هەبێت لەو بڕوایەدا بێت کە لەوانەیە شیوعییەت لە ڕێگەی هێز و پۆلیس و دادگاییکردنەوە سەرکوت بکرێت ئەوا ئەو کەسە کەوتۆتە هەڵەیەکی گەورەوە– شیوعییەت لە بارودۆخی زۆرداری و فەوزا و برسێتی و هەژاریدا سەر هەڵدەدات» [٢٦٢] » [٢٦٣].

---

[٢٦٠] دەقەکەی بە ئینگلیزی بەم جۆرەیە:

"Our Slogan: Strengthen Your Partyis Organization. Its revolutionary theory give you security", "Ibid, Top Secret, Appendix (A), P.1."

[٢٦١] شایانی باسە دەڵێن «فایق سامەرائی» بە ڕەگەز کوردە، بۆخۆم قسەیەکی وەهام لە مێژوونووسی بەناوبانگ «عەبدولڕەزاق حەسەنی» بیستووە.

[٢٦٢] دەقی قسەکانی فایق سامەرائی بەم جۆرەیە:

"Faiq Samàrai declared once: if there are any people who belive that Communism could be checked and fought by force, the police and trials,

به هەمان دەستوور «فایق سامەڕائی» و هاوبیرەکانی داوای ئازادییان بۆ حیزبە نیشتیمانییەکان و «نەتەوەپەرستانی عەرەب» کردووە وەك هۆیەکی سەرەکیی بۆ دامەزراندنی «عیراق»ێکی دیموکراسی[٢٦٤].

they are quite mistaken: communism grows in an atmosphere of peresecution, famine and poverty) (N.A., F.O., 371/ 75130, Cypher, Top Secret, The Iraqi Communist Party, Appendix (A), P.1. "

(263) Ibid, P.1.

(264) Ibid, PP.1-8.

## گواستنەوەی «فەهد» بۆ بەندیخانەی «بەغدا»

ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ «حیزبی شیوعیی عیراقی» بەیانێکی ئاراستەی هەمووان کردووە و تیایدا باسی بڕیاری گواستنەوەی «فەهد» و هاوەڵەکانی لە بەندیخانەی «کووتەوە» بۆ بەندیخانەی «بەغدا» بە نیازی سەرلەنوێ دادگایی کردنیانەوە کردووە، و بەو جۆرە وەك دەڵێت، «کۆنەپەرستانی عیراق و ئاغاکانیان دەیانەوێت «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەناو بەرن». کۆتایی بەیاننامەکەیش بەم دروشمانە هاتووە:

«خەبات بکەن لە پێناوی ئازادکردنی هاوڕێ «فەهد»ی ڕەهبەری حیزبەکەمان و گشت بەندکراو و گیراوەکانی دیکە.

خەبات بکەن لە پێناوی ڕووخاندنی کابینەکەی «موزاحیم پاچەچی»دا و بۆ دامەزراندنی حوکمەتێکی دیموکراسیی پەسند لای گەل.

خەبات بکەن لە پێناوی جێبەجێکردنی ئامانجە شکۆدارەکانی ڕاپەڕیندا.

هەربژی دۆستایەتی «کورد» و «عەرەب» (٢٦٥) دژی ئیمپریالیزم» (٢٦٦).

---

(٢٦٥) لەدەقی بەڵگەنامەکەدا دروشمەکە بەم جۆرە هاتووە:

"Long live the Kurdish – Arab fienship against Imperialism"

شایانی گوتنە ئەو دروشمەیش لەوساوە بووە یەکێك لە دروشمە سەرەکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی».

(266) N.A., F.O., 371/ 75130, Cyper, top secret, The Iraqi Communist Party, Appendix (C), A great Appeal Addressed to all, 25.12.1949, PP.11-15.

## پوختەی ناوەڕۆکی پاشکۆکانی دیکە

بە هەمان دەستوور پاشکۆکانی دیکەی ئەم بەشەی فایلەکە بە زانیاریی بایەخدار و پێویست ئاخنراون تاوەکو دەگەینە پاشکۆی ژمارە «ف» کە بریتییە لە «نامیلکەیەکی ناوخۆ تەنها بۆ ئەندامەکانی حیزب»، بەڵام نووسەرانی ڕاپۆرتەکە مێژووی تەواوی دەرچوونی ئەو نامیلکەیەیان نەزانیوە و بە پێی مەزەندەی ئەوان لە نێوان مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ و مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩دا بڵاو کراوەتەوە. پاشکۆکە دوو لاپەڕە و نیوی پڕکردۆتەوە و بەم چەند دێرە دەستی پێی کردووە:

«برایان! ئەمە نە یەکەم و نە تاکە جارە حیزبەکەمان بە تایبەتی و بزووتنەوەی نیشتیمانی بە گشتی دەکەونە بەر شاڵاوی تیرۆری ئیمپریالیزمی نەگریسەوە، بەڵام تیرۆری ئەمجار یەکجار دڕندە و بێ ئەندازە توند و تیژە چونکە هەستیان بەو گورزە ترسناکە کرد کە ڕاپەڕینە بەرفراوانەکەمان وەشاندییە خودی ئیمپریالیزم»، ئینجا لە نۆ خاڵدا ئەرکەکانی سەر شانی ئەندامانی حیزب لەو قۆناغەدا دەستنیشان دەکات و لە کۆتاییشدا داوایان لێ دەکات بڕوایان بە کۆشش و خەباتی حیزب هەبێت لە پێناوی دامەزراندنی «نیشتیمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختەوەردا» «وطن حر و شعب سعید» کە لە زووەوە «فەهد» کردبوویە دروشمی سەرەکیی «حیزبی شیوعیی عیراقی»»[(٢٦٧)].

بەشێکی زۆری پاشکۆکانی هەمان فایل بریتین لە ئامۆژگارییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بۆ ئەندامەکانی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٨ و سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤٩دا کە قۆناغێکی یەکجار ناسک بوو لە ژیانیدا.

---

(267) Ibid,, Appindix (F), An Internal Bulletin for The Party Members Only, Dated not Known, Probably between December 1948 and January 1949, PP.18-20.

شایانی باسه لە کۆتایی پاشکۆی ژمارە (ﻫ)دا کە دیسانەوە یان لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا یان لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩دا دەرچووە حیزب داوا لە ئەندامەکانی دەکات لە کاتی خۆ نیشاندانەکانیدا (بە هیچ جۆرێك هێرش نەکەنە سەر هێزەکانی میری، بە پێچەوانەوە پێویستە هەوڵ بدەن ئەو هێزانە بەلای جەماوەردا رابکێشن لە رێگەی ژمارەیەك دروشمی راستگۆوە، هی وەك «هەر بژی یەکیەتی نێوان کرێکاران و سەربازان و قوتابیان لە کۆری خەباتدا دژی ئیمپریالیزم»، لەم رێگەیەوە دەتوانرێت رابکێشرێنە ناو ریزەکانی خۆنیشاندەرەکانەوە دژی دوژمن» [٢٦٨].

پاشکۆی ژمارە (م)یش بۆ ئەو هەشت پرسیارەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» کە مانگانە ئاراستەی ئەندامەکانی خۆی دەکات تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێرانی ناوەرۆکی ئەو پاشکۆیەیە:

«پاشکۆی ژمارە (م)،

ئەو پرسیارانەی هەموو مانگێك «لەلایەن حیزبەوە –ك.م.» ئاراستەی ئەندامەکانی دەکات و مێژووی نەزانراوە، لەوانەیە لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩دا بێت:

١- چەند جار ئەم مانگە لەگەڵتدا کۆبوونەتەوە؟

٢- ئایا کۆبوونەوەکانتان لە ماڵان بووە؟

٣- ئەو کتێب و بڵاوکراوانە چین کە پێکرا دیراسەتان کردوون؟

٤- رات چییە دەربارەی رێکخەر «منظم» ەکەت؟

٥- کۆبوونەوەکانتان لە موعەدەلدا چەند دەخایەنێت؟

٦- ئایا چالاکییە حیزبییەکانت لە ماوەی ئەم مانگەدا چی بوون؟

٧- کێشەکانت و پێشنیازەکانت و رەخنەکانت چین؟

---

(268) Ibid, Appindix (H), Instructions and Recommendations to all members, date not known, Probably December 1948- January 1949, PP.23-24.

٨- پارەی ئیشتیراکی ئەندامەتی و ئەو پارە و پوولانەی مانگانە «بۆ حیزبت -ك.م.» کۆکردوونەتەوە و ئەو دیارییانەی داوتنە حیزب هەموویان بنووسە» [٢٦٩].

هەرچی پاشکۆی ژمارە (پ)یە بریتییە لە نامەی ژمارە یەکی ڕۆژی یازدەی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ کە «ساسۆن دەلال» ناردوویە بۆ «عەبدوللەطیف ئەلسەعدی» لە «هەولێر» کە ناوی حیزبیی نادرە، نامەکە بریتییە لە لاپەڕە و نیوێك و حەڤدە خاڵ و سێ تێبینی. «ساسۆن صدیق دەلال» نامەکەی بەم ڕستەیە دەست پێکردووە:

«هاوڕێی خۆشەویست - سڵاوێکی گەرمی هاوڕێیانە، دوا نامەکانت گەیشتن».

لە خاڵی یەکەمیشدا دەڵێت:

«١- ئێمە هیچ مافێکی ئەوەمان نەداوەتە بەرپرسی «کەرکووك» کە نامەکانی تۆ بکاتەوە و بیانخوێنێتەوە، ئەوی پێویست بێت لەم بوارەدا دەیکەین».

لێرەیشدا ئەم تێبینییەی داوە:

«تێبینی: ژمارە یەك- «عەبدوللەطیف ئەلسەعدیی» بەرپرسی «هەولێر» بڕیاری داوە کتێبخانەیەك لە هەولێر بکاتەوە بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندێك بۆ گەیاندنی نامەکانی حیزب لە سەرکردایەتی حیزب و شوێنەکانی دیکەوە. ئەو بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە حەز دەکات دەمانچەکەی «ڕەووف یەحیای» [٢٧٠] ئەندامی حیزب کە ڕەسوڵ ناوی حیزبییەتی بفرۆشێت».

لە خاڵی نۆیەمیشدا باسی ڕۆژنامەی «الشعلة» دەکات و لە دامێنی پاشکۆکەدا پێمان دەڵێت:

---

[269] Ibid, Appendix (M), Questionnaires Directed to members monthly, Date not known, probably January 1949, P.31.

[٢٧٠] «ڕەووف یەحیا» خەڵکی شاری «سلێمانی»یە، هونەرمەندێکی ڕووخۆش و خۆی و هاوسەرەکەی لە ناو خەڵکدا زۆر خۆشەویست بوون، ساڵی ١٩٧٤ دایە پاڵ شۆڕشی کورد.

«الشعلة ڕۆژنامەیەکی نهێنی بوو «عەبدوللەطیف ئەلسەعدی» بە عەرەبی و کوردی بڵاوی دەکردەوە. تەنها یەك ژمارە لە «الشعلة» دەر چوو، چونکە حیزب فەرمانی وەستاندنی دا لەبەر ئەوە لە سیاسەتی ئەو ڕۆژنامەیە ڕازی نەبوو، کۆمیتەی ناوەندی حیزب لە بریتی «الشعلة» ڕۆژنامەی «صرخة العمال»ی بەزوبانی عەرەبی و ڕۆژنامەیەکی دیکەی بە زوبانی کوردی بەناوی «بانگی فەلاح»ەوە لە شاری سلێمانی دەرکرد. یەکەمیان «واتا ڕۆژنامەی صرخة العمال – ك.م.» لە لایەن «فوئاد بەهجەت»ەوە پەخش دەکرا کە ناوی حیزبی سەلام بوو، دووەمیشیان «واتا ڕۆژنامەی بانگی فەلاح–ك.م.» لە لایەن «حەمید عوسمان»ەوە پەخش دەکرا کە ناوی حیزبیی سابیر بوو».

لەخاڵی دوازدەمینیشدا ئەم پرسیارە دەکات:

«۱۲– ڕەسوڵ کێیە «بڕوانە تێبینیی ژمارە دوو»، چۆن و بۆچی هاتە ناوچەکەی تۆ؟».

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی تێبینیی ژمارە دووە:

«تێبینیی ژمارە دوو: ڕەسوڵ ناوی خواستەنیی ڕەووف یەحیای یاریدەری «عەبدوللەطیف سەعدیی» بەرپرسی «هەولێر» کە نادر ناوی حیزبییەتی.

ڕەووف خەڵکی شاری «سلێمانی»یە و جاران کاتبی ئینحیصاری تووتن بوو لە «کۆیسنجەق» و تاوەکو مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹٤۸ «سێرجانت»[۲۷۱] بوو لە «سلێمانی» و لەوسایشەوە بە فەرمانی حیزب گوێزرایەوە «هەولێر»، لەم چەندانەیشدا نێردرایەوە «سلێمانی» لەبەر ئەو ناکۆکییانەی لە نێوان ئەو و «عەبدوللەطیف سەعدی»دا ڕوویان دا»[۲۷۲].

---

[۲۷۱] وشەی (Sergeant) بە زوبانی ئینگلیزی واتای ڕەهبەری دە کەس و چاوەش دەگەیێنێت.

[272] N.A., F.O., 371/75130, Cypher,Top Secret,The Iraqi Communist Party, Appendix (P), Letter No.1 (11.12.1948), from Sason Dalal to Abdullatif al Sa`adi (Nadhir), Erbil.

دیسانەوە پاشکۆی ژمارە (ر) نامەیەکە «ساسۆن دەلال» کە ڕۆژی هەژدەی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ فوئاد بەهجەتی بەرپرسی لقی کەرکووکی «حیزبی شیوعیی عیراقی»، نەك هەر ئەوە بەڵکو بەشی سەرەکیی پاشکۆ و ڕاپۆرت و لێدوانەکانی دوا لاپەڕەکانی ئەم فایلە تەرخان کراون بۆ پێوەندییەکانی حیزب بە «فوئاد بەهجەت» و «کەرکووك»ەوە، هەڵبەت ئەوە لە خۆڕا نەهاتووە، شاری کەرکووك وەك ناوەندێکی کرێکاریی عیراق لە سەرەتاوە بایەخی تایبەتیی خۆی لای «حیزبی شیوعیی عیراقی» هەبوو، تایبەت دوای ڕاپەڕینە گەورەکەی «گاوڕباغیی» ساڵی ١٩٤٦. لە پاشکۆی ژمارە «ر»دا کە بریتییە لە نامەیەکی دوور و درێژ کە «ساسۆن دەلال» لە ڕۆژی هەژدەی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا ناردوویە بۆ «فوئاد بەهجەتی ڕەهبەری کەرکووك» [٢٧٣] و دەلال لە سێ لاپەڕە و بیست و سێ خاڵی چڕوپڕدا ئاماژە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە کار و ئەرکەکانی حیزب لە «کەرکووك» دەکات وەك گەیشتنی نامەکانی ناوچەکە و زوو زوو ئەوە دووپات دەکاتەوە کە «حیزبی شیوعیی عیراقی» «بەر لە هەر شت حیزبی چینی کرێکارە» «بڕوانە خاڵی نۆیەم» و هەمیشە مەرکەزی حیزب ویستوویەتی ئاگاداری ئەوە بێت کە ئایا:

١- ژمارەی کرێکارانی ناوچەکە چەندە.

٢- ژمارەی کرێکارانی شارەزا و نەشارەزا چەندن.

٣- ڕۆژانەیان چەندە و بارودۆخی کارکردنیان چۆنە.

٤- هەستی چینایەتی و هەستی نەتەوایەتییان چۆنە «بڕوانە خاڵی نۆیەم» [٢٧٤].

[273] Ibid, Top Secret, Appendix (R), Letter(18.12.1949) From Sason Dalal to Fuad Bahjat, Leader in Kirkuk, PP.38-40.

[274] Ibid, PP.38.

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی خاڵی چواردەیەمی پاشکۆکەیە:

«ئێمە هیچ دەربارەی «خانەقین» نازانین، تۆ پێویستە لە ڕێگەی ئەو هەواڵنێرەوە کە دەچێتە ئەوێ ئاگاداری وەزعەکە بیت و ئێمە پێویستیمان بە زانیارییە دەربارەی «خانەقین»[٢٧٥].

لە خاڵی نۆزدەیەمیشدا «ساسۆن صدیق دەلال» لە «فوئاد بەهجەت» دەپرسێت:

«١٩- ئاخۆ وەزعی ڕێکخراوەکانی لادێ «جووتیارەکان» چۆنە، تایبەت لە ناوچەی «قادر کەرەم»[٢٧٦].

پاشکۆی ژمارە «س» نامەی ژمارە دووی «ساسۆن صدیق دەلال»ە کە ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ «عەبدوللەطیف سەعدی» لە «هەولێر»، نامەکە لاپەڕە و نیوێك و دوازدە خاڵە و گشتیان تەرخان کراون بۆ کاری حیزب لە «کوردستان»، وەك گرتنی یەکێك لە حەیدەرییەکان لە هەولێر لە ڕۆژی سی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٩دا و یاریدەدانی خێزانی «حەمید عوسمان» و کێشەی «ئەو دوو دینارەی کە «کەرکووك» لە «عەبدوللەطیف سەعدی»ی داوا دەکاتەوە» و «ساسۆن دەلال» داوا لە «عەبدوللەطیف» دەکات چ ئەو کێشەیە و چ کێشەکانی دیکە «بە خێرایی و بە گیانی هاوڕێیەتی حیزبییانە» چارەسەر بکرێن و خاڵی یازدەمینیش بۆ بابەتی پێوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی»بە «پارتی دیموکراتی کوردی» یەوە تەرخان کراوە و ئەمەیش دەقی وەرگێڕانی لایەنە بایەخدارەکانی ئەو خاڵەیە:

«کۆیسنجەق» و «ڕەواندن» ئاگادار بکە کە هەڵوێستمان بەرانبەر پارتی[٢٧٧] لە بواری پێکهێنانی «بەرەیەکی نیشتیمانیی یەکگرتوو» دا لە

---

(275) Ibid, P.39.

(276) Ibid, P.39.

نامەیەکی دواتردا ڕوون دەکەینەوە و تۆیش دەتوانیت ئەوە بکەیتە پرۆگرامی کاری ڕۆژانەی خۆت»[٢٧٨].

پاشکۆی ژمارە «ت» دیسانەوە نامەیەکی دوور و درێژی «ساسۆن صدیق دەلال»ە کە ڕۆژی بیست و نۆی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ناردوویە بۆ «فوئاد بەهجەت» لە «کەرکووك»، نامەکە بریتییە لە نزیکەی شەش لاپەڕە و نۆزدە خاڵ، دواخاڵی، واتا خاڵی نۆزدەیەم، دوو لاپەڕە و نیوی پڕکردۆتەوە کە هەمووی باسی «ئەکرەم» ناوێکی[٢٧٩] ئەندامی حیزب دەکات و گەلێك ڕەخنەی لێ دەگرێت و بەشێك لە بیروبۆچوونەکانی بە بۆرجوازی لە قەڵەم دەدات کە ئەو ڕۆژگارە لای «حیزبی شیوعیی عیراقی» تاوانێکی گەورە بوو[٢٨٠].

پاشکۆی ژمارە(یو) بریتییە لە نامەیەکی «ساسۆن صدیق دەلال» کە ڕۆژی یەکی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «جەواد کاظم»ی بەرپرسی لقی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە «حلە» و تێیدا وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە ناوبراو ئاراستەی سەرکردایەتی حیزبی کردوون[٢٨١].

---

(٢٧٧) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ژمارەی سێ لەسەر وشەی «پارتی» دانراوە و لە ژێرەوە دەڵێت: لە «کوردستان» (پارتی) بووەتە زاراو بۆ ئاماژەکردن بۆ ناوی «پارتی دیموکراتی کوردی».

(278) N.A., F.O., 371/ 75130, Cypher, Top Secret,Letter No.2 (28.12.1949) From Sason Dalal to Abdullatif Sa`adi in Erbil, PP.41-42.

(٢٧٩) دوور نییە مەبەستی دوکتۆر «ئەکرەم یامولکی» بێت کە یەکێك بوو لە ڕەهبەرە دیارەکانی (النجمة).

(280) N.A., F.O., 371/75130, cypher, Top Secret, Appendix (T), Letter No.3(23.12.1948) From Sason Dalal To fuad Bahjat at Kirkuk, PP.42-47.

(281) Ibid, Appendix (U), Letter (1.1.1949) From Sason Dalal in Answer to questions put to him by Jawad kadhim, responsible member of Hilla, PP.47-49.

پاشــكۆی ژمــاره (دەبــل یــو)یش بریتییــە لــە نامــەی ژمــارە دەی «عەبدوللەطیف سەعدیی» بەرپرسی «هەولێر» کە ڕۆژی دووی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» و پڕییە لە زانیاریی بایەخدار و دەگمەن کە بەڵگـەن بـۆ ڕادەی پەلهاویشـتنی «حیزبـی شـیوعیی عێراقی» لە زۆربەی ناوچە کوردییەکاندا و وا لـە خـوارەوە دەقـی وەرگێڕانـی ناوەڕۆکی بەشی زۆری ئەو بەڵگەنامەیە، کە بریتییە لە نزیکەی دوو لاپـەڕە و دە خاڵ، پێشکەشی دەکەین:

«٢- پـۆلیس بـە زۆر گشـت قوتابییـەکانی ناردوونەتـەوە ناوچـەکانی خۆیان[٢٨٢]، هەرچـی کادرەکـانی خۆمـانن «لـەنێو ئـەو قوتابییانـەدا -ك.م.» هێشتوومانەتەوە و تەنها بە شەو ڕێگەیان دەدەینێ بچنە دەرێ.

٣- بیست کەس لە برایانمان حوکم دران بە ساڵێك تاوەکو سێ ساڵ کـە دووانیان لە کادرە قوتابییەکانی حیزبن و یەکێکیان کادری کرێکاری حیـزب و دووانیان سێرجانتن و[٢٨٣] شەشـیان ئەنـدام و سـیانیان کاندیـدات «مرشـح» و شەشیشیان موئەیدن، وێڕای ئەوە «ئەنوەر سـالح» و «جـەلال» هـەر یەکـەیان حوکمی سێ ساڵ دراون.

٤- ڕۆژی شــەممەی بیســت و دووی کــانوونی دووەمــی ســاڵی ١٩٤٩ برادەرانمــان ئامــادەی ســازکردنی خۆنیشــاندان بــوون و لــە کــات و شــوێنی دیــاریکراودا دەســتیان کـردە گردبوونــەوە، بـەلام پـۆلیس پێیـانی زانـی و پــەلاماری دان، پێکـدادان لــە نێـوان هــەر دوو لادا دە دەقیقـەی خایانـد و سەرئەنجام برادەرەکانمان ناچار بوون بلاوەی لێ بکەن، ئەنجام جەلال و[٢٨٤]

---

[٢٨٢] ئەوسـاکە تـەنها لـە شـاری «هـەولێر» خـۆی قوتابخانـەی ناوەنـدی هـەبوو، قوتابییـانی ناوچەکانی دیکە لەوێ دەیانخوێند.

[٢٨٣] دەربارەی واتای وشەی (Sergeant) بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٢٧١.

[٢٨٤] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە داخەوە پتر لە جارێك نـاوی هـەر بـە جـەلال دێـت بـێ ئـەوەی ئاماژە بۆ ناوی باوکی یان نازناوی بکەن.

ژمارەیەك هاوڕێمان كوژران، خودی جەلالیش هەمووی چەند ڕۆژێك بوو لە زیندان ئازاد كرابوو، تاوانی ئەو زیانەیش دەكەوێتە ئەستۆی «عیزەت» كە كادیرێكی قوتابییانە و خەڵكی «كۆیسنجەق»ە و دانرابوو بە ڕەهبەری خۆنیشاندانەكە و یەكسەر ڕووخا و حسێبی بۆ ئەوە نەكردبوو كە لەو شوێنەداماڵی ژمارەیەكی زۆر لە «ئیخوان موسلیمەكان» هەیە، ئەوانەی هەر ئەوەندە خەڵكەكە كۆبوونەوە پۆلیسیان ئاگادار كرد، كاتێك پێكدادان لە نێوان هەردوولادا گەیشتە لووتكە و پیاوەكانمان لە هەڵمەتبردندا بوون بورهانی ڕەهبەر هەڵهات و ئەوەیش بووە هۆی شڵەژانی جەماعەتی ئێمە، بەو جۆرە خۆنیشاندانەكە لە سەرەتاوە بڕایەوە، سەرباری هەموو ئەوانەیش «بورهان» كەوتە ڕەخنەگرتن لە سیاسەت و سەركردایەتیی حیزب، بەرانبەر بەوە ئێمەیش لە حیزب دەرمانكرد و گشت دەسەڵاتێكمان لێی سەندەوە و چاوەڕوانی بڕیارتانین.

هەرچی «ئەنوەر عەبدوڵڵا» یشە، كە لە «كەركووك» گیرابوو، ئەویش ڕووخاوە و بەر لە ڕۆژی بیست و یەكی مانگ ئێرەی جێهێشت، بۆیەكا ئێمەیش لە حیزب دەرمان كرد، ئەنوەر دوو شانەی كەسانی خوێندەواری بەڕێوە دەبرد، ئەو دوو شانەیشمان لێی سەندەوە و چاوەڕوانی دوا بڕیارتانین.

هەمان كات «ڕەفعەت ئیسماعیل»، كادیرێكی كرێكارە، ڕۆژی بیست و یەكی مانگ هەر ئەوەندە بیستی لەوانەیە داوای لێ بكرێت لە خۆنیشاندانەكەدا بەشدار بێت ئێرەی جێهێشت، وێڕای ئەوە بەوەیشمان زانیوە كارێكی میری لە زێبار «لیوای «مووسڵ» دەستكەوتووە بێ ئەوەی سەرەتا ئێمە ئاگادار بكات، بۆیەكا دەستیمان لە گشت كارە حیزبییەكانی پێ كێشایەوە و چاوەڕوانی ئامۆژگاریتان دەكەین، هەرچەندە پێمان وایە پێویستە لە حیزب دوور بخرێتەوە.

بە پێچەوانەی ئەوانەوە تاقیكردنەوەكانی خۆمان ژمارەیەك قارەمانیان بۆ دەرخستین كە هەرگیز بەو جۆرە چاوەڕوانمان نەدەكرد ئەوان هێندە ئازا

بن، ئێمە ڕەفعەت و بورهانمان بە قارەمان دەزانی کەچی لە یەکەم پێکداداندا هەڵهاتن بۆیەکا پێشنیاز دەکەین ئەو جۆرە کەسانە بە یەکجارەکی لە حیزب دوور بخرێنەوە، تکایە لە ئامۆژگاریی خۆتان ئاگادارمان بفەرموون.

٥- «ئیسماعیل ڕەسول» یەکێکە لەو هاوڕێیانەمان کە ڕۆڵێکی قارەمانانەی کەم وێنەیان لە خۆنیشاندانەکەدا بینی، «ئیسماعیل» یەکێکە لەوانەی پیاو دەتوانێت پشتیان پێ ببەستێت، هەروەها «خەلیل عەزین»ی کرێکار، زۆر باش ئاگاداری ئەم سیانە بن، هەرچی «ئەنوەر سالح»یشە، کە ناوی خواستەنیی «جەلال»ە، یەکێکە لەوانەی دەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت و باش لە لایەن حیزبەوە ناسراوە. با هاوڕێکانمان لە بەندیخانە پێوەندیی بە ئەنوەر و هاوڕێکانی دیکەوە بکەن.

هەروەها ئێمە پشتگیریی یەکێکیمان بیستووە کە ناوی «حەسەن عەلی غالب»ە[٢٨٥] و کوڕی ئەفسەرێکی پۆلیسە، بەڵام تاوەکو ئێستا لە شانەیەکی موئەیەدینی حیزبدا وەرنەگیراوە لەبەر پۆستەکەی باوکی، حسەین «لە خۆنیشاندانەکەدا -ک.م.» قارەمانێتی و چاونەترسی و گیانفیدایی نواند، پێویستە ئاگاداری بین.

هەروەها «باهیر مستەفا»یشمان هەیە کە ئەویش کوڕی ئامێر حامییەکە و شایانی ئەوەیە ئاگاداری بن. بە گشتی سەرجەمی هاوڕێکانمان لێرە وەك پاڵەوان ڕەفتاریان کرد، بەڵام من تەنها ئاماژەم بۆ ناوی ئەوانەیان کرد کە یەکجار دیار بوون و ئێوە دەتوانن لە دوارۆژیشدا پشتیان پێ ببەستن[٢٨٦].

---

[٢٨٥] کاک «حەسەن عەلی غالب نەقشبەندی»م لە نزیکەوە دەناسی، کوڕێکی ساکار و ئازا و لە خۆبردوو بوو، لە پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە هاوڕێی «دوکتۆر حسام»ی برای بووم کە ئەویش دوکتۆرای لە مێژووی ئیسلامیدا وەرگرتووە و چەند جارێك لە کتێبی «مێژوودا» باسیم کردووە. بڕوانە: کەمال مەزهەر، مێژوو، کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو، بەغدا، ١٩٨٣، ل٢١٠-٢١١، ٣٠٢-٣٠٧.

[٢٨٦] لێرەدا نووسەرانی ڕاپۆرتەکە تێبینییەکیان ڕاگەیاندووە دەڵێت «هەموو ئەو کەسانەی لە لاپەڕەی پێشوودا ناویان هاتووە و بەشدارییان لە خۆنیشاندانەکاندا کردووە بە ساڵێك تاوەکو سێ ساڵ حوکمی قورس دراون».

٦- تـازه بـەوەمان زانـی کـه دوابـەدوای خۆنیشـاندانەکەی «شـەقلاوه» هەژده کەس و لـه «ڕەوانـدزیش» بیسـت و یـەك کـەس گـیراون. هـەمان کـات بەوەیشـمان زانـی کـه لـه کۆیسـنجەقیش خۆنیشـاندان کـراوه، بـەلام هـیچ زانیارییـەکی فـەرمیمان دەربـارەی نییـه، دوای ئـەوەی ئەمـەتان پێـدەگات ئامۆژگاریتان چییه؟».

له دوا خاڵی هەمان پاشکۆیشدا ئەمەی لای خوارەوه نووسراوه:

«لـه نامیلکەیەکدا ئـەوەمان خوێنـدەوه کـه هاوڕێکانمـان لـه بەندیخانـه سرودی حیزبیان گوتووه، ئایا دەتوانن کۆپێیەکیمان بۆ لێ بنێرن؟»[٢٨٧].

پاشـکۆی دواتـر نامـەی ژمـاره چـواری ڕۆژی شەشـی مـانگی کـانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩یه له «ساسۆن صدیق دەلال»ەوه بـۆ «فوئـاد بەهجـەت» لـه کـەرکوك»، نامـەی ئـەمجارەیان کورتـه و ئەمانـەی لای خـوارەوەیش ناوەرۆکی خاڵه گرنگەکانین:

«نامەی ژماره نۆی ڕۆژی بیست و شەشی مانگی کانوونی یەکەمی سـاڵی ١٩٤٨ت گەیشت.

١- ئـەو بڕیـارەی داوتـه کـه لـه شـانەکانی حیزبـدا موحازەرەیـەك بـه ناونیشانی «حیزبێکی شیوعی نەك سۆشیال - دیموکرات» پێشـکەش بکەیت بڕیارێکی تەواو ڕاست و دروسته.

٢- پێوەنـدیمان بـه «خانـەقین»ەوه بەرهەمـدار بـوو، ئەگـەر دەتوانیـت پێوەندییان پێوه بکه و گشت بڵاوکراوه و تەعلیماتـەکانی «حیزبیـان - ك.م.» بـۆ بنێـره. بـا جارێکـا پێوەنـدییان بـه تـۆوه بێـت تـاوەکو تێبینیی دیکەتان «بۆ دەنێرین -ك.م.»، ئامۆژگاریمان دەربارەی ئەم بابەته بدەنێ.

[287] N.A., F.O., 371/75130, Cypher, Top Secret, Appendix (W), Letter No.10(2.1.1949), From Abdullatif Sa`adi, Erbil, To Sason Dalal, PP.49-51.

٣- داوامان له «سلێمانی» كرد یاریدەی عەینی و كاش «مانگی هەشت دیناری عیراقی»ت بدەنێ، ئەگەر لەوە زیاترت پێویستە ئاگادارمان بكە.

٤- هاوڕێ «خالید»مان «ناوەكەی تەواو نەزانراوە» ناردە لات تاوەكو كارێك لە كۆمپانیای «نەوتی «خانەقین» -ك.م.» دەدۆزێتەوە. دوای بیست ڕۆژ لە دەستبەكاربوونی نامەیەكمان دەربارەی چالاكییەكانی بۆ بنێرە».

دوا بەدوای ئەمە سێ پرسیاری ئاسایی لێ دەكات و ئینجا لە خاڵی هەشتەمدا دەڵێت:

«٨- پەنجا دانە كۆپیی یادداشتێكی «حیزبمان- ك.م» بە عەرەبی و دانەیەكمان بە كوردی بۆ ناردی. ئەگەر پێویست بوو وێنەیان لەسەر بگرەوە و ژمارەكانی بەسەر ئەندامانی حیزبدا دابەش بكە و لە ڕێگەی ئەوانیشەوە بیانگەیێنە جەماوەر. هەروەها داوات لێ دەكەین یادداشتەكە وەرگێڕیتە سەر زوبانی كوردی تاوەكو برا كوردەكانمان بتوانن بیخوێننەوە، ئێوارەی شەممەی ڕۆژی هەشتی مانگی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ و دەقاودەق لە سەعات حەوت و نیودا بۆ دابەشكردنی «بەیاننامەی -ك.م.» «بۆ هەمووان» دەستنیشان كراوە. وەرگێڕان و وێنەگرتنەوەی بسپێرن بە دوو ئەندامی سكرتارییەت.

٩- دوای دابەشكردنی بەیاننامەی «بۆ هەمووان» كارێكی ئەوتۆ بكەن ئەندامەكانمان پێوەندی بە هاوڕێ پارتییەكانیانەوە و گشت جەماعەتە سیاسییەكانی دیكەوە بكەن و هەوڵ بدەن پاڵیان پێوە بنێن بەرەو بەرەیەكی یەكگرتوو، خۆ ئەگەر هاتوو ڕەهبەرەكانیان لەم بارەیەوە داوای موفاوەزاتیان كرد «دەها باشتر- ك.م.» هتد.هتد.هتد «تێبینی: بڕوانە نامەكانی پێشوو»، دەربارەی ئەنجامەكان ڕێنماییمان بكە.

١٠- یەکسەر دیارییەکان بنێرە بۆ «هەولێر» و «سلێمانی» [(٢٨٨)].

پاشکۆی دواتریش نامەی ژمارە سێی ڕۆژی شەشی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ی «ساسۆن صدیق دەلال»ە بۆ «عەبدوللەطیف ئەلسەعدی»ی بەرپرسی «هەولێر» و بریتییە لە دە خاڵی ئاسایی [(٢٨٩)].

هەرچی پاشکۆی ژمارە «PP»یشە بریتییە لە یەکەم نامەی «ساسۆن صدیق دەلال» کە ڕۆژی هەشتی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «حەمید عوسمان» لە «سلێمانی». نامەکە کورتە و لە چوار خاڵی سەرەکی پێکهاتووە و ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

«١- ڕاپۆرتی مانگانەت گەیشت. لە دوا نامەماندا تەعلیماتمان دەربارەی ڕێکخراوی قوتابییان و ڕێکخراوی ناوچەیی بۆ ناردی- بە پێی ئەو تەعلیماتە کار بکە و هەوڵیش بدە کرێکاران بهێنیتە سەر ڕێگە.

٢- عەرزوحاڵی خێزانە بەندە سیاسییەکانمان بۆ دابەشکردن بەسەر ئەندامانی حیزب و جەماوەردا بۆ ناردن.

٣- چەند پۆستەرێکی کوردیمان بۆ بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامەی «جووتیاران»دا بۆ ناردوویت، وێنەکان هەمان کات شێوازی کارکردن لە ناو ڕیزەکانی جوتیاراندا نیشانی تۆیش دەدات. وێنەی ئەو پۆستەرانە بنێرە بۆ «کەرکووك» و «هەولێر».

٤- پلانی پۆستەرەکان - حەرەس ئامادە بکە و مەشقیان پێ بکە تاوەکو چ ئەوان و چ کۆمەڵانی خەڵك بۆ مانگرتن و خۆنیشاندان ئامادە بن بە مەبەستی ڕووخاندنی «نوری سەعید» و «دامەزراندنی ڕژێمێکی میللیی دیموکراسی و دەستوبرد هەر تێبینییەکی دیکەمان هەبێت ئاگادارتان دەکەین» [(٢٩٠)].

---

(288) Ibid, Appendix (Y), Letter No.4(6.1.1949) From Sason Dalal to Fuad Bahjat, Kirkuk, P.52.

(289) Ibid, P.53.

(290) Ibid, Appendix (AA), Letter No.1(8.1.1949), From Sason Dalal to Hamid Uthman, Sulaimanya, PP.53-54.

پاشکۆی ژماره «ب. ب»یش بریتییه له نامەی ژماره پێنجی ڕۆژی شازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ له «ساسۆن صدیق دەلال»ەوە بۆ «فوئاد بەهجەت» له «کەرکووك». ئەم نامەیەیان له پێنج لاپەڕە و شازدە خاڵی سەرەکی پێکهاتووە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی پوختەی ناوەڕۆکیانە:

«١- هەردووك نامەی ژماره یەك و دووی ڕۆژانی پێنج و یازدەی مانگی کانوونی دووەمی «ساڵی ١٩٤٩-ك.م.» و ڕاپۆرتی مانگانە و کورتە حسابێك و گشت هاوپێچەکانی دیکەمان پێ گەیشت تەنها ئەو مەنیفستۆیە نەبێت کە خۆت دەربارەی هاوڕێ «فەهد» پێشنیازت کردبوو.

٢- ئێمە لەگەڵ ئەو پێشنیازەت داین کە تۆ وتارێك دەربارەی تێبینییەکانمان دەرحەق کرێکارانی کۆمپانیای «نەوتی کەرکووك» [٢٩١] بۆ بلاو کردنەوەی له ڕۆژنامەی «الصرخة» دا بنووسیت.

٤- لەگەڵ ئەو داوایەتدا نین کە مانگی یەك دیناری عیراقی بۆ هاوڕێ ڕەفیق «چالاك -ك.م.» و سێ دیناری عیراقی بۆ هاوڕێ ئەحمەد «غەفور-ك.م.» ببڕدرێتەوە.

٥- گشت ژماره کۆنەکانی ڕۆژنامەی «الصرخة» له ناوبەرە و دوای ناردنی ڕەشنووسی ناوەڕۆکی بۆ مەرکەز دەستبکەرە دەرکردنی ژماره نۆی و ئەم ئامۆژگارییانەیش وەبەر چاو بگرە: ئێمە هەستمان بەوە کردبوو کە ڕۆژنامەی ناوبراو ئەم کەم و کورتییانەی تێدا بوو:

أ- هەڵەی ئابووری و تەرکیز کردنە سەر ئەو لایەنە و دابڕینی له بارودۆخی هێرشی سیاسیی چینی کرێکار.

---

[٢٩١] له دەقی بەڵگەنامەکەدا بە زوبانی ئینگلیزی وەها هاتووە:
"and drive the warrers to the streets".
شایانی باسیشە له دەقی بەڵگەنامەکەدا خاڵی ژماره سێ نییە.

ب- هەڵوێستی هەڵە بەرانبەر چەپڕەوی، وەك هەڵوێستی دژ بە هەلپەرستی و هەستی چینایەتییان کامڵ بێت.

ج- خۆ تەرخانکردن تەنها بۆ کاروباری ناوچەیی کرێکاران وەك ئەوەی بە تەنها چینی کرێکار لە ئارادا بێت، هەر لەبەر ئەوەیشە کە هیچ هەوڵێك نادرێت بۆ کەڵك وەرگرتن لە پێوەندییە چینایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و ڕوونکردنەوەیان، وەك باروودۆخ و هەڵوێستی دەوڵەتان و جووتیاران و قوتابییان و کرێکاران لە جیهاندا، وێرای گەلێك دیاردەی دیکە.

د- وتارەکانی بە زوبانێکی ساکار و ڕەوان دانەدەڕێژران بە جۆرێك لەگەڵ نزمیی هەستی چینایەتی کرێکاراندا بگونجێن، چونکە شێوازی نووسینەکەی پڕی بوو لە حەشو و قسەی قۆڕ[٢٩٢] و بێ تام. «پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین- ك.م.» کە جەماوەر لە خودی ژیانەوە فێر دەبێت، ئەوان وانەی شۆڕشگێڕی لە دیاردەکانەوە فێر دەبن نەك لە وشەی پفدراوی شۆڕشگێڕانەوە.

ه- جگە لەوانەی سەرەوە ڕۆژنامەی «الصرخة» ناوەڕۆکی ئیمپریالیزم و وکارەکانی وەك ئیحتیکارکردنی نەوتی وەك پێویست ڕیسوا نەکردووە».

دوا بەدوای ئەم زنجیرە ڕەخنە وردانە «ساسۆن صدیق دەلال» لە پێنجەمین نامەیدا بۆ «فوئاد بەهجەت» لە کەرکووك داوا دەکات ڕۆژنامەی «الصرخة» لە داهاتوودا گشتیان وەبەرچاو بگرێت و بۆ ئەم مەبەستەیش گەلێك شتی لە بەرهەمە بە ناوبانگەکەی لینین «دەبێ چی بکەین؟»[٢٩٣] وەرگرتووە.

---

[٢٩٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی "nonsense"ی بە کار هێناوە کە بە عەرەبی واتای «هذيان وكلام فارغ» دەبەخشێت.

[٢٩٣] بە زوبانی ئینگلیزی "What is to be done?" نووسراوە کە بەزوبانی عەرەبی «ماالعمل؟» دەگەیەنێت، «ماالعمل؟»یش یەکێکە لە بەرهەمە بە ناوبانگەکانی لینین.

٦- بەشی دووەمی دروشمەکانمان بۆ بلاو کردنەوە بۆ ناردیت کە دەربارەی کرێکارانن و دەشبێت «ئاگادارمان بکەیت-ك.م.» دەربارەی هەر بابەتێك دەتەوێت بینووسیت.

٧- وا لە خوارەوە ئەم تێبینییانەت دەربارەی ئیمپریالیزم و پرسی نەتەوەیی بۆ دەنێرین، پێویستە بە وردی لەگەڵ گشت بابەتەکانی دیکەدا دەربارەی کێشەکانی کرێکاران لە کۆبوونەوەکانتا لەگەڵ ڕێکخەرە بالآکانی کرێکاراندا دەرسیان بکەیت».

دوا بە دوای ئەمە «ساسۆن صديق دەلال» لە حەوت خاڵدا مەبەستەکانی خۆی بۆ «فوئاد بەهجەت» ڕوون کردۆتەوە کە هەموویان دەربارەی سەرمایە و مۆنۆپۆلی و بانك و هەناردنی سەرمایە «تصدير الرأسمال» و «پرۆژەی مارشاڵ»ن و ئاماژەیش بۆ ناوی شەش کتێبی «کارڵ مارکس» دەکات کە وەرگێڕدراونەتە سەر زوبانی عەرەبی و یەکێکیان «سەرمایە» «الرأسمال»ە بەناوبانگەکەی مارکسە و یەکێکی دیکەشیان ئەو کتێبەی لینینە کە ناوی لێ ناوە «ئیمپریالیزم بەرزترین قۆناغی سەرمایەدارییە» «الاستعمار أعلى مراحل الرأسمالية» و بە «فوئاد بەهجەت»یش دەڵێت «لە هەر شوێنێکی ناوەڕۆکی ئەم کتێبانە تێنەگەیشتی دەتوانیت دەربارەیان ئاگادارمان بکەیت».

لە خاڵێکی سەربەخۆیشدا «ساسۆن صديق دەلال» ئەو قسەیەی «ستالین» بۆ «فوئاد بەهجەت» دێنێتەوە کە لە لاپەڕە سەد و چواردەی ئەو کتێبەیدا بە ناوی «پرسەکانی مارکسیزم و نەتەوە و ئیمپریالیزم»ەوە بلاو کراونەتەوە و تێیدا دەڵێت:

«دوا سەرکەوتنی پرۆلیتاریا هەرگیز نایەتە دی بەر لەوەی گشت نەتەوەکان و وڵاتە ژێردەستە ناسەربەخۆکان لە چەوساندنەوەی ئیمپریالی قوتار دەکرێن» (٢٩٤).

(294) N.A., F.O., 371/ 75130, Cypher, Top Secret, Appendix (BB), Letter No.5(16.1.1949), From Sason Dalal, to Fuad Bahjat, Kirkuk, P.54-59.

هەرچی پاشکۆی دواتریشە بریتییە لە نامەیەکی ئاسایی «ساسۆن صدیق دەلال» کە ڕۆژی شازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «عەبدوللەطیف سەعدی» لە «هەولێر» [(٢٩٥)].

پاشکۆی دوای ئەویش نامەیەکی کورتی «دەلال»ە کە دیسانەوە ڕۆژی شازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ «ساسۆن صدیق دەلال» ناردوویەتی بۆ «حەمید عوسمان» لە «سلێمانی» کە لە چوار خاڵدا باسی کارەکانی حیزب و تایبەت چاپی کوردیی بەرهەمە حیزبییەکانی بۆ دەکات [(٢٩٦)].

پاشکۆی دوای ئەو لە «ساسۆن صدیق دەلال»ەوە بۆ زەکی «وەطبان» لە «بەصرە»یە [(٢٩٧)].

دیسانەوە پاشکۆی دواتر لە «ساسۆن صدیق دەلال»ەوەیە بۆ «صەبری عەبدولکەریم» لە «بەصرە» کە ڕۆژی حەڤدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩بۆی ناردووە [(٢٩٨)].

پاشکۆی دواتر دیسانەوە نامەیەکی «ساسۆن صدیق دەلال»ە بۆ «فوئاد بەهجەت» لە «کەرکووک» کە ڕۆژی نۆزدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ [(٢٩٩)] بۆی ناردووە. لەم نامەیەیدا «ساسۆن دەلال»، «فوئاد بەهجەت» لەوە ئاگادار دەکات کە ئەمانەی لای خوارەوەی بە دەستی بۆی ناردوونەتەوە:

---

(295) Ibid, Appendix (CC), Letter No.1(16.1.1949), from Sason Dalal to Abdullatif Sa`adi, Erbil, PP.59-62.

(296) Ibid, Appendix (DD), Letter No.2(16.1.1949), from Sason to Hamid Uthman,Sulaimanya, P.62.

(297) Ibid, Appendix (EE), Letter No.1(16.1.1949), from Sason Dalal to Zaki Watban, PP.62- 64.

(298) Ibid, Appendix (GG), Letter (17.1.1949), from Sason Dalal to Sabri AbdulKarim in Basra, PP.64-65.

(٢٩٩) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە بریتی ساڵی ١٩٤٩ بە هەڵە نووسراوە ساڵی ١٩٤٨.

«أ- راپۆرت دەربارەی خالید.

ب- راپۆرت دەربارەی صالح.

ج- پرسیار و وەڵامەکانیان پێویستییان بە نامەیەکی تایبەتییە.

د-نامەی ژمارە سێی ڕۆژی چواردەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ت، کە لە نامەی سەرەوەتدا ئاماژەت پێداوە، تاوەکو ئێستا نەگەیشتووە. هەرچی نامەکانی ژمارە یەك و دووتن، کە ڕۆژی پازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردووتن، گەیشتن و ئێمەیش لە نامەی ژمارە پێنجی ڕۆژی شازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ماندا وەڵاممان داویتەوە».

لە خاڵی پێنجەمیشدا دەڵێت:

«٥- وتارەکەتمان بە ناونیشانی «پرۆژەی کوردی و کێشەی کورد»ەوە خوێندەوە، پێمان وایە پێویستی هەیە بە:

١- بە فەسڵێکی مێژوویی و لێکدانەوە «ئەنالیز - تەحلیل».

٢- شەرح و بنەما دانان «بۆ دیاردەکان- ك.م.» و دەرخستنی حەتمییەتی یەکیەتیی شۆڕشگێڕانە لە نێوان پرۆلیتاریا و بزووتنەوە نەتەوەییەکان و بەو جۆرەی لە نامەی پێشووماندا بۆمان ڕوون کردوویتەوە، وتارەکەشت بۆ دەنێرینەوە»[٣٠٠].

هەر دووك پاشکۆی دواتریش لە «ساسۆن صدیق دەلال»ەوەن بۆ ڕێکخراوی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە بەصرە[٣٠١].

هەرچی پاشکۆی ژمارە «ك ك»یشە بریتییە لە نامەیەکی «ساسۆن صدیق دەلال» کە ڕۆژی بیست و سێی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «گشت ئەندامە بەرپرسەکانی لیواکان»ی حیزب. نامەکە بریتییە لە نزیکەی دوو لاپەڕە و چواردە خاڵ کە گشتیان بۆ ئامۆژگارییەکانی «حیزبی

(300) N.A.,F.O. 371/75130, Cypher, Top Secret, Appendix (HH), Letter No.6(19.1.1949), from Sason Dalal to Fuad Bahjat, Kirkuk, P.65.

(301) Ibid, PP.66-68.

شیوعیی عیراقی» دەربارەی جۆری ڕەفتارکردن چ لەنێو ڕیزەکانی ئەندامانی حیزب و چ لە نێو جەماوەردا تەرخان کراون[(٣٠٢)].

پاشکۆی ژمارە «ل ل»یش نامەیەکی کورتی کەم وێنەیە کە ڕۆژی بیست و سێی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩دا «حەمید عوسمان» لە «سلێمانی»یەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»، نامەی ناوبراو تەنها لە دوو خاڵ پێکهاتووە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی هەردووکیانە:

«١- بۆمبای دژی تانك لە ئێرانەوە بۆ فرۆشتن هێنراوەتە ئێرە و نرخی هەر یەکێکیان حەوت سەد و پەنجا (٧٥٠) فلسە.

٢- تکایە ئامۆژگاریی ئەو هاوڕێ هەواڵنێرەتان بکەن کە ئەگەر هاتوو پۆلیس گرتیان خۆی وەها نیشان بدات کە قاچاغچییە و بەرتیلیان بداتێ، ئەمەیش بە کەڵکی دێت نەك هەر بۆ ئێمرۆکە، بەڵکو بۆ ڕۆژانی دواتریش وەها لە پۆلیس دەکات هاتوچۆی «قەڵادزێ»ی بە قاچاغچێتی نەك بە هاتوچۆی کاری حیزبایەتی لە قەڵەم بدەن، ئەگەر هاتوو پۆلیس لێیان پرسی ئەوساکە لە وەڵامدا با پێیان بڵێت کە ئەو لە «سلێمانی»یەوە بۆ کڕینی گوللەی دەمانچە و تفەنگ دێتە «قەڵادزێ»، ئامۆژگاریشی بکەن تەنها بە شەو نەبێت ئەو شوێنەی خۆی تێدا شاردۆتەوە بۆ کۆبوونەوەی حیزب نەبێت بەجێی نەهێڵێت. ئەگەر دەتوانرێت ڕێگەی مەدەنیێ دیدەنیی ڕێکخراوەکانی ناوچە جیا جیاکان بکات تاوەکو کەس غەیرەز ئەندامە لێپرسراوەکان و خاوەن ماڵەکەی نەبێت هیچ دەربارەی نەزانن.

باشتریش وایە ناوی خۆی بگۆڕێت لەگشت ئەو کاتانەدا «کە لە قەڵادزێ- ك.م.» دەمێنێتەوە و با گشت ئەو هاوڕێیانەمان کە دەیاننناسن لە بارەی پێویستیی بەکارنەهێنانی ناوی ڕاستیی خۆیەوە ئاگاداری بکەن»[(٣٠٣)].

---

[(302)] Ibid, Appendix (KK), Letter (23.1.1949), from Sason Dalal to all members responsible in Liwas, PP.68-69.

پاشکۆکانی دیکەی هەمان فایل بە ڕیز بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- نامەی هەشتەمی «عومەر محەمەد ئەلیاس» کە ڕۆژی بیست و چواری مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ لە «مووسڵ»ەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال».

٢- نامەی دووەمی «ساسۆن صدیق دەلال» کە ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «عەبدوللەطیف سەعدی» لە «هەولێر».

٣- نامەی ژمارە حەوتەمی ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ کە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»وە ناردوویە بۆ «فوئاد بەهجەت» لە «کەرکووك».

٤- نامەی ڕۆژی بیست و حەوتی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ کە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا» وە ئاراستەی «گشت مامۆستایانی لیواکان»ی کردووە.

٥- نامەی ژمارە یازدەی ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ کە «عەبدوللەطیف سەعدی» لە «هەولێرە»وە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال».

٦- نامەی ژمارە حەوتی ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ ی «حەمید عوسمان» کە لە «سلێمانی»یەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

٧- نامەی ڕۆژی دووی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە «عەبدوللەطیف سەعدی» لە «هەولێر»ەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

٨- نامەی ژمارە نۆی ڕۆژی سێی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ کە «عومەر محەمەد ئەلیاس» لە مووسڵەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

---

(303) Ibid,· Appendix (LL), Letter (23.1.1949), From Hamid Uthman, Sulaimaniya To Sason Dalal, PP.69-70.

٩- نامەی ڕۆژی سێی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»وە ناردوویە بۆ «عومەر محەمەد ئەلیاس» لە «مووسڵ».

١٠- نامەی ژمارە سێی ڕۆژی سێی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە دیسانەوە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»وە ناردوویە بۆ «عومەر محەمەد ئەلیاس» لە «مووسڵ».

١١- نامەی ژمارە هەشتی ڕۆژی سێی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»وە ناردوویە بۆ «فوئاد بەهجەت» لە «کەرکووك».

١٢- نامەیەکی بێ مێژوو کە نووسەرانی ڕاپۆرتەکە دەڵێن لەوانەیە ڕۆژی هەشتی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ زەکی وەطبان لە «بەصرە»وە ناردبێتی بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

١٣- نامەی ژمارە یەکی ڕۆژی نۆی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»وە ناردوویە بۆ «عەبدوللەطیف سەعدی» لە «هەولێر».

١٤- نامەی ژمارە یەکی ڕۆژی دەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە فوئاد بەهجەت لە کەرکووکەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

١٥- نامەی ڕۆژی سیازدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا»وە ناردوویە بۆ صەلاح ئەلخەزرەجیی بەرپرسی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە شارۆچکەی «موسەیەب».

١٦- نامەیەکی بێ مێژووی بەرپرسی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە «کەربەلاوە» بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

١٧- نامەیەکی دوور و درێژی بێ مێژوو کە نزیکەی شەش لاپەڕە دەبێت و لەوانەیە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ دا زەکی وەطبان لە بەسرەوە ناردبێتی بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

١٨- نامەیەکی ڕۆژی سێی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ کە حەسان «ناوی خواستەنیی بەندکراو «محەمەد عەبدوللەطیفە» ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

١٩- نامەیەکی دیکەی هەمان «محەمەد عەبدوللەطیف»ە لە بەندیخانەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

٢٠- نامەی ژمارە سێی هەمان «محەمەد عەبدوللەطیف» کە لە بەندیخانەوە ڕۆژی دەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

٢١- نامەی ژمارە چواری هەمان «محەمەد عەبدوللەطیف» کە ڕۆژی یازدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩ لە بەندیخانەوە ناردوویە بۆ «ساسۆن صدیق دەلال» لە «بەغدا».

٢٢- ئینجا نامەیەکی ئەو شیوعییانە لە ڕاپۆرتەکەدا دانراوە کە لە شارۆچکەی «بەدرە» لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا دەژیان.

٢٣- نامەیەکی بێ مێژووی ئەو شیوعییانەی کە لە ناوچەی «عێن تەمر»دا لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا دەژیان بۆ کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی».

٢٤- لێدوانێکی «ساسۆن شەلۆمۆ دەلال» دەربارەی حیزب لە ڕۆژی گرتنییەوە لە دووی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨وە تاوەکو کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٩.

٢٥- ئیعتیرافاتی «صەبری عەبدولکەریم»ی خەڵکی «بەصرە» کە ئێستا لە «بەغدا» دەژیت(٣٠٤).

٢٦- ئیعترافە دوور و درێژەکانی «ڕەفیق چالاك»ی خەڵکی «سلێمانی» کە پتر لە دوو لاپەڕە و شازدە خاڵیان پڕ کردۆتەوە و بەم جۆرەی لای خوارەوە باسیان دەکات:

---

(304) Ibid, PP.70-94.



ڕەفیق چالاك

«١- «ڕەفیق چالاك»: [٣٠٥] تەمەنی بیست و نۆ ساڵە، خەڵکی «سلێمانی»یە و مامۆستایەکی دەرکراوی «ئیبتیدائییە- ك.م.»، لە ساڵەکانی «جەنگی دووەمی جیهان»یدا سەرپەرشتیی «ئێزگەیەکی بەریتانی» بە زوبانی «کوردی» دەکرد[٣٠٦]. ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی تا ڕادەیەك لە ناوچەکەدا ناوی بزرێت، «قادر نووری» هاوینی ساڵی ١٩٤٩ وەك لایەنگرێکی «حیزبی تەحەرور» تاوانباری کرد و وەها دیارە ئەم ڕۆژنامانە «طریق» و «مەسەلە» و «عوصبە» دراونەتە «چالاك» بۆ ئەوەی بیان خوێنێتەوە و دوایش گەلێك لەم دوو کتێبەوە فێر بووە- «حیزب و ڕێبازەکانی کارکردن» و «بنەماکانی لێنینیزم»[٣٠٧].

---

[٣٠٥] خوالێخۆشبوو «ڕەفیق چالاك»، کە ماڵەکەیان لە «گەڕەکی گۆیژە»ی شاری «سلێمانی» بوو، یەکێك لە هونەرمەندە هەرە گەورە و چالاك و دەنگ خۆش و مۆدێرنە ناسراوەکانی کوردستانی هاوچەرخ بوو، هەرگیز ئەوە لە یاد ناکەم چۆن لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا شا و گەدای «کورد» بە ئەوپەڕی جۆشەوە گوێیان لەو شانۆگەرییە پڕ لە وانە و پەندانە دەگرت کە ڕەفیق چالاك لە ڕێگەی «ئێزگەی کوردی بەغدا»وە پێشکەشی دەکردن، لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، دوای گەڕانەوەم لە هەندەرانەوە لە نزیکەوە پێوەندیم بە خوالێخۆشبووەوە پەیدا کرد و بە دڵ خۆشم ویست و ڕێزم گرت و زانیم تاوەکو چ ڕادەیەك کوردێکی دڵپاك و خزمەتگوزار قۆشمەو دڵسۆزە، زۆر بە داخەوە لەناکاو ساڵی ١٩٧٣ لە ناکاو کۆچی دوایی کرد و دوای خۆی گەنجینەیەکی کەم وێنەی بۆ نەتەوەی کورد جێهێشت، گۆڕەکەی پڕ لە نوور بێت، ئامین، بەغدا، بەرەبەیانی ڕۆژی هەژدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٩.

[٣٠٦] مەبەست ئەو ئێزگەیەیە کە ئەو و «گۆران»ی شاعیر لە «حەیفا»وە لە ساڵەکانی «جەنگی جیهانی دووەم»دا بە قەناعەتەوە وەك بەشێك لە خەباتیان دژی فاشیزم کاریان تێیدا دەکرد، ئەوەی دوایی بووە هۆی پلار تێگرتنیان لە لایەن نەیارەکانیانەوە.

[٣٠٧] دەقی ناوی ئەو دوو کتێبە بەئینگلیزی بەم جۆرەیە:

٢- پایزی ساڵی ١٩٤٧ بە فەرمانی «حیزبی تەحەڕوپ» و بە بۆنەی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکەوە وتارێکی خوێندەوە کە تێیدا ئۆباڵی ئەو کارەی خستە ئەستۆی بەریتانییەکان و ئیمپریالیزم. «تێبینی: ئەو چوار ئەفسەرە لەلایەن کابینەکەی «صالح جەبر»ەوە تاوانبار کران».

٣- بەرە بەرە پتر بەرپرسی درایە «ڕەفیق چالاک-ك.م.» و لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧یشدا بووە یاریدەدەری ڕێکخستنی خۆنیشاندانێك دژی «پەیمانی پۆرتسمۆث» و بەو بۆنەیەشەوە وتارێکی خوێندەوە کە تێیدا هێرشی کردە سەر پەیمانی نێوان «ئینگلتەرە» و «ئوردون».

٤- لەوانەیە لە ئەنجامی ئەم چالاکییانەدا لە مامۆستایەتی دەرکرابێت «مێژووی دەرکردنەکەی نەزانراوە»، هەوڵی دا لە «بەغدا» کارێك بدۆزێتەوە، بەڵام هەوڵەکەی بە فیڕۆ چوو بۆیەکا گەڕایەوە «سلێمانی» و بووە بەرپرسی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەوێ[٣٠٨] حیزب مانگی سێ پاوەن «سێ دیناری عیراقی- ك.م.» بۆ بڕییەوە.

٥- دەورووبەری کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٨ «سەید عەلی حیجازی»[٣٠٩] کرایە موتەسەڕیفی «سلێمانی» و ئەویش «ڕەفیق چالاکی- ك.م.» بە تۆمەتی چالاکیی شیوعیی تاوانبار کرد.

٦- «ڕەفیق چالاك» مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ دوو هاوڕێیدا بۆ ڕێکخستنی ئاهەنگی نەورۆز «سەری ساڵی نوێی فارسەکانە کە کوردیش یادی دەکەنەوە» نێردرایە «بەغدا»، نوێنەرانی ناوچەکانی دیکەی باکووری (عیراقیش-ك.م.) بە بۆنەی ئەو یادەوەرییەوە

---

1-"The Party and the Methods of Work".

2-"Leninist principles".

(٣٠٨) ئەوساکە «حەمید عوسمان» بەرپرسی شاری «سلێمانی» و دەورووبەری بوو.

(٣٠٩) «سەید عەلی حیجازی» بەرپرسێکی پۆلیسی بە زەبروزەنگ بوو.

هاتنـه «بەغـدا» و لـەوێ چـەند کۆبوونەوەیـەکیان سـازکرد و دەڵـێن «چالاك» لەو کۆبوونەوانەدا ڕۆژنامەی «القاعدة» و بڵاو کراوەی دیکەی حیزبی بڵاو کردۆتەوە.

٧- لە کاتێکی نەزانراودا «ڕەفیق چالاك» وەك مامۆستا پۆستەکەی خـۆی وەرگرتـەوە، بـەڵام ئـەمجارەیان لـە «عـەممارە» دانـرا، لـەو کاتـەدا نامەیەکی ڕێکخراوی ناوچەیی «حیزبی شیوعیی عیراقـی» پـێ درا بـۆ ئـەوەی بیگەیەنێتـە «بەغـدا»، کاتێـك نامەکـەی گەیانـد یـەکێك لـە شیوعییەکانی «بەغدا»ی بینی «بۆ خۆی دەڵێت ئەو دیتنـە ڕێککـەوت بـوو» و داوای لـێ کـردووە چـەند ڕزمەیـەك لـە بەیاننامـەکانی حیـزب بگەیێنێتـە «بەصـرە» و قایـل نـەبوونی دادی نـەداوە و جوگرافیـای بەصرەیان بۆ شی کردۆتەوە و چۆن لەوێ پاسکیلیخانەیەك ڕزمەکانی دەگـەیێنێتێ، بـەو جـۆرە ئـەو بەیاننامانـەی گەیاندۆتـە «صـەبری عەبدولکەریم»ی «بەرپرسی بەسرە-ك.م.» «تێبینی: ئەوە ڕوون نییە کە ئایا پاسکیلخانەکە وەك شوێنی پەیوەندی بەکار هێنراوە یـاوەخو نـا»، وەهـا دیـارە حیـزب «ڕەفیـق چـالاکی -ك.م.» بـۆ ئـەو کـارە هەڵبژاردووە چونکە چ لە «بەغدا» و چ لە «بەصرە» ناسراو نەبووە.

٨- بە پێی ئیدیعای چالاك خۆی لـەو ماوەیـەدا کـە لـە «عـەممارە» بـووە شارەزای چالاکییەکانی حیزب بووە «لێدوان: لە ڕاستیدا بنەمای ئـەو ناوچەیە هەژارە بۆ ئـەو جـۆرە کـارە». هـەر چـۆن بێـت ڕۆژی سـێی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٨ دیسانەوە «ڕەفیـق چـالاك» لـە کـاری مامۆستایی دوورخرایەوە «هۆکانی ئەوە نەزانراوە» و چووە «بەغدا» و لێرە لەگەڵ ئەندامێکی حیزبدا تووشـی گێرمەوکێشـە هـات و ئـەنجام حیزب پێی ڕاگەیاند پێویستە کاریان لەگەڵدا بکات و لەبەرئەوەیش لە «سلێمانی» ناسراوە ئەگەر بگەڕێتەوە ئەوێ دەگیرێت.

٩- لێـرە بـە نـاوی خواسـتەنیی «محەمـەد ڕەشـید» ەوە لەگـەڵ پـارێزەر «عەبدولمەجیـد بەهییـە»دا دەبـوو «چـاپخانەکەی دار الحکمـة» چـاك

بکەنەوە، بۆ ئەو کارە بەهییە داوای حەفتا پاوەن «حەفتا دیناری عیراقی» دیکەی کرد «ئەوە نەزانراوە ئەو پارەیە سەرف کراوە یاوەخود سەرف نەکراوە». چالاك لەویٚ «ئارا خەچەدۆریان»یشی دی کە تایپێکی ئەرمەنیی دایێ.

١٠- لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨دا «رەفیق چالاك» چووە ئەو ماڵەی «قاترخانە» کە «جۆزێف» [٣١٠] واتا «میر یەعقوب کۆهین»ی تێدا دەژیا و کتێبێکی بە زوبانی ئینگلیزی دەربارەی «کێشەی لادیٚ» [٣١١] پیٚ دا بۆ ئەوەی دەرسی بکات.

١١- «جۆزێف» نزیکەی سەد دانەی لە ئیحتیجاجێکی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دایە «رەفیق چالاك» بۆئەوەی لە کەرخ بلاّوی بکاتەوە و پێی گوتووە: « ئێمە «تەحەرورین» و پشتی حیزبی شیوعیی دەگرین چونکە رێکخراوێکی نیشتیمانی یە»، دوای ئەوەیش گوتی گشت شیوعییەکان تەحەرری بوون بەلاّم هەموو تەحەرورییەکان شیوعی نەبوون.

١٢- هەمان کات چالاك ئەم شتانەی لای خوارەوە لە جۆزێفەوە فێر بوو:

أ- هەردووك رۆژنامەی «عوزن»(؟) [٣١٢] و «زەهرا» کە «سەلیم تەها تکریتی» دەریان دەکات و مەتریاڵەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بلاّو دەکەنەوە کە لە رێگەی «سەعید حەسەن»ەوە دەگەن کە لای «سەلیم تەها تکریتی» کار دەکات.

ب- «شەریف ئەلشێخ» عادەتەن پێوەندی بە «لاوانی دیموکراسی» «الشبيبة الديمقراطية» وە لە ئوتێلی «سەمیرامیس» لەگەڵ

---

[٣١٠] جوزێف ناوی خواستەنی «حیزبی»ی میێر یەعقوب کۆهین بووە.

[٣١١] دەقی ناوی کتێبەکە بە ئینگلیزی بەو جۆرەیە: "The Rural Problem".

[٣١٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە چونکە بڕوا ناکەم رۆژنامەیەك بەو ناوەوە لە عیراق دەرچووبێت، یان بە ناوی «العذر»ەوە.

«كامیـــل چادرچـــی» و «عـــەزیز شـــەریف» و «عەبـــدولڕەحیم شەریف»دا كۆدەبێتەوە.

ج- نامـــە و وتـــار و وەرگێڕدراوەكـــانی ڕۆژنامـــەكان لـــە پاریســـەوە دەنێـردرێن بـۆ «عـەدنان حـافـظ» و ئـەویش دەیـان نێرێـت بـۆ «جۆزێف».

١٣- ڕۆژی سـیازدەی مـانگی تەشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩٤٨ «ڕەفیـق چـالاك» بـەوەی زانـی كـە «جۆزێـف» و گشـت ڕەهبـەرەكانی حیـزب گیراون و چاپخانەی «القاعدة» یش دەستی خراوەتە سەر و ئەمانەیش بوونەتە هۆی شڵەژاندنی ئەندامەكانی دیكـەی حیـزب، بـەڵام هەرچـی «صەبری عەبدولكـەریم»ە ئیـدیعای قیـادەكردنی حیزبـی كـرد و «لـە شوێنی خۆشاردنەوەكەی -ك.م.» هاتـە دەرێ و پێوەنـدیی بـە عـەلی ناوێكەوە كرد كە «دوور نییە سەركردەیەكی نیشتیمانی»بێت.

١٤- دواتر «چالاك» «دەلالی» دی كە یەكسەر جڵـەوی كـاری حیزبـی گرتـە دەسـت چـونكە ئـەو شەخسـییەتی و شـارەزایی لـە بـواری پرنسـیپە ماركسییەكاندا «لە صـەبری عەبدولكـەریم-ك.م.» زۆرتـر بـوو بۆیـەكا توانیی بەسەر ئەودا زاڵ بێت.

١٥- سەرەتای ساڵی ١٩٤٩ «سەمیر عەبدولئەحەد» بە حیزبی ڕاگەیاند كە شەش حەوت بۆمبای دەست كەوتووە و نموونەیەكی دانـێ و كـە لـەو بۆمبایانە بوون كە بۆ ڕاوەماسی بە كـار دەهێنـران، بـەڵام كۆمیتـەی حیـزب ڕەفـزی كـردن. هەرچـی «محەمـەد عەبدوللـەطیـف» یشـە لـە بەندیخانەی ناوەندییەوە بیست دیناری عیراقی نارد بۆ حیزب، بیست وپێنج دیناری عیراقیش لە كەركووكەوە هات.

١٦- شەوی نۆزدە لەسەر بیستی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩ چالاك، وەك دەڵێن گیرا...» [٣١٣].

دوا بە دوای ئەمە ئیعترافاتی «فوئاد بەهجەت»ی بەرپرسی «کەرکووك» تۆمار کراوە و وەك راپۆرتەکە دەڵێت ئەوساکە تەمەنی بیست و چوار ساڵ بووە و سەرەتا کارمەندی وەزارەتی دارایی بووە و یەکەم شیوعیی کە کاری کردووتە سەر «فوئاد» ناوی «عەبوود حەمزە» بووە و لە رێگەی «حیزبی تەحەرور»ەوە بووەتە شیوعی و مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٧ بووەتە موئەیدی حیزب، رۆژی شازدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٧ پۆلیس ویستیان بیگرن بەڵام ئەو توانی هەڵبێت و لەوساوە حیزب ناردییە «کەرکووك» بۆ رێکخستنی کرێکاران، لە ئیعترافەکەیدا «فوئاد بەهجەت» تۆباڵی هەموو هەڵەکانی حیزبی خستووەتە ئەستۆی «ساسۆن صدیق دەلال» [٣١٤].

هەرچی مەهدی حەمیدە ئەفسەری سوپای عیراقی بووە و لەسەر ئەوەی بەشداری «شۆرشی بارزان»ی کردووە لە سوپا دەرکراوە و دەوروبەری مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ بووەتە ئەندامی کۆمیتەی رێکخستنی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە کەرکووك[٣١٥].

دوای ئەوە لە هەمان راپۆرتدا ئیعترافاتی «مەجید رەفعەت» بڵاو کراوەتەوە کە قوتابیی کۆلێجی حقوق بووە و یەکەم پێوەندیی بە «حیزبی شیوعیی عیراقی»یەوە دەوروبەری مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٣ بووە، لە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧دا چووەتە کەرکووك و بووەتە بەرپرسی دوو شانەی حیزبیی کرێکاران، لە «بەغدا» و «کەرکووك» و

(313) N.A.,F.O.371/75130,Cypher,Top Secrt,Appendix (MMM), Statement of Rafiq Chalak, PP.97-99.

(314) Ibid, Appendix (NNN),Statement of Fuad Bahjat, PP,99-101.

(315) Ibid, PP.99-100.

«هـەولێر» و شـوێنی دیکـەدا لەگـەڵ «نـافیع یـونس» و «عاصـم حەیـدەری» و «حەمید عوسمـان» و «سـاڵح حەیـدەری» و «عەبـدولقادر ڕەشـید» و کەسـانی دیکەدا کاری کردووە و یەکێکیش بووە لە ڕەهبەرانی «پارتی شۆڕش»[٣١٦].

دوای ئەمانە چەند پاشکۆیەکی دیکەی هەمان فایل تـەرخان کـراون بـۆ باسی قوتابیی «حسقێل قۆچمان» کە تەمەنی بیست و هەشت ساڵ و قوتابیی «کۆلێجی دەرمانسـازی» «كلیـة الصـیدلة» بـووە، وێـڕای ئیعتیرافـاتی «فوئـاد ساسۆن مەشعەلی» پازدە ساڵان کە لە ناوچەی «سەعدون»ی «بەغـدا» ژیـاوە، هەروەها بـۆ ئیعتیرافـاتی «یـەعقوب مـیر مەصـری» و ئینجـا «عەبـدولڕەحمان ئەلمەنصور» و دواتریش ئیعتیرافاتی «خەچـەدۆر ئۆسـکانیان» و لێـرەدا ئـیتر فــایلی ژمــارە ٧٥١٣٠/٣١٧ی وەزارەتــی هەنــدەرانی حوکمــەتی بــەریتانی دەربارەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» تەواو دەبێت[٣١٧].

---

[316] Ibid, Appendix (OOO),Statement of Majid Ra`afat, PP.101-102.
[317] Ibid, PP.102-104.

# چەند تێبینییەکی پێویست

**١- سەرەتا:**

بەر لەوەی کۆتایی بەم بابەتە بهێنین بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ چەند سەرنجێکی تایبەتیی خۆم لەم بوارەدا بکەم. هەڵبەت لە خۆڕا نەبوو کە «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە دوا قۆناغی ڕژێمی پاشاییدا بووبووە هێزێکی زۆر دیار و بە توانا لەسەر شانۆی سیاسیی «عیراق» و پتر لەوەیش هەر لەو ساڵانەدا «مارکسیزم — لێنینیزم» لە ناوچە کوردییەکانی وڵاتدا ببووە دروشمی زۆرینەی جەماوەر بە نەتەوەپەرستانی کوردەوە، تەنانەت منداڵێکی دڵسۆزی وەك «فایەق هۆشیاری» نەوەی «پیرەمێرد» لە ژمارە پێنج و شەشی — مایس و حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢ی گۆڤاری بەناوبانگی «گەلاوێژ»دا وتارێکی حەوت لاپەڕەیی دەربارەی «لێنین» بلاو بکاتەوە[٣١٨].

جا هەروەك لە سەرەتای ئەم بابەتەدا و لە لاپەڕەی یەکەمی ئەم بەرهەمەدا گوتوومە گەلێك لایەنی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی «شایانی ئەوەن نامەی ماجستێر و دوکتۆرا و کتێبی سەربەخۆی دەوڵەمەندیان بۆ تەرخان بکرێت کە بێ گومان بەڵگەنامە نهێنییەکانی دەزگاکانی «حوکمەتی بەریتانی» دەبنە سەرچاوەیەکی ڕەسەن و بایەخداری دەگمەنی هەر لایەنێك لە لایەن و دیاردە سەرەکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی »، وێرای ڕۆژنامە و نامیلکە زۆرەکانی حیزب.

**٢- یەکەم ڕۆژنامەی «حیزبی شیوعیی عیراقی»**

ژمارەیەکی یەکجار دەگمەنی ڕۆژنامەکانی حیزب یان خۆیان، یان وێنەیان لە کتێبخانەکەی خاوەنی ئەم بەرهەمەدا پارێزراون، هی وەك وێنەی ژمارە یەك و دووی ڕۆژنامەی «خەباتی گەل — کفاح الشعب» کە یەکەم

---

[٣١٨] بڕوانە: «گەلاوێژ»، بەغدا، ژمارە ٥-٦، مایس — حوزەیرانی ١٩٤٢، ل٨١-٨٧.

ڕۆژنامەی زانراوی حیزبی ناوبراوە و ژمارە یەکی و دیسان لەسەری نووسراوە «ساڵی یەکەم» «السنة الأولى» و لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٣٥دا چاپ کراوە و بریتییە لە پێنج لاپەڕەی گەورە (٣٠×٢٠سم) و هەردووك دیوی لاپەڕەکانی چاپ کراون و لەسەر لاپەڕەی دەرەوەی یەکەمی بە تەنها و بە گەورەیی نووسراوە « کفاح الشعب» و لە سەروو ناوەکەیەوە وێنەیەکی ساکار دروست کراوە کە ئاماژە بۆ دوو بلێسە و هەڵهاتنی خۆر دەکات و لە ژێریشییەوە چەکوش و داسێك و لە بن ئەویشەوە وێنەی ئەستێرەیەکی پێنج سووچی کراوە کە هەمان دروشمی ئاڵای «یەکیەتی سۆڤیەتی» جارانە. لاپەڕەی دیوی ناوەوەی ڕۆژنامەکەیش دیسانەوە تەنها بەشی سەرەوەی ژمارەکە بە ناوی ڕۆژنامەکە و لە سەروویشەوە بە وێنەی ئەستێرە پێنج سووچییەکە و لە سەروو ئەویشەوە بە وێنەی چەکوش و داسەکە ڕازێنراوەتەوە و لە ژێر ناوەکەیشدا نووسراوە «ئۆرگانی کرێکاران و جووتیاران» «لسان حال العمال و الفلاحين» و لە لای ڕاستی ناوەکەیشەوە نووسراوە «ژمارە یەك، «خەباتی گەل»، ڕۆژنامەیەکە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعیی عیراقی دەری دەکات، یەکەم ڕۆژنامە» » العدد الاول، «کفاح الشعب»، جريدة تصدرها اللجنة المركزية «للحزب الشيوعي العراقي، الصحيفة الأولى» . و لەلای چەپی ناوەکەیشەوە نووسراوە «ساڵی یەکەم، با چینە فەرمانڕەواکان لەبەر دەم شۆڕشی شیوعیدا بلەرزن چونکە پرۆلیتاریا لە زنجیر و کۆتەکانی بەو لاوە شتێکی دیکەی نییە بیدۆڕێنێت و لەو ڕێگەیەشەوە گشت جیهانی دەست دەکەوێت – السنة الأولى « «فلترتعش الطبقات الحاكمة أمام الثورة الشيوعية فليس للبروليتاريا ما تفقده فيها سوى قيودها وأغلالها و تربح من ورائها عالما بأسره»»، لە ژێر ئەو دروشمەیشەوە نووسراوە «تەمموزی ساڵی ١٩٣٥» «تموز سنه ١٩٣٥» و لە ژێریشییەوە نووسراوە «نرخی بیست فلسە» «الثمن عشرون فلسا» .




«چۆن بزووتنەوە شۆڕشگێرییەکانی فوڕات کۆتاییيان هات» «كيف إنتهت الحركات الثورية فی الفرات» کە دیارە مەبەستی شۆڕشی بیست و گشت لاپەڕەی یەکەم و دووەم و بەشێکی کەمی لاپەڕەی سێیەمی ژمارە یەکی «كفاح الشعب»ی بۆ تەرخان کراون، هەڵبەت ئاوڕدانەوە لە «شۆڕشی بیست»ی عیراقی لە سەرەتای چالاکییەکانی حیزبی شیوعیدا ئاوڕدانەوەیەکی بەجێ و پێویستە هەرچەندە لە ژمارەیەك بۆچووندا چ لەم بوارەدا و چ لە گەلێك بواری دیکەیشدا حیزب تەواو بە دروستی نیشانەکانی نەپێکاوە.

بەڵام پێویستە توێژەر ئەو هەڵوێستە بە تەرازووی شوێن و کات بکێشێت، بە وێنە ڕۆژنامەی « كفاح الشعب» شوێنێکی تایبەتی هەمان ژمارەی خۆی بۆ بابەتی «پرسی کەمینەکان» «مسألة الأقليات» تەرخان کردووە کە هەمیشە بابەتێکی زۆر پێویست و بایەخدارە (بڕوانە ل٧–٨)، کەچی لە کاتێکدا بە دوورودرێژی باسی «ئەرمەن» و «ئاشووری» و «موسڵمان» و «گاور» دەکات نە زۆر و نە کەم نە لە دوور و نە لە نزیکەوە توخنی پرسی «کورد» نەکەوتووە کە هەمووان دەزانن گەورەترین کێشەی نەتەوەیی «عیراق»ە و تاوەکو ئیمرۆکەیش هەندێك لایەنی ماوە بێ ئەوەی بە تەواوەتی و بە شێوازێکی دیموکراسییانە، یان لەبەر ڕۆشنایی پرەنسیپە قووڵەکانی خودی «مارکسیزم لێنینیزم»دا چارەسەر بکرێن.

هەر چۆن بێت ژمارە یەکی ڕۆژنامەی «کفاح الشعب» بە ڕستەی «لە چاپخانەی حیزبی شیوعیی عیراقی چاپ کراوە» «طبعت بمطبعة الحزب الشیوعي العراقی» تەواو دەبێت و بە ڕاستی چاپێکی ڕێکوپێکی ڕوون و کەم هەڵەیە.

ئینجاکە با بەکورتی بێینە سەر باسی ژمارە دووی هەمان ڕۆژنامەی «کفاح الشعب» کە ئەمیشیان هەشت لاپەڕەیە و بە هەمان بارستە و لە سەر لاپەڕەی یەکەمی ئەم دروشمە بە گەورەیی بە دەستخەت نووسراوە» ئەی کرێکاران و جووتیارانی جیهان یەکگرن» «یاعمال و فلاحي العالم إتحدوا» ئینجا ناوی ڕۆژنامەکە و وێنەی چەکوش و داس و ئەستێرە پێنج گۆشەییەکە دانراون و ئەمانیش هەموویان دەستخەتن، ئینجا بە دەستووری ژمارە یەك گشت دروشم و وێنەکان دووپات کراونەتەوە تەنها ئەوەندە هەیە ڕستەی «ژمارە دوو» و مانگی «ئابی ۱۹۳۵»جێگەی ڕستەی «ژمارە یەك»و مانگی «تەمموزی ۱۹۳۵» یان گرتۆتەوە «باجی خوێن» «ضريبة الدم» ناونیشانی یەکەم وتاری ئەم ژمارەیەی « کفاح الشعب» ە و «وشەی بەلشەفیك چ دەگەیێنێت» «ماهي كلمة بولشفيك"یش ناونیشانی وتاری دووەمییەتی و ئەمەی لای خوارەوەیش ناونیشانی بابەتەکانی دیکەی هەمان ژمارەن:

«خەبات دەربارەی ڕۆژی کار – الكفاح حول يوم العمل» (ل ٣)، «حەوتەمین کۆنفرانسی حیزبە شیوعییەکانی جیهان – المؤتمر السابع للأحزاب الشيوعية العالمية» (ل٤–٥)، «بۆ هاوڕێ خۆشەویستەکان – الى الرفاق الأعزاء»کە تیایدا بە کورتی مەرجەکانی بڵاوکردنەوەی وتاری لە «کفاح الشعب»دا ڕوون کردۆتەوە (ل ٥)، «تێبینی بۆ هاوڕێیان – ملاحظات الى الرفاق» وتاری داهاتوویەتی (ل ٦–٧) و ئینجا ئەم دروشمەی نووسیوە «ئەگەر من نەسووتێم و تۆیش نەسووتێیت و هەمووومان نەسووتێین چۆن لەم تاریکاییەدا ڕووناکی بەرپا دەبێت – أن لم أحترق أنا، وتحترق أنت ونحترق

نحن، فيكف يخرج من هذه الظلمات نور» (ل ٧) و له دوا لاپەڕەیشدا لە ژێر ناونیشانی «داواکاری ڕۆژانەمان – مطالیبنا الیومیة» بە دەستخەت ئەم خاڵانەی خوارەوە نووسراون:

١- «دیارکردنی سەعاتی کار ئەوپەڕەکەی بە هەشت سەعات و ٦-٧ سەعات بۆ کاری قورس و بەرزکردنەوەی ڕادەی ڕۆژانە» «تحدید ساعات العمل- الحد الأقصى ثمان ساعات و ٦-٧ ساعات للأعمال الشاقة و رفع مستوى الأجور».

٢- «دانی ئازادی بلاّو کردنەوە و کۆبوونەوە و دانەوەی گشت ئیجازەکانی کردنەوەی یانە و نەقابەکانمان» «منح حریة النشر والأجتماع وإرجاع الرخص لفتح نوادینا ونقاباتنا».

٣- «دەرکردنی یاسای پاراستنی کار، وەك قەدەغەکردنی دەرکردنی کرێکار لە کارگە و دانی تەقاویتی بە کرێکارە کەفتەکارەکان کە ناچاربوون لە کار بکەون» «سن قانون حمایة العمل، مثل عدم فصل العامل من معمله، و إعطاء تقاعد للعمال العجزة والمرغمین على العَطَلِ».

٤- «قەدەغەکردنی کار و چەوساندنەوەی ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە سیازدە ساڵان کەمترە» «عدم تشغیل الاطفال و إستثمارهم الذین یبلغون دون الثالثة عشر».

٥- «ڕێگەمان بدرێتێ ببینە نوێنەری چینەکەمان لە ئەنجوومەنی نوێنەران و شارەوانییەکان و بەرگری لێ بکەین» «إفساح المجال لنا لتمثیل طبقتنا وندافع عنها في المجالس النیابیة و البلدیة».

لە دامێنی هەمان لاپەڕەیشدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ژمارە دووی ڕۆژنامەی « کفاح الشعب» لە چاپخانەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» چاپ کراوە».

دوا لاپەڕەیش بۆ بابەتی «ئامانجەکانمان – غایاتنا» تەرخان کراوە و بریتییە لەمانەی لای خوارەوە کە گشتیان بە خەتێکی جوان و گەورە نووسراون:

«ڕزگاریی نەتەوەیی و ئازادی بۆ گەل – التحرر القومي والحرية للشعب».

«دابەشکردنی زەوی بەسەر جووتیاراندا – توزیع الأراضي علی الفلاحین».

«شۆڕشی کۆمەڵایەتی و قوتاربوون لە کۆیلایەتییەکی بێ شومار – الثورة الاجتماعية و الخلاص من عبوديات جمة».

بێ گومان ئەو دوو ژمارەیەی ڕۆژنامەی « کفاح الشعب» لە نرخاندن نایەن و پێموایە هەر ئەو دوو ژمارەیەشی لێ دەرچووە و هەر دووك مانگی تەمووز و ئابی ساڵی ١٩٣٥یش لەگەڵ سەرەتای دامەزراندنی «حیزبی شیوعیی عیراقی» دا دەگونجێن، واتا لەگەڵ ئەو ڕۆژگارەدا کە ڕەهبەریی حیزب بە دەست «عاصم فلەیح» و جەماعەتەکەیەوە بوو کە زوو دەستیان لە کار هەڵگرت و دوورەپەرێز دانیشتن[٣١٩] و ماوەیەکی ویست تاوەکو «یوسف سەلمان یوسف– «فەهد» لە «مۆسکۆ» خوێندنی تەواو کرد و سەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوو بووە سکرتێری گشتیی «حیزبی شیوعیی عیراقی».

٣– ناوەڕۆکی زەنگینی ڕۆژنامەی «القاعدة»

بە هەمان دەستوور حەوت ژمارە لە ڕۆژنامەی بە ناوبانگی «القاعدة»[٣٢٠] لە کتێبخانەکەمدا پارێزراون. یەکەم ژمارەی ئەو حەوت دانەیەی

---

[٣١٩] «عاصم فلەیح» بەرگدروویەکی خوێندەوار بوو، هەرچەندە زوو دەستی لە کار هەڵگرت بەڵام بە خاوێنی مایەوە، دوکانەکەی کەوتبووە سەر شەقامی ڕەشید لە شاری «بەغدا».

[٣٢٠] شایانی گوتنە ژمارەکانی ڕۆژنامەی «القاعدة» دەگەیشتنە دەست جەماوەرێکی زۆر و ناوچەیەکی فراوانی وڵات، چونکە لە دامێنی دوالاپەڕەی گەلێك لە ژمارەی «القاعدة» دا ئەمەی لای خوارەوە نووسرابوو:

«ئەی هاوڕێ دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی «القاعدة» تەواو دەبیت بیدەرە هەر هاووڵاتییەکی بەشەرەف و دڵسۆز لە هاوڕێکانت و داواشی لێ بکە ئەویش بیگەیێنێتە هەر کەسێك بڕوا و متمانەی پێیەتی و دوای ئەوەیش فڕێی بدەرە شوێنە گشتییەکان وەك چایخانە و

«القاعدة» له مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣وە دەست پێدەکات و دوا ژمارەیشیان بە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٤ کۆتایی دێت. یەکەم ژمارەیان بیست و دوو لاپەڕە و دووەم ژمارەیان شازدە لاپەڕە و سێیەم ژمارەیان چواردە لاپەڕە و چوارەم ژمارەیان شازدە لاپەڕە و پێنجەم ژمارەیان بیست و هەشت لاپەڕە و شەشەم ژمارەیان بیست و چوار لاپەڕە و حەوتەم ژمارەیان کە هەمان کات دواژمارەی ڕۆژنامەی ناوبراوە کە من هەمە، شازدە لاپەڕەیە.

گشت ژمارەکانی ڕۆژنامەی «القاعدة» ی چلەکانی سەدەی ڕابردوو بە وێنەی چەکوش و داس ڕازێنراونەتەوە، وێڕای ئەم دروشمە سەرەکییە «ئەی کۆمەڵانی خەڵکی گەلەکەمان دژی «فاشیزم» و لە پێناوی نان و ئازادییە دیموکراسییەکاندا لە بەرەیەکی نیشتیمانیی یەکگرتوودا یەك بگرن - یا جماهیر الشعب إتحدى ضد الفاشية وفي سبيل الخبز والحريات الديمقراطية في جبهة وطنية موحدة»، له ژێر ناوی ڕۆژنامەکەیشدا نووسراوە «ئۆرگانی حیزبی شیوعیی عیراقی یە» «لسان حال الحزب الشيوعي العراقي» و نرخی هەموو ژمارەیەکیش پەنجا فلس بوو، هەروەها «فەهد» بۆ خۆی سەروتاری گشت ئەو ژمارانەی نووسیوە تەنها ژمارە دوازدە و سیازدە نەبێت کە بە ناونیشانی «کێشەی «لوبنان» «أزمة لبنان»ەوە بڵاو کراوەتەوە و لەسەری نووسراوە «بە پێنووسی «فەهد» و «حەنظە ل» - بقلم فهد و حنظل» [٣٢١]. ئەو وتارەی «القاعدة» شەش لاپەڕەی چروپڕی پڕکردۆتەوە (ل١-٦)، «خوتبەی عەرش» «خطاب العرش"یش وتاری داهاتووی هەمان ژمارە «القاعدة»یە کە فەهد

---

سینەماکان - ايها الرفيق بعد انتهائك من قراءة القاعدة اعطها الى كل مواطن شريف ومخلص من أصدقائك واطلب اليه أن يوصلها هو بدوره الى من يثق به ويعتمد عليه، وأخيراً القيها في المحلات العامة كالمقاهي والسينمات). بە وێنە بڕوانە: «القاعدة» ، العدد ٢- ١٥، كانون الثاني ١٩٤٤، ص١٤.

[٣٢١] دیارە حنظل ناوی خواستەنیی یەکێك لە ڕەهبەرەکانی ئەو ڕۆژگارەی «حیزبی شیوعیی عیراقی»یە.

بەتەنها بۆ خۆی نووسیویەتی (ل٧-١٣)، دوابەدوای ئەوەیش «القاعدة» ئەم بابەتەی بلاوکردۆتەوە بێ، ئەوەی ئاماژە بۆ ناوی نووسەرەکەی بکات کە دوور نییە «فەهد» هەر بۆ خۆی بێت «دامەزراندنی پێوەندییە دیپلۆماسییەکان لەگەڵ دەوڵەتی «یەکیەتی سۆڤیەتدا» - إنشاء العلاقات الدبلوماسية مع دولة الأتحاد السوفياتي» و ئەم ڕستەیەشی لە خوتبەی عەرش وەرگرتووە- «...... وەها چاوەڕوان دەکرێت لە دەرفەتێکی نزیکدا پێوەندیی سیاسی و ئالوگۆڕی نوێنەران لە نێوان «عیراق» و «ڕووسیا»ی سۆڤیەتیدا تەواو بێت»- خوتبەی عەرش -..... من المؤمل أن يتم إنشاء العلاقات الساسية و تبادل الممثلين بين العراق و روسيا السوفياتية فى فرصة غير بعيدة»- خطاب العرش» (ل١٣-١٤).

هەروەك لە «بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی»یەوە و لە پەخشە و نامیلکە و ڕۆژنامەکانی«حیزبی شیوعیی عیراقی »یەوە دیارە «شیوعییە عیراقییەکان»ی ڕۆژگاری «فەهد» بایەخێکی زۆریان دابووە «پرسی کورد» و باش هۆ و ئەنجامە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیان شی کردبۆوە. بە وێنە ڕۆژنامەی «القاعدة» لە ژمارە دەی و چواردەی ساڵی ١٩٤٤یدا بە درێژی باسی «ڕاپەڕینی بارزانی» ئەو دەوروبەرەیان کردووە و زۆر بە ڕاستی و گەلێك ژمارەی دەگمەنیان بۆ پاراستووین، وەك کوژرانی نزیکەی هەشتا و بریندار بوونی نزیکەی سەد و بیست کەس لە هێرشبەرانی پۆلیس و سەرباز بۆ سەر «بارزانی»یەکان لە نزیك گوندی «مێرگەسوور»ەوە لە پایزی ساڵی ١٩٤٤دا کە تەنانەت یەکێکیشیان ئەفسەری سوپا بووە، هەروەها باسی ئەوەیش دەکات چۆن میری پەنای بردۆتە بەر تۆپ و فڕۆکە و کاولکاریی ناوچەکە و چۆن ئەوە بووەتە هۆی هاتوهاواری ئافرەت و زاڕۆڵەکانی ناوچە شاخاوییەکانی «بارزان»[٣٢٢].

---

[٣٢٢] بە وێنە بڕوانە: «القاعدة» ، العدد ١-١٤، کانون الثاني ١٩٤٤، ص٦.

هەرچی ژمارە ٣-١٦ی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٤یشە سەرچاوەیەکی ڕەسەن و بایەخدارە بۆ توێژینەوەی گەلێك لایەنی کەم زانراوی مێژووی هاوچەرخی عیراقی و بەر لە هەمووانیش مێژووی «حیزبی شیوعیی عیراقی» و بزووتنەوەی چینی کرێکارانی «عیراق» و قۆناغەکانی بزووتنەوەکانی ئەو چینە چونکە هەر شازدە لاپەڕەکەی ئەو ژمارەیە بۆ ئەو وتارەی «فەهد» لە یەکەم کۆنفرانسی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا خوێندییەوە تەرخان کراون. لە ناوەڕۆکی ئەو وتارەوە لەوە دەگەین کە حیزب دروشمی سەرەکی خۆی «نیشتیمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختەوەر - وطن حر وشعب سعید»ی لە «حیزبی شیوعیی سووری» یەوە وەرگرتووە (ل ٣).

دەربارەی کوردیش «فەهد» لە خاڵی دەیەمی وتارەکەیدا بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی پرسی کوردی کردووە:

«١٠- خەبات دەکەین لە پێناوی وەدیهێنانی یەکسانییەکی ڕاست لە بواری مافدا بۆ کەمینەی[٣٢٣] نەتەوەیی کوردی لەگەڵ وەبەرچاو گرتنی مافی دەستە نەتەوەیی و ڕەگەزە بچووکەکانی وەك «تورکمان» و «ئەرمەن» و «یەزیدی» [٣٢٤] «نناضل في سبيل ايجاد مساواة حقيقية في حقوق اللأقلية الكردية مع مراعاة حقوق الجماعات القومية والجنسية الصغيرة كالتركمان والأرمن واليزيدية» (ل.١٦). سەر وتاری ژمارە (٤-١٧) و (٥- ١٨)ی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٤ی ڕۆژنامەی «القاعدة» بۆ وتاری «فەهد» بە بۆنەی «ڕۆژی ئافرەتانی جیهانی»یەوە تەرخان کراوە و سێ لاپەڕە و نیوی پڕ کردۆتەوە و لە هەمان ژمارەیشدا وتارێکی دەربارەی «خەباتی ئافرەت - نضال المرأة» ی

---

[٣٢٣] هەر چەندە ئەوە بەندێکی وەبەر چاو بوو بۆ ڕۆژگاری خۆی بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نین کە «کورد» لە «عیراق»دا کەمینەیە، ئەوەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بۆ خۆی پاش ماوەیەك چارەسەری کرد.

[٣٢٤] هەڵبەت لەگەڵ ئەوەیشدا نین کە «یەزیدییەکان» دەستەیەکی بە ڕەگەز جیاوازن لەگەڵ نەتەوەی کورددا.

«بە پێنووسی «مناضلة» تێدایە کە نووسەرەکەی نەیویستووە ناوی ڕاستەقینەی خۆی بنووسێت (ل.٤-٥)، وێڕای وتارێك بە ناونیشانی «جێژنی جیهانی ئافرەتان و ئافرەت» بە «پێنووسی سامحە» «عيد النساء العالمي والمرأة، بقلم سامحة» (ل ٥-٧).

شایانی باسە «حازم زەکی بەسیم» و باسم «محەمەد ئەلشەبیبی» کە نزیکترین هاوڕێی «فەهد» بوون و وەك لە شوێنی خۆیدا ئاماژەمان پێی داوە ساڵی ١٩٤٩ لە هەمان ڕۆژدا هەرسێکیان لە سێدارە دران، نووسینیان لە «القاعدة» دا زۆرە. بە وێنە لە هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی ناوبراودا یەکەمیان وتارێکی بەپێزی بەم ناونیشانەوە بلاوکردۆتەوە: «ئیمڕۆکە پۆلیسی «عیراقی» هەمان ڕۆڵی جانەوەرانەی دادگاکانی پشکنینی ڕۆژگاری تاریکی زۆرداری دووپات دەکەنەوە»[٢٢٥]. هێزی ئەم وتارە لەو ڕۆژگارەدا لە ناونیشان و قووڵیی بەراوردکاریی زەکی بەسیمەوە هاتووە چونکە ئەو دادگایانە لە تاریکستانی سەدە ناونجییەکاندا بوویوونە کۆت و زنجیر لە گەردنی ولاتانی «ئەورووپا» و پێشکەوتنخوازەکانی ئەو ولاتانەدا. لە وتارەکەیدا «زەکی بەسیم» ئەم داستانەی لای خوارەوە دەکاتە یەکێك لە نموونە و بەڵگە سەلمێنەرەکانی:

«لێرەدا باسی بەسەرهاتی تاوانبارێکتان بۆ دەکەم کە گشت جۆرە ئەشکەنجەیەکی لەگەڵ کراوە، ئەو تاوانبارە پۆلیسێکە لە ماڵی بەڕێوەبەری ئیقامە و سەفەر «جەواد عەلی» خزمەتکار بوو، هاوسەری جەواد عەلی کە زانیی ئەو پۆلیسە هەندە شتێکی دەربارەی بۆ مێردەکەی گێڕاوەتەوە یەکسەر تۆمەتی دزینی سەد دینار و چەند پارچە خشڵێکی دەداتە پاڵ، ئەوەی پاڵ بە جەواد عەلییەوە دەنێت داوا لە یەکێك لە بنکە پۆلیسییەکانی

---

[٢٢٥] بڕوانە: الشرطة العراقية تعيد اليوم تمثيل فظائع محاكم التفتيش في العهود الاستبدادية المظلمة، بقلم حازم، «القاعدة»، العدد ٤-١٧، ٥-١٨، اذار ١٩٤٤. ص٧-٩.

«(بەغــدا» –ك.م.» بكــات تۆژینـــەوەی لەگەڵــدا بكــەن، بــەڵام چــۆن تۆژینەوەیەك؟... داركاری و فەلەقـە و لەقـە و بۆكس و هەڵواسـین و لەسـەر پلیكانە فڕێ دانە خوار و بە زۆر ناچار كردنـی خوێـاوك بخواتــەوە. بـە پێـی فــەرمانی «جــەواد عــەلی» ئــەو بەســەزمانە لــە بنكەیــەكی پۆلیســەوە دەیانگواستەوە بنكەیەكی دیكە و لە هەر یەكێكیشیان بە دەردێكیـان دەبـرد گەلێك خراپتر لەوەی پێشوو، كار گەیشت بەوەی پتر لە بیست دار عەسای لە دەور كەڵەكە كرابوو، چـەند جارێـك لـە تـاو ئـازاری گیـانی بوورایـەوە، بـەڵام یەكسەر بە سەتڵە ئاو دەیانهێنایەوە هۆش خۆی.

كە كار گەیشت بەمە پۆلیسـە قوربەسـەرە بـێ تاوانەكـە ناچـار بـوو دان بەوەدا بنێت گوایە شتەكانی دزیـون هـەر بـۆ ئـەوەی واز لـە ئەشـكەنجەدانی بهێنن و گوتی گوایە پارە و خشڵەكەی داوەتە كابرایەك لە «باقووبە»، كاتێـك جەنابی بەڕێوەبەری پـۆلیس جـەواد عـەلی بەمـە دەزانێـت دەیباتـە باقووبـە، لەوێ پۆلیسەكە عەرزی دەكات ئەو بوختانەی بـەخۆی كـردووە تـەنها لەبـەر ئەوەی لە داركاری و ئەشكەنجە قوتاری بێت، كە وادەڵێـت جـەواد عـەلی ئـەو قوڕبەسەرە تووڕ دەداتـە تاوڵـەی وڵاخـی پۆلیسـەكانی باقووبـەوە و بۆخـۆی دەكەوێتە ئەشكەنجەدان و داركاری كردنـی بـە جۆرێـك ئـەمجارەیان ناچـاری دەكات بڵێت ئەو كابرایەی شـتومەكەكانی لای دانـاوە وا لـە «خانـەقین» نـەك «باقووبە»، بەو جۆرە لە خانەقینەوە بۆ كەركووك و لە «كەركووك»یشەوە بۆ «سلێمانی» بەو ئاواتەی لە «سلێمانی» كە خۆی خەڵكی ئـەو شـارەیە، خزمـو كەسوكاری فریای دەكەون و قوتاری دەكەن، بەڵام تەنانەت لێـرەیش جـەواد عـەلی دەسـتی لـەو بەسـەزمانە هەڵنـەگرت و لـەوێ ئـەوی پێـی كـرد گـەلێك لەوانەی پێشوو خراپتر بوو، لە «سلێمانی» بە دەم ئـەم داركارییـەوە «مامـە» جـەواد عـەلی پێـی دەگـوت ئەگـەر دان بـە تاوانەكەتـدا نـەنێیت و پـارە و خشـڵەكەمان نەدەیتــەوە بــە گوللەیــەك ســاردت دەكەمــەوە، ئــەویش لێــی

النصر للبنادق المشرعة في مواجهة الأعداء العمالقة والغزاة والمرتزقة

النضال الجماهيري الثوري المتلاحم مع سائر القوى التقدمية العراقية في جبهة وطنية شاملة سبيلنا لإسقاط الفاشية والاتيان بحكم الائتلاف الديمقراطي وتحقيق الاستقلال والديمقراطية للعراق وحق تقرير المصير للشعب الكردي




ان الاتحاد الوطني الكردستاني يسعى لتنظيم قوى الثورة الكردية الوطنية والديمقراطية في شكل اتحاد وطني يجمع بتحالف التيارات التقدمية واتحادها النضالي المتين تحت قيادة الطليعة الثورية الكردستانية التي ستتولد حتما

العدد ٧ | تموز-آب/١٩٨٣ | السنة الثانية

الشرارة

دەپارایەوە و هەزار و یەك سوێندی بۆ دەخوارد کە بێ تاوانە و نە پارە و نەخشڵی دزیوە و ئەوەی هەیە و نییە بە خێزانی جەنابی بەڕێوەبەری گوتووە هەندێك لە ڕەفتارەکانی ئەو جوان نین!»[٣٢٦].

بەو جۆرە ئەو ژمارانەی ڕۆژنامەی «القاعدة» کەمن هەمن سەرچاوەیەکی بایەخدار و دەگمەنن و بە ڕوونی ئەوە نیشان دەدەن کە «حیزبی شیوعیی عیراقی» هێزێکی جەماوەری فراوان و کاریگەر بوو لە ڕۆژگاری ڕژێمی پاشاییدا.

## ٤- بابەتە سەرەکییەکانی ڕۆژنامەی «الشرارة»

کاتی خۆی لە کتێبخانەی دەزگای ڕۆژهەڵاتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستیی سۆڤیەتی لە «مۆسکۆ» گشت ئەو ژمارانەی ڕۆژنامەی بە ناوبانگی «الشرارة»م دیوە کە لە ساڵانی ١٩٤٢ و ١٩٤٣دا لە «بەغدا» بە نهێنی چاپ دەکران و گەلێك زانیاریی بە کەڵکم لێ کۆکردنەوە و لە کارە زانستییەکانی خۆمدا کەڵکی زۆرم لێیان وەرگرتووە. ئێستا لە کتێبخانەکەمدا دوو دەفتەری چڕوپڕ لەو زانیارییانە هەڵگیراون کە بە گەلێك بابەتی سیاسیی دەگمەن تەنراون، تایبەت دەربارەی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی» لەو ڕۆژگارەدا، هی وەك خەباتی حیزب دژی «فاشیزم» و «نازیزم» و هەڵوێستی

---

[٣٢٦] هەمان سەرچاوە، ل٩.

شیوعییەکان بەرانبەر ڕاپەڕینەکەی نیسان- مایسی ساڵی ١٩٤١ بە ڕەهبەریی «ڕەشید عالی گەیلانی» و ڕەخنە گرتن لە ڕێگەدان بە سوپا کە دەست بخاتە ناو کاروباری سیاسەتەوە[٣٢٧].

هەمان کات ڕۆژنامەی «الشرارة» بایەخێکی زۆری داوەتە کرێکاران و بارودۆخی ژیانیان و گشت بزووتنەوەکانیان، تەنانەت باسی مانگرتنی کرێکارانی «سینەمای ڕەشید»ی لە «بەصرە» کردووە کە کۆتایی ساڵی ١٩٤١ ڕووی داوە[٣٢٨]. بە هەمان شێواز ڕۆژنامەی «الشرارة» بایەخی بە «پرسی کورد» داوە و بە گەرمی داوای کردووە ڕێگە بدرێتە مندالآنی گشت نەتەوەکانی «عیراق» بە زوبانی زگماکیی خۆیان بخوێنن[٣٢٩]. لە هەمان بواریشدا ڕۆژنامەی «الشرارة» بە وردی باسی بارودۆخی نالەباری ئابووریی ناوچە کوردییەکانی وڵاتی کردووە و لەم بارەیەوە ئەم نموونە سەیرەی بۆ خوێنەرانی گێڕاوەتەوە:

«لە شاری «کەرکوك» نانێك بە هەمان نرخی نانێك لە شاری «بەغدا» دەفرۆشرێت، بەڵام کێشی هەر چوار نانی کەرکوك بە قەدەر کێشی یەك نانی «بەغدایە!»[٣٣٠].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ژمارەکانی ڕۆژنامەی «الشرارة» لە ساڵی ١٩٤١دا گەلێك جار بە شانوباهووی «چەرچل»ی سەرەك وەزیرانی بەریتانی و دیموکراسیخوازیی «خاوەن شکۆ» «ئەمیر عەبدولئیلا» و «نووری سەعید»ی سەرەك وەزیراندا هەڵدەدات. هەر چۆن بێت ڕۆژنامەی «الشرارة» سەرچاوەیەکی دەگمەن و بایەخدارە بۆ توێژەران و سیاسەتمەداران.

---

[٣٢٧] بە وێنە بڕوانە: «الشرارة»، ژمارە هەشت، تەمموزی ١٩٤١، ل١.

[٣٢٨] بڕوانە «الشرارة»، ژمارە سێ، ساڵی دوو، کانوونی یەکەمی ١٩٤١، ل١٤.

[٣٢٩] بە وێنە بڕوانە «الشرارة»، ژمارە پێنج، ساڵی دوو، شوباتی ١٩٤٢، ل١٠.

[٣٣٠] «الشرارة»، ژمارە هەشت، ساڵی دوو، نیسانی ١٩٤٢، ل١١.

حزیران ١٩٤٥ زمارة (٣) نرخی ٢٠ فلس

نیشتمانیکی سەربەست و میللەتیکی بەختیار

آزادی

مللەتی کورد و کومەلی شیوعی عراق

— قلمی فؤاد —

تنها حزبی شیوعی یکەم حزبە لەعراقدا کە برامبر مللەتی کورد موقفیکی حازم وەستابی و تنها حزبی شیوعیە کە تا ایستا بدلیکی پاک بو پاراستنی مصالحی کورد هەولی دابی و مکافحەی زولمی کورد و شوفینیەکان و اتهامەکانی کردبیتە جداو هر وەکو بو پاراستنی ملتی عرب هەولی ئەدا کەلەزە سیطرتی زحمایە انهازیە کانیا بار و پرستەکانی فورنار بی .

## ٥- ڕۆژنامەی «آزادی» بە زوبانی کوردی:

هـەمان کـات ژمـارە سێی مـانگی حـوزەیرانی سـاڵی ١٩٤٥ی ڕۆژنامـەی «آزادی » م هەیـە کـە بـێ گومـان سەرچاوەیەکی دانسقە و پڕ بەهایـە، ئـەو ژمارەیەی «آزادی » بریتییە لە شەش لاپەڕە و لە هەردووك دیوی لاپـەڕەکان وتارەکـانی «آزادی » بـە ڕەنگـی سـەوز و پیتـی ورد چـاپ کـراون، بارسـتی ڕۆژنامەکەیش مامناوەندییە (٢٢×١٤سم)ە، نـاوی ڕۆژنامەکـە بـەم جـۆرە بـە گەورەیی و خەتێکی ڕازاوە لای چـەپی ڕۆژنامەکـەوە نووسـراوە «آزادی»، لـە سەروو ناوەکەیشەوە دروشمـی «حیزبـی شیوعیی عیراقـی» بـە پیتێکـی ورد نووسـراوە «نیشـتیمانێکی سەربەسـت و میللـەتێکی بـەختیار»، نرخـی هـەر ژمارەیەکیش بیست فلس بوو.

«میللـەتی کـورد و کۆمـەڵی شـیوعیی عیراقـی» بـە «قەڵـەمی فوئـاد» ناونیشـانی سـەروتاری ئـەو ژمارەیـەی ڕۆژنامـەی «آزادی»یـەو خـاوەنی بـە ئەوپـەڕی دڵنیاییـیـەوە دەڵێـت: «تـەنها حیزبـی شـیوعی یەکـەم حیزبـە لـە «عیراق»دا کە بەرانبەر میللەتی «کورد» مەوقفێکی حـازم وەسـتابێت و تـەنها حیزبی شیوعییە کە تا ئێستا بە دڵێکی پاك بۆ پاراستنی مەصاڵیحی «کورد»

هەوڵی دابێت و لەگەڵ دوژمنـەکانی کـورد و شـۆڤێنییەکان و ئیـنتیهازییـەکان کەوتبێتە جیدال هەر وەکو بۆ پاراستنی میللەتی عەرەب هەوڵ ئەدات کـە لـە ژێر سەیطەرەتی زوعەمایە ئینتیهازییەکان و پارەپەرستەکان قوتاری بێت».

لە موئتەمەری ساڵی ١٩٤٤ کە بە موئتەمەری پەیمانی نیشتیمانی نـاونرا حیزبی شیوعی بە ئاشکرا مەوقیفی خۆی بەرانبەر میللەتی کورد نیشان دا کە لە ژمارەکانی پێشووی «بنکە» «القاعدة»شدا بەیانی کردبـوو وەك لـە مـادەی ١١ لە پەیمانی نیشتیمانی کە لە لایەن کۆنفرانسەوە قەراری لەسەر درا داوای موساواتێکی تەواوی کرد لە بەینی کورد و عەرەب لە «عیراق»دا «کە دەڵێت – ك.م.» «تێدەکۆشین بۆ موساواتێکی تەمام و بۆ یەکیەتیی قەومی کوردی...، وە حیزبی شیوعی هیچ دەمێك لە حقوقی میللەتی کورد و لەو مەظـالیمانـەی کـە لێـی دەکرێـت غافـڵ نـەبووە و هــەر دەمێـك تەماشـای ئـیش و کـار و دەسیسـەی خائینـەکانی کـوردی کـردووە و بـۆ دەرخسـتنی مـەکر و دەسیسەکانیان هەوڵی داوە» [٣٣١].

ئینجا لێرەوە بە شێوازێکی زۆر توندوتیـژ و یـەکجار توندڕەو هێرشـێکی ناڕەوا دەکاتە سەر «مەعرووف جیاوك» و «عەلی کەمال» و «ماجید مستەفا» و «حیزبی هیوا» و ئەوانی تر و لە زوبان «فەهد»یشەوە دەڵێت:

«سـکرتێری حیزبـی شـیوعیی عیراقـی بـرادەر «فەهـد» دەربـارەی ئـەو مەسەلەیە بەیانێکی دەرخست و نیشانی دا کە ئەو زوعەمایانە بۆ مەصاڵیحی میللەتی کـورد ئـیش ناکـەن بـەڵکو بـۆ مەصـاڵیحی سـەرەکیی خۆیـان ئـیش دەکەن و بە کارێکی واقیعی نیشانی دا کە چۆن پێویستە میللەتی کـورد ئـەو چەشنە موجریمانە لە خۆی دوور بخاتەوە و چۆن خـۆی ڕێـك بخـات و هێـزی خۆی لەگەڵ برا عەرەبەکان یەك بخات تاوەکو بە ئامانجی خۆی دەگات.

وە دیسان بەیانی کرد کۆمەڵی هیوا «أمل» کۆمەڵێکی میللی نییە، بـەڵکو کۆمەڵێکی ئینتیهازی و ئیستیعمار پەرستەکانە و میللەتی کورد پێویستی بـە

---

[٣٣١] بڕوانە: «آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ١٩٤٥، ل١.

کۆمەڵی هیوا «أمل» نییە بەڵکو ئیحتیاجی بە کۆمەڵی کار «عمل» هەیە و لە ئاخردا برادەر «فەهد» تێکۆشەرانی کورد بانگ ئەکات بۆ یەکبوون و دامەزراندنی کۆمەڵێکی میللی.......»[٣٣٢].

ڕۆژنامەی «آزادی» لەسەری دەڕوات و دەڵێت:

« لەم ڕۆژانەدا کۆمەڵی شیوعی بەیانێکی تری دەربارەی فەلاحی کورد دەرهێنا کە «تێیدا دەڵێت-ك.م.» برای فەلاح بزانە کۆمەڵی شیوعیی بۆچی تێدەکۆشێ!، ئیتر هەروا حیزبی شیوعی بەرانبەر دژوارییەکانی میللەتی کورد هیچ دەمێك چاوی نەپۆشیوە و لە نیزامی داخلی کە لە موئتەمەری نیشتیمانیی یەکەم سالی ١٩٤٥ قەراری لەسەر درا زرووفی قەومی و جوغرافیی کوردی بەرچاو گرتووە و دامەزراندنی لقێکی کوردی «کە نزیکە دابمەزرێ» لە «حیزبی شیوعیی عیراقی» و دامەزراندنی لیژنەیەکی مەرکەزیی جودا و سکرتێرێکی جودا لە نەفسی موئتەمەردا قەرار درا، ئیتر ئەی برای کورد بۆ تێکۆشین لەگەڵ کۆمەڵی شیوعی بە دڵێکی پاك هەوڵ بدەن و بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی میللی هەوڵ بدەن و شیعاری «بژی برایەتی کورد و عەرەب» بالا بکەن و پێشکەون»(ل١-٢).

دوابەدوای ئەوە ئەم وتارەی «فەهد» بەم جۆرەی لای خوارەوە بلاو کراوەتەوە:

«وا هێزی سەربەستی لە یەکیەتی بەسەر کەوت، ئەبێ ڕزگار بین لە ئوسلوبی ژینی «فاشیستی»، بەقەڵەمی سکرتێری عام بۆ «حیزبی شیوعیی عیراقی» برادەر «فەهد».

میللەتانی گێتی لە هەر جۆرە تەرحێکیان دا بۆ دەرهێنانی ڕەگوڕیشەی فاشیزمی هەرە گەورە دوژمنی میللەتان و بە خوێنی پاکی کوڕە دڵسۆزەکانی کەلیمەی سەرکەوتنیان نووسی، سەرکەوتن لەسەر دوژمنی

---

[٣٣٢] بڕوانە: «آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ١٩٤٥، ل١.

میللـەتان و دوژمنــی مەدەنییــەت، ســەرکەوتن لەســەر دوژمــن سەربەســتیی میللەتە بچووکەکان، سەرکەوتن لەسەر ئیستیعمار و لەسـەر ڕێگـا پیسـەکەی کە ئەیەوێ خوێنی میللەتان بمژێت بە هەر جۆرێك بـێ، لـەو دەقیقـەوەی کـە «نازییەت» «هاتە– ك.م.» سەر حوکم ساڵی ١٩٣٣ هەموو ئامانجی ئەمە بـوو کە سەربەستی میللەتانی بچووك بکوژێت و موکافەحەی چینی کرێکار بکات، بەڵام مەیدانی شەڕ تەنها لە «ئەڵەمانیا» نەبوو، بەڵکو تەئسیری لەسەر گشـت میللەتان کرد و بـە دوو بـەش دابـەش کـران، بەشـی یەکـەم مـەلاك و خـاوەن شەریکات و کلکانی ئیستیعمار، ئەوانەی کە بە هەموو هێزیان هـەوڵیان دا بـۆ ئەوەی میللەت بێ چەك بکەن تاوەکو نەتوانێ خۆی بپارێزێ بەرانبەر هێرشە پیسەکانی نازییەکان، بەڵام بەشـی دووەم کرێکـار و فەلاحـەکان و میللـەتانی حەق خوراو و ژێر چەپۆك یەکدگیر بوون لە ژێر فەرماندەری باوکی میللەتانی بێ هێز و بچووك «یەکیەتی سۆڤیەت» و هەموویان بە هەموو هێزێکیانەوە بـۆ پاراستنی دموقراطییەت تێکۆشین کە ئەمەش یەکەمین ڕێگایـە بـۆ پاراسـتنی سەربەستی و شـکاندنی ئـەو زنجیرە بـە هێـزەی کـە فاشیسـتەکان لـە پێـی بەشەرییەتیان خستبوو کە ئەم هەموو بـەلا گەورانـەی بەسـەر دونیـا دەهێنـا وەکـو ئــەزەمات و خۆپەرسـتی و شەڕوشـۆڕی ئیسـتیعماری... تـا دوایـی. سەرکەوتن لەسەر نازییـەکان شـتێکی ئیعتیـادی نـەبوو، بـەڵکو سـەرکەوتنی میللەتانی گێتییە لەسەر هەرە گەورە دوژمنــی سەربەسـتیی میللـەتان: ئەمـە سـەرکەوتنێکە بـە خـوێنی میللـەتان «هاتـە دی–ك.م.» و دەورێکـی نـوێ لـە ژیــانی ئــەو میللەتانــەدا دەســتی پێکــرد. ســەرکەوتنێکە کــە یەکــەمین نەتائیجەکانی «بریتییە لەوەی– ك.م.» هەر میللـەتێك ئـەتوانێ خـۆی حـەقی خۆی تەعیین بکات، بە هـۆی ئـەم پیرۆزییـەوە هـەموو میللـەتان ڕێگایـان بـۆ کراوە تاوەکو بتوانن لە ژیانی پێشوو ڕزگـار بـبن.... میللـەتی خۆشەویسـتی «عیراق» ئەیەوێ نەتائیجی سەرکەوتنی ئـازادی لەسـەر «نازییـەت» ببینێـت و خۆشـی لـە سەربەسـتی بچـێژێت و ژیـانێکی تـازە دابمـەزرێنێت و ئەیـەوێ حوریاتی دەستووری بپارێزێت و قـەوانینی ئیسـتثنائی هـەڵبگرێت.... وەکـو

قـانوونی موکافەحـەی شـیوعییەت و قـانوونی مـەطبوعـات، میللـەتی خۆشەویستمان ئەیەوێت لەو حاڵە ناخۆشە ڕزگار بێـت کـە تـەنها بـە قسـەی جاسووسێك یان پۆلیسێك بۆ بەندیخانە ئەینێرن و خوا نـەبێ کـەس نـازانێ چ وەقـت قورتـار ئـەبێت، میللـەتی «عـێراق» ئەیـەوێت حوکمـەت دائـیرەی تەحقیقاتی جینائی پاك بکاتەوە لەو کەسانەی بوونەتە سەرچاوەی ناخۆشـی میللەتـە خۆشەویسـتەکەمان، ئـەم دائیرەیـە کـە هـیچ ئیشـێکی بـە قـازانجی نەبووە جگە لە ئەزیەتـدانی دانیشـتووانی وڵات و ئیشـکەرانی وەطـەنییـەت و هەر ئەزیەتدانی کرێکـاران کـە ئەیانـەوێ کرێکـار ڕزگـار بکـەن.... میللـەتمان چاوەڕێی ئەکات کە حوکمەت ڕێگای بدات بۆ تەشکیلی ئـەحزاب و نـەقابات و تەنزیمی حەفەلات و موزاهەرات، ئەمانەوێ حوکمەت حەدێك دابنێت لە بەینی عـێراق و نیزامـی ئیسـیتعماری ئینگلیـزی و حـەدێك دابنێـت بـۆ تێکـەڵبوونی «ئینگلیزەکـان» لـە ئیشـوکاری داخلیمـان و ئیـدارەی محـەلی لـەو موەزەفـە ئینگلیزانە پاك بکاتەوە چونکە یەکەمین سەبەبن بۆ ئەوەی ناوی ئیسـتیقلالی «عیراق» بخەنە «خبر کان» ەوە.

ئەمەیە کە میللەت تێئەگەیێنین کە بۆی تێبکۆشێ، ئـیتر بـۆ پێشـەوە بـۆ حقـوقی دیمـوقراطـی و زدی قـەوانینی ئیسـتیثنائـی و زدی هـەر جـۆرە تەدەخولێکی ئەجنەبی و نفوزی ئیستیعماری»[٣٣٣].

دوا بەدوای ئەمە ڕۆژنامەی « آزادی » وتارێکی بە نرخی بەم ناونیشانەوە بلاو کردۆتـەوە: «دەنگوباسـی کرێکـاران. چـینی کرێکـاری کـورد» کـە تێیـدا دەڵێت: «چینی کرێکار لە کوردستان عیبارەتە لەو کرێکارانەی کە لە قیتـاری کـەرکووك و خانـەقین و ماکینـەکانی ئـارد و بـووز «واتـا سـەهۆڵ—ك.م.» لـە «هـەولێر» و «سلێمانی» و «کـەرکووك» ئـیش دەکـەن و ئـەو کرێکارانـەی لـە دائیرەکانی ئیشـوکاری حوکمـەت وە کردنـی خـەڵوز و چـاندنی تـووتن و لـە

---

[٣٣٣] بڕوانە: (آزادی)، ژمارە ٣، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥، ل٢-٣.

گـەلێك جێگـای تـریش ئـیش دەکـەن، وە ئـەو کرێکـارە کوردانـەی لـە بـۆ «ئینگلیز» ئیش دەکەن ژمارەیان کەم نییە.

چینی کرێکـار لـە کوردسـتان عیبارەتـە لـەو بەشـانەی کـە لـە سـەرەوە گوتمانن و ئەگەرچی تا ئێسـتا ژمارەیـەکی مـەزبووت بـە دەسـتمانەوە نییـە، بەڵام هەر چۆنێك بێ بە مەعنای عیلمی کرێکاری کورد چینێکی سەربەخۆیە.

وە بـە گـوێرەی تەتـەوری زرووفـی ئیقتیصـادی لـە کوردسـتان ئـەمیش قابیلییەتی زۆر بوون و پێشکەوتنی هەیە، لەبـەر ئەمـە مەسـەلەی کرێکـاری کـورد و تێکۆشـین بـۆ پێشخسـتنی مسـتەوای ئیقتیسـادی و سـەقافی و ئیجتیماعی بەشێکی مەسەلەی نیشتیمانیمانە.

چینی کرێکـار بەشـێکی میللـەت تەشـکیل دەکـات، بەشـێکی وەهـا کـە سیاسییەن و ئیجتیماعییـەن ئەهەمیـەتی خـۆی هەیە، کـەوابێ پێویسـتە بـە چاوێکی ئیهتیمامەوە تەماشای بکرێ، وەزعی کرێکار کە تا ئێستا لە حقـوقی سیاسی و ئەدەبیی خۆی بێ بەش بووە نەك تەنها لە «کوردستان» بـەڵکو لـە گشت «عـێراق» سـەبەبی ئـەو ئەسالیبە غـەیرە دیموقراتییەیـە کـە لـە لایـەن حوکمەتەوە بە کار هاتووە، وە سەبەب ئەو عەقڵییەتە کۆنەیـە کـە صـاحیب ئیشەکان هەیانە و سەبەب تەعەصوبیانە بۆ کاری خۆیان و چاوپۆشینیان لـە حقوقی کرێکار. لەبەر ئەمە دەبینین کرێکـاری کـورد کەوتۆتـە نـاو وەزعێکـی دژوارەوە، مەسـەلەن کرێکـاری کـورد نەخوێنـدەوارە، برسـییە، هـەردەم هەژارە، ناساغە، ڕۆژانەی کەمە.

ئـەم هـەموو دژوارییانـە کـە ئیمـڕۆ لەسـەر کرێکـاری کـورد کۆبۆتـەوە سەربەخۆ حەل ناکرێ ئیلا بە بێ کۆششێکی بەهێز نەبێ، لەبەر ئەوە «وەك—ك.م.» دیمان دیفـاع کـردن لـە حقـوقی کرێکـاران واجبێکـە دەبـێ ئێمـە پێـی هەڵبستین وە ئەم تێکۆشینە تەنها بـە ئێمـە پێـك نـایێ، ئێمـە تێئەکۆشـین و

برایە کرێکارەکان بانگ ئەکەین بۆ وەرگرتنی حقوقی سیاسی و نەقابی و زێدەکردنی ڕۆژانەیان وە بۆ تەسقیف کردنیان.

ئەی برای کرێکار وا برایەکانت کرێکارانی عەرەب لە نەتیجەی تێکۆشین وە تەعاونیان لەگەڵ حیزبی خۆیان «حیزبی شیوعیی عیراقی» بە کەمێك لە حقوقی مەشروعی خۆیان گەیشتن وە بۆ ئەوانی تریش تێئەکۆشین تۆش لەو سەعی و کۆششەی ئەمان دەرس وەرگرە وە بۆ حقوقی خۆت کۆشش بکە و لەسەر ئەم ڕێگایە بڕۆ کە جەریدەی خۆت «آزادی»بۆتی ڕەسم دەکات.

ئێمە کە باوەڕمان بە هێزی تۆ و پێشکەوتنی تۆ هەیە هیچ وەختێك تۆ بەجێ نایێڵین وە بۆ بالا کردنی ئالای چینی کرێکار تێئەکۆشین وە پێش ئەکەوین. سەربەستێك» [334].

وتاری دواتری هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی « آزادی » بۆ بابەتی «کوردی ئێران» تەرخان کراوە و بێ باکی نووسەری باسی چالاکییەکانی کۆمەڵی «ژ.ك» دەکات و دەڵێت:«ژ.ك» مانای «ژیانی کورد» دەبەخشێت و «ئەم حیزبە بۆ لەناوبردنی «فاشیست»ە گەورەکان بە هەموو هێزێکییەوە کۆششی ئەکرد» . دوابەدوای ئەمە نووسەری وتاری ناوبراو ئەم ڕاستییە دەگمەنە بایەخدارەی لای خوارەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە: «لە یەکەم ڕۆژەوە کە ئیستیعمار بە هەبوونی کۆمەڵێکی وای زانی کەوتە بیرکردنەوە بۆ [335] لەناو بردنی، بەڵام هەرچەندە بە حوکمەتی ڕەجعیی «ئێران» و «تورکیا» و «عیراق» و چەند کوردێکی پوولپەرست کەوتە دوای دۆزینەوەی ئیدارەی گۆڤاری حیزبی نیشتیمان و ناوی چەند ئەندامێکی حیزب نەیتوانی و بۆی نەکرا و مەئیوس بوو تا لەم دواییانەدا «چەند مانگێك لەومەبەر» توانییان حیزبێکی ڕەجعیی ئیستیعماری بەناوی «حیزبی حەلقە»ی کوردی بنیاد بکەن، جا بۆ

---

[334] بڕوانە: «آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥، ل٣-٤.

[335] بە هەڵە لە بریتیی «بۆ» «بەهۆی» چاپ کراوە.

هەموو ئەندامێکی ئەو حیزبە خوێندەوار (١٦٠) تومەن و نەخوێندەوار (٧٥) تومەن مانگانە براوبۆوە وە پێشەکیش دەمانچەیەکی «گۆڵد» و (١٠٠) فیشەك ئەدرایە گەلێك لە کوردفرۆشەکان و پوولپەرستەکان و ئاغاکان «ئەوانەی — ك.م.» کە داخڵی بووبوون و کە هەمیشە هەوڵیان ئەدا بۆ لەناوبردنی حیزبی «ژ.ك» و دواخستنی کورد و وەبەرچاوگرتنیان لە پەیڕەویی تازە کە هەموو گێتیی وەك ڕۆژ ڕوون کردووە.

کە «ژ.ك»ی یەکان بەمەیان زانی بە هۆی ئەندامێکیان کە بە هەر جۆرێکی هەبێ توانی بچێتە ناو حیزبە ناپەسندەکەیان و لە پاش ئەوەی کە بەتەواوی ئامانج و هەوڵ و تەقەلایان دەرکەوت و دیتی کە برێ لە برایە کوردەکان لە ژێر تەئسیری پارە هەڵخەڵەتاوە و زدی کورد و «ژ.ك» ئیش دەکەن یەکسەر ئاگاداری لیژنەی مەرکەزی حیزبی «ژ.ك» ی کردووە و هەر نهێنییەکی بۆ هێنانە سەر دەست و هەموویان بۆ دەرکەوت کە بە پێویستیان زانی بناغەی «حەلقە» ییەکان بڕووخێنن و لە ناویان ببەن چونکە ئەم کۆمەڵە ئامانجی دوژمنانی میللەتی کورد بوو، لەبەر ئەمە دوژمنایەتی کۆمەڵی «ژ.ك» ی ئەکرد و «ژ.ك» بۆ بەربەست کردنی ئەم کۆمەڵە ناپەسەندە هەموو تەقەلایەکی دا و لەم کارەدا یەکیەتی سۆڤیەت ئاگادار کرا و بە ئیستیحسانەوە لەلایەن سۆڤیەتەکانەوە موقابەلە کرا.

ئێستا یەکیەتی سۆڤیەت بۆ یاریدەدانی کوردەکان لە هێنانی کوتاڵ و شەکر و چای هەر شتێکی کە پێویستی میللەت بێ قسور ناکات و ناوچە کوردەکانی کردووەتە خۆشی و لەم زووانەدا چەند سینەمایەکی بۆ هێناون کە هەموویان فیلمەکانیان بۆ کوردن و لەسەر کوردن، وەکو «تەمسیلی «سەلاحەددین ئەیوبی»»، «کەریم خانی زەند»»، «مەم و زین» .... تا دوایی» وە لەو ڕۆژەوەی کە «ئیستیعماری ئینگلیز»ی بە نیشانی سەربەستی کوردەکانی زانیوە....هیچ حەجمانی بە دەوائیری ئیستیخبارات و ئینزیبات و


مەعرووف جیاوك

چاسووسییەکانیان بلاو بوونەتەوە، ئەوەیە کە دەربارەی برا کوردەکانی ئێران دەیزانین و ئومێدی پێشکەوتن و سەرفرازییان بۆ دەکەین و هیوای ئازادبوونی برا کوردەکانی تورکیاش دەکەین کە چۆن برا کوردەکانی ئێران کەوتنە خۆشی ئەوانیش لە ژێر پەنجەی تورکە فاشیستەکان دەربچن و هەر وەکو ئیمڕۆ بە خۆشییەوە ئەم دێڕە لەسەر برا کوردەکانی «ئێران» دەنووسم لە بابەت خۆشیی ژیانیان ڕۆژێکیش بێت لە بەبات ڕزگاربوون و خۆشیی ژیانی برا کوردەکانی «تورکیا»ش بنووسرێ و هیوای ئەو ڕۆژەش ئەکەم کە لەسەر ئازادی و خۆشیی ژیانیان و گەیشتنە ئامانج لەسەر هەموو «کوردی کوردستان» بنووسرێت، ئیتر بۆ پێشەوە ئەی لاوانی خزمەتگوزاری کوردەواری بۆ ڕزگارکردنی میللەتە هەژارەکەمان لە دەست برسێتی و ڕووتییەتی و نەزانین و بەتایبەتی لە دەست وڵات فرۆشەکان و پوولپەرستەکان و نۆکەرەکانی ئیستیعمار، وە بۆ ڕوونکردنەوەی بەردەمی هاوڵاتییەکانتان بە ڕووناکی ئازادی و بلێسەی ئەو گەورەیە کە بەردەمی گەلێ میللەتی ڕوون کردووەتەوە و تازە تورسکی دێت، بگاتە کوردستان. ئەویش ئەو بلێسەیەیە ئەو گەورەیە، ئەو ئەستێرەیە کە لەوڵاتی کرێکار و جووتیار و بێشکەی ئیشتراکییەت هەڵساوە، ئەو ئەستێرەسوورەیە کە نووری پەرت بووەتە هەموو وڵاتێکی گێتی. بیێ باك»[٣٣٦].

«لە هەر لایەکەوە» ناونیشانی دواتری هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی «آزادی»یە کە دیسانەوە هێرشێکی زۆری تێدایە دژی «مەعرووف جیاوك»ی موتەصەریفی «سلێمانی» و دایکی «جوامێر»ی هاوسەری و پێوەندییان لەگەڵ

---

[٣٣٦] بڕوانە: «آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥، ل٤-٥.

«حەپسەخانی نـەقیب» و «شـێخ قـادری بـرای شـێخ مـەحموود» و «تێکـدانی حەفلەی خـەڵاتکردن لـە مەکتـەبی کچـانی «سلێمانی» بـە دەسـتی پـۆلیس، وێڕای چەند هەواڵێکی شاری «ڕەواندن» [٣٣٧].

دوای ئەوەیش «آزادی » داوا لە «برای کورد» دەکات بـە وردی نـاوەڕۆکی ڕۆژنامەکە بخوێنێتەوە و هەوڵ بدات بـە فـراوانترین شـێواز بـڵاوی بکاتـەوە و ڕووی دەمی تی دەکـات و پێـی دەڵێـت: «ئـەی بـرای کـورد بـە هـیچ جۆرێـك «آزادی» لە یاریدەی مادی و مەعنەوی تۆ ئیستیغنا ناکات و بـە هـیچ جۆرێـك واز لە فیداکاریی خۆی ناهێنێ مادام مەسڵەحەتی تۆی تێدابێت.

ئەی برای کورد «آزادی» شتێکی بە نرخە چونکە ئێش و ئـازاری میللەتـە بریندارەکەت دەرمان دەکات، کەوابێت نەکەی بە شتێکی بێ نرخی تێبگـەیت و چاوی دوژمنانی خـۆت ڕوون بکـەیتـەوە، دەرمـانی دەردی خـۆت لـە یەکـەم دۆستی بە وەفات «آزادی» وەربگرە......» [٣٣٨].

سەرتاپای لاپەڕەی هەشتی ئەو ژمارەیەی «آزادی»، کە هـەمان کـات دوا لاپەڕەیـەتی، بـۆ وێنەیـەکی گـەورەی سـتالین و پارچـە هۆنراوەیـەك بـە ناونیشانی «سەلام بۆ «ستالین» تەرخان کراوە، وێنەکە ڕێکوپێکە و بە ڕەنگی سەوز گیراوە، هەرچـی شیعرەکەیشـە لـە چـواردە بـەیت پێکهـاتووە، دەقـی بەیتی یەکەمیان دەڵێت:

ئەتۆ لێمی قەبوڵ ناکەیت (ستالین) طاعەتی ئەعمی
بەڵام تەقدیسی تۆ هەردەم ئەکەم بەخوا لە دڵما
دوا بەیتیشیان دەڵێت:
ستالینم ڕەفیقی خۆشەویستم هەربژی دایم
بە تەنها من وەها ناڵێم، شیعاری میللەتی خۆمە [٣٣٩]

**«٦– ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» بە زوبانی کوردی:**

---

(٣٣٧) بروانە: « آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥، ل٥–٧.
(٣٣٨) بروانە: « آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥، ل٧.
(٣٣٩) بروانە: « آزادی»، ژمارە ٣، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٥، ل٨.

نیشتمانیکی ئازادو میللەتیکی بەختیار

آزادي كوردستان

زماني حزبي شيوعي عيراق، لقي كوردستان

ژمارە (١) سالی (١٣) دوایی حەزیران ٩٥٧

نرخی - ٢٥ - فلسە

بەو جۆرە «حیزبی شیوعیی عیراقی» ڕۆژ بە ڕۆژ لە ناوچە کوردییەکانی «عیراق»دا چالاکییەکانی پەرەیان دەسەند و جەماوەری بۆ مافی «کوردستان» لە دەوری دروشمەکانی کۆدەبوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان بوونە بەشێکی سەرەکیی ڕەهبەرە دیارەکانی حیزب و هەر بەو پێیەش چاپەمەنییە کوردییەکانی حیزبی ناوبراو لە دوا قۆناغی ڕژێمی پاشاییدا لە هەموو ڕوویەکەوە هەنگاوی باشیان بەرەوپێشەوە نا. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە پەنا دەبەمە بەر ناوەڕۆکی ژمارە یەکی ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» کە تەنها یەك ساڵ بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ دا دەرچووە و دانەیەکی دانسقەی ئەویش لە کتێبخانەکەی مندا پارێزراوە.

لاپەڕەی یەکەمی ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» بەم جۆرەیە: لەسەروو ناوی ڕۆژنامەکەوە دروشمی سەرەکیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بەم جۆرە نووسراوە «نیشتیمانێکی[٣٤٠] ئازاد و میللەتێکی بەختیار» و لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەیشدا نووسراوە «زمانی حیزبی شیوعی عیراق» لقی کوردستان، ژمارە (١)، ساڵی (١٣) دوایی حەزیران ١٩٥٧، نرخی ٢٥ فلسە».

ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» شازدە لاپەڕەی مامناوەندییە (٢٠×١٤سم) ەو بە جوانی و بە پیتی کوردی چاپ کراوە.

---

[٣٤٠] لەو شوێنانەدا کە دەقێکمان لە ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» وەرگرتووە دەستکاریی شێوازی ڕێنووسی ڕۆژنامەکەمان نەکردووە، ئەگەر وەها نەبووایە ئەو دروشمەی «حیزبی شیوعیی عیراقی»مان بەم جۆرە دەنووسی: «نیشتیمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختەوەر»..

«لاچـوونی «نـووری سـەعید» گـۆڕینی مەبەسـتەکانی ئیسـتیعمار نییـە» ناونیشانی یەکـەم وتـاری ڕۆژنامـەی نـاوبراوە (ل ١و٨)، ئەمـەیش ناونیشـانی دووەم وتاریـەتی: « تێکۆشـان بـۆ وەسـتاندنی تاقیکردنـەوەکانی ئـەتۆم و هایدرۆجینی فەرمانێکی پێویستی نەتەوەی کـوردە»(ل ٢-٣ و ١٤). «بوێـژی بەرزی کوردستان مامۆستا گۆران» بابەتی دواتـری ئـەو ژمارەیـەی ڕۆژنامـەی «ئـازادی کوردسـتان»ە (ل ٤-٥)، وتـاری دواتریشـی بـەم ناونیشـانەوەیە «داخوازییـەکانی لیژنـەی بـەرزی نیشـتیمانی» کـە دیـارە مەبەسـتی «بـەرەی نیشتیمانیی یەکگرتوو» «جبهة الأتحاد الوطني» یە (ل ٥).

سەروبەری لاپەڕە شەشی هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» بۆ بابـەتی «یـادی ڕۆژی شـەهیدانی کـورد» «مسـتەفا خۆشـناو» و «محەمـەد قودسی» و «عیزەت عەبدولعەزیز» و «خەیروڵلا عەبدولکەریم» تەرخان کـراوە، «دەنگوباسی کوردستان»یش لە دوا ساڵی تەمەنی رژێمی پاشاییدا لـە عـێراق نزیکەی سێ لاپـەڕەی ئـەو ژمارەیـەی ڕۆژنامـەی «ئـازادی کوردسـتان»ی پـڕ کردۆتەوە (ل٧-١٠، ١٣) و بەشاری «سلێمانی» دەستی پێکـردووە و هـەواڵی دوورخسـتنەوەی «عومـەر عـەلی» لـە پۆسـتی پارێزگـاری ئـەو شـارە و دەوروبەری کردووەتە سەردەستەی هەواڵەکانی کوردسـتان کـە لـە ناوەنـدی پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە بووبووە دروشمێکـی سـەرەکیی گشـت هێـزە نیشتیمانییەکانی ناوچەکە و لە سەروو هەموویشیانەوە لقی «حیزبی شیوعیی عیراقی»، «ئازادی کوردستان» دەقاو دەق ئەمەی لای خـوارەوەی دەربـارەی ئەو بابەتە نووسیوە:

«ئازادی کوردستان لە یەکەم ڕۆژەوە عومەر عەلیی بە خـەڵك «ناسـاند- ك.م.» کە تۆرانییەکی دز و دوژمن بە نەتەوەی کوردە و تـەنها فـەرمانێك کـە لـە «بەغـدا»وە پێـی سـپێردرا کزکردنـی گیـانی کوردایـەتی و داپڵۆسـینی

جولأنەوەی نەتەوەییمانە، لە پێناوی ئەم فەرمانەیشدا ڕێگەیَ دراوەتیَ بە هەوەسی خۆی تالأنی بکات و گیرفانی خۆی و ژنەکەی بئاخنیَ»[٣٤١].

دەربارەی هەمان بابەتیش «ئازادی کوردستان» ئەم قسانەی لای خوارەوە لە زوبانی «سەعید قەزان»ی وەزیری ناوخۆی ئەوسای عیراقەوە دەگێڕێتەوە:

«لە سەرەتای سالّی ١٩٥٥دا سەعید قەزاز هات بۆ «سلێمانی» و بە پیاوە ناسراوەکانی شاری وت– وا مەزانن عومەر عەلیش موتەسەڕیفێکە وەك ئەوانی تر، نەء! ئێمە هەموو جۆرە دەسەلأتێکمان داوەتیَ، شکات و مەزبەتە بۆ ئەم سەرناگریَ! تەنانەت ئەگەر ئەم ئیشێکی کرد پێچەوانەی قانون بوو ئێمە ئیشەکەی ئەم تێك نادەین «بەلّکو–ك.م.» قانونەکەی بۆ هەلّدەوەشێنین!!»[٣٤٢].

هەمان ڕۆژنامەی ناوبراو باسی تووتنیشی وەك «بەرهەمێکی زۆر گرنگی کوردستان» کردووە و بەو بۆنەیەوە هێرشێکی زۆری کردووەتە سەر بەڕێوەبەرایەتیی ئینحیسار و دوای ئەوەیش دێتە سەر هەوالّەکانی شاری کەرکووك و دەوروبەری و گشت ئەو بەشەی بابەتەکەی بۆ سەرباز و سەربازگەی ناوشار تەرخان کردووە کە چۆن شەووڕۆژ بە جۆرێکی سەیر بیَ وچان ئامادە دەکرێن نەبا شتێك لەو بارودۆخە ناسکەدا ڕوو بدات (ل٩)، دوای ئەوە دێتە سەر باسی شاری هەولێر و بەتایبەتی باسی باری نالەباری جووتیارانی ئەو ناوچەیە دەکات و گەلێك شتی سەیر و دەگمەن دەگێڕێتەوە، جا کورد واتەنی ئەگەر «مشتێك نموونەی خەروارێك بێت»، کە هەر وایشە،

---

[٣٤١] بڕوانە: «ئازادی کوردستان»، ژمارە ١، سالّی ١٣، دوایی حوزەیرانی ١٩٥٧، ل٧.

[٣٤٢] شایانی باسە قسەکانی سەعید قەزازمان وەك خۆیان هێناوەتەوەو و تەنانەت ئەو نیشانەی تەئکیدانەیش وەك خۆیان لە ڕۆژنامەکەوە هێنراونەتەوە. بڕوانە: «ئازادی کوردستان»، ژمارە ١، سالّی ١٣، دوایی حوزەیرانی ١٩٥٧، ل٨.

ئەوا ئەم نموونەیەی لای خوارەوە دەربارەی ئەوەی شارە سەرکەشەکەی «پاشا کوێرە»ی میری ڕەواندز دەگێڕینەوە:

«لەو ئیستیعرازەدا کە قوتابییە ساواکانی ڕەواندز لەسەر مەیدانی حامییە کردیان دوو قوتابی دەرکەوتن کە یەکێکیان جلی کوردی و ئەویتر سەروبەرگی عەرەبیی لەبەردا بوو، ئالآیەکیان هەڵگرتبوو لێی نووسرابوو: «بژی برایەتی کورد و عەرەب» و لە پێش هەموو ڕیزەکانەوە ئەڕۆیشتن. ئەم دیمەنە کاری کردە سەر دەروونی بینەرەکان و چەپڵەیەکی زۆر لێدرا، بە تایبەتی قوتابییە عەسکەر گیراوەکان لە «ڕەواندن»[٣٤٣] هەستێکی باشیان دەربڕی»[٣٤٤].

هەرچی دوا هەواڵی ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان»ە بۆ ناوچەی «بارزان» تەرخان کراوە و نووسیوییە دەڵێت:

«ناوچەی بارزان– «ئەسعەد ئاغای دەرەبەگ» داوای چوار گا و حەفتا دینار پارەی لە فەلاحێك ئەکرد کە ئەیەویست ژن بۆ کوڕەکەی بهێنێت، بەڵام کاتێك مامەی فەلاح پەلاماری تفەنگی دا ئەسعەد ئاغا بە ناچاری دەستی لە چوار گا و حەفتا دینارەکە هەڵگرت» (ل١٣).

پێم سەیرە چۆن «ئازادی کوردستان» باسی «بارزانی» و هاوەڵەکانی کە پەنابەر بوون لە «یەکیەتی سۆڤیەت» نەکردووە هەرچەندە فەرمانڕەوایانی ئەو ڕۆژگارەی «عیراق» لەوە زراوەترەك بووبوون کە هەر ئەوەندەت دەزانی دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە دەورووژێنرا[٣٤٥]،

---

[٣٤٣] لەو دەورووبەرەدا میری بۆ دوورخستنەوەی دەرچووانی زانکۆی بەغدا لە چالاکیی سیاسی دەیناردنە سەربازگەی ڕەواندز.

[٣٤٤] «ئازادی کوردستان»، ژمارە ١، ساڵی ١٣، دوایی حوزەیرانی ١٩٥٧، ل١٣.

[٣٤٥] بڕوانە بابەتی «دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی لە ساڵی ١٩٤٩ و ساڵی ١٩٥١ لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بۆ کوردستان لە دوو فایلی نهێنیی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا».

وێڕای ئەوەیش دەوروبەری یازدە ساڵ دەبوو «شێخ ئەحمەدی بارزان» و ژمارەیەك بارزانیی زۆر لە «بەندیخانەی بەسرە» ژیانێکی سەختیان دەبردە سەر. پێویستە لێرەدا ئاماژەیش بۆ ئەوە بکەین کە دوا لاپەڕەی ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی هەڵچوونی پرسی کوردی لەو ڕۆژانەدا کردووە:

«کوردیش لەم ماوەیەدا تووشی دەرد و ئازار و چەرمەسەرییەکی زۆر هات، کردەوە جانەوەرەکانی «عومەر عەلی» لە «سلێمانی»، کوشتارە خوێناوییەکەی «جوانڕۆ» لە «ئێران»، گیران و دەربەدەرکردنی ئازادیخوازانی «کوردستان» و نزیکبوونەوەو هاوسوێندی لەگەڵ دوژمنی دێرین و خوێنخۆری کورد، واتا «حوکمەتی تورکی» زۆردار، ئەمانە گشتیان بەری ئەو دڕك و زیپەیە کە حوکمەتی «نووری سەعید» لەسەر ڕێگەماندا چاندی.

ئەمجا داخوازیی نەتەوەیی کوردیش بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە[٣٤٦] و بڵاو کردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی و خوێنەرانی مێژوو و ئەدەبی خۆیی، پاکیان ئەنجامێکی پێکهاتی داخوازییەکانی سەرەوەن و لە سەرمانە کە بۆ سەرگرتنیان بکەوینە کۆششێکی بێ وچان هەتاوەکو میللەتەکەمان بگەیێنینە ئاوات و ئامانجە بەرز و پیرۆزەکەی دێرینی: نیشتیمانێکی ئازاد و میللەتێکی بەختیار»[٣٤٧].

بەو جۆرە ڕۆژنامەی «ئازادی کوردستان» بە کوردییەکی پاراو و چاپێکی زۆر ڕێکوپێك و کەم هەڵە و ڕازاوە پەخش دەکرا و ئەوەیش ڕێگەی خۆش کرد بۆ ئەوەی جێگەیەکی شیاوی بۆخۆی لە ناخی دەروونی زۆرینەی نیشتیمانپەروەرە خەباتگێڕەکان و لە سەروو هەمووشیانەوە لە نێو زۆرینەی دەستەبژێری کورددا کردبۆوە و هەڵبەت لە خۆڕا نەبوو کە یەکێکی وەك

[٣٤٦] لە دەقی وتارەکەدا بە هەڵە لە بریتی وشەی کۆمەڵە «الجمعیة والجمعیات» وشەی کۆمەڵ «المجتمع» چاپ کراوە.

[٣٤٧] بڕوانە: «ئازادی کوردستان»، ژمارە ١،ساڵی ١٣، دوایی حوزەیرانی ١٩٥٧، ل١٦.

،دوکتور موکەرەم تاڵەبانی» «ئازادیخوازی» کردبووە سەر ناوی ئەو گۆشەیەی خۆی کە لە ڕۆژنامەی «طریق الشعب» دا دوای شۆڕشی چواردەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ «حیزبی شیوعیی عیراقی» لە «بەغدا» بە زوبانی عەرەبی بڵاوی دەکردەوە.

٧- ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»

لێرەدا بە پێویستی دەزانین بە کورتی ئاماژە بۆ ناوەڕۆکی ڕۆژنامەیەکی چەپڕەوی دیکەی ئەو ڕۆژگارە بکەین کە جۆرە دووبەرەکییەکی سیاسیی ئاشکرای لە نێوان ئەو و ڕۆژنامە نهێنییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا هەبوو کە ئەویش ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»ی ئۆرگانی «پارتی دیموکراتی کوردستان»ی «عیراق»ە. لای من ژمارە سێی ساڵی یەکەمی ڕۆژنامەی ناوبراو پارێزراوە کە مانگی مایسی ساڵی ١٩٥٧ چاپ کراوە[٣٤٨]، واتا پتر لە دە ساڵ دوای دامەزراندنی «پارتی دیموکراتی کوردستان»ی عیراق. ئەو ژمارەیەی «خەباتی کوردستان» هەشت لاپەڕەی مامناوەندییە و لە هەردووك دیوی چاپ کراوەو بارستی بریتییە لە (٢١×١٧سم)، بە تایپراتەر چاپ کراوە، هەرچی ناوی خودی ڕۆژنامەکەیشە بە دەستخەت و ڕەنگێکی مۆری کاڵی گەورە کراوەتە مۆر و لە لای چەپی سەرەوەی ڕۆژنامەکە چاپ کراوە و لە ژێریشیەوە نووسراوە «ئۆرگانی لیژنەی سەرکردەیی پارتی یەکگرتووی کوردستان». لە سەری سەرەوەی ڕۆژنامەکەیشدا ئەم ڕستەیە چاپ کراوە «خەبات ئەکەین بۆ وەدەست هێنانی مافی سەربەستی...» [٣٤٩]، لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەوەو لە لای چەپەوە ئەم قسانەی «بارزانی» چاپ کراون:

---

[٣٤٨] بە قەڵەمی ڕەش یەکێك لە سەرەوەی ئەو ژمارەیەی لای من نووسیوویە (٢٧ی مانگی نیسان).

[٣٤٩] بە داخەوە ئەو ڕستەیە بە جۆرێك چاپ کراوە کە خوێندنەوەی گەلێك زەحمەتە.

«من ئەم بانگەم بۆ هەردوو گەلی کورد و عەرەبە بۆ ئەوەی شان بە شانی یەك بووەستن و کۆششیان یەکبخەن و لە خەباتی یەکگرتوودا بۆ بەرهەڵستیی دوژمنی هەردووك لا ئیمپریالیزم و نۆکەرانی تاوەکو هەر گەلە لە نیشتیمانیی خۆیدا بە سەربەستی و ئازادی و بەختیاری بژیەت. مستەفا بارزانی» (ل١).

«کورد و عەرەب» سەروتاری ئەو ژمارەیەی «خەباتی کوردستان»ە کە نزیکەی پێنج لاپەڕەی چڕوپڕی پڕ کردۆتەوە و باسی ئەو زانا کوردانەی وەك «ئیبن خەلەکان» تاوەکو «زەهاوی»ی کردووە کە چۆن «هەمیشە خزمەتێکی زۆری زمان و مێژوو و ئەدەبی عەرەبیان کردووە و بە جووتە خوێنیان ڕژاندووە بۆ پاراستنی وڵاتی موسڵمانان و بەربەست کردنی پەلاماردەران، بەتایبەتی لە کاتی شەڕی سەلیبییاندا کورد ئازایانە و نەبەردانە لەگەڵ برا عەرەبەکانیاندا بەرەنگاری داگیرکەرانی ئەوروپایی بوون و لە ئەنجامدا دوای ڕشتنی خوێنێکی زۆری جەنگاوەرانی کورد داگیرکەران لەسەر دەستی قارەمانی کورددا «سەلاحەددینی ئەیوبی» شکێنران و خاکی پیرۆزی «فەلەستین»یان لێ خاوێن کرایەوە»[٣٥٠].

ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» لەسەری دەڕوات و دەڵێت: «لەو سەردەمەیشدا کە کورد و عەرەب دووچاری مۆتەکەی عوسمانلی بووبوون و لە ژێر چەکمەی ژەندرمەکانی «تورك» ئەپلیشانەوە دیسان پێوەندییان هەر دۆستانە بوو، وە شان بەشانی یەك بۆ ڕزگاری و سەربەخۆیی «دەجەنگین- ك.م.»و لەو ماوە زۆرەیشدا کە کورد و عەرەب مێژووی چارەنووسی پێکەوەی بەستبوون هیچ شەڕ و ناخۆشی و خوێنڕژان و ناکۆکییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا ڕووی نەداوە کە بووبێتە هۆی دروست کردنی دوژمنایەتی و ناخۆشی و قین هەڵگرتن، بە تایبەتی کورد لە ماوەی دوور و درێژی مێژووی

---

[٣٥٠] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل١-٢.

خۆیدا ڕۆژێ لە ڕۆژان بە پێچەوانەی قازانج و دەستکەوتی گەلی عەرەب نەوەستاوە، بەڵکو هەرگیز هەر لایەنگری عەرەب و قازانجی بووە، تەنانەت دوای ڕمانی «ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی» و بەستنی «کوردستانی خواروو» بە نۆکەری ئیمپریالیزم و هێزی داگیرکەری «ئینگلیز» بە «عێراق»ەوە کورد هەر پشتیوانی بزووتنەوەی ڕزگاریی عەرەب بووە و هیچ دەمێ بە پیچەوانەیەوە نەوەستاوە و بە ئیمپریالیزم فریوی نەخواردووە، نەك هەر ئەوەندە بگرە لە هەموو خەباتەکانی عەرەبدا بۆ سەربەستی و ئازادی کورد ڕۆڵێکی باشی بووە و چەند جار لە پێناوی سەربەخۆیی عەرەبدا خوێنی ڕژاندووە و لە هەموو گێروگرفتێکدا عەرەب تووشی هاتبێ و لە هەموو کاتی لێ قەوماندا خەڵکی کوردستان دڵسۆزانە پشتی عەرەبیان گرتووە و هێشتا ڕەنگە خوێنی گەنجانی کورد لە فەلەستین لەبۆ عەرەبیان ڕژاندووە لەکاتی هورژمی چەتەکانی «سەهیۆنی» بۆ سەر عەرەب هەر وشك نەبووبێتەوە، خۆ لەم دواییەدا بزووتنەوەی ڕزگاریی عەرەب هاتە بووژاندنەوە و پەرەسەندن و ئیمپریالیستەکان کەوتنە هەڕەشە و گوڕەشە و پاشان کەوتنە پەلاماردانی نامەردانە بۆ سەر «میسری» قارەمان کورد بە ئاشکرا دەری بڕی کە نەك هەر دۆستی عەرەبە بەڵکو خۆشی سازداوە تەك بە تەکیان شەڕ بکات بە پێچەوانەی ئیمپریالیزم و نۆکەرە سەهیۆنی و عەرەبەکانەوە.

ئێستە کورد بزووتنەوەی ڕزگاریی عەرەب بە بزووتنەوەیەکی پیرۆزی ئازادیخوازی دائەنێ کە ئیمپریالیزم لە ڕۆژهەڵات و هەموو دونیادا ئەلەرزێنێ و زووتر دووچاری چارەی ڕەشی خۆی ئەکات کە گلۆربوونەوەیە لە هەڵدێری هەزار بە هەزارەوە ڕووەو چاڵی مەرگ و نەمان. بێ گومان ئەمەیش دەبێتە هۆی ئاسان کردنی سەرکەوتنی خەباتی هەموو گەلانی ژێردەستە و زۆرلێکراوی جیهان بە گەلی بەشخوراوی کوردستانەوەیش، بۆیە خەڵکی «کوردستان» لەسەر ڕەوشتی هەزار ساڵەی خۆیان زۆر بە گەرمی و دڵسۆزانە

پشتی برا عەرەبەکانیان دەگرن لە خەباتی پیرۆزیاندا بۆ ڕزگاری و یەکیەتی، ئەمەیە ویستەکانی ڕاستەوخۆی کورد لەگەڵ عەرەب، سەرەڕای ئەوەی کورد خەباتیان لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستاندا و بۆ دەکردنی ئیمپریالیزم و داگیرکەران لە نیشتیمانی خۆیدا و بۆ سەندنەوەی سەروەت و سامانی و نەوتی بە تاڵانچووی یارمەتییەکی تری زلی عەرەبی داوە چونکە ئەو خەباتەی کورد وەك هینەکەی عەرەب ئەبێتە هۆی بێ هێزی و شکستیی ئیمپریالیزم».

«خەباتی کوردستان» کۆتایی ئەو سەروتارە بە پێز و بایەخدارەی خۆی بەم قسانەی لای خوارەوە دەهێنێت: «پارتیی ئێمە نوێنەری گەلی کوردە و هەر ئەو بەڕاستی دەتوانێ زۆربەی هێزی بزووتنەوەی کورد لەگەڵ برا عەرەبەکانماندا لە کۆڕی خەباتدا ڕیزبکات و دەری ئەبڕێ کە ئامادەیە لەگەڵ برا عەرەبەکانماندا لە کۆڕی خەباتدا ڕیز بکات و دەری ئەبڕێ کە ئامادەیە لەگەڵ لیژنەی بەرزی نیشتیمانی[٣٥١] بێت و شوێنی خۆی لە کۆڕی خەباتی یەککگرتوودا بگرێ»[٣٥٢].

لە دامێنی لاپەڕە پێنجیدا ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» بە دە دێڕێ بە پێز و هەست بزوێن یادی ڕۆژی یەکی ئایار «جێژنی کرێکار و ڕەنجبەرانی هەموو گێتی» دەکاتەوە و دەڵێت: ئەو «جێژنە پایەیەکی بەرزی لە دڵی کورددا و جێگایەکی تایبەتی لایان هەیە»[٣٥٣].

---

(٣٥١) دیارە مەبەستی «بەرەی یەککگرتووی نیشتیمانی – جبهة الأتحاد الوطني»یە کەساڵی ١٩٥٧ لە نێوان ئەو پارتییانەدا دامەزرێنرا کە دژی ڕژێمی پاشایی بوون و هێزە نەتەوەپەرستەکان و لە سەروو هەمووشیانەوە «پارتی بەعس» دژی ئەوە وەستان «پارتی دیموکراتی کوردستان» ببێتە یەکێك لە ئەندامەکانی، ئەوەی «حیزبی شیوعیی عیراقی» گەلێك هەوڵی بۆی دا و ئەوەبوو بڕیار درا حیزبی ناوبراو ببێتە هۆی پێوەندیی نێوان پارتی و بەرە.

(٣٥٢) بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل٥.

(٣٥٣) بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل٥.

«بژی شەهیدانی ٢٩ی مایس» ناونیشانی ئەو پرسە گەرمەی ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»ە کە بە بۆنەی تێپەڕبوونی سی و دوو ساڵ بەسەر لە سێدارەدانی ڕەهبەرانی ڕاپەڕینە گەورەکەی ساڵی ١٩٢٥ی کوردستانی باکوور «شێخ عەبدولقادر» و «شێخ سەعید» و «دوکتۆر فوئاد» و «ئۆرفەلی زادە» و هەڤاڵەکانیان و «هەزارەها ئەو شەهیدانەی دەستە لە پێناویدا سەربەرزانە بە بەهەشتی نەمری شاد بوون و خوێنی گەشیان وەك بلێسەیەکی شەوقدار لە ئاسمانی نیشتیماندا ڕووناکی دەپرژێنێتە دڵ و گیانی تێکۆشەرانی و ئاسۆی سەربەخۆیی و یەکیەتییان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ئەو ئاسۆیەی مژدەی نزیکبوونەوەی هەڵهاتنی ڕۆژی بەدیهاتنی ئاواتی شەهیدەکان دەدات کە ڕزگاریی کوردستانە بۆ هەموو کوردێکی بە شەرەف»[٣٥٤].

«گەلی کورد لایەنگری خەباتی «جەزائیری» قارەمانە ناونیشانی وتاری دواتری ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»ە کە لاپەڕە و نیوێکی پڕ کردۆتەوە[٣٥٥].

دوابەدوای ئەمە ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» وەستایانە بابەتی خوێندن بە زوبانی کوردی لە ناوچە کوردییەکانی «عیراق»دا دەوروژێنێت و ئەم نموونە سەیرەمان بۆ دەهێنێتەوە:

«لە «کۆیە» کچە بچووکەکانی قوتابخانەی سەرەتایی «ئیبتیدائی» نەك بە زوبانی شیرینی کوردیی زگماك بەڵکو بە زوبانی عەرەبی دەرس دەدرێن بۆیە بەشی هەرە زۆریان هیچ فێر نابن و ئەوەندەی فێریشی دەبن هەر دەرخ کردنە، ئەگەر لە کچێك بپرسی پێنج جاران پێنج ئەکاتە چەند ئەبێ زۆر بیری

---

[٣٥٤] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل٦.

[٣٥٥] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل ٦–٧.

لێ بکاتەوە تا وەڵامت دەداتەوە، کەچی ئەگەر لێی بپرسی «خمسة في خمسة» گورج وەك تووتی ئەڵێ «خمسة و عشرين» [٣٥٦].

لە خاڵی سێیەمیشدا دەربارەی شاری کەرکووك و دەوروبەری ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» بەم جۆرەی لای خوارەوە نیشانی بەدروستی پێکاوە: «لە «کەرکووك» کۆمەڵێکی «تۆرانیی» سەر بە کۆنە پەرستانی «تورکیا» کە ڕاستەوخۆ جاسووسی بێگانەن و بە ئاشکرا لە جرتوفرتدان بە بەرچاوی پۆلیس و یارمەتیی زۆر لە معاوین و موفەوەزەکان کە خۆیان ئەندامن لەم کۆمەڵانەدا کە چالاکیی تۆرانییەت ئەنوێنن و هەڵبەت بە چالاکی بە بڵاوکردنەوەی ژەهری شۆڤێنیزم و هەستی پیسی تۆرانییەت و جاسووسییەتەوە خەریکن» [٣٥٧].

دەربارەی «کوردە فەیلییەکان»ی «بەغدا» و قوتابخانەکەیان لەوێ ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» لە هەمان ژمارەیدا ئەمەی لای خوارەوەی نووسیوە: «لە تاکە قوتابخانەکەی کورددا لە «بەغدا» (قوتابخانەیەکی فەیلییەکان) قەدەغە کراوە بە زوبانی خۆیان بخوێنن و هەر جارێك باسی خوێندنی زوبانی کوردی بێتە پێش کاربەدەستەکانی «حوکمەتی عیراق» دەکەونە هەڕەشەی داخستنی قوتابخانەکە» [٣٥٨].

«کوردستان و ڕژێمی دیموکراسی لە عیراقدا» ناونیشانی وتاری دواتری ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»ە کە شەش لاپەڕەی پڕکردۆتەوە [٣٥٩].

«لە گوڵزاری شاعیرانی کوردستانا» یش بابەتی دواتری ژمارە سێی مانگی مایسی ساڵی ١٩٥٧ی ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»ە کە بەم تێبینییانەی بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەکە دەستی پێکردووە:

---

[٣٥٦] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل٨.

[٣٥٧] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل٨.

[٣٥٨] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل٨.

[٣٥٩] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل١٠-١٥.

«ماوەیەکی کەم لە پێش دەرچوونی ژمارەی پێشووی «خەباتی کوردستان»دا لاوێکی نیشتیمانپەروەر شیعرێکی نایابی بۆ ناردین، بەلاّم داخمان ناچێ نەمانتوانی بلاّوی بکەینەوە لەبەر زۆر سەبەب، وا لەم ژمارەیەدا چەند بەیتێکی بلاّو ئەکەینەوە!

نەورۆز

«نەورۆزی ئەم شارە مات و خەمگینە
چیا تاریکە، باخیش ناشرینە
مەلولە ئەم گولّ و نەسرینە
نەغمەی گەرووی مەل بێ سۆز و تینە
چونکە ژێر دەستە ئەم نیشتیمانە
دیلن ئەم کوردە قارەمانانە
بەخوێنی گەشی ڕەنجبەر و پالّە
تاوێری کەژی کوردستان ئالّە
بۆ هەر کوێ ئەچی زیندان و چالّە
ئەلّێم بێ گومان ئەم ژینە تالّە
ئەبێ دوایی بێ چونکە هیچ هێزێ
هەرگیز بەرگەی هێزی گەل ناگرێ
جەژنە نەورۆزمان بیر نەچۆتەوە
هاتووینە دەرێ لەناو بۆتەوە
موژدەبێ کاوە زیندوو بۆتەوە
«مستەفای بارزانی» جێی گرتۆتەوە
سلاّوتان لێ بێت پێشمەرگانی ئەو
ئەی دلێرانی ڕۆژی گەل و ئەو» [٣٦٠]

---

[٣٦٠] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، سالّی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل١٥.

سەرجەمی دوا لاپەڕەی هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» بۆ هۆنراوەیەك بە ناونیشانی «تیری کەوان» ەوە تەرخان کراوەو بەر لە هۆنراوەکە بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەکە ئەم تێبینییەیان نووسیوە:

«ئەم پارچە شیعرە نایابە ئەڵێی بۆ ئیمڕۆ گوتراوە، بەڵام داخمان ناچێ هەموویمان چنگ نەکەوت».

هۆنراوەکە بەم دوو بەیتە دەست پێدەکات:

(دوا تیری کەوانی خۆت بهاوێژە هەلە دوژمن

دوا سەرکەوتنی تۆیە و دوا نووچی گەلە دوژمن)

هەروەها هۆنراوەکەش بەم دوو بەیتە کۆتایی دێت:

(نە کۆڵ دان و نە ژان و نە وەستانی هەیە هەرگیز

پشوو نادا هەتا نەبڕێ ڕەگی چەوسانەوە و ماکی)[٣٦١].

شایانی باسە لەسەر دوا لاپەڕەی ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان» مۆرێکی گەورەی پێوەیە کە بە عەرەبی لەسەری نووسراوە «مديرية شرطة لواء السليمانية. القلم السري».

ئەوەی بە تایبەتی لەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی «خەباتی کوردستان»دا سەرنج ڕادەکێشێت بریتییە لە چەند خاڵێکی سەرەکیی وەك شێوازی داڕشتنی ناوەڕۆکی بە کوردییەکی ڕازاوە و پەتی و کوردایەتییەکی خاوێن و دوور لە هەستی ڕەگەزپەرستی و هەڵسەنگاندنی بابەتەکیی برایەتی کورد و عەرەب و دەستنیشانکردنی لایەنە ڕەواکانی خەباتی ڕزگاریخوازی عەرەب و بڕوای پتەوی ڕۆژنامەکە بە مافی چارەنووسی گەلان بە گەلی کوردەوە، ئەو ڕاستییانەی تەواو لەگەڵ سیاسەتی گشتیی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا دەگونجان بەو شێوازەی «فەهد» دەستنیشانی کردبوون، شایانی باسە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی «پارتی دیموکراتی کوردستان»ەوە «فەهد» لە

---

[٣٦١] بڕوانە: «خەباتی کوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل١٦.

ڕێگەی «ئەنوەر ئەدهەمەوە» [٣٦٢] لەگەڵ تەها محی ددین مەعروفداو وەك نوێنەری پارتی لە ناوچەی «بستان الخس»ی نزیك «بەتاوینەوە» یەكتریان دیوە و پێوەندیی هەردووك حیزبیان هەڵسەنگاندووە [٣٦٣]، بریا ئەو برایانەش كە بەرهەمیان لە ڕۆژنامە كوردییە نهێنییەكاندا بڵاو كردۆتەوە خۆیان، یان ئەوانەی ئاگادارن ناوەكانیان بڵاو دەكردنەوە.

٨- بەیاننامەیەكی دەگمەن

هەمان كات بەیاننامەیەكی بایەخدار و دەگمەن لە كتێبخانەكەمدا پارێزراوە كە ئەویش تیشك دەخاتە سەر چەند لایەنێكی خەباتی شیوعییەكانی «عیراق» لە دوا قۆناغی «ڕژێمی پاشایی»دا بۆ پتەوكردنی ڕیزەكانیان و ڕێگەنەدان بە دووبەرەكیی فیكری لە نێوانیاندا. ئەو بەیاننامەیە مێژووی بەسەرەوە نییە و لەسەر لاپەڕەیەكی مامناوەندی (٢٤×١٤سم) لە هەردووك دیوی بە زوبانی عەرەبی چاپ كراوە و دیوی یەكەم و نزیكەی نیوەی دیوی دووەمی «حیزبی شیوعیی عیراقی» ئەندامان و پاڵێوراوانی حیزب لە بڕیاری كەرتی «یەكیەتی تێكۆشین - وحدة النضال» دەربارەی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خۆی و هاتنە ناو ڕیزەكانی حیزبی شیوعییەوە ڕادەگەیێنێت و لە نیوەی دووەمی بەیاننامەكەیشدا بڕیارەكەی «یەكیەتی تێكۆشین» چاپ كراوە [٣٦٤].

٩- ڕاپۆرتە نهێنییەكانی ئاسایش دەربارەی چالاكییەكانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»:

---

[٣٦٢] خوالێخۆشبوو «ئەنوەر ئەدهەم» خەڵكی «سلێمانی»یە و شیوعییەكی چالاك و دڵسۆز بوو، پێم وایە لە هەرەتی لاویدا بە نەخۆشی شێرپەنجە لە «سلێمانی» كۆچی دوایی كرد.

[٣٦٣] بەر لە چەند ساڵێك ئەم ڕاستییەم لە ڕەشنووسی بیرەوەرییەكانی بەڕێز «تەها محیددین مەعرووف»دا خوێندووەتەوە، وێڕای ئەوەی كە بۆ خۆیشی پتر لە جارێك درێژەی ئەو لایەنەی بیرەوەرییەكانی بۆ ڕوون كردوومەتەوە.

[٣٦٤] بڕوانە: «خەباتی كوردستان»، ساڵی ١، ژمارە ٣، مایسی ١٩٥٧، ل.١٦٠.

بێ گومان خوێنەری بەڕێز لە گەڵێك لایەنی ئەم بابەتەدا هەستی بەوە کردووە چۆن دەزگاکانی ئاسایش بە ئەوپەڕی پەرۆشییەوە و بە هەموو جۆر و شێوازێك هەوڵیان داوە کنە بکەنە ناو ڕیزەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»یەوە و چەند بۆیان بلوێت هەوڵ بدەن هەرەس بە کارو پلانەکانی بهێنن و هەڵبەت لەو بوارەیشدا ڕۆژئاواییەکان بەگشتی و «حوکمەتی بەریتانی» بە تایبەتی هەوڵیان داوە هەموو جۆرە دەستێکی یاریدە و هاندان بۆ «حوکمەتی عیراقی» درێژ بکەن و ئەو شتانەی دەربارەی ئەو ڕاستییە لە کاتی خۆیدا نووسراون ئیمڕۆکە سەرچاوەیەکی گەلێك ڕەسەن و پێویست بۆ لێکدانەوەی مێژووی «حیزبی شیوعیی عیراقی» پێك دەهێنن و خۆشبەختانە ژمارەیەکی زۆر لەو سەرچاوانە لە کتێبخانەکەی مندا هەڵگیراون و وا لەخوارەوە چەند نموونەیەکی کەمیان لێ دەخەمە بەرچاو:

أ- بەنرخترین و گەورەترینی ئەو سەرچاوانە بریتییە لە کتێبێکی دوو بەرگیی ئاسایشی عیراق ڕۆژگاری پاشایی کە هەردووکیان بە سەریەکەوە (٦٧٨) لاپەڕەن و پڕن لە سەدان بەڵگەنامەی نهێنیی «حیزبی شیوعیی عیراقی» [٣٦٥] و وێنەی یەکجار دەگمەن. لە لاپەڕە (٣٧٢)ی بەرگی دووەمیدا ئەم زانیارییە بە نرخەی دەربارەی ژمارەیەك لە بەرپرسانی حیزب لە ناوچە کوردییەکاندا بڵاو کردۆتەوە:

«لە ئەنجامی ئەو پشکنانەدا کە بەڕێوەبەرایەتیی تەحقیقاتی جینائی ڕاپەرمواند فوئاد بەهجەت گیرا کە بەرپرسی ڕێکخراوی شیوعیی بوو لە «کەرکووك» و «عەبدوللەطیف سەعدی» کە بەرپرسی ڕێکخراوی شیوعیی بوو لە «هەولێر» و «عەلی عومەر محەمەد ئەلیاس» کە بەرپرسی ڕێکخراوی شیوعیی بوو لە «موسڵ» (ل.٣٧٢).

---

[٣٦٥] ئاماژەمان بۆ گەلێك لەو بەڵگەنامانە کردووە، تایبەت ئەوانەیان کە لە ڕۆژنامە و پەخشەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»دا بڵاو کراونەتەوە.



یەکێك لە وێنە هەرە دەگمەنەکانی ناو ئەو کتێبە وێنەی ژمارە سیازدەیە کە لە بەرگی دووەمدا بڵاو کراوتەوە و لە سەرەوەی نووسراوە:

«ڕیکخەرانی ئەو دەزگا شیوعییانەی لە شانەی قاطرخانەدا گیران» و هەر پێنجیشیان کوردن و بەڕیز ئەمانەن:

١- «موسا سلێمان» کە دانیشتووی «هەولێر»ە و قوتابیی دار المعلمین العالیة‌یە.

٢- «عادل سەلیم» کە دانیشتووی «هەولێرە» و قوتابیی دوا ناوەندییە لەقوتابخانەی دواناوەندیی «بەغدا».

٣- «مەجید ڕەئوف» کە دانیشتووی «هەولێر»ە و قوتابیی کۆلێجی حقوقە.

٤- «عاصم حەیدەر ئەلحەیدەری» کە دانیشتووی «هەولێر»ە و فەرمانبەرێکی دەرکراوە لە تەموین.

٥- «عومەر عەلی ئەلشێخ» کە دانیشتووی «سلێمانی»یە و کۆلێجی ئەندازیاری تەواو کردووە.

شایانی باسە هیچ کام لەو پێنج شیوعییە چالاکە دەستیان لە کار هەڵنەگرت و بەشێکیان لەگەڵ هاوەڵەکانیاندا دوای کودێتاکەی بەعسی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ لە سێدارە دران.

ب- کتێبی «موسلم هادی موسا» کە ساڵی ١٩٧٩ لە «بەغدا» چاپ کراوە[٣٦٦].

خاوەنی ئەم کتێبە یەکێك بووە لە بەرپرسانی «حیزبی بەعس» و بە ناوەرۆکی کتێبەکەیدا دیارە کە زۆر دژی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بووە، تایبەت دژی «عەزیز شەریف»، بەلاَم بایەخی کتێبەکەی لە ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانەی حیزبی ناوبراودایە کە وێنەی ژمارەیەکیشیانی بلاَو کردۆتەوە.

ج- نامیلکەیەکی بیست و حەوت لاپەڕەییە کە بە شێوازێکی «یەکجار نهێنی» ساڵی ١٩٧٨ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی عیراقی دەری کردووە و گەلێك بەڵگەنامەی دەگمەنی تێدایە دەربارەی ئەوەی چۆن پێویستە سیخوڕەکانی ڕژێم کنە بکەنە ناو ڕیزەکانی ڕێکخراوەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی «یەوە لە ناوچە کوردییەکاندا[٣٦٧]، با ئەوەیش بڵێین ئەوساکە صەدام حسەین لەبەر گەلێك هۆ سەرزارەکیی دۆستی «حیزبی شیوعیی عیراقی» بوو و لەژێریشەوە بە دەستە چەپەڵەکانی لە شیوعییە چالاکەکانی سەرەونگوم دەکرد.

١٠ -سەرچاوە بایەخدارەکان دەربارەی چالاکییەکانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»:

هەمیشە هەر ڕێکخراوێکی سیاسیی وەك «حیزبی شیوعیی عیراقی» مێژوویەکی وەها دێرینی هەبووبێت و شوێن پەنجەی بەو ڕادەیەی ئەو لەسەر جەماوەر و چالاکییەکانیدا هەبووبێت بێ گومان گەلێك سەرچاوەی بایەخدار بۆ کردارەکانی تەرخان دەکرێن. لێرەیشدا چەند نموونەیەکی کەم بۆیان هەیە تیشك بهاونە سەر لایەنە جیاوازەکانی ئەم بابەتە گرنگە و ڕەنگبێ کتێبە

---

[٣٦٦] «مسلم هادی موسی»، نظرات فی المسارات السیاسیة، ١- الحزب الشیوعي العراقی، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٧٩، ٢٢٤ صفحة.

[٣٦٧] «ملاحظات حول عمل الحزب الشیوعي العراقي في المنطقة الشمالیة»، سری للغایة، مدیریة الأمن العامة، مدیریة م/٧٨، قسم الدراسات، کراس رقم ٢. ٢٧ ص.

ناوازه گەورەکەی مێژوونووسی پێشکەوتنخواز «حەنا بەطاطۆ» بە زوبانی ئینگلیزی[٣٦٨] باشترین بەڵگەی ئەم بۆچوونە بێت، وێڕای ژمارەیەکی بێ شومار لە وتار و کتێبی بایەخدار بە زوبانی «ڕووسی».

شایانی باسە گەلێك لایەنی بایەخداری ئەو ڕاستییانە لە زوبان ڕەهبەرە کوردەکانەوە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە عەرەبییە بەناوبانگەکاندا ڕەنگیان داوەتەوە، لێرەیشدا تاکە نموونەیەك لە ڕۆژنامەی بەناوبانگی «الزمان»ەوە دەهێنینەوە کە لە زوبان «بارزانی»یەوە دەربارەی برایەتی و هاوخەباتی و هاو چارەنووسی کورد و عەرەبە و ئەمەی لای خوارەوەی ڕاگەیاندووە:

« برایەتی عەرەب و کورد،

یەك چارەنووس،

بە بۆنەی «جێژنی نەورۆز»ەوە.

لە وەڵامی پرسیارێکی ڕۆژنامەنووسێکی «ئەڵەمانیدا» کە ساڵی ١٩٦٤ زیارەتی «عیراق»ی کردووە دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرانبەر یەکیەتیی عەرەب ڕەهبەری کۆچکردووی کورد «مەلا مستەفای بارزان» گوتوویەتی:

«ئێمە هیواداریین عەرەب یەك بگرن چونکە دەبێتە پشتیوان بۆ کوردەکان» هەروەها گوتیشی، «ئەگەر هاتوو عەرەب دووچاری هێرشێکی بیانی هاتن ئەوساکە ئێمە بەرگرییان لێ دەکەین چونکە ئێمە بەو جۆرە بەرگری لە نیشتیمان و ئایینی خۆمان دەکەین، لەم گۆشەنیگایەشەوە ئەگەر عەرەب بە ڕاستی باوەڕیان بە قسەکانی پێغەمبەر محەمەد «دروودی خوای لێ بێت» کە گوتوویەتی: «ئەوەت بوێت بۆ براکەت کە بۆ خۆتت ئەوێت – أحب لأخيك كما تحب لنفسك» ئەوساکە پێویستە عەرەب خەبات لە پێناوی جێبەجێکردنی یەکیەتیی کورددا بکەن لە گشت جیهاندا و خوێنیان بڕژێنن لە

---

[٣٦٨] کتێبی ناوبراو وەرگێردراون سەر عەرەبییەکی ڕەوان و لە سێ بەرگی گەورەدا بڵاوکراوەتەوە.

پێناوی ئەوەدا کە کورد بتوانن ئاڵای خۆیان شان بەشانی ئاڵای عەرەب و وڵاتە موسڵمانەکانی دیکەدا هەڵبکەن چونکە کارێکی وەها هێزە بۆ عەرەب و موسڵمانان و لاوازییە بۆ گشت دوژمنەکانیان»[٣٦٩].

پێم وایە بۆنی گوڵاو لەم قسانە لێ دەپڕژێ و شایانی ئەوەن کۆتایی ئەم بابەتەمانی پێ بهێنین!.

---

[٣٦٩] «الزمان»، العدد ١١٨٧، ٢٢ آذار ٢٠٠٥.

بابەتی چوارەم:

# دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی
# ساڵی ١٩٤٩ و ١٩٥١
# لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بۆ کوردستان

لە دوو فایلی نهێنیی
وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا



**سەرەتا**

گشت ڕاپەڕینەکانی بارزانییەکان هەر لە ڕۆژگاری عوسمانییەکانەوە لە نزیکەوە سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانیان ڕاکێشاوە، ئەوەی بە ڕوونی لە کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرە بەرهەمەدا هەستمان پێی کرد، بەڵام دوای ئەوەی بارزانی دایە پاڵ کۆماری کوردستان و تایبەت دوای ئەوەیش کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگەی کورددا لە سەرەتای دەستپێکردنی «جەنگی سارد»ەوە[1]، کە لە نێوان هەر دووک بەرەی سۆشیالیزم و سەرمایەداریدا هەڵگیرسا، بووە پەنابەر لە یەکیەتی سۆڤیەت ئیتر ئەو و هۆزەکەی هێندەی دیکە سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانیان ڕاکێشا و زۆر بە وردی کەوتنە سۆراخی هەر هەواڵێکی پێوەندیدار پێوەیان، جا بەر لەوەی بچینە ناو خودی بەڵگەنامەکانی ئەو دوو فایلەی ساڵی ١٩٤٩ و ١٩٥١وە وەك پێشەکی ئاماژە بۆ چەند ڕاستییەکی دیکە دەکەین، کە پتر لایەنە جیاوازەکانی هەمان بابەتمان بۆ ڕوون دەکەنەوە.

فایلی ژمارە ٣٢٢٩ی ساڵی ١٩٤٥ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی[2] بریتییە لە سی و شەش لاپەڕە کە بەشی هەرە زۆریان بۆ پرسی کوردی عیراق و تایبەت بارزانییەکان تەرخان کراون، یەکێك لە بەڵگەنامە هەرە گرنگەکانی ناو ئەم فایلە بریتییە لە یادداشتێکی سێ لاپەڕەیی کە

(1) جەنگی سارد زاراوێکی سیاسیی نوێیە کە سێر وینستن چەرچلی سەرەك وەزیرانی بەریتانی ساڵی ١٩٤٦ بۆ یەکەم جار بە کاری هێناو زۆر زوو بووە زاراوێکی باو، هەڵبەت دووبەرەکیی نێوان وڵاتە سۆشیالیزمەکان بە ڕەهبەری یەکیەتی سۆڤیەت و وڵاتە سەرمایەدارییەکان بە ڕەهبەریی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دوای جەنگی دووەمی جیهانەوە و دوای پەیدابوونی چەکی ئەتۆمی پێی نایە قۆناغێکی یەکجار دژوارو ناسکەوە، بۆیەکا هەردووك بەرە دەبوو پەنا بەرنە بەر تەکتیکی نوێی ئەوتۆ کە لە لایەکەوە نەبێتە هۆی بەرپابوونی جەنگی سێیەمی جیهانی کە دەبێتە هۆی مالکاولییەکی بێ وێنە بۆ هەموان و لە لایەکی دیکەشەوە لە ڕێگەی جەنگی ناوچەیی بچووکی وەك جەنگەکانی ڤێتنام و کۆریا و کێشەی هەمەجۆری ترەوە چەند دەتوانن گورز لە یەکتری بووەشێنن.

(2) N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, Iraq, File No.3229.

ڕۆژی سێی مایسی ساڵی ١٩٤٥ سان فرانسیس بێردی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا، ناردوویە بۆ لەندەن بۆ خودی سەرەك وەزیران ئەنتۆنی ئیدن[٣]، بەڵام بەر لەوەی بێمە سەر دەقی ناوەرۆکی خودی بەڵگەنامە گرنگەکە، لەبەر گەلێك هۆ، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ چەند ڕاستییەکی پێویست بکەم. بەر لە هەر شت ناوی کەس لە دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی ئەو ڕۆژگارە لەسەر بەڵگەنامەکە نییە لەوە بەولاوە کە لە سەرەتادا لەسەری نووسراوە «باڵوێزخانەی بەریتانی، بەغدا، بۆ ڕێزدار ئەنتۆنی ئیدن» و لە لاپەڕە سێیشدا، واتا لە کۆتایی بەڵگەنامەکەدا، ئیمزایەکی دەستخەتی بەسەرەوەیە کە زۆر بە زەحمەت توانیم بزانم نازناوی ئەوکەسە بێرد"Bird"ەو هیچ سەرچاوەیەکیشم لەبەر دەستدا نییە لە ڕێگەیەوە بزانم کەی ئەو دیپلۆماسییە بۆتە باڵوێز لە عیراق، وێڕای ئەوە بەڕاستی شێوازی نووسینی

---

(٣) ڕۆبەرت ئەنتۆنی ئیدن (Robert Anthony Eden) یەکێکە لە دیپلۆماسییە هەرە بەناوبانگەکانی هاوچەرخی بەریتانیا و جیهان، ڕۆژی دوازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٧ لە دایك بووە، گشت قۆناغەکانی خوێندنی بە سەرکەوتوویی بڕی، لە پایزی ساڵی ١٩١٩وە دەستی کردە خوێندنی زوبانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، تایبەت فارسی و عەرەبی و ساڵی ١٩٢٢ دەورەکەی بە پلەی شەرەف و یەکەمی تەواو کرد ساڵی ١٩٢٣ لەسەر لیستی پارتی موحافیزین بووە ئەندام پەرلەمان، لەو دەوروبەرەیشەوە کەوتە بڵاوکردنەوەی گەلێك وتارو کتێب، ساڵی ١٩٢٥ یەکەم کتێبی کەوتە بازاڕەوە، دوایش یادداشتە دەوڵەمەندەکانی لە چەند بەرگێکدا چاپکرد، لە سییەکانی سەدەی بیستەوە وەك دیپلۆماسییەکی چالاك ناوی دەرکرد و ڕۆژی بیست و دووی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥ بووە وەزیری هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا، ساڵەکانی جەنگی دووەمیش لە وەزارەتە بەناوبانگەکەی وینستن چەرچڵدا دیسانەوە وەزیری هەندەران بوو، لە ناوەندی پەنجاکانی سەدەی بیستیشەوە، واتا لە گەرمەی ڕۆژانی جەنگی سارد و کێشەی کەناڵی سوێسدا بووە سەرەك وەزیران، لە ڕۆژی بیست و شەشی تەمموزی ساڵی ١٩٦١ەوە بووە ئەندامی ئەنجوومەنی لۆردان، گەلێك نیشان و میدالی بەرزی خەڵات کراوە کە بەشێکیان شاژنی بەریتانی ئەلیزابێتی دووەم پێی داوە، ڕۆژی چواردەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:
"Oxford Dictionary of National Biography",Vol. 17, Oxford University Press, 2004, pp.664-679.

ناوبراو یەکجار ڕازاوەیە، بە ئارەزووی خۆی هەڵبەز و دابەز بە وشە و زاراوە و پەندەکانی ناو فەرهەنگی زوبانی ئینگلیزی دەکات لە پاشکۆی ژمارە (   )دا ئەوەی هێندەی دیکە مەراقی ناسینیم لا پتر کرد و ناچار گەڕامەوە سەر لیستی دیپلۆماسییانی بەریتانی و زانیم کە کابرا سێرە و ناوی تەواوی بەم جۆرەیە: سێر فرانسیس هەف ولیام ستۆنهێوێر بێرد– "(Sir Francis Hugh William Stonehewer Bird)"[٤]. با ئەوەیش بڵێین سێر فرانسیس بێرد پاش تەنها مانگ و نیوێك دوای ئەوەی بووەتە باڵوێزی وڵاتەکەی لە بەغدا ئەم ڕاپۆرتە چڕوپڕەی وەك شارەزایەکی کونوقوژبنی سەرانسەری عیراق، بە کوردستانی باشووریشەوە، نووسیوە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو ڕاپۆرتەیە:

(باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

ژمارە ١٨٦ (٤٥/٨٦/٢٧٢)،

٣ی مایسی ١٩٤٥،

بۆ: ڕێزدار ئەنتۆنی ئیدن، م.سی.،م.پ.

١– سێر،

نیشانە بە برگەی ژمارە هەشتی نامەی ژمارە سەد و حەفدەی ڕۆژی نۆزدەی مارتی سێر کێنهان کۆڕۆنوالیس شەرەفمەند دەبم ئاگادارتان بکەم کە یاسای بەخشینی بارزانییەکان گەیشتە کۆشك و ڕۆژی بیست و یەکی نیسان پەسند کرا. هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەدا وەرگێڕانی ئەو یاسایە بۆ

---

[٤] سێر فرانسیس بێرد ڕۆژی سیازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨٩١ لە دایك بووە، لە هەرەتی لاوییەوە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، لە یۆگۆسلاڤیا و سعودییە و کازابلانکا و ڕۆمانیا و حەبەشە کاری کردووە تا ڕۆژی بیست و هەشتی مارتی ساڵی ١٩٤٥ لە تەمەنی پەنجا و چوار ساڵیدا بۆتە باڵوێزی وڵاتەکەی لە عیراق. بڕوانە:
The Foreign Office List and Diplomatic and Consular year Book; 1947, London, p.308.

سەر زوبانی ئینگلیزیتان بۆ دەنێرم بەپێی ئەو دەقەی کە لە ڕۆژنامەی فەرمیدا[٥] بلاّو کراوەتەوە.

٢- سەرنج بفەرموون بەندی یەکەمی یاساکە ئەندامانی هێزەکانی سوپا و ئەو کارمەندانەی یاسا تایبەتییەکانیان[٦] بەسەردا جێبەجێ دەبن لەم بەخشینە بێ بەری کراون. پێموایە بڕیار وابوو بەخشینێکی گشتی بۆ ئەوانەی دەرکراون لە ڕیزەکانی سوپا و پۆلیس دەربچێ، چەند هەوڵدرا بۆ ئەو ئەفسەرانەی دایانە پاڵ مەلا مستەفا و بە هاندەری بیرە شەڕئەنگێزەکانی و پەنا هێنانەوەی بەر بەغدای دادەنران باش ڕەفتار بکرێن، بەلاّم ئەنجامی نەبوو.

٣- دەرچوونی ئەم یاسایە، ئەگەر ببێتە هۆی هەڵسەنگاندنی سیاسەتی حوکمەت بەرانبەر بە کورد، شتێکی نائاسایی نییە. بەگشتی پرۆژەی یاسای بەخشین زۆر بە گەرمی لە پەرلەمان لێی کۆڵرایەوە، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشا ئەوە بوو کە قسەی پەرلەمانتارەکان دوور بوو لە ڕق و کینەی دژ بە کورد، بەلاّم هەڵبەت ژمارەیەکی کەم لە شۆڤێنییە توندڕەوەکان، کە بە داخەوە یەکێکیان وەزیری ناوخۆی ئێستا بوو[٧]، حەز دەکەن سیاسەتی ڕق و کینە تەقلیدییەکەی جاران بەرانبەر بە کورد بەردەوام بێ[٨]. هەر چۆن بێ لە ناو

---

[٥] مەبەستی ڕۆژنامەی «الوقائع العراقیة» یە.

[٦] ڕستەی یاسا تایبەتییەکان بە پێتی گەورە بەم جۆرە نووسراوە Special Laws. مەبەستیش لەو یاسایانە «قانون الخدمة العسكرية» و «قانون الخدمة المدنية» یە.

[٧] مەبەستی «مستەفا عومەری» یە کە بە داخەوە یەکێك بوو لەو توندڕەوە موسڵاوییانەی کە وەك دوژمنی باوەکوشتەیان سەیری کوردیان دەکرد.

[٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت:

There are, of course, afew extremists, among whom unhappily is the present Minister of Interior, who would like to continue treating the kurds with traditional harshness N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, File No.3229,British Embassy, Baghdad No.186 (272/86/45), 3rd May, 1945, To: the Right Honourable Anthony Eden, M.C., M.P., p.4.

خەڵکی ڕووناکبیردا هەستێك دروست بووە کە ئەگەر پێویست بێ خۆ دوور بگرێ لە ئەنجامی بەخشینە تەقلیدییەکان ئەوا پێویستە حوکمەتی عیراق سیاسەتێکی بەخشندەتر و بە کەڵکتر بەرانبەر بە کورد بگرێتە بەر. ئەمە خۆی لە خۆیدا وەرچەرخانێکی چاکە.

٤- هەمان کات ئەنجوومەنی وەزیرانی«عیراقی- ك.م.» زۆر بە پەرۆشە بۆ ئەوەی بزانێ سیاسەتی حوکمەتی بەریتانی بەرانبەر پرسی کورد چۆنە.

ئەندامانی ستافەکەم پرسیاریان لەم بارەیەوە لە لایەن وەزیری ناوخۆوە و هەروەها وەزیری دەوڵەتی کۆن ماجید مستەفاوە لێ کراوە، ماجید مستەفا پێوەندیدارە بە کاروباری کوردەوە و وەزیری دەوڵەت بوو لە وەزارەتەکەی نوری سەعیددا و بێ گومان زۆر مەبەستییە دڵسۆزیی تەواوی خۆی بۆ وەسی و حوکمەت دەرببڕێ، خودی سەرەك وەزیران[9] لە دیدەنییەکی ئەم دواییانەماندا لە خۆمی پرسی کە ئایا هەڵوێستمان چۆنە بەرانبەر کورد، هەڵبەت من وەڵامێکی گشتگیرم نەدایەوە، بەڵام هێندەم گرتە ئەستۆی خۆم کە پێی بڵێم ئەگەر بمانەوێ خۆمان لە نانەوەی کێشە دوورەپەرێز بگرین ئەوساکە پێویستە لەگەڵ کورددا دڵفراوان بین، پێم گوت من دەزانم ژمارەیەکی زۆر کەم کورد هەن لە قووڵایی دڵەوە لەگەڵ بزووتنەوەی جیابوونەوە یا «سەربەخۆیی» [10] دان، سەرەك وەزیران پشتی بۆچوونەکەمی گرت و وتی: (تەنها ژمارەیەکی کەم لە قوتابییانی «کورد-ك.م.» لەگەڵ ئەو جۆرە بزووتنەوەیەدان. ئێمە پێویستە دڵفراوان و بەخشندە بین وەك ئێوەی بەریتانی چۆنن). پێم وایە «سەرەك وەزیران- ك.م.» بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ مەبەستی هەڵوێستی میانڕەوی ئێمە بوو دوای یاخیبوونەکەی ساڵی ١٩٤١[11].

---

[9] ئەوساکە حەمدی پاچەچی کە سیاسییەکی میانڕەو بوو، سەرەك وەزیران بوو.

[10] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی سەربەخۆیی"independence" بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

[11] مەبەستی ڕاپەڕینەکەی ڕەشید عالی گەیلانییە کە نیسان - مایسی ساڵی ١٩٤١ بەرپا بوو.

٥- ئـەوی ڕاسـتی بـێ، وا دیـارە، چ کـورد و چ ئەنجوومـەنی وەزیـران درەنگ هەستیان بەوە کـردووە کـە لـە بەرژەوەنـدیی هـەردوو لایانـە کـوردی عیراق مەیلی ڕووسیایان نـەبێ. پەرەسـەندنی وەدیهێنـانی یەکیـەتی عـەرەب وای لە کورد کردووە بێنە سەر ئەو بڕوایەی کارێکی بێ ئەنجام دەکەن ئەگەر بێتو لاسایی ناسیۆنالیزمی ناحەزەکانیان بکەنەوە، بەڵام چالاکیی ژمارەیەکی کەم لە سەرگەرمەکانی ناو کوردی لێ دەربکەی، ئەوانـەی تـاوەکو ڕادەیـەکی زۆر هەستیان لەگەڵ ڕاگەیاندنی شیوعییە[١٢] ئیتر زۆربـەی کـورد گۆڕینـەوەی دەسـەڵاتی ڕووس بـە دەسـەڵاتی بـەریتانی بـە کـارێکی یـەکجار زیانبـەخش دادەنێن، بەڵگەی هەستێکی وەها لە دوو حەفتەی ڕابردوو دەرکەوت، ئەویش دوای ئەوەی بەو نامەیە زانرا کە ژمارەیەك کوردی سەرەڕۆ هـەوڵیان داوە لـە ئێـران پێوەنـدیی بـە ڕووسـەکانەوە بکـەن، بـەڵام تـاوەکو ئێسـتەیش ئـەوە نەزانراوە ئەو هەوڵە تاوەکو چ ڕادەیەك سەرکەوتووە.

٦- هەروەها ئەنجوومەنی وەزیران گەیشتووەتە ئەو ئاستەی بە دروستی بایەخی مانەوەی کوردستان لە ناو عیراقدا هەڵبسەنگێنێت، کوردەکـانیش لـە لایەن خۆیانەوە دەرکی ئەوە دەکـەن کـە بەرژەوەنـدیی ئـەوانیش لـە هـەمان بۆچووندایە. یەکسەر دوای دیدەنییەکەی من لەگەڵ سەرەك وەزیراندا ماجیـد مستەفایش[١٣] ڕاوێـژکاری گشـتی ڕۆژهـەڵاتیی وەزارەتـی هەنـدەرانی دیـوە و پێی گوتووە چ خۆی و چ هاوڕێ کوردەکـانی «لـە ئەنجوومـەنی نوێنەرانـدا - ك.م.» بە گەشبینییەوە پرۆژەی یەکیەتی عـەرەبیان[١٤] پێشـوازی کـردووە و

---

[١٢] لەو قۆناغەدا بزووتنەوەی چەپڕەو لە ناو دەستەی ڕووناکبیری کوردستانی باشووردا تـەواو دەستی کردبوو بە پەل هاویشتنی و لاوانـی کـورد کەوتبوونـە ئـەوەی پشـت بـە یەکیـەتی سۆڤیەت ببەستن.

[١٣] لە هەر شوێنێکدا لەم بەڵگەنامەیـەدا نـاوی ماجیـد مسـتەفا هـاتبێ وشـەی سـەید خراوەتـە پێش ناوەکەی، واتا نووسراوە سەید ماجید مستەفا.

[١٤] لـەو دەوروبـەرەدا عـەرەب سـەرگەرمی دامەزرانـدنی «جامیعـەی عـەرەبی» بـوون، ماجیـد مستەفا ویستوویەتی باسی هەڵوێستی خۆی و هـاوڕێ کوردەکـانی ئەنـدامی «ئەنجوومـەنی نوێنەران» بۆ ئەو دیپلۆماسییە بەریتانییـە بکـات کـە لـە وەزارەتـی هەنـدەرانی بـەریتانی

لە گوتەکانی خۆیاندا ئەوەیان لە کاتی پەسندکردنی پرۆتۆکۆڵی ئەو یەکیەتییەدا دەربڕیوە و گوتوویانە تاکە دوارۆژی کوردی عیراق لەوەدا وەدی دەکەن کە ببنە هاوڵاتیی دڵسۆزی عیراق، بەڵام جێگەی داخە «بەرانبەر بەوە-ک.م.» ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان لە هەر شوێنێك دەوڵەتێکی کوردی دامەزرێنرا ئەوساکە حوکمەتی «عیراق-ک.م.» بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ بێ دواخستن پۆلیس بەربداتە گیانی ئەو کەسانەی وەك مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەدی بارزانین.


مەلا مستەفای بارزانی و
شێخ ئەحمەد بارزانی

٧- هەرچی ستافی باڵوێزخانەکەمانە، تایبەت ڕاوێژکارەکانمان لە باکوور، دیسانەوە تێمگەیاندوونەتەوە کە نابێ خۆیان بە کاری سیاسیی لاوەکییەوە، یان بە دوو بەرەکیی ئەم و ئەوەوە خەریك بکەن، بەڵکو دەبێ گشت توانای خۆیان بۆ وەستاندنی ئاڵۆزبوونی کێشەی کەمینەکان تەرخان بکەن، پێویستە بە یەك چاو سەیری کورد و عەرەب و ئاشووری و جوو بکەن و هەموویان بە هاوڵاتیی عیراقی دابنێن. کارمەندی نموونەیی نابێ گوێڕایەڵی ئەو شتانە، یان ئەو کەسانە بێ کە ڕکەبەرن، بەڵکو پێویستە لە ڕێگەی پارسایییەوە ڕاوێژی ئەو جۆرە کەسانە بکات و هەوڵ بدات پاریدەی ئینگلیز

---

ڕاوێژکاری گشتیی ڕۆژهەڵات بووە و هەڵوێستی باشی کوردی لەو بوارەدا بۆ ڕوون بکاتەوەو تێی بگەیێنێ کە توندڕەوانی عەرەب سپڵەن و لەگەڵ ئەو هەموو هەڵوێستانەیشدا خراپ ڕەفتاری کورد دەکەن، بەڕادەیەك ئەگەر بێت و ڕۆژێك لە ڕۆژان لە هەر شوێنێکی دەرەوەی عیراقیش کوردستانێکی سەربەخۆ دامەزرێنرا ئەوا حوکمەتی عیراق بە ئەرکی خۆی دەزانێت بکەوێتە ڕاوەدوونانی ڕەهبەرانی کوردی وەك شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای بارزان.

ئاراستەی ڕەواندنەوەی کێشەکان بکات بۆ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کامیان ڕەوایە و کامیان ڕەوا نییە[١٥]. من تەواو ئاگاداری ئەوەم کە هەڵوێستێکی لەم بابەتە بەجێیە و پێویست بەوە ناکات هەموو شتێك بگەیێنرێتەوە حوکمەت...

٨- بەپێی پێوەدانی هاوسەنگیی بەلای خۆم و بەلای ئەندامانی باڵوێزخانەکەمانەوە لێرە - لە بەغدا پێویستە چەند دەتوانین لە کات و لە ناکاتا، حوکمەت هان بدەین یەکسانانە لە بواری خوێندن و خزمەتە کۆمەڵایەتییەکاندا لەگەڵ کوردستان ڕەفتار بکات و ژمارەیەکی موناسیبیش لە وەزیفە میرییەکان بداتە کورد. هیچ نەبێ لێرەی پایتەخت، نەك لەناو گوندەکان و لە نێو هۆزەکانی باکووردا، با بەرژەوەندیی کوردەکان بپارێزین و بایەخیان بدەینێ.

٩- پێموایە لە قسەکانی سەرەك وەزیرانی «عێراق-ك.م.» و هاوەڵەکانیدا هەست بە شتێك مەترسی دەکرێ کە لەوانەیە گوایە بەریتانییەکان بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیانیان هەیە و دەیانەوێ لە کوردستان ڕاوی بکەن[١٦]. وا بزانم تەمەنی ئەو گومانانە دەگەڕێتەوە پێش گەلێك ساڵ بەر لە ئێستا، بۆیەکا پێموایە کارێکی بێ سوود نابێ ئەگەر بێت و جارێکی دیکە سەرەك وەزیران ویستی سەرنجی من بزانێ ئەوساکە دەرسێکی ڕەوشتی دابدەم دەربارەی هەردووك برگەی پێشوو[١٧] تاوەکو بزانێ سیاسەتی ئێمە چ بەرانبەر بە کورد و چ لە گشت بوارەکانی دیکەدا

---

[١٥] پێم وایە باڵوێزی بەریتانی لەم بۆچوونەیدا کەوتۆتە هەڵەوە، ئەرکی دیپلۆماسیی ڕێکوپێك کە ئەو سەد دەر سەد یەکێکیانە، ئەوەیە هەمیشە لە کاری ناسکی وەك ئەو کارە یەکجار وردو ناسکەی ئەواندا لە عیراقی ئەو قۆناغەدا ڕاست بە ڕاست و چەوت بە چەوت وەك خۆیان دابنێن.

[١٦] دیارە باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا مەبەستی ئەوەیە فەرمانڕەوایانی عیراق پێیان وایە بەریتانییەکانیش وەك خۆیان هەڵپەرستن و بیر تەنها لە بەرژەوەندیی خۆیان دەکەنەوە.

[١٧] پێم وایە مەبەستی باڵوێز برگەی حەوتەم و هەشتەمی نامەکەیەتی.

تەواو لەگەڵ بەرژەوەندیی حوکمەتی عیراق و سەرجەمی پێکهاتەکانی ئەم وڵاتەدا دەگونجێ، بەختەوەر دەبم ئەگەر لە بیر و بۆچوونی خۆتانم ئاگادار بفەرموون دەربارەی ئەم بڕیارەم.

١٠- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ بیرۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزیری «هەندەران-ك.م.» وێڕای نوێنەری خاوەن شکۆ لە هەر یەك لە ئەنقەرە و تاران و بێروت.

خزمەتکاری هەمیشە ئەڵقە لە گوێتان

ئیمزا) [١٨].

خاڵێکی تەواو سەرنجڕاکێشی ناو ئەم بەڵگەنامەیە بریتییە لەوەی فەرمانڕەوایانی ئەوسای عیراق گەلێك عەوداڵی ئەوە بوون لە نزیکەوە بزانن سیاسەتی ئینگلیز بەرانبەر کورد و دوارۆژیان چییە؟ دیپلۆماسییە ئینگلیزەکانیش لە هەموو دەرفەتێکدا ئەوەیان بۆ دووپات کردوونەتەوە کە زۆر بە پێویستی دەزانن بنەمای سیاسیەتی حوکمەتی عیراق لەگەڵ کورددا لەسەر بنەمای یەکسانی و دڵفراوانی دابمەزرێنرێ، هیچ کات ئەوەیشیان نەشاردۆتەوە کە ئەوان تەنها دژی دەستە و دایەرە چەپڕەوە مەیلدارەکانی یەکیەتی سۆڤیەتن.

شایانی باسە ئەم ڕاستییە بایەخدارە چەند جارێکی دیکە لەناو بەڵگەنامەکانی هەمان فایل و ژمارەیەك فایلی دیکەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیدا بە ڕوونی ڕەنگی داوەتەوە. «هەڵوێستی بەریتانییەکان بەرانبەر کوردستان» ناونیشانی بەشی شەشەمی هەمان فایلە کە بریتییە تەنها لە نامەیەکی باڵوێزخانەی حوکمەتی بەریتانی لە بەغدا کە ڕۆژی بیست و هەشتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ بە برووسکە ناردوویە بۆ وەزارەتی

---

[18] N.A., F.O., 371/ 45346, Eastern 1945, File No.3229, British Embassy. Baghdad, No.186 (272/86/45),3rd May, 1945, To: The Right Honourable Anthong Eden, M.C.,M.P., PP.3-5.

هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و لە سەرەوەی برووسکەکەدا ئەم دوو دێرە چاپ کراون کە هەڵبەت نیشانەی بایەخی زۆری ناوەرۆکی برووسکەکەن:

(ئەم برووسکەیە بە شێوازێکی تایبەت نهێنییە بۆیەکا پێویستە ئەو بەرپرسەی وەریدەگرێ بیپارێزێ و نەگاتە دەست کەس)[19].

ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ناوەرۆکی برووسکەی ناوبراوە:

لەبەغداوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

لە سێر هـ. ستۆنهێویر بێردەوە،

ژمارە ٩٠،

٢٠ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥،

وێنەی بۆ:

بێروت، ژمارە ٤٧،

تاران، ژمارە ١٨١،

ئەنقەرە، ژمارە ١٣.

١- ئەم بەیانییە کە سەرەك وەزیرانی عیراقم دی بە دەرفەتم زانی دەبارەی ڕووداوەکانی ئەم دواییەی باکووری ئێران گفتوگۆی لەگەڵ بکەم و پێی بڵێم ئەو ڕووداوانە بۆ حوکمەتی عیراق بە کەڵکن بۆ ئەوەی دیسانەوە هاوڵاتییە کوردەکان دڵنیا بکاتەوە کە بەرژەوەندییەکانیان ناخرێنە پشت گوێ و ئەوانیش وەك سەرجەمی دانیشتوانی عیراق بەشی تەواوی خۆیان دەبێ لە گشت چاکسازی و بەرەوپێشچوونێکی وڵاتدا.

٢- هەمان کات ئەو ڕوونکردنەوەیەی حوکمەتی خاوەن شکۆی «بەریتانیم-ك.م.» هێنایەوە یاد بەڕێزیان کە ڕۆژی چواردەی حوزەیران وێنەیم لێی دایە دەست خۆی، هەروەك چۆن لە نامەی ژمارە ٢٥١مدا ئاماژەم بۆی کردبوو، لە ڕۆژانی هەراوبگرەکەی ئەم دواییانەی بارزاندا کارێکی وامان

---

[19] ئەمە دەقی ئینگلیزییەکەیەتی:
"This telegram is of particular secrecy and should be retained by the authorised recipient and not passed on".

کـرد هــەمووان، بــە کوردیشــەوە، زۆر بــە ڕوونــی بــزانن بــە لای ئێمــەی «بەریتانییـەوە—ک.م.» هــەمووان هاولاتییـەکی ئاسـایی عیراقـن، هــەر لەبـەر ئـەوەیش شـتێکی زۆر بایەخـدارە کـە کـورد لـە هـیچ شـوێنێك لـە دەرەوەی سنووری عیراقدا بە دووی دۆستدا نەگەڕێن.

٣- سەرەك وەزیران یەکسەر لـە مەبەسـت گەیشـت و سوپاسـی کـردم و گـوتی کـارێکی ئـەوتۆ دەکـات کـە لـە وتـاری عەرشـدا، لـەکاتی کردنـەوەی پەرلەمانـدا ڕۆژی یــەکی کـانوونی یەکـەمی داهـاتوو ئاماژەیـەکی لـەبار بـۆ کوردستان بکرێ و تێیدا بگوترێ زۆربەری کوردی عیراق دڵسۆزی وڵاتن) [٢٠].

بەو جـۆرە دیپلۆماسـییە بەریتانییـەکان لـە قۆنـاغی «جـەنگی سـارد» دا لەبەر گەلێك هۆ بایەخێکی زۆریان دەدایە هەر شتێك پێوەندیی بـە بـارزانی و بارزانێکانــــەوە بــــێ و هەوڵیشــــیان دەدا دۆســــتەکانیان و لەســــەرووی هەمووشیانەوە فەرمانڕەوایانی عیراق بە هەمان دەستوور بڕواننە ئەو بابەتـە، تایبـەت دوای ئـەوەیش کـە بـارزانی دایـە پـاڵ کۆمـاری کوردسـتان و بـەرگی جەنەڕاڵی پۆشی و ئینجا پەنای بردە بەر خاکی یەکیەتی سۆڤیەت.

هەڵبەت دەبێ لەم قوژبنەوە بڕواننە ئـەو دوو دەنگوبـاوەی سـاڵی ١٩٤٩ و ساڵی ١٩٥١ بڵاو بوونەوە دەربارەی ئـەوەی گوایـە بـارزانی نیازییـە لەگـەڵ لایەنگرەکانیدا لە وڵاتی شوورەوییەوە بگەڕێتەوە عـیراق. ئـەو مەسـەلەیە بـێ گومان ئاو زۆر دەکێشێ، بەر لە هەر شت ئاخۆ کێ لە پشت بڵاوکردنەوەیەکی لەو جۆرەوە بووە، پێم وایـە بـیری توێـژەران بـەر لـە هـەر لایـەکی دیکـە بـۆ مۆسکۆ دەچێ، هەرچۆن بێ ئەو هەواڵە هەردوو جارەکە بە شێوازێکی فـراوان ســەرنجی کارمەنــدانی ئینگلیــز و عــیراق و ئێــران و تورکیایــان ڕاکێشــاوە و وەزارەتــی هەنــدەرانی حوکمــەتی بــەریتانیش دوو فــایلی ســەربەخۆی بۆیــان تەرخان کردووە کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەی ناوەڕۆکی هەردووکیانە.

---

[20] N.A., F.O., 371/ 45346, Eastern 1945, File No.3229, From Baghdad To Foreign Office, Sir H.Stonehewer Bird, No.90, 20th November, 1945, Reported To: Beirut No.47, Tehran No. 181, Angora No.13,P.32.

فایلی یەکەمیان کە بۆ دەنگوباوەکەی ساڵی ۱۹٤۹ تەرخان کراوە، لە هەژدە لاپەڕە و شەش بەش پێکهاتووە، بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە بریتییە لە برووسکەیەکی سێر ولیام هێنری برادشۆ ماکی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا[۲۱]. کە بە شفرە ڕۆژی بیست و نۆی نیسانی ساڵی ۱۹٤۹ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی لە لەندەن و لەسەری نووسراوە: (ئەم برووسکەیە بە شێوازێکی تایبەتی نهێنییە بۆیەکا پێویستە ئەو بەرپرسەی وەریدەگرێ بیپارێزێ و نەگاتە دەست کەس)، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو برووسکەیەیە:

بە شفرە،

لە بەغداوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

لە سێر هـ. ماکەوە،

ژمارە ۳۹۱،

۲۹ی نیسانی ۱۹٤۹،

نهێنی،

۱- ئەم برووسکەیە بۆ وەزارەتی هەندەرانە و وێنەیشی لێ دەنێردرێ بۆ قاهیرە و ئەنقەرە و تاران و مۆسکۆ.

۲- حوکمەتی عیراقی ئاگاداری کردووم کە داوای لە نوێنەرانی خۆی لە هەریەك لە ئەنقەرە و تاران کردووە داوا لە حوکمەتانی تورکیا و ئێران بکەن بەردەوام ئاگادارمان بکەن لە هەر زانیارییەك دەست دەکەوێ دەربارەی بزووتنەوە و نیازەکانی مەلا مستەفا و بارزانییەکانی پیاوی کە ئێستا لە یەکیەتی سۆڤیەت دەژین، یان دەربارەی بزووتنەوەیەکی دیکە لە تورکیا،

---

[۲۱] سێر ولیام هێنری برادشۆ ماك (Sir William Henry Bradshaw Mack) ڕۆژی بیست و یەکی ئابی ساڵی ۱۸۹٤ لە دبلن لە دایك بووە، لە بنەماڵەیەکی ناسراوە، وەك دیپلۆماسی لە زۆر وڵاتی ئەورووپی وەك ئیتالیا و ئەڵمانیا کاری کردووە، لە ڕۆژی چواری شوباتی ساڵی ۱۹٤۸وە بۆتە باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا، بڕوانە:
The Foreign Office List and Diplomatic and Consular year Book; 1950, London, PP.338-339.

یان لە ئێران کە لەوانەیە کار بکەنە سەر ئاسایشی کوردستانی عیراق، حوکمەتی عیراق هەمان کات لە کۆتایی نامەکەیدا داواشی لە باڵوێزخانەی ئێمە کردووە چ زانیارییەکمان دەربارەی هەمان بابەت دەستکەوێ بۆیانی بنێرین.

٣- ئەگەر بەڕێزتان قایلن بەوەی ئەو جۆرە زانیارییانەیان بۆ بنێرین ئەوساکە بەختەوەر دەبم ئەگەر کارێکی ئەوتۆ بکەن هەردووك باڵوێزی خاوەن شکۆ «واتا بەریتانی-ك.م.» لە تاران و ئەنقەرە هەر ڕاپۆرتێکی پێوەندیداریان لەم بارەیەوە دەستکەوت بۆمی بنێرن.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم برووسکەی ژمارە شەشم بنێرن بۆ مۆسکۆ.

ئیمزا هـ.ماك)[٢٢].

بەڵگەنامەی داهاتووی ئەم بەشەی هەمان فایل بریتییە لە برووسکە وەڵامێکی نهێنیی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی برووسکەکەی ولیام هێنری برادشۆ ماك کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(ئەم برووسکەیە بە شێوازێکی تایبەتی نهێنییە بۆیەکا پێویستە ئەو بەرپرسەی وەریدەگرێ بیپارێزێ و نەگاتە دەست کەس.

بە شفرەن

إی، ٣٤/١٠١١٠/٥٣٨١،

نهێنی،

لە وەزارەتی هەندەرانەوە بۆ بەغدا،

ژمارە ٥٨٩،

١١ی حوزەیرانی ١٩٤٩،

---

(22) N.A., F.O., 371/75471/Eastern Department, Telegram From: Sir H. Mack (Baghdad), No.391, Secret 29th April, 1949, Request for information about Mulla Mustafa from the Iraqi Government, Reported to B.M.E.O., Angora, Tehran, Moscow.

وێنەی بۆ:
ئەنقەرە ژمارە ١١٧،
تاران ژمارە ٢٩،
مۆسکۆ ژمارە ٥١٧،
قاهیرە ژمارە ٤٤١،
نهێنی.

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٣٩١ی ڕۆژی بیست و نۆی نیسانتان دەربارەی مەلا مستەفا.

لەگەڵتانم پێویستە چ ئێوە و چ باڵوێزانی خاوەن شکۆ لە تاران و ئەنقەرە هەر جۆرە زانیارییەکتان دەربارەی مەلا مستەفا و بارزانییەکان دەستکەوێ و لەوانەبن کار بکەنە سەر ئاسایشی کوردستانی عیراق بیاننێرن بۆ حوکمەتی عیراقی، لەوەیشدا هیچ جۆرە درکاندنێکی نهێنییەکانی بەڵگەنامەکانمان وەدی ناکرێ) [٢٣].

بەشی دووەمی هەمان فایل لە سێ بەڵگەنامە پێکهاتووە، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی هەرسێکیانە:

إی ٥٧٢٢/١٠١١٠/٣٤،
بروسکە لە سێر هـ. ماکەوە،
بەغدا،
ژمارە ٤٠٨،
نهێنی،
٦ی مایسی ١٩٤٩.

---

(23) Ibid, Cypher, E 5381/10110/34, Secret, From Foreign Office To Baghdad, No. 589, 11th June, 1949, Reported to Angora No.117, Tehran No.29, Moscow No. 517, Cairo No.441.

به پێی ڕاپۆرتەکان مەلا مستەفا خەریکی ئامادەکردنی هێرشێکی لە ناکاوە بۆ سەر کوردستانی عیراق، داوای زانیاریی زۆرتر دەکەین.

بۆ تاران ژمارە ٧٤، شەشی مایس، وێنەی بۆ ئەنقەرە و مۆسکۆ) (٢٤).

(ئەم برووسکەیە بە شێوازێکی تایبەتی نهێنییە بۆیەکا پێویستە ئەو بەرپرسەی وەریدەگرێ بیپارێزێ و نەگاتە دەست کەس.

بە شفرە،

لە بەغداوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

لە سێر هـ. ماکەوە،

ژمارە ٤٠٨،

٦ی مایسی ١٩٤٩،

نهێنی،

١- ڕۆژی شەشی مایس بە برووسکەی ژمارە ٧٤ نێردراوە بۆ تاران، هەروەها بۆ قاهیرە و ئەنقەرە و مۆسکۆ.

وەزارەتی ناوخۆی عیراق ژمارەیەك ڕاپۆرتی پێگەیشتووە دەربارەی ئەوەی مەلا مستەفا، وەك دەڵێن، ئێستا لە ماکۆی سەر سنووری سۆڤیەتییە و دەستەیەکی ناردۆتە ناو خاکی ئێران بۆ لای هۆزەکانی ئەو ناوچانە تاوەکو ئامادەبن بۆ هێرشێکی لە ناکاو بۆ سەر کوردستانی عیراق.

٢- بەپێی زانیارییەکانی ئێمە شتێکی وەها لە ئارادا نییە، بەڵام هەرچی وەزیری ناوخۆی «عیراق-ك.م.» و بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیسە لەو بڕوایەدان ئەو هەواڵە ڕاستە. بەختەوەر دەبم ئاگادارم بکەن لە هەر زانیارییەکی هەتانە، یان دەتوانن لەم بارەیەوە پەیدای بکەن) (٢٥).

---

(24) Ibid, E 5722/10110/34, Telegram from sir H.Mack, Baghdad,No. 408 Secret, 6th May, 1949.

(25) Ibid, cypher from Baghdad to Foreign Office, from Sir H.Mack, No. 408, 6th May, 1949, Secret.

بەڵگەنامەی سێیەمی ئەم بەشە لە باڵوێزخانەی بەریتانی لە تارانەوەیە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(بە شفرە،

لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

لە سێر ج. لیێ. ڕۆوگێتێلەوە[٢٦]،

ژمارە ٣٧٢،

١٠ی مایسی ١٩٤٩،

نهێنی،

نیشانە بە برووسکەی بەغدا- ژمارە حەفتاو دووی ڕۆژی دەی مایس، هەروەها بۆ ئاگاداریی وەزارەتی هەندەران و باڵوێزخانەکانی خاوەن شکۆ لە قاهیرە و ئەنقەرە و مۆسکۆ.

نیشانە بە برووسکەی ژمارە چوارتان دەربارەی مەلا مستەفا.

لێپرسراوانی ئێران هیچ زانیارییەکی لەو جۆرەیان لا نییە و لەو بڕوایەشدان ئەو ڕاپۆرتانەی تۆ باسیان دەکەی ئەسڵوئەساسیان نییە.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم نامەیەم بنێریێ بۆ ئەنقەرە و مۆسکۆ، هەروەها هەردووك برووسکەی یەك لە دوای یەکیشم کە ژمارەکانیان چوار و سیازدەن)[٢٧].

---

[٢٦] سێر جۆن لیێ هێلیێر ڕۆوگێتێل (Sir John Helier Le Rougetel) ڕۆژی نۆزدەی حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٤ لە دایك بووە، زانکۆی کامبریجی تەواو کردووە، لە یەکی ئابی ساڵی ١٩٢٢وە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، لە کەنەدا و مەجەر و یەکیەتی سۆڤیەت و ڕۆمانیا و بەلچیکا و شوێنی دیکە کاری کردووە، ڕۆژی هەژدەی نیسانی ساڵی ١٩٤٦ کراوەتە باڵوێزی بەریتانی لە تاران و تاوەکو ڕۆژی هەژدەی مایسی ساڵی ١٩٥٠ لەو پۆستەدا مایەوە، دوای ئەوە گوێزرایەوە بڕۆکسل. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular year Book, 1951", London, p.353.

بەشی سێیەمی هەمان فایل بریتییە لە برووسکەیەکی زۆر نهێنی و بایەخداری باڵوێزی بەریتانی لە تاران بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتەکەی لە لەندەن بە بەرواری نۆزدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٨، وا دیارە باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران ساڵی ١٩٤٨، واتا بەر لە ساڵێك پێش بڵاوبوونەوەی دەنگوباوی نیازەکانی بارزانی، بەوەی زانیوە کە حوکمەتی عیراقی بە فەرمی داوای لە حوکمەتی ئێرانی کردووە بە وردی چاودێری گشت چالاکییەکانی بارزانی و لایەنگرانی بکەن و بەغدا دەربارەیان ئاگادار بکەن، کاتێك باڵوێزی بەریتانی لە تاران ئەمەی بیر کەوتۆتەوە یەکسەر ڕۆژی نۆزدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٩ ئەم برووسکەیەی ناردووە بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی لە لەندەن:

(ئەم برووسکەیە بە شێوازێکی تایبەتی نهێنییە و بۆیەکا پێویستە ئەو بەرپرسەی وەریدەگرێ بیپارێزێ و نەگاتە دەست کەس.

بەشفرە و جانتای نهێنی،

لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ج. لێ ڕۆوگێتێل،

ژمارە ٤،

١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٩،

نهێنی،

دەنێردرێ بۆ کرمانشا، نیشانە بە برووسکەی ژمارە بیست و نۆی ڕۆژی نۆزدەی حوزەیرانتان، هەروەها دەنێردرێ بۆ تەورێزیش.

برووسکەی ژمارە ٣١/٥٥ی ساڵی ١٩٤٩م.

حوکمەتی عیراق داوای کردووە بەردەوام ئاگادار بکرێ دەربارەی هەر زانیارییەکی پێوەندیدار بە نیازەکانی مەلا مستەفا و پیاوەکانییەوە کە

---

(27) N.A., F.O., 371/ 75471/ Eastern Department, Cypher From Tehran To foreign office, from Sir J. Le Rougetel No. 372, 10th May 1949. Confidential.

ئێستا لە یەکیەتی سۆڤیەت دەژین، وێڕای زانیاریی دەربارەی هەر بزووتنەوەیەك لە ئێران کە لەوانەیە کار بکەنە سەر ئاسایشی کوردستانی عێراق و حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانی ڕازییە هەر زانیارییەکی لەو جۆرە دەستکەوت بدرێتە حوکمەتی عێراق بەو مەرجەی ئەو زانیارییانە بن کە پێوەندییان بەم بابەتەوە هەیە و بیاننێرن بۆ من تاوەکو بیانگەیێنمە بەغدا)[٢٨].

بەشی چوارەمی هەمان فایل بریتییە لە سێ لاپەڕە، لە لاپەڕەی یەکەمدا تەنها ئەمەی لای خوارەوە نووسراوە:

(هاندانی سەردارە کوردەکان لەلایەن مەلا مستەفاوە. نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٥٨٩ی ڕۆژی یازدەی حوزەیران کە وەزارەتی هەندەران ناردوویە بۆ بەغدا (إی. ٣٤/١٠١١٠/٥٣٨١).

وێنەی برووسکەی ژمارە ٨٤ی ڕۆژی بیست و پێنجی حوزەیرانی تەورێز دەربارەی دیدەنیی لەگەڵ کونسوڵی عێراقدا).

لاپەڕەی دووەمیش بریتییە لە بەڵگەنامەیەك کە هەر ئەو قسانەی سەرەوەی تێدا دووپات کراوەتەوە لەگەڵ تەنها ئەم ڕستەیەدا: (وێنەی بۆ مارشاڵ شاهبەختی – Marshal Shahbakhti).

هەرچی لاپەڕە سێی بەشی چوارەمە بریتییە لە برووسکەیەکی چوار خاڵیی جێگری کۆنسوڵی بەریتانی لە تەورێز بۆ باڵوێزی بەریتانی لە تاران کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(برووسکەی ژمارە ٨٤،

ڕۆژی ٢٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٩،

لە : تەورێزەوە،

بۆ: تاران،

---

(28) Ibid, Cypher and by Confidential Bag, Form Tehran To Foreign Office, Sir J. Le Rougetel, No.4 Saving, 19th June, 1949, Secret.

بە شفرە.

١- نیشانە بە برووسکەی ژمارە هەشتاو چواری ڕۆژی بیست و پێنجی حوزەیرانتان.

کونسوڵی عیراق ئیمڕۆ پێی ڕاگەیاندم کە مارشاڵ شاهبەختی پێی گوتووە حەز دەکات ببینێ، گوتووشییە ئەو گەلێك ڕاپۆرتی لەو بارەیەوە پێگەیشتووە، بەڵام نازانێ ئەو ڕاپۆرتانە تا چەند ڕاستن کە دەڵێن لە ڕێگەی فڕۆکەوە پەخشە فڕێدراوەتە ناو کوردستانی عیراقەوە و گوایە بە ناوی مەلا مستەفاوە ئەو پەخشانە دەپرسن ئایا «خەڵکەکە-ك.م.» ئامادەن تەواو لەگەڵی بن یان تەنها یاریدەی مەعنەویی دەدەن.

٢- بەپێی ڕاوێژی من کونسوڵی عیراقی بە دووی ڕاستیی ئەم دەنگوباوەدا دەچێ لە ڕێگەی عیراقییەکان خۆیانەوە.

٣- بە لای شاهبەختیشەوە پێویستە تاقیبی ئەم مەسەلەیە بکرێ، چونکە مەرج نییە ئەوانەی ئێستا دەگوترێن لەوانە بکەن کە دوو مانگ لەمەوبەر دەربارەی هەمان بابەت دەگوتران، وێڕای ئەوە گوتیشی ئەو بۆ خۆی دەربارەی بارودۆخەکە هیچ نیگەران نییە.

٤- تکا دەکەم وێنەی ئەم برووسکەیەم، لەگەڵ برووسکەی ژمارە یەکمدا بنێرن بۆ بەغدا.

ئیمزا

جێگری کونسوڵ (٢٩).

هەرچی بەشی پێنجەمی هەمان فایلە، دیسانەوە بریتییە لە سێ لاپەڕە کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی هەرسێکیانە کە تەرخان کراون بۆ باسی ڕەنگدانەوەی دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی لە

(29) Ibid, Telegram No. 84 of 25th June 1949, From: Tabriz, To: Tehran, Cypher.

سـالّی ١٩٤٩دا لــه ناوچــهی سهردهشــتی کوردســتانی ڕۆژههڵاتــدا و لــهو بوارهیشــدا، وهك دهبینــین، بهڵگهنامــهی ســێیهمیان کــه بریتییــه لــه برووسکهیهکی نهێنیی سێر جۆن لیّ هێلیێر ڕۆوگێتێلی بـاڵوێزی بـهریتانی لـه تاران بۆ باڵوێزخانهی بهریتانی له بهغدا بایـهخێکی تایبـهتی بـۆ ئـهم بابهتـه ههیه.

لـه دهقـی بهڵگهنامـهی یهکـهمی بهشـی پێنجـهم دهسـت پێدهکـهین کـه دهڵێ:

(بـه پێـی ڕاپۆرتـهکان شـهش کـورد لـه سهردهشـت گـیراون. نیشـانه بـه نامهی تـارانی ژمـاره ٢٣٤(گ.٢٠/٢١/٤٩) (ڕای ٨٢٩٩/١٠١١٠/٣٤)، لـه سـێر ج. لــیّ ڕۆوگێتێلــهوه، تــاران (ژمــارهپ ل)٢٧٢(گ٢٠/٢٧/٤٩)، ڕۆژی بیســت و ههشتی تهمموزی ١٩٤٩) [٣٠].

بهڵگهنامهی دووهمـی بهشـی پێنجـهم بریتییـه لـه نامهیـهکی نهێنیـی کـه ژمارهکهی ٢٧٢(گ٢٠/٢٧/٤٩)یه و باڵوێزی بهریتانی له تارانهوه ناردوویـه بـۆ جێگری وهزیری ههندهرانی ولّاتهکـهی لـه لهنـدهن دهربـارهی هـهمان بابـهتی گرتنی ئهو شهش کوردهوه له سهردهشت[٣١].

ههرچـی لاپـهڕهی سـێیهمی بهشـی پێنجهمیشـه بریتییـه لـه دهقـی ئـهو برووسکهیهی باڵوێزی بهریتانی له تارانهوه ناردوویه بۆ باڵوێزخانهی بهریتانی لــه بهغــدا دهربــارهی هــهمان بابــهت و ئهمــهی لای خــوارهوهیش دهقــی وهرگێڕانهکهیهتی:

(برووسکهی ژماره ١٢٦ی ٢٨ی تهمموزی ١٩٤٩،

له: تارانهوه،

بۆ: بهغدا،

---

[30] Ibid, From: Sir J. Le Rougetel, Tehran, To: Baghdad, 28 July 1949, cypher.

[31] Ibid, From: Sir J.Le Rougetel, Tehran, No.272 (G20/27/49), To: Foreign Office, London.

بە شفرە،

نهێنی،

١- سەرەتا ڕاپۆرتەکەی تەورێز بەم جۆرەیە: کونسوڵی عیراق ڕایگەیاند دوو حەفتە لەمەوبەر شەش کورد لە سەردەشت گیراون لەسەر ئەوەی لە ڕێگەی نامەوە پێوەندییان بە بارزانییەوە هەبووە. وەك کونسوڵ زانیویە ئەو شەش کەسە گوێزراونەتەوە یەکێك لە بەندەرەکانی کەنداوی فارس.

٢- بەپێی ڕاپۆرتەکان لەوانەیە گشت مەخفەرەکانی هەردووك لای سنووری نێوان عیراق و ئێران تۆڕی بێتەلیان[٣٢] بۆ دابمەزرێنرێ بۆ ئەوەی پێوەندیی لە نێوان هەردووك لادا بەردەوام بێ. کۆتایی.

ئیمزا

لێ ڕۆو گێتێل)[٣٣].

پێموایە ئەو خاڵەی دوا بەڵگەنامەی بەشی پێنجەمی ئەم فایلە کە باسی گواستنەوەی شەش کوردە گیراوەکەی سەردەشت بۆ یەکێك لە بەندەرەکانی کەنداوی فارس دەکات، بەڵگەیەکی کەم وێنەیە لە سەرانسەری جیهاندا بۆ ئەو دەردەسەری و ئەشکەنجانەی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان گیرۆدەیان هاتوون، بە ڕاستی جێگەی سەر سوڕمانە فەرمانڕەوایانی ڕژێمی پەهلەوی بە زیندانە تاریك و نووتەکەکانی کوردستان قایل نەبن و ئەو نیشتیمانپەروەرانە ڕاگوێزنە بەندیخانەکانی یەکێك لە بەندەرە دوورەکانی کەنداوی فارس، جا ئاخۆ کەی بێ ئەوەی سەربەرزی ئەو ڕۆڵە بەجەرگانە بتوانن تاجە

---

(٣٢) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

It is reported that military Posts each side of the Iraqi- Persian frontier may be issued with wireless transmitter sets for inter- commanication.

(33) N.A., F.O., 371/75471/Eastern Department, Telegram No. 126 of 28 July, 1949. From: Tehran, To: Baghdad, Cypher Despached: 1240-28.7.1949, Le Rougetel.

گوڵینەیەکی پڕ لە شانازی لە گوڵەداری سێوی سەردەشتی نازدار بخەنە سەر گۆڕی دوورە وڵاتی ئەو جوامێرە بێ نازانە؟.

بەشی شەشەم، کە هەمان کات دوا بەشی فایلەکەیە، لە دوو بەڵگەنامە پێکهاتووە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی هەردووکیانە:

(لە باڵوێزخانەی بەریتانییەوە لە بەغدا،

بۆ بەشی ڕۆژهەڵات[٣٤]،

ژمارە ١٨٥/٤٤/٤٩،

ڕۆژی ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٤٩.

بە پێی ڕاپۆرتێك مەلا مستەفا حوکمەتێکی لە ئازەربایجان دامەزراندووە و ناوی لێ ناوە «حوکمەتی ئازادی کوردستان».

وێنەی بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران، وێنەیشی بۆ کەرکووك) [٣٥].

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی نامەکەی باڵوێزخانەی بەریتانییە لە بەغدا بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران:

(باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

ڕۆژی ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٤٩،

ژمارە ١٨٥/٤٤/٤٩،

نهێنی.

باڵوێزی خۆشەویست.

وەزارەتی هەندەران ئاگاداری کردووین کەوا بە پێی ڕاپۆرتێك مەلا مستەفا حوکمەتێکی لە ئازەربایجان دامەزراندووە و ناوی لێ ناوە «حوکمەتی ئازادی کوردستان». ئەو لەسەری دەڕوات و دەڵێ مەلا مستەفا

---

[٣٤] دیارە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندرانی حوکمەتی بەریتانییە.

[35] N.A., F.O., 371/75471/Eastern Department, From: Chancery Baghdad, To: Eastern Department, No. 185/44/49,Datad 20th September, copy to Chancery, Tehran, Copied to Kirkuk.

شاری تفلیسی[٣٦] کردۆتە پایتەختی حوکمەتەکەی و ڕووسەکان لەوێ مەشق بە پێنج هەزار سوارەی «کورد–ك.م.» دەکەن، بەم زووانە مەلا مستەفا هەواڵی دامەزراندنی حوکمەتە سەربەخۆکەی ڕادەگەیێنێ و ئاڵایەکیش بۆ ئەو حوکمەتە هەڵدەبژێرن، بەڵام تاوەکو ئێستا شێوەی ئەو ئاڵایە دەستنیشان نەکراوە.

ئێمە هیچ هەواڵێکی تەواومان دەربارەی ئەو مەسەلەیە لا نییە و نازانین ئایا ئەو ڕاپۆرتە ئەساسی هەیە یاوەخود نا، بەختەوەر دەبین هەواڵێکمان بگاتێ پشتی ئەو ڕاپۆرتە بگرێ یاوەخود بە درۆی بخاتەوە. ئێمە پرسیارێکمان دەربارەی ئەو بابەتە ناردووە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی عیراقی.

وێنەی ئەم نامەیەش دەنێرین بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران و بۆ کەرکووك.

هەمیشە دڵسۆزتان.

باڵوێز

بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران) [٣٧].

فایلی دووەمی ئەم بابەتە کە ژمارەکەی (٩١٢٥٢/٣٧١)ە و بۆ دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانیی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە لە ساڵی ١٩٥١دا تەرخان کراوە لە فایلی یەکەم گەورەترە، ئەمیان لە چل و نۆ لاپەڕە پێکهاتووە و دابەش کراوە بەسەر چوار بەشدا.

---

(٣٦) لێرە هەست بە جۆرە تێکەڵاوییەك دەکرێ، چونکە ئەوساکە تفلیس پایتەختی جۆرجیای سۆڤیەتی و باکۆیش پایتەختی ئازەربایجانی سۆڤیەتی بوون، لە هەردووکیشیاندا کورد دەژین.

(37) N.A., F.O., 371/75471/Eastern Department,British Embassy, Baghdad, 20th September,1949, No. 185/44/49, Confidential, To the Chancery, British Embassy, Tehran.

ناوونیشـانی بەشـی یەکـەمی ئـەم فایلـە «بـارودۆخی کوردسـتان»ە کـە مێژووی بیست و حەوتی کانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٥٠ی بەسـەرەوەیە[٣٨] لـە ناوەوە ڕاپۆرتێکی سێ لاپەڕەیی بە هەمان ناوونیشانەوە تێدایە، کـە ئیمـزای گ. دەبـل یـو. فـەرلۆنگ[٣٩]ی بـە سـەرەوەیە و لـە تەنیشـت ناوەکەیـەوە نووسراوە (ئەو، واتا فەرلۆنگ، بە ناوەرۆکی ڕاپۆرتەکەدا چوّتەوە)[٤٠].

ڕاپۆرتی ناوبراو لە گەلێك لایەنـەوە بایـەخی مێـژوویی و سیاسـی زۆرە و بۆ خۆیشی بۆ «بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمـەتی بـەریتانی» ئامادە کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

## بارودۆخی کوردستان

١- وەزیـری دەوڵـەتی «بـەریتانی -ك.م.» دەربـارەی ئـەو ڕاپۆرتـە نهێنییانە دەپرسێ کە باسی پەرەسەندنی چالاکیی شـیوعیی لـە نـاو کـوردی ناوچـەی جـەزیرەی سـووریادا دەکـەن، پوختەیـەکی کورتمـان دەربـارەی کەمینەی کوردی ئەو وڵاتانەی کوردیان لـێ دەژیـن ئامادە کـردووە کـەوا لـە

38) Ibid, British Emdassy, Baghdad, 20th September, 1949., No. 185/44/49, Confidential To the Chancery, British Embassy, Tehran.

(٣٩) گیـۆفری وارێـن فـەرلۆنگ (Geoffrey Warren Furlonge) ڕۆژی شـازدەی تەشـرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٣ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجـە، لـە ڕۆژی بیسـت و دووی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٦ەوە بـووە جیگـری کونسـوڵ لـە موفەوەزیـەتی بـەریتانی لـە سووریا و لوبنـان، دوایـی بـە ڕیـز وەك دیپلۆماسـی لـە کازابلانکـا و مـەراکیش و جـەددە و بێـروت و تـەرابولس و تـاران کـاری کـردووە و لـە ڕۆژی نـۆی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٤٩یشەوە بۆتە سەرۆکی بەشی ڕۆژهەلاَت لە بارەگای وەزارەتی هەندەرانی بـەریتانی لـە لەندەن، بڕوانە:

"The Foreign office List and Diplomatic and Consular Year Book 1951"., London, pp. 279-280.

(٤٠) لەدەقی ئینگلیزییەکەدا بە دەستخەت نووسراوە:

"Who approved minute".

خوارەوە پێشکەشی دەکەین، هاوپێچیشی نوێترین ڕاپۆرتتان دەربارەی «کوردی—ک.م.» جەزیرە بۆ دەنێرین.

**عیراق (ژمارەی کوردی دەوروبەری ٧٤٠ هەزارە)**

٢- ئەگەر کێشەی ئاسایی هۆزایەتی و دەرەبەگی و وردە چەتەگەرییەکی لێ وەدەرنێی کوردستانی عیراق ئێستا هێمنە، هەستی نەتەوەییش بە لایەنی کەمەوە لەو ڕەخنانەدا خۆ دەنوێنێ کە ئاراستەی کاربەدەستە عیراقییەکان دەکرێن، ئەوەی «حوکمەت—ک.م.» دەستی کردووە بە چارەسەر کردنی، بەڵام هەر چۆن بێ لەوە دەچێ لەم دواییانەدا ئەمەریکاییەکان خەریك بن بایەخ بدەنە کورد، ئەوەی لەوانەیە ببێتە هۆی بزواندنی ئاواتی سەربەخۆیی لایان.

٣- هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە ئەوە نیشان بدەن کە سیخوڕی سۆڤیەتی لە کوردستانی عیراق هەن، پارتی کۆمۆنیستی عیراقیش زۆر نییە لە ناوچە کوردییەکاندا پەرەی بە چالاکیی خۆی داوە، بەڵام هیچ نیشانەیەك لە ئارادا نییە ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە ئەو چالاکییە سەرکەوتووە. هەرچی مەسەلەی ئەو ئێزگە کوردییانەشە کە دەڵێن شتێك کاریگەرییان لەسەر کورد هەیە ئەوە بابەتێکە بە جیا باسیان دەکەین[41].

**سوریا (ژمارەی کوردی دەوروبەری ٦٠ هەزارە)**

٤- لەوە ناچێ ژمارەیەکی وا کەم کوردی جەزیرە، کە لە ناوچەیەکی کەلادا دەژین و سەرقاڵی کێشە دووبەرەکییەکانی خۆیانن، بۆ حوکمەتی سووریی سەرچاوەی کێشەی کاریگەر بن.

٥- هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە دەربارەی ئەوەی سیخوڕی سۆڤیەتی لە جەزیرە هەبن، بەڵام بە پێی ڕاپۆرتە نهێنییەکان نفووزی شیوعیی لەوێ لە پەرەسەندندایە، کوردەکانی جەزیرە پشت بە سۆڤیەت دەبەستن، وەك هۆیەك بۆ یاریدەدانیان دژی ئەو دەزگا کارگێڕییە نەفام و

---

(41) N.A., F.O., 371/91252.

دواکەوتووە سوورییەی گیرۆدەی هاتوون. وەزیری موفەوەزی حوکمەتی خاوەن شکۆی «بەریتانی– ک.م.» لە دیمەشق لەو باوەڕەدایە لە کاتی هەڵگیرسانی جەنگ لەگەڵ لە ڕووسیادا هۆ بەرگرییە سوورییەکان لە فورات گورزی کاریگەرییان تێدەوەشێنرێ لە لایەن ئەو کوردانەوەی سەر بە ڕووسیان، لەو بڕوایەداین سوورییەکان لەوانەیە بتوانن لە ڕێگەی بایەخدانەوە بە کورد، وەك ئەوەی ڕێگە بدەن بە کوردی لە قوتابخانەکاندا بخوێنن و ئەمن و ئاسایشیان بۆ دابین بکەن، لە کاریگەریی پڕۆپاگەندەی شیوعیی لەسەر کورد کەم بکەنەوە.

**تورکیا** (ژمارەی کوردی دەوروبەری ملیۆن و نیوێکە)

٦– بارودۆخی ئاسایشی ناوخۆ لەناو کوردی تورکیادا خراپ نییە. هەرچەندە هۆیەکەی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو هێزە زۆرەی سوپای تورك لە ناوچە کوردنشینەکاندا، بەڵام پێویستە لەم بوارەدا ئەوەیش لە یاد نەکەین کە سیاسەتی بە ڕۆژئاوایی بوون[٤٢] یاریدەی تورکی داوە کورد وەك کەمینەیەك بتوێنێتەوە و لەمەدا تا ڕادەیەکی هەست پێکراو سەرکەوتوون.

٧– هیچ نیشانەیەکی بوونی بزووتنەوەیەکی سەربەخۆیی یەکگرتووی کوردیی لە ئارادا نییە، هەرچی پڕۆپاگەندەی شیوعیشە لەوە ناچێ کاریگەرییەکی ئەوتۆی بەسەر کوردی تورکیاوە هەبێ.

**ئێران** (ژمارەی کوردی دەوروبەری ٦٠٠ تاوەکو ٧٠٠ هەزارە)[٤٣]

٨– کوردی ئێران گیرۆدەی ناکۆکیی هۆزایەتی و خێزانی بوون و بە دەگمەن بیر لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد دەکەنەوە، بە دەستووری عیراق لەوە دەچێ بایەخپێدانی ئەمەریکاییەکان بە کورد ببێتە

[٤٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە: "Policy of westernizing..." کە واتای (تحدیث) ڕادەگەیێنێ.

[٤٣] گشت ژمارەکانی ناو یادداشتەکە دەربارەی سەرژمێریی کورد بە لای کەمدا دایشکاندووە. تایبەت دەربارەی ژمارەی کوردی ئێران کە تەنانەت لەو ژمارانەیش کەمترن کە لە بەڵگەنامەی دیکەی حوکمەتی بەریتانی خۆیدا هاتووە.

هۆی بووژاندنەوەی ئاواتی سەربەخۆیی لای کوردی ئێرانیش. مانگی ئەیلوولی رابردوو رەفزیی یەکێك لە هۆزە کوردەکان چەکەکانیان تەسلیم بە پۆلیس بکەن بووە هۆی سەرهەڵدانی ئاژاوەیەك، بەلاّم هۆزە کوردەکانی دیکە نەهاتنە دەنگ، ئەوەی یاریدەی کاربەدەستانی دا کێشەکە بە شێوازێکی رۆتینی چارەسەر بکەن، هیچ بەڵگەیەکیش بە دەستەوە نییە کە هەڵوێستی ئەو هۆزە بە هاندانی سۆڤیەت بووبێ.

٩- چەند شتێك «لەناو کوردی ئێراندا-ك.م.» بە هاندانی سیخورەکانی رووسیا روویان دا، بەلاّم دەستکەوتێکی ئەوتۆیان نەبوو، کوردی «ئێران-ك.م.» زۆر بایەخ نادەنە کۆمۆنیزم، ئەو پرۆگرامە بەردەوامە «کوردییانەیش-ك.م.» کە لە ژێر چاودێریی رووسیادا لە رێگەی ئێزگەی نهێنیی ئازەربایجانەوە پەخش دەبن زۆر کاریگەر نین، مەسەلەی بەرپەرچدانەوەیان وەبەر چاو گیراوە.

ئەنجامەکان:

یەکەم: ئەگەر هەراو بگری هۆزایەتیی ئاسایی لێ وەدەرنێین ئەوا بارودۆخی کوردستان بە گشتی هێمنە.

دووەم: هەستێکی نەتەوەیی یەکگرتوو لەناو کورددا نییە، لەوانەیە هاتنە گۆڕێی بەرژەوەندیی ئەمەریکا ببێتە هۆی سەرهەڵدانی هەستێکی لەو جۆرە.

سێیەم: ناوچەی جەزیرەی سووریای لێ دەرکەی پرۆپاگەندەی شیوعیی سەرکەوتنێکی ئەوتۆی لەناو کورددا وەدەست نەهێناوە، ئەوەی جەزیرەیش تا رادەیەکی زۆر ئۆبالّی دەکەوێتە ئەستۆی کەمتەرخەمی و بوودەڵەیی کاربەدەستە سوورییەکان کە نازانن چۆن رەفتار لەگەڵ کورددا بکەن.

چوارەم: لە کاتێکدا لەوە دەچێ چالاکیی ئێستای سیخورەکانی رووسیا فراوان نەبێ و کەمئەنجام بێ، بەلاّم لە حالّێکدا ئەگەر شەڕ لەگەڵ رووسیادا بقەومێ ئەوساکە کورد رۆڵێکی دیار و مورعیجیان دەبێ.

**پێشنیارەکان:**

یەکەم: هان نەدانی ئەو ئارەزووە زۆرەی ئەمەریکاییەکان هەیانە لە بواری بایەخدان بە کوردستان، تایبەت ئەو لایەنانەیان کە پێوەندییان بە دامەزراندنی کونسوڵخانەی ئەمەریکاوە لە کوردستاندا هەیە.

دووەم: حوکمەتی سووریا لە ئەنجامە چاوەڕواننەکراوەکانی سیاسەتە ناقۆلاکەی «بەرانبەر کوردی جەزیرە–ک.م.» ئاگادار بکرێ.

سێیەم: ئەوەی پێوەندیی بە دامەزراندنی ئیزگەی کوردییەوە هەیە دوایی بە تایبەتی باسی دەکەین.

ئیمزا

گ.دەبل یو. فەرلۆنگ

٢٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٠ )[٤٤].

لە بەشی دووەمی هەمان فایلدا وتارێکی ڕۆژنامەی بە ناوبانگی سکۆتسمان[٤٥]ی ڕۆژی نۆی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥١ هەڵگیراوە کە لە نووسینی فلیپ تۆینبیی هەواڵنێری تایبەتیی «سکۆتسمان»ە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمەیش ناونیشانی سەرنجڕاکێشی ئەو وتارەیە:

(مژدەی دوا ڕۆژێکی بەختەوەر بە کوردە بێزارەکان لە لایەن سۆڤیەتەوە– ئەو پاروەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە قوت دەدرێ[٤٦].

---

[٤٤] N.A., F.O., 371/75471/Eastern Department, The Sitiuation In Kurdistan, G.W. Furlonge, 27th December, 1950.

[٤٥] «سکۆتسمان» یەکێکە لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی بەریتانیا، لە ساڵی ١٨١٧وە لە شاری ئێدنبرا دەر دەچێ و نزیکەی دوو سەدەیە ڕۆڵێکی دیار لە دارشتنی ڕای گشتیی کۆمەڵگای ئەم وڵاتەدا لە ڕێگەی لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکانی وڵات و جیهانەوە دەبینێ، لە کاتێکی زووی وەک ساڵی ١٨٧٣دا ڕۆژی چل هەزار دانە لە «سکۆتسمان» چاپ دەکرا.

[٤٦] لە دەقی ئینگلیزییەکەیدا وا هاتووە: "allow food to pass down the throat"

بڕوانە:

"The Cocise Oxford Dictionary of Current English", Oxford, 1990, P.1230.

ئەم وتارەی «سکۆتسمان» هەڵسەنگاندنێکی ورد و قووڵی سیاسیی پرسی کوردە لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوودا و بە زوبانێکی ئەدەبیی بەرز دارێژراوە بۆیەکا بە پێویستی دەزانین بە پێی توانا پوختەی ناوەرۆکی لێك بدەینەوە.

بەر لە هەر شت فلیپ تۆینبیی پەیامنێری «سکۆتسمان» ناونیشانێکی سەیر و یەکجار سەرنجڕاکێشی بۆ وتارەکەی هەڵبژاردووە کە نەخۆم و نە ئەوانەی پەنام بردنە بەر نەمانتوانی دەقاودەق لێی تێبگەین چونکە ئەو فەرهەنگە ئینگلیزی – عەرەبییانەی لەبەر دەستدان واتای وشەی "Swallow" یان تێدا نییە، لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ئینگلیزی – ئینگلیزیشدا ئەو وشەیە گەلێك مانای هەیە کە لە نێویاندا تەنها ئەو «پارووەیە کە قووت دەدرێ»[٤٧] بۆ ناونیشانی وتارەکەی فلیپ تۆینبی دەست دەدات.

خوێنەر لە ناوەڕۆکی ئەو وتارەی «سکۆتسمان»ەوە بە ڕوونی هەست دەکات چۆن گشت گەلی کورد، بە پاشا و گەداوە، لە دەست جەور و ستەمی چەوسێنەرانی کورد و کوردستان بێزار بوون، بە ڕادەیەك وایان لێ هاتووە بێ سێ و دوو ئامادە بن تەنانەت ببنە داردەستی یەکیەتی سۆڤیەت و شەو و ڕۆژ خواخوایان بێ جەنگێکی جیهانیی دیکەی وەك جەنگی یەکەم یا دووەم بەرپا بێ چونکە لەوانەیە ئەنجامەکانی جەنگێکی وا مژدەی ئازادی بۆ کورد بهێنێ.

گەلێك لایەنی دیکەی وتارەکەی فلیپ تۆینبی لە ڕۆژنامەی «سکۆتسمان»دا بایەخیان بۆ پرسی کورد لە ناوەندی سەدەی ڕابردوودا زۆرە و دەتوانین لەم خالانەی خوارەوەدا بەم جۆرە عەرزیان بکەین:

---

[٤٧] لە دەقی ئینگلیزییەکەدا وا هاتووە:

"Midlle East (Soft Spot)" Discontented Kurds Swallow Soviet Promises of Happy Future", From Philip Toynbee "The Scotsman" Special Correspondent Touring The Middle East,- "Scotsman", 9th January 1951.

أ- هاندەری سەرەکیی نووسینی ئەو وتارە دەنگدانەوەی دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بۆ کوردستان بوو، شایانی باسە فلیپ تۆینبی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٤٥ی باشووری کوردستانی بە سەرۆکایەتی بارزانی بە شێوازێکی ڕەوا و تا ڕادەیەکی زۆر بە پێچەوانەی سەرنجی باوی ئەوسای ڕۆژئاواییەکانەوە هەڵسەنگاندووە:

(لە عیراق کورد دوای یاخیبوونە گەورەکەی ساڵی ١٩٤٥یان هێمن بوون و سەرئەنجام ڕەهبەری کورد مەلامستەفا هەڵهات بۆ ڕووسیا و لەوساوە هەر لەوێیە)[٤٨].

ب- ڕۆژنامەی «سکۆتسمان» پرسی هاوچەرخی کورد بە پرسێکی نێودەوڵەتی دادەنێ و لەو بوارەدا دەیشوبهێنێ بە مەسەلەی وڵاتانی بەلکان و تایبەت بەلگاریا، ئەو مەسەلەیەی بووە یەکێك لە هۆ سەرەکییەکانی بەرپابوونی هەردووك جەنگی یەکەم و دووەمی جیهان، ئەوەتا فلیپ تۆینبی لە سەرەتای وتارەکەیدا دەڵێ:

(وا پێدەچی کوردستان ئەوە دەسەلمێنێ کە ئاسانترین «یا لەبارترین» خاڵی سەرجەمی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە بۆ هاتنە ژوورەوەی ڕووسیا، لەوەیشدا دەقاودەق لە ناوچەکانی بەلکان دەکات - هەر چەندە ئەمیان ئێستاکە لەو بارەیەوە لە پەلوپۆ کەوتووە[٤٩] - بەلام بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ناوچەیەکی پڕ لە ئاژاوەی جیهان بوو، هەروەك چۆن ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بووەتە نموونەی ئاژاوەی جیهان، ئەوساکە بەلگاریا ناوەندی

---

[٤٨] لە دەقی ئینگلیزییەکەدا دەڵێ:
"In Iraq the Kurds have been quiescent since their big revolt of 1945, after which the Kurdish Leader, Mulla Mustafa, fled to Russia. He has remained there ever since".

[٤٩] مەبەستی لەوەیە کە ناوچەکانی بەلکانی وەك بەلگاریا و یۆگۆسلافیا بە هۆی ئەنجامەکانی جەنگی دووەمی جیهان و دامەزراندنی بەرەی سۆشیالیزمەوە ئێستاکە، واتا لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، هێمنن.

کێشەی بەڵکان بوو، ئێستایش شانۆیەك لە ئارادایە کە کوردستان تێیدا وەك مەڵبەندی گرژیی و ئاژاوەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دێتە بەر چاو).

ج- وا دیارە ئەو پرۆگرامە کوردییانەی لەو ساڵانەدا لە ناو خاکی سۆڤیەتدا پەخش دەکران وەك «ئێزگەی ئازەربایجانی ئازاد» ڕۆژئاواییەکانیان تەواو نیگەران کردبوو، تەنانەت ئەوەیش سەرەنجی ڕاکێشابوون کە ئەو ئێزگانە چۆن وێنەی خولە پیزەیان[50] وەك قارەمانێکی نەتەوەیی کێشاوە.

د- هەرچەندە ڕۆژنامەی «سکۆتسمان» لەو وتارەیدا بە ئاشکرا ئاماژە بۆ پەرەسەندنی بایەخ پێدانی ئەمەریکاییەکان بە پرسی کورد ناکات، بەڵام لە ڕێگەی خۆی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانییەوە زۆر بە ئاسانی هەست بە ڕادەی نیگەرانیی ئینگلیز لەو کارە دەکەین، ئەوان پێیان وابوو دیپلۆماسییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەو کارەیان یاری بە ئاگر دەکەن و چەند جارێك سەرنجی واشنتۆنیان بۆ ئەو بۆچوونەیان ڕاکێشاوە.

هـ- خاوەنی وتارەکەی ڕۆژنامەی «سکۆتسمان» چەند جارێك ئاماژەی بۆ سیاسەتی بێ ئەندازە شۆڤێنی و توندڕەوی فەرمانڕەوایانی تورکیا لەگەڵ کوردی باکووردا کردووە و بەرانبەر بەوەیش نیشانی داوە چۆن وەزعی کوردی باشوور، واتا عیراق، لە وەزعی گشت پارچەکانی دیکەی کوردستان باشترە.

و- فلیپ تۆینبی «سوپای ڕزگاریی چاوەڕوان دەکرێ»ی[51] کردۆتە ناوونیشانی دوا بەشی وتارەکەی کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکەکەیەتی:

---

[50] شایانی باسە فلیپ تۆینبی بە هەڵە خەلە پیزە (Khala Piza)ی لە بریتی خولەپیزە نووسیوە.

[51] لە دەقی ئینگلیزییەکەدا وا هاتووە: "Liberation Army Expected"

(لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا گەلێك جار لە کوردە گەشبینەکان بیستراوە کە مەلا مستەفا بەم زووانە لە ڕووسیاوە بە سوپایەکی ڕزگاری پێکهاتوو لە سێ تیپ «فیرقە»وە دەگەڕێتەوە و هیچ گومان لەوە ناکرێ ئەگەر هاتوو شتێکی وەها ڕوویدا ئەوساکە زۆر بە گەرمی لە زۆربەی هەرە زۆری ناوچەکانی کوردستاندا پێشوازی لێ دەکرێ.

ڕووسیا پەیمانی دامەزراندنی کۆمارێکی سۆشیالیزمی سۆڤیەتی کوردیی داوەتە کورد، ئەوەی لە خراپترین شێوازیدا بریتی دەبێ لە باشترین ڕژێمێکی ئۆتۆنۆمی کە تاوەکو ئێستا لە «هیچ قوژبنێکی کوردستاندا–ك.م.» پێی شاد نەبوون و تا ڕادەیەکی زۆریش ئەوە باوە کە لە ژێر سێبەی ڕووسیادا کورد دەتوانن خۆیان لە زۆرداری و زەبروزەنگی ئاغاکانیان قوتار بکەن کە بارێکی قورسە لە سەر شانیان و تەواو لێی وەرسن و ئیتر جڵەوی خۆیان بگرنە دەست و لەو کەسانەی ماوەیەکی دوور و درێژە چواردەوریان داون و زۆریان لێ دەکەن ڕزگاریان بێ و بەو جۆرە «ئەو کوردەی جەنگاوەرترین و ئازاترین گەلی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن» دەتوانن «بە هەر نرخێك بێ بگەنە ئەو دواڕۆژە خۆشە»، ئەویش لەو ڕێگەیەوە کە «ببنە بەڵکانی ئاسیای دەوڵەمەندی ڕووسیا» (٥٢). «بڕوانە پاشکۆی ژمارە».

بەشی سێیەمی هەمان فایل بریتییە لە بەڵگەنامەیەکی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە ج.سی.ب. ڕیچمۆندەوە (٥٣)،

---

(52) N.A., F.O., 371/ 91252, P.4,-Middle East "Soft Spot", Discontented Kurds Swallow Soviet Promises of Happy future, From philip Toynbee "The Scotsman" Special Correspondent Touring the Middle East.

(٥٣) جۆن چریستۆفەر بلەیك ڕیچمۆند "John Christopher Blake Richmond" ڕۆژی حەوتی ئەیلوولی ساڵی ١٩٠٩ لە دایك بووە، لە ڕۆژی سێی نیسانی ساڵی ١٩٤٧وە کرایە کونسوڵ لە بەغدا، لە ساڵی ١٩٤٨وە کرایە جێگری باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا و لە بیست

باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

نهێنی،

ژمارە/ ٥١/٢/١٠٢٥،

١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٥١،

بۆ: بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن س. دەبل یو١٠.

بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست.

١- تکایە ئامـاژە بکـەن بـۆ ئـەو نامەیـەی گرینهیـل "Greenhill"کـە ژمارەکـەی ٥٠/١٤/١٦٨٣یـە و دەربـارەی مـەلا مسـتەفایە و ڕۆژی چـواردەی کانوونی یەکەم ناردوویە بۆ فەرلۆنگ.

٢- دەنگوباوی گەڕانەوەی مەلا مستەفا زۆر جاران لێرە «واتا لە بەغدا- ک.م.» دووپات دەبێتەوە، هەمیشە ئـەو دەنگوبـاوە لـە بـەهاردا دەگاتـە لقـە پۆپە و لە هاویندا دەڕەوێتەوە. گومان لەوە دەکرێت ئەو بیەوێت بگەڕێتـەوە عـێراق، چـونکە گەڕانەوەیـەکی وەهـا پێویسـتی بـە لێبـووردنی «عـەفواتی- ک.م.» حوکمـەتی عێراقییـە، وێـڕای ئـەوەی ڕێـی تـێ ناچـێ کاربەدەسـتانی سۆڤیەت ڕێگەی گەڕانەوەی بـدەنێ تـەنها لـەو حاڵەتـەدا نـەبێ کـە بۆخۆیـان هەڵیاندەبـژێرن، لەوانەیشـە سـۆڤیەتەکان دەنگوبـاوێکی لـەو جـۆرە بـڵاو بکەنەوە بۆ شێواندنی کاربەدەستە عێراقییـەکان، یـان بـۆ ڕاکێشـانی سـەرنج دەربارەی کورد.

---

و شەشی تەمموزی ساڵی ١٩٥١وە گوێزرایـەوە خـودی وەزارەتـی هەنـدەرانی بـەریتانی لـە لەنـدەن، زۆری نـەبرد گوێزرایـەوە ژمارەیـەك ولاّتـی عـەرەبیی وەك: ئـوردون و میسـر و کوەیت، تایبەت لەبەر ئەوەی عەرەبییەکی زۆر چاکی دەزانی. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960". London, PP.347-348.

٣- دوای گەیشتنی ئەو نامەیەی گرینهیل جارێکی دیکە داوامان لە وەزارەتی ناوخۆی «عیراق-ك.م.» کرد دەربارەی ئەو بابەتە ئاگادارمان بکەن، لە وەڵامدا وەزارەت گوتی ئەوەندەی ئەوان ئاگادارن هیچ ئاڵوگۆڕێکی نوێ لە ئارادا نییە ئەوە نیشان بدەن مەلامستەفا نیازییە تێهەڵچێتەوە.

٤- ئێمە نازانین ئەو ڕاپۆرتانەی باسی گەڕانەوەی مەلا مستەفا دەکەن لە کوێوە گەیشتوونەتە بەشی ڕۆژهەلاتی «وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی-ك.م.» بەڵام ئەگەر بۆچوونی ئێمە پەسند بێت دەڵێین سەرچاوەی ئەو هەواڵە جێگەی بڕوا نییە.

وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانمان لە واشنتۆن و تاران.

هەمیشە دڵسۆزتان

ج.سی.ب.ریچمۆند) (٥٤).

بەشی چوارەمی هەمان فایل بریتییە لە بەڵگەنامەیەك دەربارەی هەمان بابەت کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا،

زانیاری لە میستەر باوڵەوە- وەزارەتی هەندەران،

ڕۆژی بیست و شەشی کانوونی دووەمی ١٩٥١.

ئیمڕۆکە بە میستەر پالمەر "Mr. Palmer"م گوت حەز دەکەم پێکەوە بەراوردێك لە نێوان ئەو ڕاپۆرتانەدا بکەین کە دەربارەی کەمینە کوردەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستن، هەروەها کورتەیەکم دەربارەی بارودۆخی کورد لە وڵاتە جیاوازەکاندا، بە پێی ڕاپۆرتە پێوەندیدارەکان، پێشکەش کرد. جگە لەوانە ئەوەیشم بیر کەوتەوە کە ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٠ لەگەڵ میستەر مکخێی "Mr. Mcghee" (٥٥) ڕێککەوتبووین کارێکی ئەوتۆ نەکەین هۆزە «کوردەکان-

(54) N.A., F.O., 371/91252, From: J.C.B. Richmond, British Embassy, Baghdad, Secret, No.1025/3/51, 18th January, 1951, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(٥٥) بە داخەوە نەمتوانی بزانم ئەو کەسانە کێن چونکە نە ناو و نە ناونیشانیان وەك گەلێك ناوی دیکەی ناو بەڵگەنامەکان تۆمار نەکراون، بەڵام دیارە ئەو گفتوگۆیە لە نێوان دوو

ك.م.» وا تێبگەن لە لایەن هێزێكی دەرەكییەوە حیمایە دەكرێن و ئاماژەم بۆ گەشـــتەكەی جەســـتایس دۆگـــلاس [٥٦] لـــە «كوردســـتانی–ك.م. » ئێـــران و ســـەردانی یـــەك لـــە دوای یـــەكی مولحـــەقی ئەمـــەریكایی لـــە بەغـدا لـــە ناوچـــە كوردییەكانی عیراق بۆی كرد.

میســـتەر پالمـــەر كـــە گوێڕایـــەڵی قســـەكانم بـــوو پشـــتگیریی كـــردم، كـــە پێویستە كارمەندەكانمان نە بە ئەنقەست و نە بێ قەسـت[٥٧] كـارێكی ئـەوتۆ نەكەن وا نیشان بدەن كە ئێمە زۆر بایەخ بە كورد دەدەین، یـان وا لـە كـورد بكەن وەك پارێزەریان سەیرمان بكـەن. هـەروەها هـەردووكمان هـاوبیرین كـە پێویستە پرسی كورد لە ژێر چاودێرییەكی بەردەوامدا بێ، داواشم لە میستەر پالمەر كرد ئاگادارمان بكـات لـە هـەر هـەواڵێكی نـوێی ئەمەریكاییـیـەكان كـە دەربارەی ئاڵوگۆڕەكانی ئەم بابەتە چنگیان دەكەوێ.

ئیمزا

ر.باول [٥٨]،

بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران) [٥٩]

---

بەرپرسی دیپلۆماسیی ئینگلیز و ئەمەریكاییدا بووە و ئینگلیزەكـەیان سـوور بـووە لەسـەر ئەوەی ڕۆژئاواییەكان كێشەی كورد نەكەنە بار بەسەر خۆیانەوە.

(٥٦) بە نامەی دووەمی بەشی پێنجەمی هەمان فایلدا دیارە كە جەستایس دۆگلاس " Justice) (Douglas" یەكێك بووە لە دیپلۆماسییەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لە تاران لـە ساڵی ١٩٥١دا و گەشتێكی بەناو كوردستانی ڕۆژهەڵاتدا كردووە.

(٥٧) ئەنقەست وشەیەكی تەواوی عەرەبییە، لـە «عـن قصـد» وەرگـیراوە و بـەو جـۆرە سـواوە، بۆیـەكا بـێ قەسـت «بـێ قصـد»م وەك خـۆی هێشـتووەتەوە تـاوەكو سـەر لـە خوێنـەر تێكنەچێ.

(٥٨) دیارە «ر. باول (R.Bowel) دیبلۆماسییەكی بەریتانییە، بە داخەوە لەو سەرچـاوانەدا كـە لەبەر دەستمدان پوختەی ژینامەیم دەست نەكەوت.

(59) N.A., F.O., 371/91252, Kurds in the Middle East, Minutes From Mr. R.Bowhel, Eastern Department, Foreign office 26th January 1951,PP.9-10.

«کێشـەی کـورد. وەزع لەسـەر سـنووری ئێـران» ناوونیشـانی بەشـی پێنجـەمی هـەمان فایلـە، ئـەم بەشـە بریتییـە لـە دوو نامـەی دوور و درێـژی بایەخدار بۆ ئەم بابەتە، یەکەمیان نامەی باڵوێزی بەریتانییە لە واشـنتۆن بـۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتـی هەنـدەرانی حوکمـەتی بـەریتانی لـە لەنـدەن کـە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(باڵوێزخانەی بەریتانی،
واشنتۆن، د. سی،
٩ی شوباتی ١٩٥١،
نهێنی،
ژمارە ٥١/٢٣/١٦٨٣،
لە: ب.أ.ب. بورووسەوە[٦٠]،
بۆ: ل.أ.سی.فرای[٦١]،
بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران،

---

(٦٠) بێرنارد ئەلێکسەندەر برۆکاس بۆرۆس "Bernard Alexander Brocas Burrows" ڕۆژی سێی تەمموزی ساڵی ١٩١٠ لە دایك بووە، دەرچـووی ئۆکسـفۆردە، لـە پـازدەی تەشـرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٤وە بووەتە کارمەنـدی وەزارەتـی هەنـدەرانی حوکمـەتی بـەریتانی، لـە ئەفغانستان و میسر کاری کردووە و فێری زوبـانی عـەرەبی بـووە، لـە شـازدەی تەشـرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٧یشەوە بۆتە سەرۆکی بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەت لە لەندەن، بڕوانە:
"Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1953", London, PP. 224.

(٦١) لێسلی ئەلفرێد چـارلێس فـرای – Leslie Alfred Charles Fry ڕۆژی حەڤـدەی نیسـانی ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بـووە، کۆلێجی سـەربازی تـەواو کـردووە و لـە دووی شـوباتی سـاڵی ١٩٢٨ لە هندستان کـاری کـردووە و دوایـی بۆتـە دیپلۆماسـی و لـە «بەشـی ڕۆژهـەڵات»ی وەزارەتـی هەنـدەران کـاری کـردووە و لـە نـۆزدەی ئـەیلوولی سـاڵی ١٩٥١یشـەوە بۆتـە «ئەفسەری خزمەتە بیانییەکان» لە وەزارەتی هەندەران، بڕوانە:
"Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1953", London, PP. 291.

لەندەن،س.دەبل یو.١.

خۆشەویستم فرای.

١- نیشانە بە نامەی فەرلۆنگی ژمارە (إی ١٨٢٢/١١٤)ی ڕۆژی بیست و چواری تەشرینی یەکەم دەربارەی کورد، ئێمە وەك لە بڕگەی چوارەمدا داوامان لێ کرابوو، وێنەیەکی یادداشتەکەی تۆمان نارد بۆ بەشی دەوڵەت لەگەڵ دواخستنێکی زۆردا، تایبەت بە هۆی درەنگ گەیشتنی ئەو ڕاپۆرتانەی پێوەندیدارن «بەو باتەوە هەیە-ك.م.» وا پێدەچێ هۆی ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ سستی کاری لقی لێکۆڵینەوەی سەر بە بەشی دەوڵەت.

٢- هەرچۆن بێ بایەخدانی بەشی دەوڵەت بە کورد کەم نەبۆتەوە. کووپەری [٦٢] وەکیلی بەڕێوەبەری «دایەرەی کاروبارەکانی ڕۆژهەلاتی نزیکی» [٦٣] «سەر بە وەزارەتی هەندەران-ك.م.» ڕۆژی شەشی شوباتی «ساڵی ١٩٥١-ك.م.» ئەو ڕاپۆرتەی ناردووە بۆ گرینهیل کە لە بەغدا و تارانەوە دەربارەی ئەم بابەتە نێردراون، بە پێی ڕاپۆرتەکەی بەغدا گوایە حوکمەتی ئێران ڕێگەی داوە بە مەلا مستەفا لەگەڵ هێزێکی سێ تا پێنج هەزار کەسیدا لە سنووری «سۆڤیەتی- ئێران-ك.م.» بپەڕنەوە تاوەکو بچنە ناو عیراق بەو مەرجەی چەکەکانیان تەسلیمی ئێرانییەکان بکەن هەرچی

---

(٦٢) تۆماس ئوستن کووپەر (Thomas Austin Cooper) ڕۆژی حەوتی تەممووزی ساڵی ١٨٩٨ لە دایك بووە، لە ئابی ساڵی ١٩٢٣وە لە شانەکانی دامەزراوە، لە هندستان و سەنغافورە و سان پاولۆ و بارەگای وەزارەتی هەندەران کاری کردووە، لە بیست و سێی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٩وە گوێزرایەوە بەغدا و تاوەکو ساڵی ١٩٥٣ لەوێ مایەوە و ئینجا گوێزرایەوە سوید، بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1956", London, P. 214.

(٦٣) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە ئینگلیزی وا هاتووە:
"Office of Near Eastern Affairs".

راپۆرتەکانی «باڵوێزخانەی بەریتانییە—ك.م.» لە تاران نە پشتگیری ئەمەیان کردووە و نە نکۆڵیشیان لێی کردووە.

٣– بەپێی بۆچوونی ئێمە بەشی دەوڵەت لە لایەنێکی زۆرر گەورەوە دڵنیا کراوە لەوەی بارودۆخی سنووری ئێران لە ژێر کۆنترۆڵی تەواو دایە، هەرچەندە جار جارە وەزعی کوردی ئەو ناوچە سنوورییە دەبێتە مایەی لێکدانەوەی بەشی دەوڵەت. دەبێ لە یادت بێ چۆن کاتی دەستپێکردنی هەرای کۆریا سەرەتای حوزەیرانی ڕابردوو سەرەك ترومان[٦٤] بۆ خۆی داوای لە هەمووان کرد ئاگاداری بکەن لە هەواڵی هەر ئاڵوگۆڕێك لەوانە بێ لەو ناوچە شپرزەیەدا ڕوو بدات.

٤– لە کاتی گشت دیدەنییەکدا کووپەر هەمیشە لە هەڵوێستمان دەربارەی ئێزگە کوردییەکان دەپرسێ، بەختەوەر دەبم ئەگەر دەربارەی دوا هەواڵی ئەم بابەتە ئاگادارم بکەن.

٥– هەروەها کووپەر حەزیشی کرد بزانێ ئاخۆ ئێمە هەست بە هیچ کارێکی پێویست دەکەین بۆ کوردی عیراق جێبەجێ بکرێ، وا دیارە ئەو راپۆرتانەی دەربارەی ناوچە کوردییەکان دەگەنە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بەغدا باسی گەندەڵی کارگێڕیی ئەو ناوچانە دەکەن. گرینهیل پەیمانی دا داوای زانیاریی لەو بارەیەوە بکات و ئەو پێی

---

(٦٤) هاری س. ترومان (Harry S. Truman) ڕۆژی هەشتی مایسی ساڵی ١٨٨٤ لە لامەر مزوری لە دایك بووە، ئەندامی «پارتی دیموکرات»بوو، ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە فەرەنسا بردەسەر، ساڵی ١٩٣٤ بووە «ئەندامی ئەنجوومەنی پیران»، ساڵی ١٩٤٥ وەك سەرەك کۆمار هەڵبژێردرا و بەو جۆرە هاری ترومان بووە سی و سێیەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و تاوەکو ساڵی ١٩٥٣ بە سەرەك کۆماری مایەوە، واتا لە سەرەتای دەستپێکردنی «جەنگی سارد»دا کە گەلێك کێشەی نێودەوڵەتیی گەورەی وەك «جەنگی کۆریا» و «جەنگی ڤێتنام» و کەوتنی ڕژێمی پاشایی میسری بە خۆیەوە بینی، ئەمیش لە بیست و یەك خاڵدا «مەبدەئی ترومان»ی بڵاو کردەوە، ئەلیزابیث ڤێرجین هاوسەری بوو، ڕۆژی بیست و شەشی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢ لە تەمەنی هەشتا و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

وایە بەشی دەوڵەت سەرنجی نێردەی بانکی نێودەوڵەتی ڕابکێشیێ و پێشنیازێکی وەهای پێشکەش بکات و چیی لەو بارەیەوە زانی ئاگادارمان بکات.

٦- وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانمان لە بەغدا و تاران.

ئیمزا) [٦٥].

نامەی دووەمی ئەم بەشەش نامەی گ. دەبل یو. فەرلۆنگە بۆ ب.أ.ب.بۆرۆ لە واشنتۆن کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە: میستەر گ.دەبل یو. فەرلۆنگەوە،

بۆ: ب.أ.ب بۆرۆ لە واشنتۆن،

ژمارە إی ١٨٢١/١٤،

٢٦ی شوباتی ١٩٥١.

بۆرۆی خۆشەویست.

١- بەداخەوە کەمێك دواکەوتم لە وەڵامدانەوەی نامەی ژمارە ١٦٨٣/٢٣/٥١ی ڕۆژی نۆی شوباتتان دەربارەی کورد.

٢- بە پێی ڕاپۆرتێك «لە باڵوێزخانەی بەریتانییەوە-ك.م.» لە بەغدا مولحەقی سەربازیی عیراقی لە ئەنقەرە لەوە ئاگادار کراوە کە مەلا مستەفا دەورووبەری دە هەزار چەکداری لە نزیك ناوچەی چەمی ئاراسی سەر سنووری تورکی - ئێرانیی- ڕووسیدا ئامادە کردووە، وا هاوپێچ لەم نامەیەدا وێنەی برووسکەی ژمارە شەشی بەغداتان دەربارەی ئەم بابەتە بۆ دەنێرم.

هەمان کات ڕاپۆرتی یەکجار نهێنیی دیکە هەیە کە لە زمان مولحەقاتی سەربازیی ئێرانییەوە لە ئەنقەرەوە عەینی هەواڵ ڕادەگەیێنێت، بەڵام لەگەڵ جیاوازیی ژمارەکاندا، ئەمیان ژمارەی چەکدارەکانی مەلا مستەفا بە نزیکەی پێنج هەزار کەس و ئەویان بە نزیکەی دە هەزار کەسیان لە قەڵەم دەدات.

(65) N.A., F.O., 371/91252,British Embassy, Washington, D.C.29th February 1951, Secret, Air Bag, Ref.1683/22/51, From: B.A.B. Burrows, TO: L.A.C. Fry, Eastern Department, Foreign Office, London,S.W.1.

هەروەها ڕاپۆرتێکی نهێنیی پۆلیسی عێراقیش هەمان شت دەڵێن. هەرچۆن بێ نەمانتوانی زانیاریی دیکە دەربارەی ئەوەی کە ئایا ئەم چیرۆکە ڕاستە یا نا وەدەست بهێنین، بەڵام دووی مەسەلەکە دەکەوین، هەرچەندە حاڵی حازر ئێمە گومانمان هەیە.

٣- ئاگاداری ئەوەین کە دیسانەوە بابەتی ئێزگە کوردییەکان هێنراوەتەوە گۆڕێ، وێنەی نامەیەك دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەنێرم بۆ بێلێی"Beeley"[٦٦]، وێڕای بیر و بۆچوونی ئێستای خۆمان دەربارەی ئەو بابەتە.

٤- وەك لەو نامەیەدا کە ژمارەکەی«إی ٢٠/١٨٢٢» و ڕۆژی نۆزدەی کانوونی دووەم ناردوومە بۆ مونتاگۆ – پالۆکی[٦٧] وەزیری دەوڵەت دەیبینێ ئەو بایەخێکی شەخسیی داوەتە ناوچە کوردییەکان و بڕیاری داوە سوورییەکان ئاگادار بکرێن لەوەی لەوانەیە ڕەفتاری خەراپیان لەگەڵ کورددا خراپ بەسەریاندا بشکێتەوە.

---

(٦٦) ناوەکەی هەر وا بە ڕووتی نووسراوە، ئەوەش زۆر جاران لە بەڵگەنامەکاندا دووپات دەبێتەوە و بەو جۆرەیش دۆزینەوەی ژینامەی دیپلۆماسییەکی وا مەحاڵە.

(٦٧) ولیام هۆرەیس مۆنتاگۆ – پالۆك (Wiliam Horace Montagu- Pallock) ڕۆژی دوازدەی تەممووزی ساڵی ١٩٠٣ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، ڕۆژی بیست و چواری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٧ بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی و کرایە سکرتێری سێیەمی باڵوێزی بەریتانی لە ڕۆما، دوا بە دوای ئەوە وەك دیبلۆماسیی لە پراگ و بارەگای وەزارەت لە لەندەن کاریکردووە و ڕۆژی بیست و چواری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ پلەی سکرتێری دووەمی باڵوێزی پێدراو بەڕێز گوێزرایەوە بەلگراد و ڤیەنا و ئینجا لە دوازدەی نیسانی ساڵی ١٩٣٦دا هێنرایە بارەگای وەزارەت لە لەندەن و ڕۆژی بیست و سێی مایسی ساڵی ١٩٣٨ پلەی سکرتێری یەکەمی پێدراو ئینجا ڕۆژی بیست و حەوتی ساڵی ١٩٣٩ گوێزرایەوە ستۆکهۆڵم و لە ساڵی ١٩٤١یشەوە بووە جێگری باڵوێز (Charged Affairs) و لە گەلێك وڵات بەو جۆرە کاری کرد تاوەکو ساڵی ١٩٥٠ گوێزرایەوە دیمەشق و هەر لەوێ ڕۆژی هەشتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ بووە باڵوێزی «فوق العادة» بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book, 1959", London, PP. 356-357.

٥- هەمان کات پێویستیشە ئەمەریکاییەکان لەو مەترسییانە ئاگادار بکەین کە لەوانەیە لەو بایەخدانە یەکجار زۆرەیان بە کورد بکەوێتەوە. بۆکەر - Bowker بە شێوازێکی نافەرمی دەربارەی ئەم بابەتە لەگەڵ پالمەری کارمەندی باڵوێزخانەی ئەمەریکا لێرە گفتوگۆی کردووە. ئەو بە گشتی باسی بارودۆخەکەی کردووە و ئەو ڕێککەوتنەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠ی لە کاتی گفتوگۆکەیدا لەگەڵ میستەر کفیدا بیر کەوتۆتەوە کە ئێمە پێویستە وا نیشانی کورد نەدەین کە ئەوان بە شێوازێکی تایبەتی لە لایەن هێزێکی دەرەکییەوە دەپارێزرێن و بەو بۆنەیەشەوە بە جۆرێکی تایبەتی ئاماژەی بۆ گەشتەکەی میستەر جەستایس دۆگلاس کرد لە «کوردستانی -ک.م.» ئێران و مەیلی مولحەقی ئەمەریکایی لە بەغدا بۆ زیارەتی بەردەوامی ناوچە کوردییەکانی عێراق، ئەم قسانە سەرنجی پالمەریان ڕاکێشا و ئەویش لەو بڕوایەدایە پێویستە هەم کارمەندانی ئێمە و هەم کارمەندانی ئەمەریکا لەوە ئاگادار بکرێن کارێکی ئەوتۆ نەکەن کورد وا هەست بکەن ئێمە بایەخێکی یەکجار زۆریان پێ دەدەین، یان ئەوەی کوردەکان دەتوانن چاوەڕوانی حیمایەتێکی تایبەتیی ئێمە بن، هەروەها لەسەر ئەوەیش ڕێککەوتین پێویستە مەسەلەی کورد لە ژێر چاودێرییەکی بەردەوامدا بێت.

بۆکەر بەو بۆنەیەوە داوای لێی کردووە ئەمەریکاییەکان لە هەر هەواڵێکی نوێ دەربارەی بارودۆخی کورد ئاگادارمان بکەن.

٦- هەرچی دەربارەی عێراقیشە ئێمە هەست ناکەین دەتوانین هیچ هەنگاوێك بنێین بۆ چاککردنی باری کارگێڕیی ناوچە کوردییەکانی ئەو وڵاتە، ئێمە هیچ ڕاپۆرتێکمان دەربارەی بارودۆخی کارگێڕیی زۆر خراپی ناوچە کوردییەکانی عێراق وەرنەگرتووە، هەڵبەت بەختەوەر دەبین ئەگەر بێت و ئەمەریکاییەکان بتوانن هەر هەواڵێکمان دەربارەی ئەم بابەتە بدەنێ.

٧- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ باڵوێزان بێلی و شیپەرد و مۆنتاگۆ پالۆك و ڕاپ.

ئیمزا) (٦٨)

«بەشی ڕۆژهەلآت، گشتیی، ژمارە ٤٠٤ف، سیی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥١، چالاکییەکانی مەلا مستەفا» ناوونیشانی بەشی پێنجەمی ئەم فایلەیە؛ لە ناو ئەم بەشەشدا یەك بەڵگەنامەی نهێنیی تێدایە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

ژمارە٤٠٤ف،

بۆ: میستەر ڕهۆدس (٦٩)،

بەشی ڕۆژ هەڵآت،

لە: ب. بلەندێلەوە،

٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٥١.

نیشانە بە نامەی ژمارە إی ٢٣/١٨٢٢ی ڕۆژی چواردەی کانوونی یەکەم.

لە مانگی ئەیلوولی ڕابردوو دەنگوباوێکی لەو بابەتە دەربارەی نیازەکانی مەلامستەفا لە ناوچە کوردەوارییە عیراقییەکاندا بڵاو بۆوە. سەرەتای ئەم مانگەش دیسانەوە دەنگوباوێکی هەمان جۆر لە نێویاندا سەری هەڵدایەوە. ئێستاکە «عیراقییەکان-ك.م.» لە ڕێگەی تارانەوە بەوەیان زانیوە کە هەرچەندە ئەو دەنگوباوە لە ناوچە کوردییەکانی ئێراندا بڵاو نییە، بەڵام کاربەدەستانی ئەو وڵاتە ئاگاداری ئەوەن کە شتێکی وەها لە عیراق لە سەر

---

68) N.A., F.O., 371/91252, From: Mr.G.W.Furlonge, To:B.A.B.Burrows, Esq., C.M.G., Washington, No.E 182/14,23 February, 1951.

(٦٩) دووپاتی دەکەمەوە بە ڕاستی دۆزینەوەی ژینامەی ئەو جۆرە دیپلۆماسییانە کارێکی بێ ئەندازە زەحمەتە، بە وێنە تەنها لە بەرگی ساڵی ١٩٨٠ی (ئەمانە کێن)دا سیازدە جاران ناوی دیبلۆماسییەکی بەریتانی هاتووە کە بنەماڵەکەیان ناوی ڕهۆدس "Rhodes"ە، بەڵام کەسێکیان بە خوێی چێشتیش پێوەندییان نە بە کورد و کوردستانەوەو نە بە عیراق و ئێران و تورکیا و سووریا و یەکیەتی سۆڤیەتەوە هەیە بڕوانە:

"Who`s Who 1980. An Annual Biographical Dictionary", London, PP.2135-2136.

ێری خەڵکییە. بە پێی ڕاپۆرتی ئاگاداران مانگی تەشرینی دووەمی ڕابردوو ئەفسەری پێوەندییەکانی کۆمپانیای نەوتی عیراق لە کەرکووک بە یاریدەری مولحەقی سەربازیی «بەریتانی —ك.م.» لە بەغدا گوتووە مەلا مستەفا حەز دەکات بگەڕێتەوە عیراق، تایبەت دوای ئەوەی شێخ ئەحمەدی برای لەبەندیخانە ئازاد کرا، لەبەر ئەوەیش کە نە ڕۆژ و نە سەرچاوەی ئەو هەواڵە نەزانراون، بۆیەکا بە دوودڵییەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ.

ئیمزا

ب. بلەندێل

٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٥١)[٧٠]

بەشی شەشەمی هەمان فایل دیسانەوە بە ناونیشانی «چالاکییەکانی مەلا مستەفا»وەیە، بەلاّم ئەمجارەیان بریتییە لە دوو برووسکەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرەوە بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن لەگەڵ جیاوازییەکی کەمدا لە نێوان ناوەڕۆکیاندا، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو دوو برووسکەیەیە:

(ژمارە ٥١/٣/١٨٢٧،

لە ئەنقەرەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

بۆ سێر نۆئێل چارلێس،

ژمارە٩،

١٩ی شوباتی ١٩٥١،

وێنەی بۆ:

بەغدا ژمارە ١،

تاران ژمارە ١،

نهێنی.

---

(70) N.A., F.O., 371/91252, Secret, No.404/F, To: Mr. Rhodes, Eastern Department, From: B.Blundell, 30th January, 1951.

وەزارەتـی هەنـدەرانی تورکیـا ڕاپگەیانـد کـە دەنگوبـاوی «گەڕانـەوەی بارزانی – ک.م.» بە شێوازێکی غامیز گەیشتە تورك، ڕاستییەکەشی شتێکی کەم لە دەنگوباو زۆرتر بوو، لەبەر ئەوەیش کە ڕوودانـی بابـەتێکی وەهـا زۆر لە واقیعەوە دوور نییە، حوکمەتی تورکیا هەواڵەکەی گەیاندە عیراقییـەکان و پێی ڕاگەیانـدن پێویسـتە بـە وردی لێـی بکۆڵرێتـەوە، وەزارەتـی هەنـدەرانی «تورکیـا–ک.م.» کـە لـەم دواییانـەدا داوای هەواڵـەکانی ئـەو بابەتـەی بـە تۆمارکراوی کرد، بە وردی دووی مەسەلەکە دەکەوێ)[٧١].

ئەمـەی لای خـوارەوەیش دەقـی وەرگێڕانـی هـەمان برووسـکەیە بـە جیاوازییەکانێوە:

(لە ڕێگای جانتای تایبەتییەوە،

لە ئەنقەرەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

بۆ سێر ن. چارلێس،

ژمارە ٩،

١٩ی شوباتی ١٩٥١،

ڕۆژی گەیشتنی: ٢٣ی شوباتی ١٩٥١،

نهێنی.

ئەمـە برووسـکەی ژمـارە نۆیـە کـە ڕۆژی نـۆزدەی شـوبات نێـردراوە بـۆ وەزارەتی هەندەران بۆ ئاگاداری وێنەی لێ دەدرێتە بەغدا و تاران.

نیشانە بە بڕگەی دووی برووسکەی ژمـارە شەشـی بەغـدا کـە دەربـارەی مەلا مستەفایە و نێـردراوە بـۆ وەزارەتـی هەنـدەرانی «حوکمـەتی بـەریتانی–ک.م.» وەزارەتـی هەنـدەرانی تورکیـا ڕاپگەیانـد کـە ئـەو دەنگوبـاوە بـە شێوازێکی غامیز گەیشتە تورك، ڕاستێکەشی شتێکی کەم لە دەنگوباو زۆرتـر بوو، لەبەر ئەوەیش کە ڕوودانی بابەتێکی وەها زۆر لـە واقیعـەوە دوور نییـە،

---

[٧١] Ibid, No. 1827/3/51, From Ankara, To Foreign Office, Sir Noel Charles, No.9 Saving, Dated:19th February,1951, Reported To: Baghdad No.1,Saving, Tehran, No.1, Saving, Confidential, P.16.

حوكمەتی توركیا هەواڵەكەی گەیاندە عیراقییەكان و پێی ڕاگەیاندن پێویستە بە وردی لێی بكۆڵرێتەوە. وەزارەتی هەندەرانی «توركیا–ك.م.» كە لەم دواییانەدا داوای هەواڵەكانی ئەو بابەتەی بە تۆماركراوی كرد، بە وردی دووی مەسەلەكە دەكەوێ.

وێنەی لێ دەنێردرێ بۆ:

بەشی ڕۆژ هەڵات،

سكرتارییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،

بەشی پێوەندییە ئابوورییەكان) (٧٢).

بەشی حەوتەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەكی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران كە ڕۆژی شازدەی مارتی ساڵی ١٩٥١ ناردوویەتی بۆ سكرتارییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی سەر بە وەزارەتی هەندەرانی حوكمەتی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی بڕیاری «ڕێكخراوی نێو دەوڵەتیی پەناهەندەكان» International Refugee Organisation كە لقی خۆی لە ئێران دابخات(٧٣).

بەشی هەشتەمی ئەم فایلە، زۆر گرنگە، بریتییە لە ڕاپۆرتێكی دووردرێژی نهێنیی نۆ لاپەڕەیی كە «بەشی لێكۆڵینەوە»ی وەزارەتی هەندەرانی حوكمەتی بەریتانی ڕۆژی دووی نیسانی ساڵی ١٩٥١ بەم ناونیشانەوە «كێشەی كورد لە نێوان ساڵانی ١٩٤٦ و ١٩٥٠»دا ئامادەی كردووە، شایانی باسە ڕاپۆرتەكە لە سی و شەش خاڵی چڕوپڕ پێكهاتووە كە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

---

(72) Ibid, By Confidetial Bag, From Ankara, To Forein Office, Sir N. Charles, No.9. Saving, 19th February, 1951, R.23 February, 1951, Confidetial, P.17.

(73) Ibid, British Embassy, Tehran, Confidential, No.18203/3/51, 16th Mar,1951, To: Middle East Secretriat Foreign Office, London S.W.1, P.19.

(نهێنی،

م. إی ٥١/٨٩،

کێشەی کورد لە نێوان ساڵانی ١٩٤٦ و ١٩٥٠دا



پێشەوا
قازی محەمەد

ئێران،

ساڵی ١٩٤٦

١- دوارۆژی کوردی ئێران لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا زۆر بە توندی بە دوارۆژی «کۆماری ئۆتۆنۆمیی ئازەربایجان» بە ڕەهبەریی پیشەوەرییەوە بەسترابوو، هەرچەندە ئەو ڕێککەوتنەی نێوان پیشەوەری و قازی محەمەدی ڕەهبەری کوردی مەهاباد «دەربارەی بڕوانە بڕگەی بیست و یەکەمی نامەی نهێنیی ژمارە ١٧٠٨١ ، هیچ کات کاریگەر نەبوو، پێوەندیی نێوان ئەو دوو «حوکمەتە» [٧٤] هەرگیز پێوەندییەکی ئاسان نەبوو. بارودۆخی ناوخۆی ئازەربایجان و مەیلی زۆری کوردایەتی و فشاری حوکمەتی ئێران بۆ سەر هەردووک لا ئەو ڕێککەوتنەی نێوان ئازەر و کوردیان کردە پارچە کاغەزێکی بێ گیان، حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ قازی محەمەد چووە زیارەتی تاران و بە پێی ڕاپۆرتەکان دەرکەوت کە دەیەویست حوکمەتی ئێران قایل بکات «سنووری کورد» [٧٥] بە جۆرێک فراوان بکرێ تا بگاتە شاپوور «سەلماس»، بەلام سەرەک وەزیران سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ کورد وەک بەشێک لە دانیشتووانی

---

[٧٤] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی حوکمەت "State" بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە چونکە، گوایە ئەو حوکمەتە دەستکرد بووە.

[٧٥] بە هەمان دەستوور ڕستەی «سنووری کورد» لە دەقی بەڵگەنامەکەدا خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە، ئەوەی چەند جارێکی دیکە دووپات بۆتەوە لەگەڵ چەند وشە و زاراوێکی وەک کۆماری مەهاباد و کۆماری ئازەربایجان، ئەوانەی بە پێویستمان نەزانی هەموو جارێك ئاماژەیان بۆ بکەین.

ئازەربایجان مامەڵە بکرێن و ئەوەیش بکرێتە یەکێك لەو بەندانەی ئەو ڕێککەوتننامەیەی قازی ڕۆژی چواردەی حوزەیرانی «ساڵی ١٩٤٦-ك.م.» لەگەڵ «پارتی دیموکراتی ئازەربایجان»دا ئیمزای کردبوو، هەرچۆن بێ کوردەکانی ڕەزائییە «ورمێ-ك.م.» یان لەسەر حسێبی ئازەرییەکان داگیرکردووە[٧٦]، بەرانبەر بەوە، وەك دەڵێن، حوکمەتی ئێران ڕێگەی داوە ئازەرییەکان سەردەشت و بانە و تاکاو «تاکئاب Takab» داگیر بکەن، وەك دەبینین هیچ کام لەم بڕیارانە کاردانەوەیەکی ئەوتۆیان لەسەر هەڵوێستی کورد نەبووە.

٢- بەهاری ساڵی ١٩٤٦ زنجیرەیەك شەڕی پچرپچڕی لە نێوان کورد و هێزەکانی حوکمەتی ئێراندا بە خۆوە بینی کە مەلا مستەفای بارزان ڕۆڵی هەرە دوژمنکاریی دیاری لەو شەڕانەدا گێڕا. دەوروبەری کۆتایی هاوین بارودۆخ و دۆسیەی بارزانی بەرەو لێژی چوو، وا دەرکەوت بارزانی نیازییە بگەڕێتەوە بۆ عێراق.

٣- ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٦ ئەوە ساغ بۆوە کە «کۆمارە کوردییەکە» بە هۆی کەمیی پارە و پوول و خراپیی تەنزیمەوە گلۆڵەی کەوتۆتە لێژی. سەرکردەکانی کورد بە لانی کەمەوە بەسەر سێ گرووپدا دابەش بووبوون، ئەوانەی سەر بە قازی محەمەد بوون و ئەوانەی دژی قازی محەمەد بوون، لەگەڵ پەنابەرە بارزانییەکان بە ڕەهبەریی مەلا مستەفا، ئەمانە تەواو سەربەخۆ بوون، سەر بە هیچ کام لەم دوو گرووپە نەبوون. هەڵبەت تا دەهات هۆکانی پێوەندیی مەلا مستەفا بە کاربەدەستە سۆڤیەتەکانەوە زۆرتر

---

[٧٦] زۆرینەی دانیشتوانی ورمێ، تایبەت دەوروبەری، کورد و ئاشووریین، هەر زوو بە نیازی تواندنەوە و نانەوەی دووبەرەکیی حوکمەتی پەهلەوی ناوی ورمێی کردە ڕەزائییە، واتا بە ناوی ڕەزا شاوە ناوی نا، وێڕای ئەوە بەشێکی زۆری لە کوردستانی لە ڕووی کارگێڕییەوە خستە سەر ئوستانی ئازەربایجان، شایەنی باسە ورمێ شوێنێکی دیاری لە خەباتی ڕزگاریخوازیی کورددا هەیە، بنکەی سەرەکیی سمکۆی شکاك بوو، سمکۆ لە ورمێ ڕۆژنامەی «ڕۆژی کورد شەوی عەجەم»ی دەرکرد.

کەڵکە دەبوون، هەرچی ئاغا سەربەخۆکانیشن لە ڕوانگەی ئیسلامەتییەوە دژ بە کۆمۆنیزم بوون، لە کاتێکدا قازی محەمەد و مەلا مستەفا لە بەرەی سەر بە کۆمۆنیزمدا بوون. لەگەڵ ئەوەیشدا ئاغاکان لارییان لەوە نەبوو چەک و پارە لە ڕووس وەربگرن، یا لە کاتی پێویستدا کەمێك یاریدەی قازی محەمەد بدەن، لەو هەنگاوانەیدا کە لە بەرژەوەندیی سۆڤیەت بوون، تایبەت لەبەر ئەوەیش کۆمەکی سۆڤیەت لە ڕێگەی قازییەوە دەهات.

٤- بێ گومان بارودۆخی ئازەربایجان زۆر بە توندی کاری دەکردە سەر وەزعی کورد. ئەنجامی وتووێژە دوور و درێژەکانی نێوان دیموکراتەکانی تەورێز و حوکمەتی ئێران بریتی بوو لە بەخشینی ئۆتۆنۆمییەکی تەسك بە ناوچەی ئازەربایجان، بەڵام بەرهەڵستی کردنی بەردەوامی «حوکمەتی» تەورێز دژی دەسەڵاتی تاران ئەگەری هێرشی سەربازیی هێنابووە گۆڕێوە، هەڕەشەی ڕووسیا دژی ڕەفتارێکی وەها هیچ دادی نەدا و حوکمەتی ئێران ئەو هەڕەشەیەی خستە پشتگوێ، تەورێز ڕۆژی دوازدەی کانوونی دووەمی «ساڵی ١٩٤٦-ك.م.» داگیرکرا، ئازەرییەکان برووسکەی پشتگیرییان بۆ شا و سەرەك وەزیران نارد و پیشەوەریش هەڵهات بۆ ڕووسیا.

٥- کاربەدەستە سۆڤیەتییەکان کە هیچ هەنگاوێکیان نەنا بۆ جێبەجێکردنی هەڕەشەکەیان هەمان کات گشت ئەو یاریدانەشیان وەستاند کە جاران پێشکەشی قازی محەمەدیان دەکرد، ئەوەی قازی محەمەدی ناچار کرد لە بارەگای سەرکردایەتی سوپای ئێرانی لە میاندواو خۆی بدات بە دەستەوە، بەو جۆرە «ڕژێمەکەیشی» چووە خانەی نەبووانەوە، لە مەهاباد قازی پێشکەش بە دادگا کرا و سەرەتای شوباتی ساڵی ١٩٤٧[٧٧] لە گەڵ ژمارەیەك لە یاریدەدەرانی لە سێدارە دران[٧٨].

---

(٧٧) قازی محەمەد و ئەبولقاسم سەدری قازیی برای و محەمەد حوسەین خانی سەیفی قازی. کە ئامۆزای قازی محەمەد بوو، ڕۆژی سی و یەکی مارتی ساڵی ١٩٤٧ لە مەیدانی چوار چرای مەهاباد لە سێدارە دران.

(٧٨) وەك لە پەراوێزی پێشوودا گوتمان تەنها سەدری قازی و سەیفی قازی لەگەڵ قازی

٦- سەرکەوتنی حوکمەتی ئێران بەسەر کورددا بووە هۆی دروستبوونی مەترسی لای حوکمەتی عیراق نەبا ئەو سەرکەوتنە ببێتە هۆی ئەوەی مەلا مستەفا لە خاکی ئێران دوور بخرێتەوە ناو خاکی عیراق و ئەوەیش ببێتە هۆی ئاشتبوونەوەی هۆزە کوردەکانی عیراق، بۆیەکا کاربەدەستانی عیراق فشاریان خستە سەر حوکمەتی ئێران بۆ ئەوەی گشت توانای بخاتە گەڕ بۆ گرتنی مەلا مستەفا و ئەو ئەفسەرە عیراقییە هەڵهاتووانەی دابوویانە پاڵی و تەسلیمی عیراقیان بکات. مەلا مستەفا سەرەتای کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧ خۆی دا بە دەست تارانەوە و گوێزرایەوە تاران و ماوەیەك لەوێ لە ژێر چاودێریدا مایەوە، زۆربەی پیاوەکانیشی لە نەغەدە بوون، حوکمەتی ئێران تەسلیمی عیراقی نەکرد و پێشنیازی بۆی کرد گشت بارزانییەکان یان ئەگەر ئەوە مومکین نەبوو ئەوا خۆی و سەد لە پیاوە هەرە نزیکەکانی جنسیەی ئێرانیان بدەنێ و بەشێك لە زەوییەکانی شا کە دەوروبەری سی میل لەولای باشووری - ڕۆژهەڵاتی تارانەوەیە بەسەریاندا دابەش بکرێ و شەش مانگی یەکەم لە لایەن حوکمەتەوە کۆمەکییان بکرێ، ئەگەر هاتوو بەوەیش قایل نەبوون ئەوساکە لە ئێران دوور بخرێنەوە، بەڵام بێ ئەوەی چەکیان داماڵرێ، یان تەسلیمی عیراق بکرێنەوە، مەلا مستەفا ئەم پێشنیازەی ڕەت کردەوە و دەوروبەری کۆتایی شوباتی «ساڵی ١٩٤٧-ك.م.» بەر لەوەی بەفر بتوێتەوە هێدی هێدی خۆی و پیاوەکانی ڕوویان کردە سنووری عیراق و لەوەی دەکرد بەرەو تورکیا هەمان ڕێگە بگرنەبەر کە تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ لێوەی هەڵهاتن، بەڵام بە پێی ڕاپۆرتەکان دوای یەك حەفتە گەڕانەوە و لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا پێکیان دادا.

---

محەمەددا لە سێدارە دران، بەپێی سەرچاوەکان قازی محەمەد و سەیفی قازی زۆر ئازایانە چوونەتە سەر پای قەنارە، سەیفی قازی پیاوێکی کەتە بوو، پەتی قەنارەکە پچڕا بوو، بەڵام جارێکی دیکە هەڵیانواسیبۆوە.

هەر چۆن بێ «بارزانییەکان—ک.م.» ناچار بوون پاشەکشە بکەن و بچنە ناو خاکی عیراقەوە تەنها خودی مەلا مستەفا خۆی و ژمارەیەکی کەمیان نەبێ[79] کە مایسی ساڵی ١٩٤٧ ڕایانکردە ناو خاکی سۆڤیەت.

٧- کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٤٦ بارودۆخی باکووری — ڕۆژئاوای ئێران بە جارێك شڵەژا، هێزەکانی سوپا دەستیان کردە داگیرکردنی سەردەشت و بانە و سەقز و هەڵمەتی داماڵینی چەکی هۆزە کوردەکان دەستی پێکرد. تەنانەت بەر لەوەیش قازی محەمەد خۆی بدات بە دەست حوکمەتی ئێرانەوە دەسەڵاتی بەسەر هۆزە کوردەکاندا لەق بووبوو، سەرکردەکانی مامش و مەنگوڕ و دیبوکری بڕیاریان دابوو بدەنە پاڵ حوکمەتی ئێران، بەڵام وا دیارە جیاوازیی بیروڕا لە نێوان هۆزەکان خۆیاندا هەبوو.

### ساڵی ١٩٤٧

٨- دەوروبەری کۆتایی حوزەیران و بەر لەوەی مەلا مستەفا و لایەنگرەکانی بکەونە کێشەنانەوە بۆ ئێران زۆربەی ئەندامانی هۆزی بارزان سەرەتای مانگی مایس ئێرانیان جێ هێشت، مەلا مستەفاش لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە لایەنگرانی، کە شەشیان ئەفسەری هەڵهاتووی سوپای عیراق بوون چوونە ناو خاکی ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە[80] بەر لەوەی مانگی

[79] ژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵ بارزانیدا چوونە ناو خاکی سۆڤیەتەوە کەم نەبوو.

[80] ئەو ئەفسەرە کوردە عیراقییانەی دایانە پاڵ ڕاپەڕینی کوردی باشووری لە ساڵی ١٩٤٥ بە ڕەهبەریی بارزانیی ئەم حەوت ئەفسەرە بوون: عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی و میرحاج و نووریی ئەحمەدی تەها و جەلالی ئەمین بەگ، لەو حەوتە تەنها میرحاج لەگەڵ بارزانیدا چووە ناو خاکی سۆڤیەت، ئەوانی دیکەیان گەڕانەوە عیراق، جەلالی ئەمین بەگ ونووریی ئەحمەدی تەها خۆیان نەدا بە دەستەوە و دڵسۆزانی وەك شێخ لەتیفی شێخ مەحموود تاوەکو بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ داڵدەیان دان، ئەو چوارەکەی دیکەیان کە خۆیان بەدەستەوە دا، واتا عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی لە سێدارە دران هەرچەندە هەوڵێکی زۆر لە لایەن جەماوەر و

مـایس کۆتـایی بـێ حـوکمی عـورفی لـە کوردسـتانی ئێـران لادرا و بـە پێـی ڕاپۆرتەکان کاری دامـاڵینی چەکی هـۆزە کوردەکـانیش بـە شـێوازێکی بـاش جێبەجێ کرا. هەروەها شا بڕیاری بەخشینی بۆ ئـەو هۆزانـە دەرکـرد کـە بـە کاری دوژمنکاری تاوانبار کرابوون.

دوا بەدوای ئەوە باری ئاسایشی ناوچەکە تاوەکو کۆتایی ساڵی ١٩٤٧ بە باشی چووە سەر.

٩- دەنگوباوی گەڕانەی مەلا مستەفا لەگەڵ هێزێکی چەکداردا بۆ عـێراق جارجارە نەبێ بە درێژایی ساڵی ١٩٤٨ لە ئارادا بوو. هەر چۆن بێ بارودۆخی کوردستانی ئێران هێمن بوو، تەنها ئەو هێرشە نەبێ کە کرایە سـەر جـوانڕۆ و ئەویش وا دیارە ڕووداوێکی گرنگ نییە، تەنانـەت زانیارییـەکانیش دەربـارەی درەنگانێك زانراوە.

## ساڵی ١٩٤٩

١٠- سـەرەتای سـاڵی ١٩٤٩ چـەند هـەوڵێك درا بـۆ زیندووکردنـەوەی بزووتنەوەی نەتـەوەیی کـورد لـە مـەهاباد لـە ڕێگـەی بڵاوکردنـەوەی بابـەتی پڕۆپاگەنـدە بـۆی لـە لایـەن کـوردە «دیمـوکرات»ەکانـەوە، کـە لەوانەیـە «ڕزگـاری»یـان پـەخش کردبـێ، بۆیـەکا کاربەدەسـتە ئێرانییـەکان شـوبات و مارت و نیسان چەند هەڵمەتێکی گرتنیان کرد، ئەو کارەی بە پێی یـەکێك لـە زانیارییەکان بەسترایەوە بە هەوڵەکەی تیرۆرکردنی شاوە لە مانگی شـوباتدا.

---

گەورەپیاوانی وەك ئەمین زەکی بەگ و تۆفیق وەهبی و عەلی کەمال و عەلائەدین سـەجادی و ماجید مستەفا و مەعرووف جیاوك و کەسانی دیکـەوە درا بـۆ قوتـار کردنیـان لـە پـەتی قەنارە، لە سێدارەدانی ئەو چوار ئەفسەرە ڕقی پیرۆزی جەماوەری کوردستانی هەڵساند و زنجیرەیەك خۆنیشاندان شارەکانی کوردستانی گرتەوە و ناشتنی هەرچواریان بـووە ڕۆژی ماتەمینی سەرجەمی کورد، وێنەکانی ئەو چوار ئەفسـەرەیش تـاوەکو شۆڕشـی چـواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ بە نهێنی دەفرۆشران و باربووی «پارتی دیموکراتی کوردسـتان»یـان پێ دەکرا.

هەرچەندە هەردووك هۆزی جەلالی و شكاك تا ڕادەیەك بە نهێنی دژی حوكمەتی ئێران چالاكییان دەنواند، بەلأم هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نییە كە كورد دەستیان لە تاوانەكەی هەوڵی «تیرۆركردنی شادا-ك.م.» هەبووبێ. هەر چۆن بێ وا پێدەچێ ژمارەیەك لە هۆزەكانی «كوردستان-ك.م.» بە ئاگاداریی دەسەلاتدارانی ئێران هەندێك كاری تایبەت ڕادەپەرموێنن.

## ساڵی ١٩٥٠

١١- زستانی ساڵی ١٩٤٩- ١٩٥٠ هێمنی باڵی كێشابوو بەسەر ناوچەكەدا، ئەو دەنگوباوەیش لە مانگەكانی یەكەمی ساڵی ١٩٥٠ دەربارەی ڕوودانی هەراوبگر بەر لەوەی هاوین دەست پێبكات، وردە وردە ڕەوییەوە. تەنانەت «كۆمەڵە»ش چالاكییەكی ئەوتۆی نەنواند، هەرچی ئەندامانی هۆزەكانن بەوە دڵخۆشن كە زستانەكەی سەخت نەبوو، وێڕای ئەوەی چاوەڕوانی دروێنەیەكی بە پیت و بەرەكەتن.

١٢- «پارتیی ئیسلامی كوردی» لە تاران سەری هەڵداوە، ئەو سەرەك هۆزە كوردانەی مانگی مایس بە بۆنەی هێنانەوەی تەرمی ڕەزا شاوە[٨١] هاتوونە پایتەخت باسی ئەو پارتییەیان كردووە.

١٣- دوو شارەزای بێ لایەنی ڕاگەیاندنی بەریتانی كە مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٠ گەشتێكیان بەناو كوردستانی ئێراندا كردووە ڕاپۆرتێكی گرنگیان دەربارەی هەڵوێستی كورد ئامادە كردووە كە ئەم خاڵانەی لای خوارەوەیان تێدایە:.

«أ- هەموو ئەو كەسانەی كە لە ناوچە كوردییەكانی باكووری سەقز دەژین كە لێمان پرسیون بە بیروباوەڕ لەگەڵ سەربەخۆییدان، هۆكانی ئەوەیش بە لایانەوە بریتین لە جیاوازیی نەتەوەیی و گەندەڵی و

---

(٨١) ساڵی ١٩٤١ دوای گرتنی ئێران لە لایەن هاوپەیمانەكانەوە ڕەزا شای پەهلەوی بە بەخسیری ڕەوانەی دوورگەی ڕۆدیسیا كرا و دوای كۆچی دوایی تەرمەكەی هێنرایەوە بۆ تاران.

بەریتیلخۆریی کاربەدەستە سیڤیل و سەربازییەکانی حوکمەتی ئێران کە وەك دەڵێن زۆر کەمتەرخەمن بۆ بەرەو پێشبردنی ناوچە کوردییەکان.

ب- لەگەڵ ئەو هەموو ڕقوکینەیەش کە ئەم جۆرە مامەڵەیە دروستی کردوون، هەرچۆن بێ ئێستا نیشانەیەکی ئەوتۆ لە ئارادا نییە ئاماژە بۆ دروستبوونی پلانی کاریگەر «عەمەلی»، یان ئاماژە بۆ بوونی ڕێکخراوێکی چالاك بۆ داواکردنی سەربەخۆیی بکات، ئەمەیش هەمان کات بیر و بۆچوونی فەرماندە سەربازییەکانی مەهابادە، پتر لەوەیش هیچ جۆرە نیشانەیەکی بوونی هیچ دروشمێکی پان- کوردستانیزم لە ئارادا نییە، وێڕای ئەوەی وا دیارە کێشەکانی کوردی تورکیا و سووریا و عێراق کاریگەرییەکی کەم، یاوەخود هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر ناوچە کوردەوارییەکانی ئێراندا نییە[٨٢].

ج- لە ناوچەکانی باشووری سەقزیش هەمان گازندە و ناڕەزایی دژی دەزگا کارگێڕییەکانی ئێران هەبوون وەك ئەوانەی زۆربەی ناوچەکانی باکووری سەقزیان گرتبۆوە، بەڵام لێرە وا هەست دەکرا خەڵکەکەی دەیانەوێ وەها لە کاربەدەستانی ئێران بکەن هەست بە مەترسییەکانی خودی ئەو ناڕەزاییە بکەن وەك لە پێویستیی سەربەخۆیی، زیارەتی ئەم چەندانەی دوایی شا [٨٣] بۆ ئەم ناوچەیە زیارەتێکی چاك بوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو گفتانەی کە داونی جێبەجێ بکرێن».

---

[٨٢] بێ گومان لەگەڵ بۆچوونێکی لەو بابەتە نین کە تەنانەت دژی بۆچوونەکانی خودی بەڵگەنامە بەریتانییە نهێنییەکانە، هەڵبەت لەو ڕۆژگارەدا لەبەر چاودێریی وردی ساڤاك و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی دیکەی شا هەر گەشتیارێك بچووبایە کوردستانی ئێران نەیدەتوانی بە ئاسانی بگاتە هەموو لایەنە شاردراوەکانی هەستی خەڵك و بزووتنەوەی نهێنیی کوردەواری.

[٨٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەم دوو دێرە وەك پەراوێز تۆمار کراوە:

«مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٠ شا، وا پێدەچێ، زیارەتێکی سەرکەوتووی بۆ هەمەدان و کرمانشا و باشووری کوردستان کرد». شایانی باسە هەمەدان زوو ناوی ئەکباتانا بوو

١٤- مـانگی مایسـی «سـاڵی ١٩٥٠-ك.م.»دوو بنكـەی سـەربازیی لـە ناوچەی جوانڕۆ دامەزرێنران، یەكسەر ئەوەیش ئاشكرا بوو كـە ئـەو هـەنگاوە بەشێكە لە سیاسەتێكی گشتیی بۆ گەیاندنی دەسـەڵاتی سـەربازیی دەوڵـەت تـا ناوجەرگـەی ناوچـە هۆزایەتییـەكان. هەرچـۆن بـێ ئـەو هـەرا بچـووكەی جوانڕۆییـەكان وای لـە هـۆزی ئیمـامی كـرد وا هەسـت بكـات فەرمانـدەی ناوچەكە بیـەوێ چـەكەكانی ئـەوانیش دامـاڵێ، ئـەو هـۆزە قایـل نـەبوو چـەك بكـرێن و ڕۆژی دووی ئـەیلوولی «سـاڵی ١٩٥٠-ك.م.» هێرشـیان بـردە سـەر سەربازگەی پڵنگان، ژمارەیەك لە هۆزە ناحەزەكانی جوانڕۆ كـەمێك یاریـدەی سوپایان دا و بەو جۆرە تا مانگی تەشرینی یەكەم كۆتایی بە هەراكە هێنـرا و جوانڕۆییـەكان سـەد تفـەنگیان تەسلیم كـرد. ئێزگـەی مۆسـكۆ و ژمارەیـەك ڕۆژنامە ئەو ڕووداوەیان گەورە كرد.

## عیراق

### ساڵی ١٩٤٦ – ١٩٤٧

١٥- لـە سـەرەوە پوختەیـەكی بابـەتی بزووتنـەوە سـەربازییەكانی حوكمەتی ئێران دژی مەلا مستەفامان باس كرد لە بـواری هەوڵـەكانی ئێرانـدا بۆ ئارامكردنەوەی ناوچەی ئازەربایجان. لەگەڵ ئەو ترسە بەردەوامەیشدا كـە لەوانەیە گەڕانەوەی بارزانییەكان ببێتە هۆی دروستبوونەوەی كێشە بۆ عیراق بەڵام ئەوەی لە ئێران دیيان و ئەو زیانانەی سوپای ئێران پێی گەیاندن بوونە دەرس بۆیان و نیسانی سـاڵی ١٩٤٧ ژمارەیـەكی زۆریـان سنووری عیراقیـان بڕی و بێ شەرت و شرووت خۆیان دا بـە دەسـتەوە و دوای ئـەوانیش دەسـتە دەسـتەیان هاتنـەوە، شـێوازی هاتنـەوە و مەرجـەكانی خۆبەدەسـتەوەدانی بارزانییەكان بوونە مایـەی ڕەخنـەگرتنی ڕۆژنامـەكانی بەغـدا، ڕۆژی پـازدەی

---

پایتەختی دەوڵەتی میدی بوو، وێڕای ئەوە كوردی شاری كرمانشا و دەوروبـەری شـیعەن و ئەوەیش كاری نەكردۆتە سەر هەستی كوردایەتییان.

«نیسانی ساڵی ١٩٤٧-ك.م.» بارزانییەکان دەستیان کردە تەسلیمکردنی چەکەکانیان کە بریتی بوون لە سێ تۆپ و نزیکەی پەنجا ڕەشاش و دەوروبەری پێنج سەد تاوەکو شەش سەد تفەنگ و ژمارەیەکی کەم دەمانچە، وا پێدەچێ بەر لە گەڕانەوەی بارزانییەکان چەکێکی زۆر بەنهێنی ئاودیو کرابێتە ناو خاکی عیراقەوە، ژمارەی بارزانییە گەڕاوەکانیش بریتییە لە نزیکەی شەش هەزار پیاو و ئافرەت و منداڵ، هەروەها چوار لە ئەفسەرە هەڵهاتووەکانیش خۆیان دا بە دەستەوە و درانە دادگا و ڕۆژی نۆی[٨٤] حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ لە سێدارە دران.

### ساڵی ١٩٤٨

١٦- نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٧ و ساڵی ١٩٤٨ بارودۆخی کوردستانی عیراق هێمن بوو، دەنگوباوی نیازی گەڕانەوەی مەلا مستەفا سەرەتای ساڵی ١٩٤٨ دەستی پێ کردەوە، هاوکاتبوونی ئەو دەنگوباوە لەگەڵ جەنگی فەلەستیندا هێندەی دیکە بووە مایەی شپرزەبوونی حوکمەتی عیراق، زنجیرەیەك خۆنیشاندان لە شاری سلێمانی دەستی پێ کرد، ئەو خۆنیشاندانانە هاوکات بوون لەگەڵ ئاژاوەکانی شوبات و ئەیلولدا دژی پەیمانی پۆرتسمۆث و بانگدانی حوکمی عورفیدا و هۆکانیان کوردایەتی نەبوون.

١٧- ساڵی ١٩٤٩ هیچ چالاکییەکی هۆزەکانی «کوردستانی -ك.م.» بەخۆوە نەدی، بەڵام تاوەکو کۆتایی هاوینی ئەو ساڵە ڕاپۆرتەکان باسی ئاڵوگۆڕکردنی نامەیان لە نێوان مەلا مستەفا و ئاغا کوردەکاندا دەکرد، هەر ئەوساکە نۆرەی ئەو چیرۆکەش هات کە نیاز وایە بە پەرەشووت خەڵك بگەیێننە ناو خاکی کوردستان، تایبەت دوای ئەوەی دەنگوباوێك بڵاو بۆوە

---

[٨٤] ئەو چوار ئەفسەرە ڕۆژی نۆزدەی حوزەیران نەك نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ لە سێدارە دران، دوور نییە هەڵەی چاپ بێ.

که گوایه شەش کەس بە پەڕەشووت گەیێنراون. لەمەوە دیارە ئەو هەواڵانە، یان ئەوانەی بڵاویان دەکەنەوە بێ هوودە بوون لە دەنگوباوی گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆیەکا دەستیان داوەتە دروستکردنی شتی وەك ئەو داستان ئاساییە دەربارەی ئەو بابەتە، هەرچۆن بێ مانگی مایس ئینزاری حوکمەتی عیراق کرا کە بەڕاستی گەڕانەوەی مەلا مستەفا کاری ئانو سەعاتە، بەڵام دەرکەوت ئەو مەترسییانە بێ بنەمایە و بەو جۆرە ساڵ کۆتایی هات بێ هیچ هەڕەشەیەکی دیکە.

سالی ۱۹۵۰

۱۸- لە نێوان نیسان و حوزەیرانی ساڵی ۱۹۵۰دا ئەو دەنگوباوە کەوتەوە کە گوایە مەلا مستەفا پێوەندیی بە ژمارەیەك ڕەهبەری کوردەوە کردووە و چەکیش لە ڕێگەی ئێرانەوە ئاودیوی عیراق کراوە، هەمان کات بە پێی ڕاپۆرتی پۆلیسی عیراق لە مانگی تەممووزدا دەنگوباوێکی وەها بڵاوبۆوە کە گوایە مەلا مستەفا هەوڵی داوە قەناعەت بە ئێرانییەکان بکات ڕێگەی بدەنێ بگەڕێتەوە عیراق. بەپێی هەمان ڕاپۆرتی پۆلیسی عیراق ئێرانییەکان بە بارزانییان ڕاگەیاندووە ئەوان لارییان نییە ڕێگەی بدەنێ بەو مەرجەی چ خۆی و چ پیاوەکانی چەکیان پێ نەبێ، بەڵام ئەو بەو مەرجە قایل نەبووە، گومانێکی کەم لەوە دەکرێ مەلا مستەفا پێوەندییەکی بەردەوامی لەگەڵ هاوبیر و خزمەکانیدا لە عیراق هەبێ، بەڵام دەنگوباوی گەڕانەوەی ئەمجارەیشی لە ساڵانی ڕابردوو کەمتر نییە.

۱۹- هەراوبگر و پێشێلکردنی یاسا لە ناوچە کوردییەکانی مووسڵ و هەولێر و سلێمانی، نە لە سنوور بەدەر نەبوون، نە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوون، تەنها لە یەك حاڵەتدا نەبێ، ئەو حاڵەتەش پێوەندیی بە مەسەلەی کابرایەکەوەیە کە ناوی خولە پیزەیە، خولە پیزە چەتەیەکە وا دەچێ بۆ هەشت ساڵ حوکمەت ناتوانێ دەستگیری بکات، پتر لە پێویستیش کردارە چاونەترسەکانی ۱۹٤۹ و ۱۹۵۰ی گەورە دەکرێن، تەنانەت لە ناوچەی


شێخ بابا عەلی شێخ

سلێمانیدا بە چاوی ڕۆبن هودی[٨٥] کورد سەیری دەکەن، و پێدەچێ بابە عەلی و شێخ لەتیفی کوڕانی مەحموود داڵدەی لەتیف دەدەن[٨٦] وەزعی خولە پیزە کاری کردووەتە سەر سومعەی حوکمەت.

٢٠- هەستی کوردایەتی کە هەرگیز لە هەولێر و سلێمانی خۆی لە خۆیدا کەم نەبووە، بەڵام سەردانی یەك لەسەر یەکی مولحەقەکانی باڵوێزخانەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بەغدا بۆ ئەو ناوچانە بووە جۆرە هاندەرێکی ئەو هەستە، بایەخ پێدانی ڕۆژنامە ئەمەریکییەکان و سەردانی شێخ بابە عەلی لە ولاتە یەکگرتووەکان، کە کاتی خۆی قۆناغێکی خوێندنی لەوێ تەواو کردووە، بوونە نیشانەی ئەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەیەوێ بکەوێتە پێشبڕکێ لەگەڵ ڕووسدا لە بواری خۆ نزیکخستنەوە لە کورد.

---

[٨٥] ڕۆبن هود (Robin Hood) پاڵەوانێکی یاخیبووی ئەفسانەیی ئینگلیزی یەکجار بەناوبانگە، گوایە کۆتاییەکانی سەدەی دوازدە سەری هەڵداوە و وەك پارێزەری هەژار و لێقەوماوان ناوی دەرکردووە و وا دیارە تا هاتووە کرداری قارەمانێتی خەیاڵپڵاوانەی بۆ دروست کراوە و لە سەدەی پازدەمینەوە دەیان نووسەری ئینگلیز کەوتوونەتە سۆراخی و شتی عەنتیکەیان داوەتە پاڵی، نووسەری وا هەیە نەك هەر ئەسڵوفەسڵی، بەڵکو تەنانەت گۆڕەکەیشی دەستنیشان کردووە، لە دەوروبەری کۆتایی سییەکانی سەدەی ڕابردوویشەوە ڕۆبن هود بووە بە یەکێك لە بابەتە هەرە سەرکەوتووەکانی فیلمەکانی هۆلیوود و دوای ئەوەیش هی تەلەفزیۆن، بۆیەکا لە گشت جیهاندا هێندەی دیکە ناسرا. بڕوانە:

"Oxford Dictionary of National Biography", Vol.27, Oxford University Press, 2004. PP.926-929.

[٨٦] شێخ بابە عەلی هەرگیز تووخنی کاری لەو جۆرە نەدەکەوت و بە عەقڵییەتێکی ژیاریی هاوچەرخ ڕەفتاری دەکرد.

## سووریا و لوبنان[٨٧]

٢١- وەك لە ڕاپۆرتی قۆناغی پێشوودا ئاماژەی بۆ کراوە، کۆمەڵگەی کوردی لوبنان بە ژمارە کەمن و بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، تەنانەت ئەگەر شاری بێرووتیش لەم بارەوە بایەخی هەبێت، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە کامەران عالی بەدرخان لەوێ دەژی و لەگەڵ براکەیدا[٨٨] بە جووتە بەردەوامن لە خزمەتکردنی پرسی کورددا. بەڵام جەزیرە «لە سوریا -ك.م.» مەڵبەندی سەرەکیی کوردایەتییە، لەوێ دوکتۆر ئەحمەد نافیز کە خەڵکی قامیشلییە چالاکترین دەربڕی ئاواتەکانی کوردە.

##ساڵی ١٩٤٦

٢٢- ڕووداوەکانی ئێران بە شێوازێکی سروشتی کوردی سووریایان بزواند، ڕاستە ساڵی ١٩٤٦ ئەو دیاردەیە لە چوارچێوەی سیاسییەکاندا خۆی نواند، ئەگینا زۆرینەی کورد یان کەم، یان هەر هیچ کاری تێ نەکردن و ئەگەر ئەو هەواڵە سەر نەگرتووەی بەدرخانییەکانی لێ بەدەرنێین کە ڕۆژانی حەج لە مەککە ویستیان کۆبوونەوەیەك بۆ کورد ساز بکەن ئەوا ساڵی ١٩٤٦ تێپەڕی بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ بەخۆوە ببینێ. لەگەڵ ئەوەیشدا چارەنووسی ئازەربایجان[٨٩] کوردی سووریای هەژاند و ڕقیانی دژی ڕووس ورووژاند، چونکە دەستبەرداری کوردی «مەهاباد-ك.م.» بوون لە کاتی کەوتنیاندا. مارتی ساڵی ١٩٤٧ دوکتۆر نافیز نامەیەکی نارد بۆ میستەر بێڤن[٩٠] کە تیایدا سەرنجی ڕاکێشابوو بۆ مێژووی کورد لە جەنگی یەکەمی

---

(٨٧) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە "The Levant States" کە ئەوساکە تەنها سووریا و لوبنانی دەگرتەوە

(٨٨) دیارە مەبەستی جەلادەت عالی بەدرخانی برا گەورەی دوکتۆر کامەرانە.

(٨٩) مەبەستی هەردووك کۆماری ئازەربایجان و کوردستانە.

(٩٠) ئێرنست بێڤن (Ernest Bevin) یەکێکە لە دیپلۆماسییە هەرە بەناوبانگەکانی سەدەی بیستەمی بەریتانیا و جیهان، حەوتی مارتی ساڵی ١٨٨١ لە دایك بووە، لە هەرەتی لاوییەوە پێوەندیی بە ڕێکخراوە کرێکاری و سۆشیالیزمەکانەوە هەبووە، لە ساڵەکانی

جیهانەوە، وێڕای ئەو زوڵمە زۆرەی لێیان دەکرێ لە لایەن حوکمەتانی ئەو وڵاتانەوە کە بەسەریاندا دابەش کراون. دوکتۆر نافیز کۆتایی نامەکەی بەم پێشنیازە هێنابوو کە دەڵێ: دوای ئەم تاقیکردنەوە دوور و درێژە نابێ بە چاوی سەر سوڕمان یان گلەییەوە بڕوانینە ئەوەی لاوی کورد ڕوو بکەنە توندڕەوی لە ژێر فشاری «یەك چەمکیی پووچگەرایی «نیهلیزم» و بێ هیوایی»دا[٩١].



نافیز جەلال

## ساڵی ١٩٤٧:

٢٣- تاکە ڕووداوی سەرنجڕاکێش لە ساڵی ١٩٤٧دا ئەو دەنگوباوە بوو دەربارەی ئەو بزووتنەوەیەی بۆ هاوکاریی لە نێوان کورد و ئاشوورییەکاندا دەستی پێکرد، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە لە جفزی پێشنیاز تێنەپەڕی، واپێدەچێ ڕەهبەری شیوعیی خالید بەکداش بە نهێنی ئەو کارەی دەبزواند، ئەوەیش بۆخۆی یەکەم جار بوو خالید بەکداش ساڵی ١٩٤٦ لە سەر شانۆی کوردایەتی دەرکەوێ[٩٢].

---

جەنگی دووەمدا وەزیری کار بوو، لە هەڵبژاردنی گشتیی ساڵی ١٩٤٥دا ڕۆڵێکی گەورەی لە سەرکەوتنی «پارتی کرێکاران»دا بینی، بۆیەکا ئەتلیی سەرەك وەزیران لەوساوە کردییە وەزیری هەندەران لە کابینەکەی خۆیدا، بیڤن بە دەستووری چەرچڵ زۆری دەخوارد و زۆری دەخواردەوە و زۆر زۆریش جگەرەی دەکێشا و توخنی وەرزش نەدەکەوت، لە دوای ساڵی ١٩٤٥وە تەندروستیی ڕووی لە نشێوی کرد، ڕۆژی چواردەی نیسانی ساڵی ١٩٥١ بیڤن بە نەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کرد، بڕوانە:

"Oxford Dictionary of National Biography", Vol. 5,Oxford University press, 2004, pp.604-613.

[٩١] لە دەقی ئەو ڕستەیەی ناو نامەکەی دوکتۆر نافیز بۆ ئێرنست بیڤنی ناردووە بە فەرەنسی بەم جۆرە نووسراوە: "une certaine notion de nihilisme et de de`sespoir"

سوپاسی زۆرم بۆ برای خۆشەویستم دوکتۆر تەجاتی عەبدوڵڵا کە بەتەلەفون لە پاریسەوە دەقی ناوەڕۆکی ڕستەکەی بۆ کردمە کوردی.

[٩٢] برای بەڕێز دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوول کە چەند ساڵێك بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ لە سووریا پەنابەر بوو لە نزیکەوە پێوەندیی بە خالید بەکداشەوە



ئەکرەم جەمیل پاشا و قەدری جان و
جەلادەت بەدرخان

٢٤- ئەو هەوڵەی حوکمەتی سووریی کۆتایی ساڵی ١٩٤٧ دای بۆ ئەوەی گیانفیدای کوردیش لە جەنگی فەلەستیندا بەشداربن لە لایەن ڕەهبەرانی کوردەوە پەسند نەکرا.

٢٥- سەرەتای ساڵی ١٩٤٨ دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان لە سویسرەوە گەڕایەوە بێروت و دەڵێن گوتوویەتی لەوێوە موتابەعەی کێشەکانی کوردی سوریا و کار بۆ کورد بە گشتی دەکات.

## ساڵی ١٩٤٩

٢٦- لە کاتی ئەو کۆنفرانسەی مایسی ساڵی ١٩٤٩ جەلادەت بەدرخان لە بێروت سازی کرد باسی دوو ڕێکخراوی کوردی هاتە گۆڕێ: یەکیەتی «یا بەرەی» پارتییە کوردییەکان و پارتی دیموکراتی کوردیی، بەلآم ئەوە نەزانراوە کە ئایا ئەوانە ناوی نوێی «یەکیەتی کوردان» و «کۆمەڵەی صەلاحەددین»ن کە ڕاپۆرتەکانی پێشوو باسیانی کردووە، یا وەخود دوو کۆمەڵەی نوێن، هەرچەندە جەلادەت بەدرخان لەسەر چالاکییەکانی خۆی بەردەوامە، بەلآم لە ڕاستیدا ئێستا کەمتر دەستی دەڕوات وەك لە سلێمان حاجۆ ئاغا و دوکتۆر نافیز و قەدریی جەمیل پاشا و ڕەهبەرەکانی دیکەی جەزیرە کە لە نزیکەوە پێوەندییان بە دانیشتوانی ناوچەکەوە هەیە. بە پێی

---

هەبوو، گەلێك جار باسی هەستی کوردایەتیی ئەو کەسایەتییەم لە دوکتۆر عیزەدین بیستووە کە دەشڵێ هەمیشە بە کوردی پێکەوە قسەمان دەکرد.

ئەو راپۆرتەی تازە پێمان گەیشتووە نەوەی تازە پێگەیشتووی کورد ڕەخنەی ئەوە لە جەلادەت بەدرخان دەگرن کە خۆی لە تورکیا و وڵاتە ڕۆژئاواییەکان نزیك دەخاتەوە، وا دیارە ئەو ڕێبازەی وەك ڕێبازێکی نوێ بۆ خۆی هەڵبژاردووە و بۆ خۆیشی نکۆڵی لێی ناکات.

### ساڵی ١٩٥٠

٢٧- هەرچەندە ئەندامانی حوکمەتی سووری لەم چەندانەی دواییدا هەندێك سکالایان لە دەست مەترسیی کەمینەی کورد بۆ سەر دەوڵەت و پەرەسەندنی چالاکیی کۆمۆنیزمی کورد لە ساڵی ١٩٥٠دا دەرکردووە، بەڵام لەوە ناکات ئەو دیاردانە گەیشتبنە ئاستێکی فراوان.

### تورکیا

٢٨- لە یادداشتی نهێنیی پێشووماندا «کە ژمارەکەی ١٧٠٨١»ە بە دوورودرێژی باسی وەزعی کوردی تورکیامان کردووە و لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا گۆڕانێکی ئەوتۆ لە وەزعیاندا ڕووی نەداوە، بەڵام ساڵی ١٩٤٩ ڕۆژنامەکانی تورکیا کتوپڕ کەوتنە بایەخدان بە پرسی کورد، چونکە وردە ئاڵوگۆڕێك لە هەستی نەتەوەیی کوردی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی «تورکیادا- ك.م.» هاتبووە گۆڕێ، کاربەدەستانی تورکیا بەردەوامن لەسەر ئەو بیرو بۆچوونەی خۆیان کە گوایە کێشەی کوردی ئەوان چارەسەر کراوە هەرچەندە لەوانەیە کوردی تورکیا هەمیشە ببنە سەرچاوەی ئاژاوە لە حاڵەتێکدا ئەگەر حوکمەتی عیراقی دەسەڵاتی لە دەست دا، یاوەخود تورکیا لە لایەن سۆڤیەتەوە هێرشی بهێنرێتە سەر.

٢٩- لە هەڵبژاردنی گشتیی ساڵی ١٩٥٠دا دیموکراتەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیادا سەرکەوتنی زۆر گەورەیان وەدی هێنا، بەڵام هیچ شتێك لە ئارادا نییە ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە ژمارەیەك لە نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی ئەو حیزبە سەر بە لیستی کوردن. بە پێی قسەی ئەوانەی لەم دواییانەدا

سەریان لەو ناوچەیە داوە، یاسا و هێمنی تا ڕادەیەکی زۆر بەرقەرارن، بەڵام حوکمەت بێ ئەندازە خۆی لە باسی هەوڵی «بەزۆر بە تورک کردنی کورد دەدزێتەوە»[٩٣].

**پەنا بردنە بەر نەتەوە یەکگرتووەکان و دەزگاکانی دیکە**

٣٠- ئەم کوردە خوێندەوارانە- محەمەد حیلمی بەگ کە لە میسر دەژی و دەڵێ نوێنەری «پارتی نیشتیمانی دیموکراتی کورد»ە و شەریف پاشا کە سالآنێکی دورو درێژ لە فەرەنسا و ئیتاڵیا ژیاوە و ڕۆژانی کۆنفرانسی ئاشتیی دوای جەنگی یەکەمی جیهان کەسایەتییەکی کوردپەروەری گەلێك دیار بوو و دوکتۆر نافیزی خەڵکی قامیشلیی سووریا و کامەران عالی بەدرخان و نوورەدین زۆزۆر[٩٤] «وەفدی کوردی»یان لە پاریس دامەزراندووە و گۆڤاری Bulletin du center d`Etudes Kurdes دەردەکەن، ساڵی ١٩٤٧یش یادداشتێکی دیکەیان دایە سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، سیازدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٠یش هەمان وەفد دژی هێرشی «حوکمەتی ئێران بۆ سەر-ك.م.» جوانڕۆ یادداشتێکی نارەزایی پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکان و ژمارەیەك لە دەوڵەتە ئەندامەکانی کرد.

---

(٩٣) لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا وشەی "Turkify"بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە و هەموو ئەو ڕستەیش بەم جۆرە داڕێژراوە:

According to recent visitors to the area law and order are satisfactory maintained but Government attempts to (Turkify) the kurds are extensively evaded.

(٩٤) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا (Nureddin Zozor) نووسراوە، لەوانەیە مەبەست نوورەددین زازا بێ.

# کۆمۆنیزم و کورد

## سووریا و لوبنان

۳- زۆر[۹۵] زەحمەتە بتوانیت مەزندەیەکی دروستی ئەوە بکەی کە ئایا ڕەهبەرە کوردەکانی سووریا و لوبنان تاوەکو چ ڕادەیەك تێکەڵ بە پیلانەکانی یەکیەتی سۆڤیەتن. ژمارەی ئەو ڕاپۆرتانەی لەم چەندانەدا باسی پێوەندیی جووتە برای بەدرخانیی[۹٦] بە دیپلۆماسییە سۆڤیەتییەکانەوە دەکەن زۆرە، ئەو گۆڤارە «کوردییەش-ك.م.» کە لە پاریس دەردەچێ هەر چەندە بە گشتی بە زوبانی کۆمۆنیزم نادوێ، بەڵام لەم چەندانەی دواییدا ژمارەیەك وتاری بڵاو کردۆتەوە کە تیایاندا باسی بایەخپێدانی ڕووس بە زوبان و مێژووی کورد دەکات و ئەو دیاردەیە لەگەڵ بایەخ پێنەدانی ڕۆژئاواییەکاندا بەراورد دەکات. لە لایەکی دیکەوە بە پێی ڕاپۆرتەکان جەلادەت بەدرخان دوژمنێکی سەرسەختی کۆمۆنیزمە، وا دیارە زۆربەی سەرکردە کوردە بە ساڵاچووەکان بە هەمان شێواز بیر دەکەنەوە. بەرانبەر بەوە گومانێکی کەم لە ئارادایە کە زۆربەی لاوی کوردی سووریی لە جەزیرە بە سەرۆکایەتی سلێمانی حاجۆ ئاغا تەواو سەر بە کۆمۆنیستن. وێڕای ئەوە ڕاپۆرتەکان باسی ڕێکخراوێکی سەر بە کۆمۆنیستیی کورد و ئەرمەن دەکەن، بەڵام بەرانبەر بەوەیش نیشانەی دوژمنایەتیی «خۆیبوون» هەیە کە سەرچاوەکەی لە هاریکاریی کورد و ئەرمەنە داشناقەکانەوە هەڵدەقوڵێ، ئەو داشناقانەی چەند دژی تورکن، هێندەیش دژی سۆڤیەتن.

۳۱- هەڵوێستی کوردی سووریا نە لە ڕەگ و ڕیشەوە و نە لە بارودۆخی ئێستاشیدا لە هەڵوێستی کەمینە کوردەکانی دیکەی «وڵاتە دراوسێکانی

---

[۹۵] نووسەرانی ڕاپۆرتەکە لە زنجیرەی ژمارەکاندا کەوتوونەتە هەڵەوە و دوو جار ژمارە سییان بۆ دوو بابەتی جیاواز دووپات کردۆتەوە، بەو جۆرەش کۆی ژمارەی خاڵەکانی ڕاپۆرتەکە دەبێتە سی و شەش (۳٦) خاڵ نەك سی و پێنج (۳۵)، هەرچەندە ئێمە ژمارەی سییەکەمان وەك دەقی بەڵگەنامەکە تۆمار کردووە.

[۹٦] دیارە مەبەستی جەلادەت و دوکتۆر کامەران عالی بەدرخانە.

توركیا–ک.م.»جودا ناکرێتەوە و هەڵوێستی هەردووک لایان بەرهەمێکی سروشتیی هەمان فاکتەرن، بەڵام لە سەرکردە بە ساڵاچووەکان بەولاوە کوردی دیمەشق و شارەکانی دیکەی ڕۆژئاوای سووریا بایەخێکی ئەوتۆ نادەن بە پرسی کورد. ئەوان، سەرباری هەستی گوماناوی ژمارەیەک ڕەهبەری عەرەب، وەک کارمەند و ئەفسەری سوپا و ئەندامی پەرلەمان لە بۆتەی عەرەبدا تواونەتەوە و لە ڕاستیدا پڕۆپاگەندەی کوردایەتی کارێکی ئەوتۆیان تێ ناکات. هەرچی جەزیرەشە بە هۆی لێشاوی نوێی پەنابەرانی کوردی تورکیاوە هەستی نەتەوەییان گەلێک زۆرتر و گەلێک زیندووترە. هەمان کات جەزیرە قەڵایەکی پتەوی کوردایەتی نییە و[97] ئەوەش موعەرەزە بۆ هێرش و بووەتە کۆسپ لەبەردەم بەرپابوونی ڕاپەڕین و وا لەسەرکردە «کوردەکان–ک.م.» دەکات هەوڵ بدەن پێوەندییان لە گەڵ حوکمەتی سووریادا باش بێ و هەمان کاتیش کار بۆ ئەو ڕۆژە بکەن کە خۆری جەنگ دەرفەتی تۆڵەسەندنیان لە تورک بۆ بڕەخسێنێ و سەرکەوتنی سۆڤیەت «لەجەنگێکی وادا–ک.م.» مۆری سۆڤیەت بنێ بە تەوێڵی سەربەخۆیی نیشتیمانەکانەوە.

هاتنە دیی ئەو ئاواتە سروشتییانە پێویستی بە کەمێک بزواندنی ڕاستەوخۆی بەکرێگیراوەکانی یەکیەتی سۆڤیەتە. ئەوەیش کە کورد شارەزا نین چۆن دەبێ لەگەڵ پڕۆپاگەندەی کاربەدەستە سۆڤیەتییەکاندا ڕەفتار بکەن دەیانخاتە هەڵەی کوشندەوە، هەمان کات لەوە دەکات بوونی کورد لەسەر سنووری تورکیا بووبێتە هۆی خۆڕاگرییان لە بواری سەر نەگرتنی ئاواتەکانیاندا لەسەر حسێبی تورک. هەمان کات ئەو کوردانە نابێ چاوەڕوانی ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەیی بەرفراوان بن لە حوکمەتی سوورییەوە پتر لەوە پێوەندیی هەیە بە هۆز و ناوچە سنوورییەکانەوە.

---

[97] ئەم ڕایە تەواو پێچەوانەی بۆچوونەکانی دەیان بەڵگەنامەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی و گەلێک بۆچوونی دیکەی ناو هەمان فایلن.

عیراق

۳۲- ڕاپۆرتەکانی ئەم دواییانە دەربارەی هەڵوێستی هۆزە کوردەکانی عیراق گۆڕینیان بەسەردا نەهاتووە، مەیلێکی فراوانیش لە نێو ئەو هۆزانەدا بەرانبەر مەلا مستەفا نییە و ژمارەیەکی زۆر لە سەرەك هۆزە کەم بایەخەکان کە مەیلداری حوکمەت، یان مەیلداری بەریتانییەکانن، پڕۆپاگەندەی سۆڤیەتی کاری تێ نەکردوون. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لە گشت ناوچە عەشیرەتییەکانی عیراقدا پڕۆپاگەندەی سۆڤیەتی دیاردەیەکی دەگمەنە. شانبەشانی چالاکییەکانی مەلا مستەفا باسی پڕۆپاگەندەی سۆڤیەتی هاتە کایەوە و ئەویش لە مەودایەکی تەسکدا. بێ هیچ جۆرە گومانێك دەزگا فەرمییە عیراقییەکان بایەخێکی بێ سنوور دەدەنە ئەم بابەتە وەك بەشێکی زیندووی گیانی یاخیگەرایی پتر لە ئەنجامی پڕۆپاگەندەی شیوعی.

۳۳- لە شارەکانی «کوردستان-ك.م.»، تایبەت لە سلێمانی، بارودۆخەکە تا ڕادەیەکی زۆر خراپترە[٩٨]. پارتی «واتا لقی پارتی دیموکراتی» لە سلێمانی هەروەها لە هەولێر و کەرکووك و ڕەواندز چالاکە. هەمان کات «پارتی نیشتیمانیی ئازادیخواز - حزب التحرر الوطني»[٩٩] کە پێوەندیدارە لەگەڵ «پارتی دیموکراتی کوردستان»[١٠٠] بەردەوامە لەسەر چالاکییەکانی. وا دیارە کۆمۆنیستەکانی بەغدا گەلێك چالاکانە دزەیان

---

[٩٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:
"33-in the towns, and particularly in Sulaimaniya, the atmospher is much less healthy" (A.N., F.O., 371/91252, confidential, The Kurdish problem 1946-1950, P.30).

[٩٩] لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا وا هاتووە: (Hizbal Watani lil Tharrur) کە ڕێکخراوێکی مارکسیی چەپڕەو و یەکێك لە ڕووکەشەکانی حیزبی شیوعیی عیراقی بوو، لە کوردستان هەر بە حیزبی تەحەڕوڕ ناسرابوو، ئەحمەد غەفوور و غەفووری میرزا کەریم و ڕوشدیی ئەحمەد بەگ و کەمالی میرزا کەریم و پارێزەر محەمەد مستەفا لە سەرکردە چالاکەکانی لقی سلێمانیی ئەو ڕێکخراوە بوون.

[١٠٠] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا «پارتی دیموکراتی کورد» هاتووە.

کردۆته ناو ڕیزەکانی هەردووکیانەوە، بە ڕادەیەك هێڵێکی جیاکەرەوە لە بیرو بۆچوونی ئەندامەکانیاندا هەست پێ ناکرێ و «هەردووك لایان چوون یەك–ك.م.» دروشمی ئازادی و دیموکراسیی کوردستان و هەموویان ئامانجە کۆمۆنیستییەکان پەیڕەو دەکەن[101] ئەوان بە تەنها نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کۆمۆنیستەکانی بەغداوە، بەڵکو هەمان کات کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی دیموکراتە کوردەکانی باکووری ئێران – یان دروستتر پاشماوەکانیان–[102] کە ئەوانیش هەڵبەت بە هاندانی ڕاستەوخۆی سۆڤیەت یاریدەیان بۆ دەنێرن– هەر چۆن بێ ئەندامانی ئەم ڕێکخراوانە، وێڕای سێ ڕێکخراوی دیکە کە وان لە ژێر فشاری پۆلیسدا[103]، بایەخێکی ئەتۆیان نییە چونکە زۆربەیان بریتین لە مامۆستا و قوتابی و دووکاندار و فەرمانبەری بچووك و[104] ئەوانەیش لەوە ناچێ بتوانن کار بکەنە سەر دەرەوەی شارەکان، هەرچەندە بۆیان بلوێ دەتوانن ئاژاوە لەناو شارەکاندا بنێنەوە، وەك ئەو هەراو بگرەی بەر لە ئێستا لە نێو کارمەندانی کۆمپانیای نەوتی

---

[101] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

"Both seem to have been fenetrated by Baghbad Communists so effectively that even in the minds of the members themselves there is no clear distinction between original aims of the organization- to free and democratize Kurdistan- and the less Precise Objectives of communism" (N.A., F.O., 371/91252, Confidential, the Kurdish problem 1946- 1950, P.30).

[102] دیارە مەبەستی «پارتی دیموکراتی کوردستان»ی ئێرانە.

[103] بەداخەوە ناوی ئەو سێ ڕێکخراوەی تۆمار نەکردووە.

[104] هەڵبەت ئێمە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نین، دیارە لای دانەرانی ئەم ڕاپۆرتە پتر لە هەمووان ئاغایانی کوردستان دەتوانن کێشە و گۆبەند بۆ میری بنێنەوە، لە ڕاستیدا «مامۆستا و قوتابی و دووکاندار و فەرمانبەرە بچووکەکانی» کوردستان دەمێك ساڵ بوو هاتبوونە کۆڕی خەباتی کوردایەتییەوە و لە نزیکەوە سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانیان ڕاکێشابوو.

عیراقدا نایانەوە[١٠٥]. هەر چالاکییەکی لەو بابەتە کە لەوانەیە بە ناوی پرسی نەتەوەیی کوردەوە بقەومێن بەڵام لە ڕاستیدا دەستکردی کۆمۆنیستن، واتا ئەو دەستە و دایەرانە لە توانایاندا نییە کێشەی نەتەوەیی کوردیی گەورە بنێنەوە، بەڵام کۆمۆنیستەکان هەمیشە دەتوانن ئەو جۆرە دەرفەتانە بقۆزنەوە.

## ئێران

٣٤- چالاکییە سۆڤیەتییە ڕاستەوخۆکان لە نێو کوردی ئێراندا- ئەگەر ئیزگەی یەرێڤان و ئازەربایجانی دیموکراتی لێ دەرکەین کە ئەوانیش بنکەی پەخشیان بە تەواوەتی دیار نییە- بریتییە لە چالاکییەکی پچڕپچڕی هەلپەرست. هەرچەندە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی ئێران لە ناوچە شاخاوییە کوردەوارییەکاندا هێشتا لاوازە، بەڵام هەرچۆن بێ ناشێ نە ئەو چالاکییە کەمانەی پیاوانی سۆڤیەت دەیاننوێنن و نە دزەکردنەکانیشیان پشت گوێ بخرێن، تەنانەت «پێویستە لە هەمان گۆشەنیگاوە-ك.م.» سەیری ئەوەی کوردەکانی مەهابادی ساڵی ١٩٤٦یش تاوەکو دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکەیان، بکرێ.

ئاشکرایە سۆڤیەتییەکان پشتی جوانڕۆیان نەگرت و بەڵگەش هەیە کە چالاکیی کۆمۆنیستی لە ناوچەکانی باشووری سنە و کرمانشادا نییە. بە هەمان دەستوور بەڵگەیش هەیە کە لە شکاك و هەرکی بەولاوە هۆزەکانی دیکە بە درێژایی ساڵەکانی جەنگی دووەم و یەکسەر دوای تەواوبوونیشی نەکەوتنە ژێر کاریگەریی پڕۆپاگەندەی سۆڤیەتییەوە، خۆ ئەگەر ئەو هەڵوێستە سەیرەی «هۆزی-ك.م.» فەیزوڵڵا بەگی لێ دەربکەین کە کۆنسوڵی گشتیی حوکمەتی خاوەن شکۆ لە تەوریز باسی کردووە و دەڵێ

---

[١٠٥] دیارە مەبەستی ڕاپەڕینە گەورەکەی گاوورباغیی کۆمپانیای نەوتی شاری کەرکووکە لە ساڵی ١٩٤٦دا، ئەو ڕاپەڕینەی کۆمۆنیستەکان و خودی فەهد ڕۆڵی سەرەکییان تێیدا بینی.

ڕەهبەرەکانیان ڕۆژانی دەسەلآتی دیموکراتییەکان زەویوزاری خۆیانیان بەسەر پیاوەکانیاندا دابەش کردووە و نەهیچ هۆزێکی دیکە لاسایی کردوونەتەوە و نە لەوەیش دەکات کەس لاساییان بکاتەوە.

٣٥- شێوازی ڕەق و توندڕەوی ئیزگە کوردییەکان نیشانەیەکی ئاشکرای بەردەوامبوونی بایەخدانی سۆڤیەتن بە کوردستان و ئەو خۆڕاگرییەی سۆڤیەتییەکان لە ناوچە «سنوورییەکانی -ک.م.» ئێراندا خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوپەڕی ئامادەییە کە هەرکاتێك پێویست بێ هێز و چەك و تفاق و پارەی سۆڤیەتی دەکەونە کار بۆ بزواندنی هۆزەکان و بەو شێوازەی مەبەستیانە، توانای سۆڤیەتییەکان لە هەڵبژاردنی ئامانجەکانیاندا پشت بەوە دەبەستێ تاوەکو چ ڕادەیەك دەتوانن کاریگەریی ناوچەییان بپارێزن و یاریدەکانیان بەردەوام بن) (١٠٦).

«پرۆپاگەندە بۆ کورد» ناونیشانی بەشی دواتری هەمان فایلە و بریتییە لە هەشت لاپەڕە کە چوار لاپەڕەی یەکەمیان تەرخان کراون بۆ تێبینییەکانی میستەر فەرلۆنگ کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی و دیارە چۆن دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی وەها کارمەندانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی شڵەژاندووە کە بکەونە سۆراخی پێکهاتەکانی کۆمەڵی کوردەواریی ئەوساکە و بۆچوونەکانیان:

## تێبینییەکانی میستەر فەرلۆنگ(١٠٧)، پرۆپاگەندە بۆ کورد

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٨٨١ی ڕۆژی بیست و شەشی مارت کە ئاماژە بۆ «پەرەسەندنی کاریگەریی ئیزگە و دەزگاکانی دیکەی ڕاگەیاندنی سۆڤیەتی بۆ سەر کورد دەکەن کە سەرنجی دەزگاکانی دەوڵەتی ڕاکێشاوە،

---

(106) N.A.,F.O.371/91252, Confidential, The Kurdish Problem 1946-1950, Research Department, Foreign Office, 2nd April, 1951.

(١٠٧) دەربارەی گ. دەبل یو. فەرلۆنگ بڕوانە پەراوێزی ژمارە سی و نۆ.

من پێم وایه له ڕاستیدا هیچ نیشانەیەك له ئارادا نییه پێمان بسەلمێنێ كه ئەمه ناوەرۆكی مەسەلەكەیە. دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بەسەر سەركەوتنی «حوكمەتی»[١٠٨] مەهاباددا بێ گومان كاری پڕۆپاگەندە بەردەوام بوو، هەروەها كاریگەریی خۆیشی هەبوو، بەڵام ئەو كاریگەری و دەنگدانەوەیە ڕووی لە زیادی نەكردووە. وا پێ دەچێ پێچەوانەی ئەو بۆچوونەش دیاردەیەكی پەسندە و ئەوەیش پێویستیی بەم ڕوونكردنەوانە هەیە:

١- پێویسته جیاوازیی له نێوان هەڵوێستی سەرەك هۆز و ئینتلیگێنسیا ئەفەندییە كوردەكاندا بكرێ بەرانبەر پرسی نەتەوەیی كورد و ڕادەی كاریگەریی پڕۆپاگەندەی سۆڤیەتی لە سەریان.

(أ) ئاغاكانیان

لەوانەیە ژمارەیەكیان بە گشتی ئاگاداری باری شلۆقی نێودەوڵەتی بن لە ئاستی جیهاندا، واته دوور له ناوچه و هۆزی خۆیان و هەست بە پێویستیی بایەخدان پێی بكەن و لەوە بگەن چی له قازانجی حوكمەتی سۆڤیەتییە وەك شێوازێكی خۆ دەربازكردن لە تەفروتووناببوون لە حاڵەتی هێرشێكی سۆڤیەتیدا. ئەوان تەواو لەوە گەیشتوون كە جێگەیان لەژێر سایەی دەوڵەتێكی سۆڤیەتیدا نییە، بەڵام ئەوەیش دەزانن كە ڕووسیا لە كاتی هەراوبگر «ئاژاوە»دا دەتوانێ لە ڕێگەی چەك و پارەوە پشتیان پێ ببەستێ، ئەو جۆرە یاریدەیەش هیوای ئەوەیان بداتێ لە ئەنجامدا ببێتە هۆی پاراستنی خۆیان، ئەوان وێڕای دەستكەوتی ماددی و چەك هیچی دیكە چاوەڕوان ناكەن، ئاغاكان لە نێوان خۆیاندا كۆك نین و بە ڕاستی عەودالی

---

[١٠٨] له دەقی بەڵگەنامەكەدا بەو جۆره وشەی حوكمەت "government" خراوەتە نێوان دوو جووت كەوانی بچووكەوە لەبەر ئەوەی بەلای ڕۆژئاواییەكانەوە كۆماری ئازەربایجان و كوردستان دەستكردی سۆڤیەت بوون.

سەربەخۆیی نەتەوەیی[١٠٩] نین و کەمێکیان هەر هیچ مەیل، یان هەستی هاوئامانجی نایانبەستێتەوە بە ئینتلیگێنسیا «دەستەی ڕووناکبیر—ک.م.» یا ئەفەندییە «کوردەکانەوە—ک.م.».

(ب) ئینتیلیگێنسیا

هەر چەندە ژمارەیەك بەڵگە «نیشانە» هەن ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەوا لە بارودۆخی بێ ئاواتیدا ئینتلیگێنسیای «کوردی—ک.م.» بیری لە یاریدەی ڕووسیا کردبێتەوە، بەلاَم هەمان کات «ئەندامانی ئەو دەستەیە—ک.م.» هەستیشیان بە مەترسیی نانی هەنگاوێکی لەو بابەتە کردۆتەوە. هەر چۆن بێ کاریگەریی دەستەی ڕووناکبیری کورد کەمە و «ئەندامانی—ک.م.» ناتوانن تەنانەت ئەفەندێکانیش ڕابکێشن بەر لەوەی ببنە کۆمۆنیستی کەللە ڕەق[١١٠]. گەلێك گومان لەوەیش دەکرێ تەنانەت بەدرخانییەکانیش، هەرچەندە سەر بە بنەماڵەیەکی بەناوبانگن، بەلاَم سەنگێکی ئەوتۆیان لە نێو ئاغاکاندا هەبێ.

ج– ئەفەندێکان

بێ گومان زۆرینەی ئەفەندێکان نیشتیمانپەروەری کوردی ڕاستەقینەن، لەوانەیە زۆربەیشیان کۆمۆنیستی نەخوێندەوار بن و پێویستە بەو چاوە سەیریان بکرێ «یان ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ—ک.م.».

---

[١٠٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئاوەها خەت بە ژێر وشەی نەتەوەیی (national)دا هێنراوە.

[١١٠] لەدەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێ:

"... unless they come out as full-blooded Communists".

٢- ئاشكرایە كە هیچ جۆرە پەیمانێك دەربارەی جێبەجێكردنی ئاواتی نەتەوەیی كورد لە بواری سەربەخۆیی كوردستاندا لەسەر حسێبی توركیا و ئێران و عیراق و سووریا كارێكی كردەنی نییە «ئەوەی سۆڤییەتەكانیش» ناتوانن بیخەنە پشتگوێ).

خاڵەكانی دیكەی هەمان راپۆرت هەمان بابەت لە گۆشەنیگای هەمان بۆچوون و هەڵسەنگاندنەوە شی دەكەنەوە(١١١).

نامەی رۆژی بیست و شەشی نیسانی ساڵی ١٩٥١ی وەزارەتی هەندەرانی حوكمەتی بەریتانی تەرخان كراوە بۆ بابەتی هەڵوێستی ئێزگە سۆڤیەتییەكان بەرانبەر پرسی كورد لەو رۆژانەدا، بە پێی بۆچوونی «بەشی رۆژهەڵات»ی وەزارەتی ناوبراو «هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نییە ئەوە نیشان بدات كە ئێزگە و دەزگاكانی پرۆپاگەندەی سۆڤیەتیی دیكە لەو رۆژانەدا پتر كاریگەرییان كردبێتە سەر كورد» و دیسانەوە «بەشی رژهەلات»ی وەزارەت سەیری ئەو بابەتەش لە گۆشەنیگای «ئاغاكان و ئینتیلیگێنسیای كورد و ئەفەندییەكان»ەوە دەكات(١١٢).

«بارودۆخی كوردستان» ناونیشانی بەڵگەنامەی داهاتووی ئەم فایلەیە و مێژووی شەشی نیسانی ساڵی ١٩٥١ی بەسەرەوەیە و بەشی هەرە زۆری تەرخان كراوە بۆ باسی «كاریگەریی چالاكیە شیوعییەكان لەسەر

---

(111) N.A.,F.O.371/91252, Confidential, The Kurdish problem 1946/1950, Research Department, Foreign Office, 2nd April, 1951, propaganda to Kurds Eastern Department.

(112) Ibid, Foreign Office, S.W.1., 26th April, 1951, E1821/16, Confidential.

کوردی سووریا»، ئەو بابەتەی خودی وەزیر موفەوەزی بەریتانی لە (دیمەشق لەگەڵ سەرەك وەزیرانی ئەوسای سووریادا باسی کردووە و بە ئاشکرا پێی گوتووە فشار خستنە سەر مافی کەمینەکان و تایبەت کورد کارێکی ترسناکە» و هەر لەو قوژبنەیشەوە هەمان باس لەگەڵ دیپلۆماسییە ئەمەریکاییەکان لە دیمەشق وروژاندووە. لە هەڵسەنگاندنی ئەو بابەتەدا دیپلۆماسیی بەریتانی جێمس کۆلێت وودرۆپ [113] بیرو بۆچوونی ورد و بابەتەکیی دەربارەی پرسی نەتەوەیی کورد دەربڕیوە.

بەڵگەنامەی داهاتووی ناو هەمان فایل نامەیەکی نهێنیی باڵوێزی بەریتانییە لە بەغدا کە ڕۆژی شەشی نیسانی ساڵی ۱۹۵۱ ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن، نامەکە نزیکەی دوو لاپەڕە دەبێ لە چوار خاڵی سەرەکیدا باسی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارەی ناوچەی سلێمانی و دهۆك دەکات، تایبەت هەڵوێستی شێخ مەحموود و شێخ لەتیفی کوڕی و گرتنی دێوالی ئاغای دۆسکی و ئەو جۆرە بابەتانەی دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی بە جارێك وروژاندوونی، بۆیەکا ئینگلیزەکان پەیتا پەیتا ڕاپۆرتیان دەربارەی بارودۆخی کوردستان دەنووسی، وا لە خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەم نامە گرنگە پێشکەش دەکەین:

---

(۱۱۳) جێمس کۆلێت ووردرۆپ (James Collett Wardrop) ڕۆژی یەکی ئابی ساڵی ۱۹۱۳ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە ناوەندی سییەکانی سەدەی ڕابردووەوە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و ڕۆژی یازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۳۵ کراوەتە جێگری کونسوڵی بەریتانی لە بێرووت و لە دووی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۳۸یشەوە گوێزراوەتەوە دیمەشق و پاشان بە ریز لە بەرشلۆنە و ڤیەنا و برۆکسل و شوێنانی دیکە وەك دیپلۆماسی کاری کردووە و لە چواری شوباتی ساڵی ۱۹۵۳یشەوە کراوەتە سەرۆکی نوێنەرایەتیی بەریتانی لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە جنێف. بڕوانە:
"The Foreign Office List And Diplomatic And Concular Year Book 1955", London, P.458.

(له:
باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،
بەغدا،
نهێنی،
ژمارە ٥١/١١/١٠٢٥،
٦ی نیسان ١٩٥١،
بۆ:
بەشی ڕۆژهەلآت،
وەزارەتی هەندەران،
لەندەن، س.دەبل یو.١.
بەشی ڕۆژهەلآتی خۆشەویست.

١- لەبەر بایەخپێدانی بەشی دەوڵەت بە کورد، ئەوەی لە نامەی ژمارە ٥١/٢٣/١٨٦٣ی فرایدا[١١٤] ئامـاژەی بـۆ کـراوە پێویستە بە کـورتی باسـی ئاڵوگۆڕەکانی کوردستانی عیراق بکەین، لەو ئاستەوەی سێر هێنری ماك[١١٥]

(١١٤) لێسلی ئەلفرێد چارلس فرای (Leslie Alfred Charles Fry) ڕۆژی حەڤدەی نیسانی ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بووە، کۆلێجی سەربازیی تەواو کردووە و لە دووی شوباتی ساڵی ١٩٢٨ەوە لە هیندستان کاری کردووە و دوایی بووەتە دیپلۆماسی و نۆزدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥١ بۆتە «ئەفسەری خزمەتە بیانییەکان» لە وەزارەتی هەندەران، بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Concular Year Book 1953", London, P. 291.

(١١٥) سێر ولیام هێنری برادشۆ ماك (Sir Willam Henry Bradshaw Mack) ڕۆژی بیست و یەکی ئابی ساڵی ١٨٩٤ لە دایك بووە، کۆلێجی لە شاری دبلن تەواو کردووە، لە ڕۆژی دەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٠ وە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و لە ئەستەمبوڵ و بەرلین و پراگ و ڤیەنا و ڕۆما و پاریس و شوێنی دیکە و بارەگای وەزارەتی هەندەران لە لەندەن کاری کردووە تاوەکو ڕۆژی چواری شوباتی ساڵی ١٩٤٨ کراوەتە باڵوێزی بەریتانی (فوق العادة) لە بەغدا. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Concular Year Book 1954", London, P.342.



شێخ لەتیف شێخ مەحموود

لە نامەکەی خۆیدا کە ژمارەکەی ٢١٨یە و ڕۆژی دووی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠ نووسیویە تیشکی بخەینە سەر.

٢- هێمنی لیواکانی باکووری «عێراق-ک.م.» لە ماوەی شەش مانگی ڕابردوودا تاوەکو ڕادەیەک نە شێوێنراوە، وەك لە نامەی ئاماژە پێدراوی بەغدا باس کراوە، دێوالی ئاغای دۆسکی لە قەزای دهۆك بووە هۆی نانەوەی ئاژاوە و ناوەندی تەشرینی یەکەمی «ساڵی ١٩٥٠-ک.م.» لە لایەن خودی موتەسەریفی «مووسڵەوە-ک.م.»[١١٦] دەستگیرکرا و تاوەکو ئێستایش هەر بەندە، لە



خولە پیزە

سلێمانیش خولە پیزەی چەتە گاڵەی دێ، ئەوەبوو کانوونی یەکەمی «ساڵی ڕابردوو-ک.م.» بە هۆی لە سێدارەدانی براکەیەوە[١١٧] خولە پیزە لە پێکدادانێکدا بووە هۆی پێوەبوونی ژمارەیەك پۆلیس. «عومەر عەلیی-ک.م.» موتەصەریفی سلێمانی ڕۆژی بیست و هەشتی کانوونی یەکەم شێخ لەتیفی کوڕی هەرە بچووکی شێخ مەحموودی بە ناوبانگی گرت، چونکە گومان لەوە دەکرا کە ئەو یاریدەی خولە پیزە دەدات و شێخ لەتیف ئێستا لە باشووری عێراق دەست بەسەرە[١١٨]، بەڵام ئەم بڕیارە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر شێخ مەحموود و لایەنگرانی نەبوو.

---

(١١٦) ئەوساکە سەعید قەزاز موتەصەریفی مووسڵ بوو، بە دەستی خۆی دەوالی ئاغای دۆسکیی گرت.

(١١٧) زۆر باش ئەو ڕۆژەم لە یادە، پێم وایە پۆلی سێی ناوەندی بووم، ڕۆژێك بەر لە سێدارەدانی تالەی برای خولەپیزە قەنارەیەك لە ناوەڕاستی شاردا، لە بەردەرگی سەرا، دانراو گۆنییەکی پڕ لە خۆڵی پێدا هەڵواسرابوو، بەرە بەیانی ڕۆژی داهاتوو تالە (طالیب)یان لە بەندیخانەوە هێنا و لە تەختانییەکەدا خەڵکانێکی زۆر هاتبوونە سەیری لە سێدارەدانەکەی، دیاربوو ئازایانە سەرکەوت و چاو و دەستیان بەستەوە و توورەکەیەکیان کرد بە سەریدا و لاشەکەی تاوەکو نزیك نیوەڕۆ بە هەڵواسراوی مایەوە و دوایی برایە کوردستان، خەڵکی شار دەیانگوت خولە پیزە بۆخۆی هاتۆتە سەیری لە سێدارەدانی براکەی و تەنانەت تێر و پڕ لە کەبابخانەی حاجی عەلی نانی خواردووە، کە هەڵبەت شتی وەها ڕووی نەداوە.

(١١٨) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا زاراوی "residence force" واتا «الأقامة الجبرية» کە خەتێکی بە ژێردا هێنراوە.

٣- کۆتایی تەشرینی یەکەمی «ساڵی ١٩٥٠-ک.م.» سی (٣٠) کەسێك لە لایەنگرانی «حیزبی شیوعیی عیراقی»[١١٩] گیران، لە مانگی مارتیشدا ژمارەیەکی دیکەیان لە هەر یەك لە کەرکووك و سلێمانی و هەولێر لێ گیران، لە هەردووك جاردا بڕێك ئەدەبیاتی شیوعیی گیران، بەڵام جاری دووەمیان بڕێك شتی مەترسیدار گیرا، هی وەك خشتەی تایبەتیی دەربارەی کارە خۆئامادەییکرەکانی سوپا و پۆلیسی عیراقی لە باکوور و ڕێگە و بان و پرد و ئەو جۆرە شتانە، لەگەڵ گشت ئەمانەیشدا ئێمە لەو بڕوایەداین چالاکیی کۆمۆنیستی لە باکووردا تاوەکو ئێستاکە هیچ مەترسییەك دروست ناکات، موتەصەڕیفی هەولێر بە کونسوڵی ڕۆژهەڵاتیی «باڵوێزخانەی بەریتانی لە عیراق-ک.م.» گوتووە ئەو جۆرە دیاردانە بریتین لە چالاکیی لاوان کە زۆرجاران لە لایەن سەرکردە ناوچەییە کۆنەپەرستەکانەوە هان دەدرێن بە هیوای ئەوەی لە بواری دووبەرەکیی بەردەوامیاندا لەگەڵ سەرکردە کۆنەپەرستەکانی دیکەدا کەڵکیان لێ وەربگرن.

٤- هەر چۆن بێ حوکمەتی عیراقی تاوەکو ئێستاکەیش مەترسیی کوردستانی هەیە، کاتێك کانوونی دووەمی ڕابردوو ڕازگری دووەمی وەزارەتی هەندەران زیارەتی کونسوڵخانەکەمانی «لە کەرکووك-ک.م.» کرد مەترسیی خۆی دەربارەی ئەوە دەربڕی کە لەوانەیە دامەزراندنی کۆمارێکی ئازەربایجانی[١٢٠] لە وێنەی کۆمارەکەی ساڵی ١٩٤٦ بە پیلانی سۆڤیەت لە عیراقیش ڕەنگ بداتەوە.

دواتر ئەو وێنەی ئەو لێکۆڵینەوە کورتەی دوایی کە دەزگا عیراقییەکان ئامادەیان کردووە و بە پێویستی دەزانن بێ دواخستن چەکی نوێ بە سەر سوپای عیراقدا دابەش بکرێ لەبەر ئەگەری ئاژاوەنانەوەی ڕووس لە کوردستاندا، من وێنەی وەرگێڕانی ئەو لێکۆڵینەوەیەی دەزگا عیراقییەکانت

---

[١١٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێ «سی کەسێك لە لایەنگرانی کۆمۆنیستی گیران».
[١٢٠] دیارە مەبەستی کۆماری کوردستانە.

بۆ دەنێرم، کونسوڵی خاوەن شکۆی بەریتانی لە کەرکووك لە لێدوانەکەی خۆیدا دەربارەی ئەم بابەتە نووسیویە دەڵێ گشت هۆزە کوردەکان لەوە دەچێ گەلێك بێ دەنگ بن. لێکدانەوەی تایبەتیی خۆی بۆ ئەو دیاردەیە ئەوەیە کە گرتنەکانی ئەم دواییەی مەحموود ئاغای زێباری و دێوالی ئاغای دۆسکی و شێخ لەتیف ئەوەیان بۆ سەرەك هۆزەکان دەرخست کەوا دەزگا کارگێڕییەکان سوورن لەسەر ئەوەی ڕۆڵی خۆیان ببینن.

بۆ خۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە واشنتۆن و تاران.

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز)[121]

دوا بەدوای ئەمە دانەیەك لە دەقی وەرگێڕانی لێکۆڵینەوەکەی دەزگا حوکمەتییە عێراقییەکان لە زوبانی عەرەبییەوە بۆ سەر زوبانی ئینگلیزی هەڵگێراوە کە نزیکەی دوو لاپەڕە دەبێ و لە چوار خاڵ پێکهاتووە.

بەشی یازدەمینی هەمان فایلیش بریتییە لە بەڵگەنامەیەکی نهێنیی هەمان باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا کە ڕۆژی شەشی نیسانی ساڵی ١٩٥١ ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکەکەیەتی:

(باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

نهێنی،

ژمارە ٥١/١٢/١٠٢٥،

٦ی نیسانی ١٩٥١

---

(121) N.A.,F.O., 371/91252, From: British Embassy,Baghdad, Confidential, No. 1025/11/51, 6th April, 1951, TO: Eastern Deartment, Foreign Office, London, S.W.1.

بەشی ڕۆژهەلاتی خۆشەویست.

١- لە ڕێگەی نامەی بۆرۆوە بۆ فرای کە ژمارەکەی (٥١/٢٣/١٦٨٣)ە بەوەمان زانی کە چیرۆکی ئەوەی گوایە مەلا مستەفا ئیجازەی لە فەرمانبەرانی ئێران وەرگرتووە کە لە «ڕێگەی ئێرانەوە-ك.م.» بچێتە ناو عیراق و ئەوەی برووسکەکەی سێر هێنری ماکی ڕۆژی بیست و یەکی کانوونی دووەمی «سالّی ١٩٥١-ك.م.» ئامارەی بۆی کردووە گەیشتۆتە بەشی دەولّەت.

٢- ڕاپۆرت دەربارەی ئەم چیرۆکە لە ڕێگەی حوکمەتی تورکییەوە گەیشتۆتە حوکمەتی عیراق و ئەوەیش پالّی بە قایمقامی ڕەواندزەوە ناوە مانگی شوبات ناوچە سنوورییەکان تاوەکو کانی ڕەش بپشکنێ تاوەکو بزانێت ئەو چیرۆکە هیچ بنەمای ڕاستیی هەیە، قایمقامی ڕەواندز بە کونسولّی خاوەن شکۆی لە کەرکوك گوتووە کە ئەو هیچ جۆرە بەلّگەیەکی دروستی ئەو دەنگوباوەی چنگ نەکەوتووە، گوتیشی ئەو بە هیچ جۆر سەری لەوە سوڕ نەماوە کە ئەو ئاغا کوردانەی کاتی ئاژاوەکەی مەلا مستەفا خەلاّتیان لە حوکمەتی عیراقییەوە وەرگرت لە پشت دروستکردنی ئەم دەنگوباوە بن، موتەصەریفی هەولێر لەم چەندانەدا کونسولّی ڕۆژهەلاّتیی «حوکمەتی بەریتانی-ك.م.» لەوە دلّنیا کردووە کە فەرمانڕەوایانی عیراق توانیویانە ئەوە بسەلمێنن کە دەنگوباوێکی لەو بابەتە هیچ بنەمایەکی ڕاستیی نییە.

بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ بالّوێزخانەکانمان لە هەر یەك لە واشنتۆن و تاران.

هەمیشە دلّسۆزتان

بالّوێز[١٢٢]

---

(122) Ibid, From: British Embassy, Baghdad, Confidential, No.1025/12/51, 6th April, 1951, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

بەر لە کۆتایی پێهێنانی ئەم بابەتە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ هەڵوێستی جەنەڕال شەریف پاشای خەندان بکەم کەوا دیارە دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانیی ناخی دەروونیی ئەویشی هەژاندووە و هەرچەندە ئەوسا تەندروستی خراپ بووە و لە نەخۆشخانەی ڕۆما کەوتووە، بەڵام ویستوویەتی کەڵک لەو دەرفەتە وەربگرێ کە بەریتانییەکان دەکەونە سۆراخی وەك لە ناوەڕۆکی ئەم دوو بەڵگەنامەیەی لای خوارەوە دەردەکەوێ.

بەشی داهاتووی هەمان فایل بریتییە لە سێ لاپەڕە، لاپەڕەی یەکەمیان نامەیەکی کورتی باڵوێزی بەریتانییە لە ڕۆما کە ڕۆژی سێی مارتی ساڵی ١٩٥١ ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە: باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

ڕۆما،

ژمارە: ٥١/٩٢/١٩٩١،

٣ی مارتی ١٩٥١،

بۆ بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

س.دەبل یو.١.

بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست

١- هاوپێچ یادداشتێکی کورتە دەربارەی کێشەی کورد کە باڵوێز داوای لە جەنەڕاڵ شەریف پاشا کردبوو تاوەکو بینێرێ بۆ تۆ، جەنەڕاڵی ناوبراو ئێستا بۆ عیلاج لە ڕۆمایە.

٢- باوەڕ ناکەین ئەم بۆچوونە ڕەشبینەی ئەم پیاوە ئەسڵ زادەیە زۆر کارتان تێ بکات، لەگەڵ ئەوەیشدا بۆتانی دەنێرم، چونکە خۆتان واتان دەوێ.

ئیمزا

هەمیشە دڵسۆزتان،
باڵویز– ڕۆما) [١٢٣].

پوختەی ناوەڕۆکی نامە فەڕەنسییەکەی جەنەڕاڵ شەریف پاشایش بریتییە لە ڕوونکردنەوەی ئەو زوڵم و ستەمە زۆرەی فەرمانڕەوایانی تورکیا و ئێران و عێراق لە کوردی دەکەن، لە تورکیا نەك هەر زوبانی کوردی قەدەغەیە، بەڵکو دان بە بوونی کوردیشدا نانێن، لە ئێران دان بە بوونی کورددا دەنێن، بەڵام ئەوانیش لە مافە نەتەوەییەکانی دیکەیان بێ بەری کراون، ئەوەیش کارێکی ئەوتۆی کردووە وەك دەڵێ: بەلشەڤیزم و ڕووسیا لای کورد پەسند بن و یەکیەتی سۆڤیەتیش هەوڵ دەدات کەڵك لەوە ببینێت، دیارە شەریف پاشا دەیەوێت بەریتانییەکان هان بدات ئاوڕ لە کورد بدەنەوە و وایان لێ بکات بڕوا بکەن لەوانەبێت دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە یارییەکی مۆسکۆ بێت [١٢٤].

تێبینییەك:

بە پێویستی دەزانم بەرلەوەی کۆتایی بەم بابەتە دەگمەنە بهێنم ئاماژە بۆ ڕاستییەك بکەم کە لە زاری برایەکی ئازیزەوە لەم بوارەدا بیستم، ئەویش کاك محەمەد سەعیدی فەقێ مەحموودە کە لەو ماوە زۆرەی ژیان و کارمدا لە لەندەن بردوومەتە سەر چ خۆی و چ صەبیحە خانی میرزا ئاوڕەحمانی هاوسەری و چ کوڕەکانی ڕەنج [١٢٥] و ئامانج و کاکە کرمانج و خاتوو لەنجەی کچیان و سامان خەفافی زاوایان بۆمان بووبوونە کەسوکار و هاوڕێی نزیك،

---

(123) Ibid, From:British Embassy, Rome, No.1991/92/51, May 3rd 1951, TO: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(١٢٤) زۆر بە گەرمی سوپاسی کارمەندی فەرەنسی زانی «ئەرشیڤی نیشتیمانی» (میخائیل برێن (Michael Berin) دەکەم کە یاریدەی دام لە ناوەڕۆکی نامە فەڕەنسییەکەی جەنەڕاڵ شەریف پاشا تێبگەم، هەر ئەویش لەو بوارەدا بەر لە ئێستا چەند جارێکی دیکە یاریدەی داوم و لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەیشدا بە تایبەتی سوپاسیم کردووە.

(١٢٥) خاتوو شەرمینی کچی دوکتۆر کاوس قەفتان هاوسەرییە.

بەر لەوە دەمزانی کاك محەمەد سەعید لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانییە چونکە کاك جەلالی برا بچووکی لە ناوەندیی سلێمانی هاوپۆلم بوو، وێڕای ئەوەی ئێمەومانان هەمووومان خوالێخۆشبوو کاك مستەفای برا گەورەیمان دەناسی کە خاوەنی «کۆگای گوڵزار» بوو، چونکە یەکەم کۆگا بوو لە کوردستاندا، ئەوەیشم دەزانی کە بەهیّ خان خوشکییە[١٢٦] هەمان کات ئاگاداری ئەوەیش بووم کە کاك محەمەد سەعید خوشکەزای عەلی کەمالی بەناوبانگە و یەکێك بووە لە کارگێڕە سەر ڕاست و دڵسۆزەکانی کورد.

هەموو ئەمانە بەسەر یەکەوە کارێکی ئەوتۆیان کرد لە لەندەن زوو زوو لەگەڵ ئەو بنەماڵەیەدا یەکتر ببینین و هەر هەموویشیان بە دڵ عەوداڵی ئەوە بوون بزانن بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی چۆن باسی کورد و کوردستان دەکەن، وەها ڕێککەوت لە دانیشتنێکی خێزانیدا پوختەی ئەم بابەتی «دەنگوباوی گەڕانەوەی بارزانی ساڵی ١٩٤٩ و ساڵی ١٩٥١ لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە لە دوو فایلی نهێنیی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا»م بۆ گێڕانەوە کە سەرنجی گشتیانی ڕاکێشا و کاك محەمەد سەعیدیش وەك شارەزایەکی ئاگادار گەلێك باسی ڕۆڵی گەورەی بزووتنەوەکانی بارزانی کرد و سەرگوزشتەی هەڵوێستێکی جوامێرانەی بارزانیی بەرانبەر خۆی گێڕایەوە کە چۆن ژمارەیەك ناکەس بەچە ویستوویانە خوێنی لای بارزانی بکەنە کاسەوە و چۆن عەلی کەمال بەگی خاڵی دڵی لێی ڕەنجاوە و خودی بارزانیی کاتێك ڕاستییەکانی بۆ دەرکەوتوون بە نامەیەکی نازدار داوای لێبووردنی لێی کردووە و دەقی نامەکەی نیشاندام کە ئیمزا بە ناوبانگەکەی خۆی بەسەرەوەیە، ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەی ئەو دەرسە مێژووییە بە کەڵکەیە کە سروشتی دوولایەنی جیاوازی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان دەخاتە دوو تای تەرازووی گەلێك جیاوازەوە.

---

[١٢٦] بەهیّ خان هاوسەری دادوەری ناسراو کاك محەمەد سالحە کە ڕۆژی دەی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠٧ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد.

بۆ ئەوەی تیشك بخەینە سەر گشت لایەنەكانی ئەم بابەتەی وەك مێژوونووسێك سەرنجی ڕاكێشاوم بە پێویستی دەزانم سەرنجی خوێنەری بەڕێز بۆ ئەوە ڕابكێشم كە كاك محەمەد سەعیدی فەقێ مەحموود ڕۆژی چواری مانگی تەشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٢٩ لە سلێمانی لە دایك بووە و هەر لەوێ ساڵی ١٩٤٨ ناوەندی تەواو كردووە و ساڵی ١٩٥٢یش كۆلێجی یاسا «حوقوق»ی لە بەغدا تەواو كردووە و بۆ ماوەیەكی كورت بووەتە پارێزەر و دوای ئەوەی بۆ ماوەیەكی دووروودرێژ وەك فەرمانبەرێكی كارگێڕیی سەركەوتوو لە باكوور و باشووری عیراق كاری كردووە و گەیشتووەتە پلەی قایمقام و جێگری موحافیز و یاریدەدەری ئەمین عام[١٢٧] پاشان بە خاوخێزانەوە بووەتە پەنابەری سیاسی لە بەریتانیا، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا كە ئەو بنەماڵەیەم لە نزیكەوە ناسی هەستم دەكرد چ كاك محەمەد سەعید خۆی و چ صەبیحەخانی هاوسەری چۆن لەنجەی كچیان و هەرچوار كوڕەكانیان بە شیری خاوێنی كوردایەتی گۆش كردووە.

## دەقی نامەكەی بارزانی:

كاتێك كار دەگات بەو ڕادەیەی خوێنی كاك محەمەد سەعید لای خودی بارزانی بكەنە كاسەوە یەكسەر كاك محەمەد نامەیەك دەنێرێ بۆ بارزانی و گشت لایەنەكانی مەسەلەكەی بۆ شی دەكاتەوە بەجۆرێك بارزانی قەناعەت دێنێ بەوەی بۆ خۆی بچێتە بنج و بناوانی تۆمەتە هەڵبەستراوەكە، ئەوساكە ئەم نامەیەی لای خوارەوە دەنێرێ بۆ محەمەد سەعیدی فەقێ مەحموود:

---

[١٢٧] شایانی باسە بەر لەوەی بچمە لەندەن بە ماوەیەك كاك محەمەد سەعید لە ڕێگەی كاك تاهیر حەیدەریی برادەرییەوە دانەیەك لەو كتێبەی بۆ ناردم كە بەم ناونیشانەوە لە لەندەن سەرەتا بە كوردی و ئینجا بە عەرەبی بڵاوی كردووتەوە «بیرەوەرییەكانم لە بواری كارگێڕی گشتی و تیشكێك لەسەر ژیانی كارگێڕیی ڕابردووم»، «مذكراتي في الادارة العامة وضوء على حياتي الادارية الماضية»، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠٤، ٢٦٠ صفحة.

(بۆ[١٢٨] برای عەزیز و خۆشەویستی خۆمان جەنابی مودیر ناحیە محەمەد سەعید مەحموودی زۆر موحتەرەم.

سەلام و ئیحتیرامم تەقدیمتان دەکەم، إنشاءاللە صیحەتتان باشە و ئێمەیش بە لوطفی خوا باشین.

عەزیزم کاغەزی جەنابتان بە دەستم گەیشت، موتەئەسیفانە بەو حاڵەی بەسەرتان هاتووە و إنشاءالله نەتیجەی خێری دەبێ و چی بڵێم کە ئێمە بە دەستی قضاء و قەدەری خوادا ناتوانین دەرکەوین، بەڵام زۆر حەز دەکەم ئەم کاغەزە جەنابتان بیدەنە مەکتەبی سیاسی تاوەکو جەنابتان ڕوخصەت بدەن بە ئیحتیرامەوە. سەلام لێتان دەکەم.

موخلیستان بارزانی مستەفا

ئیمزا

١٩٦٢/٩/٤)[١٢٩]

## هەڵوێستی عەلی کەمال

وەك گوتمان خوالێخۆشبوو عەلی کەمالی گەورە خاڵی کاك محەمەد سەعیدی فەقێ مەحموودە کە، وەك خۆی هەمیشە بە شانازییەوە باسی دەکات گەلێکی لە کانیاوی کوردایەتیی کەم هاوتای ئەو کەسایەتییەوە هەڵێنجاوە. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نییە کاتێك ئەو دەنگوباوە بۆ کاك محەمەد دروست دەکرێت عەلی کەمال و قادر قەزازی هاوڕێ و خزمی نزیکی گەلێك لۆمەی کاك محەمەد دەکەن و کاتێك بارزانی بەوە دەزانێت لە ڕێگەی سەردار ئاغای حەمەی ئەوڕەحمان ئاغاوە ئەم نامەیەی لای خوارەوەی بۆ دەنێرێت:

(براو خۆشەویستم عەلی کەمال بەگ، سوپاس و شوکرانە بۆ خوا کە هیچ کارێکم دژی کوڕی خاڵەکەت مامۆستا محەمەد سەعید نەنا کاتێك کە

---

[١٢٨] تەنها کەمێك دەستکاریی شێوازی ڕێنووسی نامەکەمان کردووە.

[١٢٩] بڕوانە دەقی وێنەی نامەکەی بارزانی.

قایمقامی ناوچەی پشدەر بوو چونکە ژمارەیەك لەو کەسانەی ویژدانیان مردووە چەند تۆمەتێکی ترسناکیان دژی ئەو پیاوە بێ تاوانە دروست کرد، بەلاّم خواوەندی گەورە پالّی پێوەنام بە قوولّی لە بابەتەکە بکۆلّمەوە و لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت ئەم مرۆڤە دوورە لەگشت ئەو تۆمەتانەی درابوونە پالّی، بەلّکو تەنانەت لە چاوی خۆیشم پاکژترە، بۆیەکا سوپاس بۆ یەزدان کە هیچ بڕیارێکی پەلەم لە دژی نەدا. بەم بۆنەیەشەوە داوای لێبووردن لە بەڕێزتان و لە جەنابی محەمەد سەعید دەکەم و لە خواوەندی گەورە دەپاڕێمەوە لە وێنەی زۆر بکات و هەمیشە سەرکەوتوو بێ و گەلێك سوپاس)[130].

دوای ئەوەی خوالێخۆشبوو عەلی کەمال لە ڕێگەی سەردار ئاغاوە ئەو نامەیەی بارزانیی پێ دەگات لەبەر چاوی هەمووان پەلاماری کاك محەمەد سەعید دەدات و بە گەرمی ئەم لا و ئەو لای و ناوچاوانی ماچ دەکات و پێی دەلّێت «بەڕاستی تۆ شێری مەیدانی و هەمیشە لە ژیانی تایبەتی و گشتیی خۆتدا پێڕەویی ئەم ڕێگە خاوێنە بکە» لە وەلاّمدا کاك محەمەد سەعیدی فەقێ مەحموود بە عەلی کەمال بەگ دەلّێت: «گەورەم، من خۆم بە یەکێك لە شاگردانی قوتابخانە پیرۆزەکەت دەزانم، ئەو قوتابخانەیەی خۆشەویستیی نیشتیمان و شانازیکردن بە کوردەوە و سەر ڕاستی و دلّسۆزیی ڕەسەنی بۆ کورد و کوردستان فێرکردین».

بەلّێ ژیان پڕییە لە دەرس و پەندی گەورە و پێویست و هەمیشە سەرکەوتن هەر بۆ ڕاستی و دلّسۆزییە !.

## پاشکۆیەکی زۆر پێویست:

بێ گومان بوونی بارزانی وەك پەنابەری سیاسی لە یەکیەتی سۆڤیەت مەترسییەکی زۆری لای گشت بەرپرسە گەورەکانی عیراق و ئێران و تورکیا،

---

[130] دەقی ئەم نامەیە لای صەباحی کوڕی خوالێخۆشبوو عەلی کەمال هەلگیراوە.

وێـڕای دەزگـا فـەرمییـە ئاگادارەکـانی بـەریتانیا و ولاّتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا دروست کردبوو، ئەو ڕاستییەی بە ئاسانی لە بابەتـەکانی بـەرگی یەکەم و دووەمی ئەم بەرهەمەدا هەستی پێ دەکەین. بێ گومان زۆر لەوانەیە گـەلێك فـایلی دیکـەی «ئەرشـیڤی نیشـتیمانی»ی بـەریتانی بـۆ ئـەم بابەتـە تەرخان کرابن.

خۆشبەختانە دوای ئەوەی ناوەرۆکی بابەتی ژمارە چـواری ئـەم بەشـەی کتێبەکەمم بۆ بەڕێز کاك تاهیر حەیدەری خوێندەوە لەوە ئاگاداری کـردم کـە قـەوارەی ئـەو باسـە گـەلێك لـەوەیش فـراوانتر و دەوڵەمەنـدترە کـە لـە بەڵگەنامەکانی ئەو دوو فایلەی ئەرشیڤی ناوبراودا هاتووە و یەکێك لـەو فایلـە نهێنییانەی نیشان دام کە بە زوبانی عـەرەبی بـەم ناوونیشـانەوە هـەڵگیراوە: «برادۆست، نهێنی، هەواڵی بارزانییـەکان» و ئەمـەی لای خـوارەوەیش دەقـی وەرگێڕانی چەند نموونەیەکی ناو ئەو فایلەیە.


تاهیر حەیدەری

(١- ئیفادەی مـەحموود خەلیفـە صـەمەدی سەرەك هۆزی برادۆست.

ڕۆژی بیسـت و یـەکی مـانگی ئـابی سـاڵی ١٩٥٢ عـەزیز خـانی پیـاوی نـووری بـەگ کـە لـە بـەگزادەکانی بەردەسـووری ئێرانییـە و دوای ئەوەی لێمـان پرسـی بـارودۆخی نـاوخۆی ئێـران چۆنە، گوتی نووری بەگ سڵاوتان لـێ دەکـات و دەڵێت بارزانییـەکان لـە چۆمی ئاراسـی «نێـوان یەکیەتی سۆڤیەت و ئێـران-ك.م.»پەڕیونەتـەوە و ئێستاکە لەناو خـاکی ئێرانـدان لـە مـاڵی شـکۆ «ڕەشید ئاغا»ی برای سەیدەخانی هەرکی و گوتی من بۆخۆم بە تەواوەتی دڵنیام لە هاتنیان و ئەمەیش ئیفادەکەمە.

١٩٥٢/٨/٢٣.

ئیمزاکان

مودیری ناحیەی برادۆست تاهیر حەیدەری، مەحموود بەگ سەرۆکی برادۆست).

٢- بەر لەو بەڵگەنامەیەی سەرەوە بە چوار ڕۆژ دەربارەی هەمان بابەت تاهیر حەیدەریی مودیری ناحیەی برادۆست ئەم نامە فەرمییەی لای خوارەوەی دەربارەی بارزانییەکان ناردووە بۆ قایمقامی ڕەواندز و ئەمیش یەکسەر دەقی نامەکەی ناردووەتە وەزارەتی ناوخۆی عیراقی لە بەغدا و ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەی وەرگێڕانی ئەو نامەیەیە.

(مودیریەتی ناحیەی برادۆست،

یەکجار نهێنی،

ژمارە ١٨٧،

ڕۆژی نۆزدەی مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٢،

بۆ:

قایمقامیەتی ڕەواندز،

بابەت:

پشتگیریی ڕووسیا بۆ بزووتنەوەی کوردی.

نیشانە بە نامەی ژمارە سی و نۆی ڕۆژی بیست و نۆی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٥٢.

دوا بە دوای لێکۆڵینەوەی ورد لە هاوپێچەکانی نامەی سەرەوەتان و هەڵسان بە ژمارەیەک تۆژینەوەی تایبەتی ئەمانەی لای خوارەوەمان بۆ دەرکەوت:

١- نەمانزانی تاوەکو چ ڕادەیەک ئەو زانیارییانەی لە نامەی ژمارە ٢٩٩ی ڕۆژی سیازدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٢ی باڵوێزخانەی عیراقی لە تارانەوە باسی کردوون ڕاستن.

٢- هەرچی دەربارەی ئەو زانیارییانەشە کە لە نامەی ژمارە ٤٥٦ی ڕۆژی چواری مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٢ی هەمان باڵوێزخانەدا هاتوون دەڵێن:

«هاتنی بارزانییەکان بۆ ناو خاکی عیراق ئەوانەی ناویان لە نامەی ناوبراوی سەرەوەدا هاتووە، لەوە ناچێت ڕاست بێت هیچ نەبێت بە نیسبەتی ژمارەیەکیانەوە، هی وەك بابکی برای مەلا مستەفا و شێخ خالید کە ئێستا وان لە بەصرە و کەربەلا، هەروەها قاسمیش کە بە قاسم پالآنی ناسراوە وەك زانیومانە ماوەیەك لەمەوبەر کۆچی دوایی کردووە، ئەوانەی دیکەش کە ناویان هاتووە، هی وەك ئەسعەد ئاغا «ئەسعەد خۆشەوی» و میر حاج ئێستا وان لەگەڵ مەلا مستەفا و هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە کە هاتبنەوە، هەرچی دەربارەی ئەوەیشە کە دوای گەڕانەوەی بارزانییەکان لە ئێرانەوە بۆ عیراق لە ساڵی ١٩٤٧دا ئافرەتێکی بارزانی لە موعەسکەری بارزانییەکانەوە لە ڕەواندز نێردراوە بۆ لای مەحموود ئاغای زێباری و ئەو ئافرەتەیش «خزیجا»ی هاوسەری شێخ ئەحمەدە کە لە گوندی «صەفتی»ی سەربە ناحیەی بیرەکەپرە دەژی و دوور نییە یەکێك لە هاوسەرەکانی مەلا مستەفایش نێردرابێت بۆ لای مەحموود ئاغای زێباری، ئەوەیش کردارێکی نهێنی نەبووە و دەتوانرێت سەیری لیستی ناوەکان چ لە بارەگای لیوای هەولێر و چ لە قەزای ڕەواندز بکرێت.

بۆ ئاگاداریتان

ئیمزا

مودیری ناحیەی برادۆست

تاهیر حەیدەری

٣- لەناو هەمان فایلدا نامەیەکی دەستخەتی مەحموود صالح بەگ بە بەرواری ڕۆژی سێ و یەکی مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٢ بە زوبانی عەرەبی هەڵگیراوە کە ناوبراو بۆ تاهیر حەیدەریی مودیزی ناحیەی برادۆست و

عوزرخوایی بۆ دەهێنێتەوە، کە ناتوانێت سەری بدات وەك داوای لێی کردووە، چونکە یەکجار نەخۆشە و لە کۆتایی نامەکەیدا مەحمووی صالح بەگ ئەم تێبینییەی لای خوارەوەی نووسیوە کە بە ئاشکرا ئەو ڕاستییە نیشان دەدات چۆن دەنگوباوەکانی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە و بەناو خاکی ئێراندا بۆ عیراق فەرمانڕەوایانی ئێرانیان شپرزە کردووە و کەوتوونەتە خۆ ئامادەکردنی هێزە سیاسییەکانیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی گشت ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوەکان:

(تێبینی: بە دڵنیاییەوە ئاگادارتان دەکەم کە هێزێکی سەربازیی ئێرانی بە گشت چەکەکانیانەوە وەك تۆپ و چەکی دیکە هێنراونەتە هەردووك سەربازگەی «زرتك» و «گروگورگۆ»، ژمارەی ئەو سەربازانەی هێنراویشن هەزار سەرباز دەبن، کە بە دروستکردنی خانووبەرە و گواستنەوەی دارو بەرد و کارەوە خەریکن بۆ پتەوکردنی سەنگەرەکانیان، هەرچەندە من بۆ خۆم بە تەواوەتی هۆ و مەبەستی ئەو هێزە نازانم.

ئیمزا

دڵسۆزتان مەحموودی صالح بەگ

١٩٥٢/٨/٣١)

٤- لە ناو هەمان فایلدا بەڵگەنامەیەکی یەکجار بایەخدار هەڵگیراوە کە بریتییە لە برووسکەیەکی یەکجار نهێنیی قایمقامییەتی ڕەواندز کە بە شفرە ناردوویە بۆ موتەصەڕیفی هەولێر و وێنەی لێ داوەتە معاونی پۆلیسی ڕەواندز و مودیری ناحیەی برادۆست تاهیر حەیدەری کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(قایمقامییەتی ڕەواندز،

یەکجار نهێنی،

ڕۆژی ١٩٥٢/٨/٢١،

موتەصەریفییەتی هەولێر،
بابەت:
هەواڵەکانی سنووری ئێران و
مەلا مستەفای بارزان.


شێخ رەشید لۆلان

وا لە خوارەوە وێنەی ئەو برووسکەیەی بە شفرە نووسراوە و ژمارە ٦٨٧ و مێژووەکەی «١٩٥٢/٨/٢١»ە دەربارەی ئەو بابەتەی سەرەوە بۆ ئاگاداری بۆتانی دەنێرین، وێڕای ئەوەیش فەرمانمان داوە بە معاونی پۆلیسی قەزاکەمان بۆخۆی بچێتە ناوچەی سەر سنووری ئێران بۆ زانینی ڕادەی ڕاستیی ئەو دەنگوباوانەی لەم بارەیەوە بڵاون و دوایش بەڕێزتان لە ئەنجامەکانی تاقییەکانی ئاگادار دەکەین.

وێنەی بۆ — معاونی پۆلیسی ڕەواندز، تکا دەکەین بێ دواخستن بچنە ناوچەی سنووری سەر ئێران بۆ زانینی ڕادەی ڕاستیی ئەو دەنگوباوە و ئاگادارمان بکەن.

وێنەی بۆ مودیری ناحیەی برادۆست بۆ ئەوەی دەستوبرد بکەوێتە تاقیبی ئەم دەنگوباوە و ئاگادارمان بکات.

وێنەی برووسکەکە بۆ:
معاونی پۆلیسی ڕەواندز،
هەروەها بۆ مودیری ناحیەی برادۆست.

شێخ ڕەشیدی لۆلان خزمەتکارەکەی خۆی، کە ناوی سەید صاڵحە و خەڵکی گوندی لۆلانە، ناردووە بۆ ئەوەی ئەمەی لای خوارەوە بە حوکمەت ڕابگەیەنێت:

«مەلا مستەفا لە چۆمی ئاراسەوە هاتووەتە ناو خاکی ئێرانەوە بە ناوی «پارتی دیموکراتی کوردستان»ەوە و بە هاندانی حوکمەتی ڕووسی شەڕێکی

قورس لە نێوان حوکمەتی ئێران لە تاران و ئەو دیموقراتە «کوردانەی — ک.م.» لە تارانن قەوما و لە ئەنجامدا ژمارەی کوژراو و بریندار گەیشتوونەتە نزیکەی پێنج هەزار کەس لە هەردووك لا و ئەوەیش بە هاندانی مەلا مستەفا قەوما، هەروەها شێخ ڕەشیدی لۆلان دەڵێت من دوژمنایەتیم لەگەڵ مەلا مستەفادا هەیە و هۆزەکەم هۆزی هەرکی و برادۆست نیازی نییە هاریکاریی لەگەڵدا بکات... هەمان کات لەسەر داوای حوکمەتی عیراقی سەرۆکەکانی ئەو دوو هۆزە ڕاسپێردراون لە کاتی پێویستدا هاریکاری «لەگەڵ هێزەکانی حوکمەتدا—ک.م.» بکەن، هەرچی حوکمەتی ئێرانیشە فەرمانی داوەتە هۆزە «کوردەکانی—ک.م.» خۆی کە تفەنگ بکڕن و خودی هێزەکانی میریش خەریکی پتەوکردنی سەنگەرەکانیانن، بۆ زانینتان تکایە).

٥— دوا نموونەی کە لێرە دەیهێنینەوە بایەخی زۆر زۆرە و زانیاریی ئەوتۆی تێدایە کە من بۆخۆم تا ئێستا نە لە هیچ کام لە بەڵگەنامە بەریتانییەکاندا و نە لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەدا نەمدیون، هی وەك ئەوەی دەڵێت ژمارەیەك ئەرمەن و ئازەریش لەو ڕۆژگارەدا بە چەکەوە داویانەتە پاڵ بارزانی، یان جۆر و سەرچاوەی ئەو چەکانەی بەدەست لایەنگرانی بارزانییەوە بوون، یان ڕاهێنانی بەشێك لەو لایەنگرانە لە قوتابخانە سەربازییە سۆڤیەتییەکاندا بە سەرپەرشتیی جەنەڕاڵێك و عەقیدێکی کوردەوە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەنامەیەیە:

(قایمقامییەتی قەزای ڕەواندز،

تەحریرات ٣٩،

ژمارە ٤،

ڕۆژ: ١٩٥٢/٧/٢٩،

یەکجار نهێنی و بەدەستی،

بۆ:

مودیری ناحیەی برادۆست،

معاوینی پۆلیسی ڕەواندز،

بابەت/ پشتگیریی ڕووسیا بۆ بزووتنەوەی کورد.

هـاوپێچ لەگـەڵ ئـەم نامەیـەدا وێنـەی نامـەی وەزارەتـی هەنـدەرانی «عێراقی–ك.م.» تان بۆ دەنێرین کە ژمارەکەی «س/٧٧٦/٧٧٦/٤/١٥٢١١»ە و مێژووی حەوتی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٥٢ی بەسەرەوەیە، لەگەڵ وێنەی دوو نامەی باڵوێزخانەی عێراقی لە تاران کە هەردووکیانمان بە نامـەی ژمارە ٢٢٠ی ڕۆژی بیسـت و سـێی مـانگی تـەمموزی سـاڵی ١٩٥٢ی موتەصـەڕیفی لیـوای هـەولێر پـێ گەیشـتووە، لەبـەر بایـەخی زۆرو پـڕ لـە مەترسیی ئـەو زانیارییانەی تێیاندایە داواتان لێ دەکەین بۆ خۆتان بەتایبەتی بایەخیان پـێ بدەن و بۆخۆتان تەحقیقاتێکی گەلێك ورد و هەمەلایەنی تێدا بکـەن، تایبـەت دەربارەی ئەو کەسایەتییانەی ناویان لـە هاوپێچـەکاندا هـاتووە و گشت ئـەو شتانەی پێوەندییان بـە بارزانییەکانـەوە هەیـە، تایبـەت ئـەو کەسـانەیان کـە دەڵـێن دزەیـان کردووەتـە نـاو خـاکی عێراقـەوە و ئـەو عێراقییانـەش کـە پێوەندییان پێیانەوە کردووە و ڕادەی ڕاستیی زانیارییەکان، بـە مـەرجێك لـە هەموو ئەمانەدا پەیڕەویی ئەوپەڕی دیقەت و نهێنی و خێرایی وەڵامدانەوەمان بکەن تاوەکو عەرزی مەقامی موتەصەڕیفییەتیان بکەین.

ئیمزا

قایمقامییەتی ڕەواندز).

لێرەیشەوە ئەم نامەیە دەست پێدەکات:

وێنـەی نامـەی وەزارەتـی هەنـدەرانی ژمـارە س/٧٧٦/٧٧٦/٤/١٥٢١١ بەرواری حەوتی تەمموزی ساڵی ١٩٥٢،

(یەکجار نهێنی،

بۆ:

وەزارەتی بەرگری،

وەزارەتی ناوخۆ،

ئاماژه بە نامەی ژمارە س/٧٦٦/٧٧٦/٤/٢٩١٥ی ڕۆژی هەژدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٢.

هاوپێچ دانەیەك لە وێنەی هەردووك نامەی باڵوێزخانەكەمان لە تاران، كە ژمارەكانیان «س/٢٩٩ و ٢٥٦»ە و بەرواری هەردووكیان ڕۆژانی دوو و چوار و سیازدەی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٢ن و بۆ ئەو بابەتەی لای سەرەوە تەرخان كراون بۆتانی دەنێرین، بۆ بینینیان و فەرمان بدەن لێكۆڵینەوەیەكی نهێنی و ورد دەربارەی ناوەڕۆكیان بكەن و ئاگادارمان بكەن لەو ئەنجامانەی پێیان دەگەن.

ئیمزا

لە بریتی

وەزیری هەندەران،

وێنەیەكی بۆ باڵوێزخانەی عیراقی لە تاران،

وێنەیەكی بۆ موفەوەزییەتی خاوەن شكۆی عیراقی لە ئەنقەرە،

ئاماژە بەو نامەیەی لە سەرەوە باسیمان كردووە وێڕای دانەیەك لەو دوو نامەیەی سەرەوە بۆ بینینیان و لە هەر شتێك ئاگادارمان بكەن دەربارەی زانیاری و مەعلوماتی ورد دەربارەی بابەتەكە).

دوا بە دوای ئەمەیش لە هەمان لاپەڕەدا ئەمەی لای خوارەوە نووسراوە:

(وێنەی نامەی باڵوێزخانەی عیراقی لە تاران،

ژمارە س/٢٩٩،

ڕۆژی ١٣ی شوباتی ١٩٥٢،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران.

نیشانە بە پێوەندییەكانمان كە دواتر نامەی ژمارە س/٢٢٠ی ڕۆژی پازدەی مانگی مارتی ساڵی ١٩٥٢بوو، وە نیشانە بەو نامەیەتان كە

ژمارەکەی س/٧٧٦/٧٧٦/٢٩١٥یە و زنجیرەی دووسەد و بیست و هەشتە و ڕۆژی هەژدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٢ ناردووتانە وا لە خوارەوە ژمارەیەك لەو زانیارییانەتان دەربارەی مەلا مستەفای بارزان بۆ دەنێرین کە گشتیانمان لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە پێ گەیشتوون و بەشێکیان جەخت لەسەر ئەو بۆچوونانە دەکەن کە لە نامەکانی پێشووماندا ئاماژەمان پێیان داوە.

١- ئەو هێزەی وا لە ژێر سەرکردایەتیی مەلا مستەفادا بریتییە لە بارزانییەکان خۆیان و ئەو کوردە ئێرانییانەی داویانەتە پاڵیان و ژمارەیەك ئەرمەن و ئازەری، کۆی هەموویشیان دەگاتە دوو هەزار و پێنج سەد (٢٥٠٠) جەنگاوەر، ئەوەیش کە دەڵێن ژمارەیان لەوە زۆرترە زێدەڕۆیی تێدایە.

٢- ئەو هێزە ئێستاکە وا لە ناوچەی ئاراسدا، لە «عەرەب کۆپروسی» و باکووری ئەو مەڵبەندە.

٣- ئەو هێزەی «بارزانیی-ك.م.» چەك و تفاقی جەنگیی نوێیان پێدراوە و سەرچاوەکان لە دیاریکردنی ئەو چەکانەدا یەك ناگرنەوە، بەڵام ئێمە لەو باوەڕەداین بەشێکیان بریتین لەو چەکە ئەڵمانییانەی «کاتی خۆی سۆڤیەتییەکان دەستیان بەسەرداگرتن-ك.م» وێڕای چەکی ڕووسیی نوێ.

٤- ئەو کەسانەی هێزەکەی مەلا مستەفا کە شەڕکەری لێهاتوون لە قوتابخانە سەربازییە «سۆڤیەتییەکاندا-ك.م.» مەشقیان پێدەکرێت و وێڕای ئەوەی دەورەی تایبەتیشیان بۆ دەکرێتەوە.

٥- دەزگایەکی «سۆڤیەتی-ك.م.» تایبەتی بەرپرسی ڕێکخستن و فێرکردنی هێزەکەی مەلا مستەفایە و دوو ئەفسەری کورد کە یەکێکیان جەنەراڵ کوباك یان قوباقە کە نەمانتوانیوە نە ناوەکەی ونە خەڵکی چ ناوچەیەکە بە وردی بیانزانین، ئەوی دیکەیشیان عەقید سابیان دۆرفە و ناوەکەی بۆ ڕەسەنی و شوێنی ژیانی بە وردی دەستنیشان ناکات بۆیە ئەویشمان بە تەواوەتی نەناسی.

تێبینی:

عەقید سابیان دۆرف ئەندامی لیژنەی باڵای ڕاوێژکارانە لە یەکیەتی سۆڤیەت، دانانی کەسایەتییەکی لەو جۆرەش لە دەزگایەکی تازە دامەزراودا کە نیازییە تەشەنە بسێنێت کارێکی چاوەڕوان نەکراوە و زۆر لەوە دەکات ڕاست بێت.

٦- لەوەتەی مەلا مستەفا پەنای بردووەتە بەر ڕووسیا چەندجارێك چووەتە مۆسکۆ بۆ پێوەندیکردن بە بەرپرسە سۆڤیەتییە گەورەکانەوە و بووەتە جێگەی بڕوای ئیدارەی سۆڤیەتی و دەشڵێن دوو جاران ستالینی دیوە.

تێبینی: ئایا دەزگا ئاگادارەکان هیچ دەربارەی ئەفسەرێك بەناوی «قاسم»ەوە دەزانن، چونکە ئێمە بۆخۆمان ناوی تەواوی و لەقەبی نازانین، بۆیەکا تکاتان لێ دەکەین هەر زانیارییەکتان دەربارەی هەیە بۆمانیان بنێرن تاوەکو بۆخۆمان بکەوینە تاقیبی.

ئیمزا

وەزیر موفەوەز و قائیم بالأعمال کاتی).

پێموایە لەم بوارەدا هیچ زانیارییەك نییە لەم بوارەدا بتوانێت شان لە شانی زانیارییەکانی ناو ئەم بەڵگەنامەیە بدات و ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کە دەنگوباوەکانی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بۆ کوردستان کاتی خۆی چ هەرایەکی گەورەی لە ناوچەکەدا وورووژاندووە..

بابەتی پێنجەم:

# نامە دەگمەنەکانی بارزانی
# ناوەندی چلەکانی سەدەی ڕابردوو و
# دەنگوباسی گەڕانەوەی لە یەکیەتی
# سۆڤیەتەوە لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی
# حوکمەتی بەریتانیدا

**سەرەتا**

راپەڕینی کوردی عیراق لە ناوەندی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا بە ڕەهبەریی بارزانی کە بە یاریدەی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود توانیی لە سلێمانی هەڵبێت و بگەڕێتەوە ناوچەی بارزان لە گشت ڕوویەکەوە هەنگاوێکی مێژوویی گەورە بوو بەرەو پێشەوە لە بواری خەباتی ڕزگاریخوازیی نەتەوەی کورددا، بۆیەکا دیپلۆماسییە بەریتانییەکان بە پەرۆشەوە کەوتنە دووی گشت دیاردە و ئاڵوگۆڕەکانی و دەیانویست هەرچۆنێك بێت ڕێگە چارەیەك بۆ ئەو کێشەیە بدۆزنەوە، تایبەت لەبەر ئەوەیش کە جەنگی دووەمی جیهانی هێشتا کۆتایی نەهاتبوو، وێڕای ئەوەی بەریتانییەکان مەترسیی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە لەو ڕۆژگارە ناسکەدا سەرجەمی هێزە چالاکەکانی کورد ڕوویان کردبووە مۆسکۆ بەو هیوایەی بە یاریدەی کرێملن بتوانن بگەنە چمکێك لە ئاواتە نەتەوەییە دێرینەکانیان. لەگەڵ ئەوەیشدا ڕەهبەرانی کورد سەرەتا نەیاندەتوانی تەرازووی هێزی نێودەوڵەتی وەبەرچاو نەگرن، ئەو ڕاستییە بایەخدارەی لە ژمارەیەك نامەی بارزانی و دیپلۆماسییە بەریتانییەکاندا بە چڕوپڕی ڕەنگی داوەتەوە و بەشی هەرە زۆری ئەو نامە دەگمەنانە لە «ئەرشیڤی نیشتیمانیی» بەریتانیدا هەڵگیراون و وا لە خوارەوە ژمارەیەك نموونەیان لێ دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز:

١- بارزانی یەکەم نامەی خۆی ڕۆژی یازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤ ناردووە بۆ باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا بە زوبانی عەرەبی و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(فەخامەتمەئابی باڵوێزی حوکمەتی خاوەن شکۆ سێر کینهان کۆرنوالیسی پایە بڵند[1].

---

[1] سێر کینهان کۆرنوالیس (Sir Kinhan Cornwaliss) ڕۆژی نۆزدەی مانگی شوباتی ساڵی ١٨٨٣ لە نیویۆرك لە دایك بووە، باوکی نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی ناسراو بوو، زانکۆی ئۆکسفۆردی تەواو کردووە، زوبانی عەرەبی خوێندووە و لە سودان و میسر و

سڵاوی شایان و ڕێزی پێویستم پێشکەشی شکۆدارتان دەکەم.

بەپێی فەرمانتان و نیازی خاوێنتان و شەرەفی بەریتانیای گەورە وەزیری عیراقی ماجید (مستەفا — ک.م.) بەگم دی و دڵنیام کرد دەربارەی فەرمانەکانی و من داوای هیچ ناکەم هەرچەندە زۆر لێکراوم و پشتم بە شەرەفی حوکمەتی بەریتانیا و ئێوەی شکۆمەند بەستووە، وێڕای ئەوەی خۆم خستووەتە ژێر سێبەری وەصیی گەورە و تایبەت دوای ئەوەی خاوێنیی نیازەکانم بەوە دەربڕی کە حامییەی مێرگەسوورم دانێ و ئێستاش شەڕ و خەیرم وان لە ئەستۆی شکۆمەندتانا و چاوەڕوانی ئەوەین کە لایەقی مەقامی باڵوێزی خاوەن شکۆی بەریتانیای گەورەیە و ئەوەیش کارێکی لێهاتووی پایە بڵندتانە و لە خواوەندی گەورە داواکارین سوپای بەریتانی بەسەر گشت دوژمنەکانیدا سەربخات و فەرمان فەرمانی ئێوەیە گەورەم.

دڵسۆزتان

بارزانی

ئیمزا

ڕۆژی یازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤ )[٢].

---

عەرەبستان کاری کردووە، لە ساڵی ١٩١٦وە بووەتە کۆڵۆنێل و کراوەتە بەڕێوەبەری بیرۆ «مەکتەب»ی عەرەبیی بەناوبانگ، لە ساڵی ١٩١٩ەوە پێوەندیی نزیکی لەگەڵ مەلیک فەیسەڵی یەکەمدا هەبووە و ساڵی ١٩٢١ لەگەڵیدا هاتووەتە عیراق و لەو ساوە بۆ ماوەی پازدە ساڵان بووەتە ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عیراقی و ساڵی ١٩٣٥ خۆی خانەنشین کردووە، بەو بۆنەیەوە مەلیك غازی ویسامی بەرزی ڕافیدەینی داوەتێ، لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی گەڕاوەتەوە سەر کار و لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤١وە تاوەکو مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٥ بووەتە باڵوێزی بەریتانی لە عیراق، ڕۆژی سێی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: وێب سایتی ئەرشیڤی نیشتیمانیی، هەروەها:

"The Pominions Office and Colonial Office List for 1935", London, P.644.

(2) N.A., F.O., 624/66, Part ONE (1-35).

دوا به دوای ئەم نامەیەی بارزانی لە هەمان فایلدا یادداشتێکی دوور و درێژی ماجید مستەفا بە ناونیشانی «پرسی بارزانی»ەوە هەلگیراوە کە ڕۆژی هەژدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤ پێشکەشی ئەنجوومەنی وەزیرانی حوکمەتی عیراقی کردووە[٣].

دوای ئەمە لە هەمان فایلدا نامەیەکی ڕاوێژکاری سیاسیی هێزە بەریتانییەکان لە ناوچەی باکووری عیراق کە بارەگاکەی لە کەرکووک بوو هەلگیراوە، ئەوساکە کۆلۆنێل لاین کە یەکێك لە ئاگادارانی پرسی کورد بوو لەو پۆستەدا بوو، نامەکەیشی بریتییە لە وەلامنامەی لاین بۆ بارزانی کە وەها دیارە بە بۆنەی جێژنی سەری ساڵەوە بارزانی پیرۆزبایی لێی کردووە، ئەمەی لای خوارەوەش دەقی وەرگێڕانی ئەو نامەیەیە کە کۆلۆنێل لاین بە عەرەبی ناردوویە بۆ بارزانی:

(دایەرەی ڕاوێژکاری سیاسیی

هێزە بەریتانییەکان لە ناوچەی

باکووردا،

کەرکووك،

٤ی کانوونی دووەمی ١٩٤٤،

خۆشەویستم مەلا مستەفای بارزانی بەڕێز،

دوای سلاو

بە سوپاسێکی زۆرەوە جەژنە پیرۆزەکەتانم وەرگرت، هیوادارم هەمیشە سەرکەوتووبن و ساڵی نوێتان پڕ لە خێر و بەرەکەت و خۆشی بێت.

وەك ئاگادارن ماجید مستەفا بەگ وەزارەتێکی تایبەتیی پێ سپێردراو هیوادارم لەو ئەرکەیدا سەرکەوتوو بێت تاوەکو ئاشتی و ئیستیقرار و ئاسوودەیی تەواو باڵ بکێشێت بەسەر ناوچەی کوردستاندا.

---

(3)Ibid, PP.26-29.

لەبەر ئەوانە هیوادارم گوێڕایەڵی ئەو پێشنیازانە بن کە پێشکەشتانی دەکات و هەربژین بە خۆشی.

دڵسۆزتان کۆلۆنێل دەبل یو. أ. لاین،

ڕاوێژکاری سیاسیی هێزە بەریتانییەکان

لە ناوچەی باکوور[٤].

وەها دیارە لاوە چەپڕەوە خوێن گەرمەکانی شاری سلێمانی دژی جموجۆڵی ئاغاکان وەستاون، ئەوەی پاڵی ناوە بە ژمارەیەك لە ئاغایانی شارباژێڕەوە ڕۆژی چواری مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٤ ئەم نامەیەی لای خوارەوە بە زوبانی کوردی بنێرن بۆ باڵوێزی بەریتانی لە عێراق و وێنەی لێ بدەنە ڕاوێژکاری سەربازیی بەریتانی لە مووسڵ میستەر کینج:

(٤/٤/٩٤٤،

سلێمانی،

بۆ فەخامەتی سەفیری بەریتانیای گەورە لە عێراق،

صورەتی بۆ سەعادەتی موشاویری عەسکەری میستەر کینج لە مووسڵ.

ئێمە رونەسا و عەلاقەداری قەزای شارباژێڕین و بە مەعروزاتی ژێرەوە موساعەدە و لوتفتان جەلب ئەکەین. لە تەشەکولی ئەم وەزارەتەیا ئومێدمان بە ئیسلاحاتێکی چاك هەبوو، خاصەتەن لە گرانی و تێگەیشتنی مەعالی مەجید مستەفا (کە) لە مەناطقی شیمالییەدا ئەفکاری عام و دەرەجەی ئیحتیاجاتی زانیوە. ئومێدمان دەکرد کە ئیقتراحێکی شامیل تەقدیمی حوکومەت بکات و حوکمەتیش بە شەفەقەتەوە بیخاتە بەر نەزەری ئیعتبار کە ئەمە چاکترین (ڕێگەیە) بۆ تەحکیمی وەحدەت و مەصاڵحی عام ئەکات

[4] Ibid, From W.A.Lyon, To: Mulla Mustafa Barzani, 4 January 1944, Kirkuk.

(بەلأم) وەها دەردەکەوێت کە حوکمەت لەم شەفەقەت و لزومییەتە چاوپۆشی بکات و گوێ بداتە بەعزێ کەس کە بەخیلافی ڕەغبەت و مەصلەحەتی عام و بە زدی ئیقتیراحی ماجید بەگ موراجەعەتیان بە مەقامەتی عالییە کردووە. ئێمە ئەمانە تەکزیب دەکەین و تەئییدی ماجید بەگ ئەکەین و پێویستە ئەهەمییەت نەدرێت بە قسەی بەعزە شەخسێك کە تەنها مەقصودیان تەشویشە و ئەم نەوعە شەخصانەیش لە ئیخفال کردنی چەند تەلەبەیەکی منداڵ نەبێت لە ناو موجتەمەعا هیچ مەوقعێکی ئیجتیماعی و ئینسانییان نییە، ئیتر مونتەزیری نەتیجەی ئەم مەعروزاتە و شەفەقەتی حوکمەتی موعەزەمەمانین

## ئیمزاکان

لە ڕوئەسای ژێرەوە
ڕەشید ئاغای عەبدوڵلا ئاغا
لە ڕوئەسای پشدەر
دەروێش ئاغای عوسمان ئاغا
داخڵی قەزای شارباژێر
لە ڕوئەسای سادات
سەید عومەر شێخ عەبدولڕەحمان
داخڵی قەزای شارباژێر،
لە ڕوئەسای پشدەر
حاجی حەمە ئاغای عەلی ئاغا

لە ئاغاواتی شیوەکەڵ
حەسەن ئاغای سلێمان ئاغا
لە ئاغاواتی پشدەر
مەحموود ئاغای ڕەسول ئاغا
ڕەئیسی ئاغاواتی شیوەکەڵ
عەبدولڕەحمان ئاغای حەمە
ڕەشید ئاغا
لە ئاغاواتی پشدەر
حەسەن ئاغای عەلی ئاغا
لە ئاغاواتی پشدەر
بابەکری عەباس ئاغا(٥)

لە ئاغاواتی پشدەر
بابەکری حاجی حەمە ئاغا
لە ئاغاواتی شیوەکەڵ
حەمە ئاغای ئیسماعیل ئاغا
لە ئاغاواتی پشدەر
هەمزە ئاغای عەبدوڵلا
لە ساداتی شارباژێر
شێخ ڕەشیدی شێخ حەسەن
لە ئاغاواتی پشدەر
حەمە عەباس ئاغا

بەر لەوەیش دیسانەوە ئەم نامانەی لای خوارەوەی بارزانی بۆ بەریتانییەکان و لەسەروو هەمووشیانەوە بۆ خودی باڵوێزی بەریتانی لە عیراق لە «ئەرشیڤی نیشتیمانیی» حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن پارێزراون.

(5) N.A., F.O., 624/66, Part Two (36-54).

نامـەی یەکـەمیان بـە زوبـانی عـەرەبی نووسـراوە و بـارزانی ڕۆژی نـۆی مانگی نیسـانی سـاڵی ١٩٤٤ ناردوویـە بـۆ بـاڵوێزی بـەریتانی لـە عـێراق سـێر کینهان کۆرۆنوالیس و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(فەخامەتمەئابی باڵوێزی خاوەن شکۆی بەریتانیی پایە بڵند.

خواوەندی گەورە بتانهێڵێت و هیوادارین هەمیشە سەرکەوتووبن و لە ژێر سایەی بەریتانیای گەورەدا بە ئازادی و بەختەوەری بژین.

گەورەم دەمـەوێت ئاگادارتـان بکـەم کـە بـێ دواکـەوتن فـەرمانی ئێـوەم بەجێ گەیاند و شەڕم لەگەڵ حوکمەتدا وەستاند و بەو جۆرە فەرمانی ئێوە و مەلیکم ڕاگەیاند، حوکمەتیش بەرانبەر بـەوە پـەیمانی دایـێ سـوپا لـە بلـە و مێرگەسۆر بکشێنێتەوە و عەفواتی گشتی دەربکات و ژمارەیەك چاکسازی لـە کوردستاندا بکات لەبەر ڕۆشنایی ئەو یادداشتەدا کە وەزیری دەوڵـەت ماجیـد مســتەفا بــەگ داویەتــە وەزارەت بــە پێــی فــەرمانی ئێــوە دەربــارەی چاکسازییەکان، بەڵام حوکمەت تاوەکو ئێستاکە هـیچ کامێـك لـە بەڵێنـەکانی خۆی نەبردووەتە سەر و دەستی کردووەتە خۆنیشاندانی «سەربازی — ك.م» و لەوەیشەوە دەردەکەوێت نیـازی بەرانبـەرمان خـاوێن نییـە و چـەند جارێـك هــەوڵی داوە چــەکمان بکــات و ئەفســەرە ئیرتیباتــەکانی[٦] هــاتبوون بــۆ چارەســەرکردنی ئــەو کێشــانەی لــە ناوچــەی بــاکووردا ڕوو دەدەن و بــۆ موراقەبــەتی فەرمانبــەرەکانی (مــیری—ك.م) و قەدەغــەکردنیان لــە دزی و جەردەیی و ئەو ئەفسەرانە لە دڵسۆزی بـۆ حوکمـەت و گـەل هیچـی دیکـەیان پێوە دیاری نەداوەو خەریك بوو بارودۆخەکە چاك ببێت کەچی ئا لـەو کاتـەدا حوکمەت دەستی کـردە پتـەوکردنی هـەردووك حامییـەی بلـە و مێرگەسـۆر و دەنگوباوێکی وەها بڵاوبووەوە کـەمیری سـوپا دێنێتـە عـەقرە و ڕەوانـدز بـە

---

[٦] بە پێی ڕێککەوتننامەیەکی تایبەتی ژمارەیەك ئەفسەری کورد کرابونـە چـاودێری هـەردووك لا— حوکمەت و شۆڕشگێڕانی کورد بۆ جێبەجێکردنی گشت مەرج و بەڵێنەکانی هەردووك لا.

بیانووی مەشقەوە، ئەمە لە کاتێکدا هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نەبوو کە حوکمەت نیازی چاکسازیی هەیە، بە پێچەوانەوە میری شتێکی دروست کرد کە گوایە بەرەیەکی موعارەزەیە کە لەو کەسانە پێکهاتووە لە گێرەشێوێن و بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان بەولاوە هیچی دیکەیان مەبەست نییە و هیچ کێش و ڕایەکیان لە وڵاتدا نییە و هیچ کێش و ڕایەکیان لە وڵاتدانییە لە فیتنەبازی و فەساد بەولاوە بە پێی ڕاوێژی ئەڵقە لە گوێکانی میری کە دەیانەوێت هەموو شتێك وەك خۆی بمێنێت و ئەوەیش دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕەد فیعلێکی «خراپ– ك.م» لەنێو ڕیزی چین و توێژەکانی باکووردا، بۆیەکا داوا لە شکۆمەندتان دەکەین کە بیر و بۆچوونی بەرزی خۆتانمان پێ بڵێن کە ئایا هیچ جۆرە مەترسییەك بۆ ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیای گەورە لەوەدا هەیە ئەگەر بێتو ئێمە ڕاستییەکان چۆنن بەو جۆرە نیشانی «کاربەدەستەکانی حوکمەتی عیراقییان–ك.م» بدەین و مافی خۆمان بە دەستی خۆمان وەربگرین و چاوەڕوانی وەڵامتانین بۆ ئەوەی فەرمانتان ڕابگەیێنین و گەورەم فەرمان فەرمانی ئێوەیە و بەندە لە ئێوە بەولاوەکەسم نییە.

دڵسۆزی ڕاستەقینەی پایە بڵندتان

بارزانی

١٩٤٤/٤/٩

ئیمزا)[٧].

بەر لەوە و لە هەمان فایلدا ئەم نامەیەی بارزانی کە بەزوبانی عەرەبی ڕۆژی یازدەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤ ناردوویە بۆ باڵوێزی

(7) N.A., F.O., 624/66, Part Two (36 – 54).

بــەریتانی لـــە عــیراق هــەڵگیراوە و ئەمـــەی لای خـــوارەوەیش دەقـــی وەرگێڕانەکەیەتی:

(فەخامەتمەئابی باڵوێزی بـەریتانیای گـەورە سـێر کینهـان کۆرۆنوالێسـی پایەدار.

سلاوی شایان و ڕێزی پێویستم پێشکەشی مەقامتان دەکەم

بــەپێی فــەرمانی فەخامەتمــەئابتان و خــاوێنیی نیازتــان و شــەرەفی بەریتانیای گەورە وەزیری دەوڵەتی حوکمەتی عیراقی پایەبەرز ماجید بەگم بـینی و دڵنیـام کـرد دەربـارەی فەرمانـەکانی و بەنـدە داوای هـیچ ناکـەم هەرچەندە زۆر لێکراوم، بەلام جڵەوی کـاری خـۆمم داوەتـە دەست شـەرەفی حوکمـەتی بـەریتانیا و شـکۆمەندتان، وێـڕای ئـەوەی خـۆم خسـتووەتە ژێـر سایەی وەصیی گەورە، تایبەت دوای ئەوەی بەنیازێکی خاوێنـەوە حامییـەی مێرگەسوورم دایێ بۆ ئەوەی بێ بەری نەبین لە کەرامـەتی، ئێسـتاش شـەڕ و خێـری بەنـدە بەسـتراوەتەوە بـە فـەرمانی ئێـوەوە و چـاوەڕوانی «ئـەو هەنگاوانەین– ک.م.» کە لایەقی مەقامی باڵوێزی خـاوەن شـکۆی بـەریتانیای گەورەن، ئەوەیش لە هیممـەتی بـەڕێزتان چـاوەڕوان کـراوە و لـە خواوەنـدی گەورە دەپاڕێمەوە سوپای بەریتانی بەسەر گشت دوژمنەکانیدا سەر بکـەوێت فەرمان فەرمانی ئێوەیە گەورەم.

دڵسۆزتان

بارزانی

ئیمزا

١٩٤٤/١/١١)[٨].

---

[8] Ibid, 624/66, Part One (1-35).

به داخەوە لەو قۆناغە ناسکەدا ڕۆژ بە ڕۆژ پرسی کوردی عیراق ئاڵۆزتر دەبوو، هەرچەندە ڕەهبەرانی کورد پەنایان دەبردە بەر گشت ئەو ڕێگایانەی هیواداربوون ببنە هۆی کردنەوەی گرێ کوێرەی بەختی نەتەوەکەیان و هەر لەبەر ئەوەیش پەیتا پەیتا ڕوویان دەکردە بەریتانییەکان و ئەوانیش بە هەستێکی هاوچەرخ مامەڵەی بابەتەکەیان دەکرد، بەڵام گیانی توندڕەوی نەتەوەپەرستیی فەرمانڕەوا عەرەبەکان بوونە گەورەترین کۆسپ لەبەردەم دۆزینەوەی چارەسەرێکی عادیلانەی کێشەی کورددا، ئەوەی تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لە دووتوێی ئەم بەڵگەنامانەی لای خوارەوەدا هەستی پێ دەکەین.

یەکەم بەڵگەنامەی لێرەدا دەیخەینە بەر چاو بریتییە لە نامەیەکی تایبەتیی دوور و درێژی دوو لاپەڕەیی کە لە چوار خاڵی سەرەکیی پێکهاتووە و باڵوێزی بەریتانی لە عیراق ڕۆژی بیستی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٥ بە زوبانی عەرەبی ناردوویە بۆ بارزانی و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(ژمارە ٢٧٢/٤٠/٤٥،

لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە لە بەغدا،

ڕۆژی بیستی مارتی ١٩٤٥،

بۆ:

جەنابی ناسراو و ڕێزدار مەلا مستەفای بەڕێز،

دوای سڵاو و ڕێز.

١- بەندە عیراق بەجێ دەهێڵم و بە داخەوە بۆخۆم ناتوانم ماڵئاواییتان لێ بکەم، بەڵام لە بریتی ئەوە وا ئەم نامەیەتان بۆ دەنێرم.

٢- وەك دەزانن بەندە گەلێك بایەخم بە كاروبارتان داوە و لە دەمێك ساڵەوە. ئێوە تاوەكو ئێستاكەیش زەحمەتی دەچێژن، بەلام ئەوە ڕێگەی هەموو ئادەمیزادێكە و دەتوانن بەوە دڵخۆشبن كە كێشەكانتان ئێستاكە لە جاران پتر نزیكی چارەسەركردنن و وەك دەزانن حوكمەتی عیراقی ئێستا یاسای لێخۆشبوونی لێتان پێشكەشی ئەنجوومەنی نوێنەران كردووە و ئەو یاسایەیش دەرفەتی ژیانێكی نوێتان بۆ دەڕەخسێنێت و دەتوانن لە دوا ڕۆژدا وەك هاووڵاتییەكی بێ وەی بژین، لە لایەكی دیكەوە ئەوەیش دەزانم كە ئێوە دەتانەوێت شتێكی زۆر بۆ خەڵكەكەتان بكەن، ئەم خاڵە بە شێوازێكی چاك لە بەغدا هەستی پێ دەكرێت و هاوڕێ بەریتانی و عیراقییەكانتان هەمیشە هەوڵ دەدەن دەستی یاریدەتان لەم بارەیەوە بۆ درێژ بكەن، بەلام پێویستە ئەوە بزانن كە هەنگاو دوای هەنگاو بنێن بۆ وەدیهێنانی ئەو ئاواتە و پێویستە ئەو هەنگاوانە لە هەڕەشە و نانەوەی یاخیبوون بە دووربن، چونكە هەڕەشەیەكی لەو جۆرە جێگەی ڕەزامەندیی كەس نییە و نە بەریتانییەكان و نە عیراقییەكان پێی قایل نین، بە پێچەوانەوە پاڵیان پێوەدەنێت وەها بیر بكەنەوە كە ئێوە كەسێكن ئارەزوو دەكەن ئاشتی بشێوێنن و تەنها كاتیان بە فیڕۆ بدەن، ئێوە پێویستە سەیری دوارۆژ نەك ڕابردوو بكەن و پێویستە ئیدراكی ئەوە بكەن كە دەبێت خۆتان و كەسوكارتان بە ئاشتی وەك جووتیاری ئیشكەر و هاووڵاتیی بێ وەی لە نێو سنووری عیراقدا بژین.

٣- دەنگوباو و هەواڵێكی زۆرم پێ گەیشتووە كە گوایە ئێوە مەترسیتان لەو مەشقانە هەیە كە سوپای عیراقی مانگی داهاتوو دەیانكات. ئەو جۆرە ترسە ئەوپەڕی شێتگەرییە، وا دەچێت بۆ چەند مانگێك سوپای عیراقی چەند مەشقێكی كردووە و مانگی نیسانیش دوو مەشقی دیكە دەكات و گشت پلانەكانی ئەو مەشقانە لە دەمێكەوە داڕێژراون، مەشقی یەكەمیان لە نێوان هەشت و چواردەی نیساندا دەبێت و لە هیچ شوێنێكدا لە ناوچەی ئێوە نزیك

ناکەوێتەوە. هەرچی مەشقی دووەمیشیانە ڕۆژی هەژدەی نیسان دەست پێ دەکات و نزیکترین شوێن لە ئێوە عەقرەیە کە هێزەکانی سوپا پێیدا دەڕوات و بە درێژایی ماوەی ئەم مەشقە هێزەکانی حوکمەتی بەریتانی لەتەك سوپای عیراقیدا دەبێت. هاریکاریی نێوان هەردووك سوپای بەریتانی و عیراقی ئەو پەیوەندییە نزیکە نیشان دەدات کە لە نێوان ئێمە و عیراقییە هاوپەیمانەکانمدا هەیە و کە هیچ ڕووکەشێکی سیاسیی نییە، وێڕای ئەوەیش وەك عەرزم کردن هێزەکانی «سوپای عیراقی-ك.م» نزیك هیچ شوێنێك لە ناوچەکانتان ناکەوێتەوە.

٤- هەمیشە خۆتان و کەسوکارتان لە یادما دەبن و هیوادارم هەواڵی خۆشتان ببیستم و دوا ئامۆژگاریشم بۆتان ئەوەیە کە پێویستە دەرکی ئەوە بکەن کە ڕۆژانی دڵەڕاوکێ کۆتاییان هات، چ خۆتان و چ کەسوکارتان هاوڕێی زۆرتان هەن، بەڵام ئەو هاوڕێیانەتان تەنها لە ڕێگەی ئاشتییانەوە یاریدەتان دەدەن ئەگەر ئێوە ئاشتیخواز بن، پێویستە ئەوەیشتان لە یاد بێت کە جیهان لەم ڕۆژانەدا گیرۆدەی گەلێك کێشە هاتووە، ئێمە تاوەکو ئێستایش لە جەنگداین دژی دوو دوژمنی خراپ و ڕق ئەستوور[٩] و دەمانەوێت گشت هێزەکانمان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکەین، ئەوانەیش کە لەم بوارەدا یاریدەمان دەدەن هاوڕێمانن، ئەوانەیش کە کۆسپ دەخەنە بەر کارەکانمان دوژمنمانن. هیوادارم ئێوە کۆشش بکەن بۆ ئەوەی هەمیشە لەو کەسانە بن کە ئێمە بە هاوڕێی خۆمانیان دادەنێین.

لە کۆتاییشدا سڵاومان قەبووڵ بفەرموون.

باڵوێزی حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانی)[١٠].

---

[٩] دیارە کینهان کرۆنوالیس مەبەستی ئەڵەمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشییە.

[10] N.A., F.O., 624/71, Part Two (21-40), No. 272/40/45, British Embassy, Baghdad, 20th March 1945, To: Respectly Malla Mustafa.

دوا به دوای ئەمە ئەو نامەیەی بارزانی هەڵگیراوە کە ڕۆژی سیی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٥ بە زوبانی عەرەبی ناردوویە بۆ باڵوێزی بەریتانیی نوێ لە عیراق و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(ڕۆژی سیی مارتی ساڵی ١٩٤٥،

فەخامەتی باڵوێزی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی،

بەغدا.

سڵاو و ڕێزمان.

گەلێك بەختەوەرم کە ئەم یەکەم نامەیەم بنێرم بۆ فەخامەتتان بە بۆنەی هاتنتانەوە بۆ وڵاتەکەمان و هیوادارم ئەم نامەیەم ببێتە سەرەتای پێوەندیی دۆستانەمان لە نێوان ئێمەی دڵسۆزتان و ئێوەی ڕێبەری چاك و پارێزەری گەلە لاواز و بەدبەختەکان.

فەخامەتی باڵوێز

ئەم بارودۆخە ناهەموارەی عیراق پاڵی بە گەلی کوردەوە نا داخوازییە نەتەوەییەکانی دەربارەی وەزعی ئێستای پێشکەش بە باڵوێزخانە شکۆمەندەکەتان و حوکمەتی عیراقی بکات بەو هیوایەی کورد بتوانێت لەو ڕێگەیەوە و بە شێوازێکی ئاشتییانە و بە ئازادی بگاتە ئاواتە بەرزەکانی کە بریتین لە وەدەستهێنانی سەربەستیی تەواو لە ناو سنووری سروشتیی وڵاتەکەی خۆیدا و بەو جۆرەی سەرەك وەزیرانی وڵاتەکەتان میستەر چەرچل و سەرۆکی کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا میستەر ڕۆزفلت لە پەیمانی ئەتلەسیدا دوای تەواوبوونی جەنگ پەیمانیان داوەتە گشت گەلانی جیهان، بۆیەکا گەلێك هیواداریین بە خودی فەخامەتی ئێوە بە چاوی باوکێکی دڵسۆز سەیری داخوازییەکانی ڕابردوومان بکەن و مافی زەوتکراوی گەلەکەمان لە چوارچێوەی سنووری عیراقدا بە شێوازێکی مووەقەت بدرێت تاوەکو جەنگ کۆتایی دێت، ئەو جەنگەی بە قودرەتی خواوەنتەعالا تێیدا

سەرکەوتوو دەبن و هیچ ئاواتێکمان نییە غەیرەز سەرکەوتنی دەستوبردتان بە زووترین کات و دەرخستنی ئاواتە نەتەوەییەکانمان و دامەزراندنی کەیانی نەتەوەییمان و هێزی ئێمە بە گرتنە بەری ڕێگەی دروست لە لایەن حوکمەتە شکۆدارەکەتانەوە بەستراوەتەوە، ئیتر تکا دەکەم ڕێز و نەوازشم قەبووڵ بفەرموون.

دڵسۆزتان بارزانی مەلا مستەفا)[11].

دوا بە دوای ئەم نامە ڕێکوپێك و قووڵەی بارزانی بۆ باڵوێزی نوێی بەریتانی لە عیراق بەڵگەنامەیەکی یەکجار بایەخدار هەڵگیراوە کە گشت خاڵەکانی جەخت لەسەر بۆچوون و پێشنیازەکانی بارزانی دەکەن. شایانی باسە لەسەر ئەو بەڵگەنامەیە نووسراوە «پوختە– خلاصة» و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

پوختە:

١– ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی مارتی «ساڵی ١٩٤٥– ك.م.» کاپتان ستۆکس چووە هاودیان و ئەوی پێویست بوو کردی بۆ ئەوەی لەگەڵ مەلا مستەفادا کۆببێتەوە.

٢– کاپتان ستۆکس کاتێك بەرەو هاودیان دەچوو بەڵگەی تەواوی بە چاوی خۆی بینی کە ژمارەیەك لە ئەفسەرانی سوپای عیراقی باسی ئەوەیان دەکرد کە بە کارێك دژی مەلا مستەفا هەڵبستن، بۆیەکا کاپتان ستۆکس داوای کردووە ئەوی پێویستە بکرێت بۆ ئەوەی ڕادەیەك بۆ ئەو قسانە لەم بارودۆخە ناسکەدا دابنرێت.

٣– لە هاودیان کاپتان ستۆکس لەگەڵ مەلا مستەفادا کۆبۆوە و «بارزانی– ك.م» مستەفا خۆشناو و محەمەد مەحموود و مامەند مەسیحی

---

[11] Ibid, 624/71, part Three (41-56).

لەگـەڵ بـوون، سـتۆکس نامەکـەی خـاوەن شـکۆی لەگـەڵ نەسـیحەتێکی دڵسۆزانەدا پێشـکەش کـرد. سـەرەتا مـەلا مسـتەفا گـوتی پێـی وایـە لـەوە دەچێت هەر دووك دەستی ببەسترێنەوە و داوا لـە حوکمـەتی عیراقـی بکرێـت بکەوێتە دارکاری کردنی. کاپتان ستۆکس نەسیحەتەکانی دووبارە کردنەوە و لـە ئەنجامـدا مـەلا مسـتەفا گـوتی بـە پێـی توانـا گوێرایـەڵی نەسـیحەتەکان دەبێت، هەرچی ئەو نەسیحەتانەیشن کە کاپتان سـتۆکس پێیـان گەیشـتووە بریتین لە:

(یەکەم) مەلا مستەفا ڕەخنـەی لـە بڕیـاری عەفوواتەکـە نـەگرت و هـەوڵ دەدات ئەوانەی سەر بەون و عەفوواتەکە نەیگرتوونەتەوە، هێوریـان بکاتـەوە تـاوەکو بڕیارێـك دەربارەیـان دەردەچـێت، هـەروەها قایلـە بـەوەی لەگـەڵ بەرپرسانی حوکمەتی عیراقیدا کۆببێتەوە بەو مەرجەی هاوڕێیـەکی بـەریتانی لەگەڵدا بێت تاوەکو زەفەری پێ نەبەن و نەیکوژن.

(دووەم) بـارزانی بـێ ئاگـایی خـۆی دەربـارەی ڕووداوەکـەی نێـو ڕێکـان نیشان دا، بەڵام ستۆکس لەو بڕوایەدایە وەها نییە.

(سـێیەم) بـارزانی بـەوە قایـل بـوو کـە پێویسـتە ئەفسـەرانی ئیرتیبـاط بگەڕێننەوە ناوچەی بارزان.

(چوارەم) بارزانی بەوە قایل بوو بێ دواخسـتن پیـاوە چـەکدارەکانی لای ڕەواندزەوە بگەڕێنێتەوە لای خۆی، بەڵام گوتیشی ئەو بەرپرسی ئـەو هێزانـە نییە کە وان لە ناوچەی عەمادییەدا چونکە شێخ ئەحمـەدی بـارزان ڕەهبـەری ئەو هێزانە و هێزەکانی ناو گوندەکانی ئیتووتە.

لێـرەدا کاپتـان سـتۆکس «بـە بـارزانی ڕاگەیانـد-ك.م.» کـە پێویسـتە دەستوبرد بکەوێتە جێبەجێکردنی گشت ئەو خاڵانەی پێیان قایلە.

٤- مەلا مستەفا باسی ئەو خاڵانەی کرد کە هێشتا چارەسـەر نـەکراون و لەوانەن ببنە هۆی نانەوەی ئاژاوە کە ئەمانەن:

(یەکەم) بابەتی گرتنی ئەحمەد ئیسماعیل ئاغا.

(دووەم) نەخستنە سەر ناوچەی ئیتووت و ناحییەی پیرە کەپرا بۆ سەر لیوای هەولێر.

٥- مەلا مستەفا بەرەو پێشبردنی کاروباری کشتوکاڵی لە ناوچەی بارزاندا بە پێویست زانی.

٦- گفتوگۆکان شەش سەعاتیان خایاند[١٢] و ڕۆژی داهاتوو کاپتان ستۆکس گەڕایەوە ڕەواندز و بە پێی ڕاسپاردەی موتەسەریفی «هەولێر- ک.م.» نامەیەکی نارد بۆ مەلا مستەفا و پێی گوتووە یان لە شێتنە یان لە مێرگەسۆر چاوەڕوانییەتی تاوەکو موتەسەریف بتوانێت بارزانی ببینێت، هەروەها بۆ ئەوەیش هەڕەشە لە شێخ ئەحمەد بکات بۆ ئەوەی ڕەفتاری باش بکات)[١٣].

دوا بە دوای ئەم نامە گرنگ و چڕوپڕە نۆرەی نامەیەکی بایەخداری دیکە دێت کە مێجەر ولسنی ڕاوێژکاری سیاسیی هێزەکانی بەریتانیا لە باکوور ڕۆژی بیست و سێی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٥ بە زوبانی عەرەبی ناردوویە بۆ بارزانی و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(دایەرەی ڕاوێژکاری
سیاسیی ناوچەی باکوور،
کەرکووک،
٢٣ی نیسانی ١٩٤٥،
بۆ:
بەڕێز مەلا مستەفا بارزانی،
سلاو و نەوازشم.

---

[١٢] ئەو هێڵەی ژێر ئەو ڕستەیەی سەرەوە لە دەقی بەلگەنامەکەدا نییە، بۆ خۆمان ویستمان سەرنجی خوێنەری بەڕێز بۆ ئەو ماوە دوور و درێژە ڕابکێشین.

[13] N.A., F.O., 624/71, Part Three (41 – 65).

هیوادارم لائیحەی عەفوات لە خۆت و هاوڕێکانت کرابێتە یاسا کاتێك ئەم نامەیەتان پێ دەگات، خۆ ئەگەر هاتوو تاوەکو ئێستاکە ئەو یاسایە دەرنەچووبێت ئەوا بەم زووانە دەردەچێت.

هەروەك چۆن جەنابی باڵوێزی «بەریتانی لە عیراق-ك.م.» لە نامەکەی خۆیدا وەك خۆم لە نامەکەمدا بۆ «شێخ ئەحمەدی-ك.م.» برات ڕوونم کردبۆوە ئێمە حەز دەکەین چەند بتوانن هێند لەمەودوا هاریکاریی لەگەڵ حوکمەتدا بکەن. هەروەها موتەسەریفی هەولێر هەوڵ دەدات هەموو جۆرە یاریدەیەکتان پێشکەش بکات تاوەکو بتوانن پێویستییەکانی پیاوەکانتان دابین بکەن، هەر لەبەر ئەوەیش ئەو یاریدانە زۆرتر دەبن چەند ئێوە پتر هاریکاریی بکەن.

هەرچی دەربارەی فەخامەتی سێر هیو ستونهیور بێردە [١٤] دەڵێم ئێستاکە حوکمەتی عیراقی دەستی کردووەتە چارەسەرکردنی وەزعی کورد بە پێی توانا و نابێت وەها دابنێین زوڵمتان لێ دەکرێت، بۆیەکا بە پێویستم نەزانی نامەکەتان بنێرم بۆ جەنابی باڵوێز.

هەر کە بیستتان لائیحەی عەفواتەکە بووەتە یاسا پێویستە یەکسەر ئەوانەی لە پیاوەکانت لە خزمەتی سەربازی هەڵهاتوون نامە بنێرن بۆ بەرپرسانی حوکمەتی عیراقی «سەرۆکی ئەرکانی سوپا، موتەسەریف یان بۆ بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس» و داوای گەڕانەوەیان لێ بکەن بۆ ئەوەی

---

[١٤] سێر فرانسێس هەف ولیەم ستۆنهیۆر بێرد (Sir Francis William Stonehwer Bird) ڕۆژی سیازدەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨٩١ لە دایك بووە، لە هەرەتی لاوێتییەوە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، لە یۆگۆسلافیا و سعودییە و کازابلانکا و ڕۆمانیا و حەبەشە کاری کردووە، ڕۆژی بیست و هەشتی مانگی مارتی ساڵی ١٩٤٥ بووەتە باڵوێزی وڵاتەکەی لە عیراق، بێ ئەندازە ئینگلیزییەکەی دەوڵەمەند بووە.
دەربارەی بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular year Book 1947", London, P. 308.

بچنەوە سەر خزمەت و چەند لەو بوارەدا دەستوبرد بکەن هێند پتر یاریدەیان دەدەن و دواکەوتنیان زەرەریان پێ دەگەیێنێت و لەوانەیشە ببێتە کۆسپ لەبەر دەم هاوڕێکانتا، هەروەها ئەگەر بێتو هەڵهاتووەکان لە ڕووی یاسادا لای خۆتان گلیان بدەیتەوە، کارێکی لەو جۆرە تەنها بەرەو هەڵەت دەبات.

مێجەر مۆر لەم هاتنەیدا لەگەڵ خۆت و «شێخ ئەحمەدی–ک.م.» براتدا وتووێژ دەربارەی پرسەکانی لیوای مووسڵ دەکات.

بەم زووانە ڕاوێژکاری سیاسیی نوێ کۆلۆنێل مید دەگاتە مووسڵ و پێویستە گشت نامەکانت بۆ نوێنەرانی حوکمەتی بەریتانی بنێریت بۆ کاپتن جاکسن لە جندیان یان لە هەولێر و ئەویش بە پێی پێویست ڕەوانەیان دەکات.

ئیتر هەر بژین.

دڵسۆزتان

مێجەر أر.جی. ولسن

ڕاوێژکاری سیاسیی هێزە بەریتانییەکان لە ناوچەی باکوور)[١٥].

بە پێویستی دەزانم لێرەدا سەرنجی توێژەران و سیاسەتمەدارانی کورد بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشم کە لە هەمان فایلدا ژمارەیەکی زۆر لە نامە دەگمەنەکانی شێخ ئەحمەدی بارزانیش هەڵگیراون کە گشتیان بایەخی زۆریان بۆ توژینەوەی لایەنە جیاوازەکانی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد هەیە[١٦].

---

(15) N.A., F.O., 624/71, Part Four (66 – 89).

(١٦) بە وێنە بڕوانە ئەو نامەیەی ڕاوێژکاری سیاسیی هێزە بەریتانییەکان لە باکووری عیراق ڕۆژی بیست ودووی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٥ بە زوبانی عەرەبی ناردوویە بۆ شێخ ئەحمەدی بارزان.

N.A., F.O., 624/71, Part Four (66 – 89).

بابەتی شەشەم:

# هەڵوێستی کورد بەرانبەر شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨دا لە سەرەتای بەرپابوونیدا لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیـدا



مەلا مستەفای بارزانی و عەبدولکەریم قاسم

**سەرەتا:**

بێ گومان شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورە و چاوەڕوان نەکراو بوو، ئەو شۆڕشەی نە سەرانی ڕژێمی پاشایی و نە وڵاتە گەورەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و تەنانەت کۆمەڵانی خەڵکی عیراقیش، بە عەرەب و کورد و کەمینەکانەوە، چاوەڕوانی نەبوون، زۆر نەبوو نووری سەعید بە ئەوپەڕی بڕوا و شانازییەوە دەیگوت (دار السيد مأمونة)، کەچی بەرەبەیانی ڕۆژی چواردەی تەمموز کتوپڕ کونە مشکی لێ بوو بە قەیسەری، ئەوەبوو پاش تەنها بیست و چوار سەعات بە عەبای ژنانەوە داستانی مێژوویی ئەو گەورە پیاوە کۆتایی هات.

کورد بە گشتی و کوردی عێراق بە تایبەتی زۆر بە گەرمی پێشوازیی سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژیان کرد و بوونە یەکێك لە یاساوڵە هەرە دڵسۆزەکانی پاراستنی دەستکەوتەکانی شۆڕش و بە ئەوپەڕی بڕواوە پێیان وابوو گرێی بەختی نەتەوەکەیان کراوەتەوە و ڕۆژی وەدیهاتنی خەونە دێرینەکانیان هەڵهاتووە و تەنانەت دەنگوباوێکی وەها کەوتە سەر زاران کە گوایە عەبدولکەریم قاسمی ڕەهبەری شۆڕش لە دایکەوە کوردی فەیلییە. بە هەمان ڕادەیش دوژمنانی کورد لەوە زراوەترەك بوون نەبا وەرچەرخانێکی ئەوتۆ لە ژیانی کورددا دەست پێ بکات کە بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەوان زیانبەخش بێ.

سەدان فایلی ناوازەی ئەرشیڤی نیشتیمانی بەریتانی بۆ باسی ڕژێمی نوێی کۆماری عیراق لە ڕۆژگاری عەبدولکەریم قاسمدا «چواردەی تەمموزی ١٩٥٨- هەشتی شوباتی ١٩٦٣» تەرخان کراون، کە بێ گومان سەرچاوەیەکی مێژوویی ڕەسەنی یەکجار دەگمەن بۆ لێکدانەوەی گشت لایەنەکانی ئەو ڕژێمە پێکدەهێنن، بەڵام ئەوەی ئێمە لەم بابەتەدا مەبەستمانە بریتییە لە گێڕانەوەی چەند لاپەڕەیەکی دانسقە دەربارەی هەڵوێستی کورد و ناحەزانی کورد لە قۆناغی یەکەمی ئەو شۆڕشەدا بە پێی گێڕانەوەی ژمارەیەك لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانییەوە.

## فایلێکی دەگمەن

یەکێك لە فایلە هەرە دەگمەنەکانی ئەم بوارە فایلی ژمارە ١٤٠٦٨٢/٣٧١ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانییە بەم ناونیشانە سەرنجڕاکێشەوە:

«بەشی ڕۆژهەلأت، گشتی، بابەت: کورد. تورك لە عیراق و کورد، ١٩٥٩، نهێنی»[(١)].

ئەم فایلە ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، بە پێی ژماردنی خۆم سەد و سی و سێ لاپەڕەیە و گەلێك لاپەڕەی لە هەردووك دیوی چاپ کراون، بەشێکیشیان بە دەستخەت نووسراون، بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە بەسەر هەژدە بەشدا دابەش کراون.

بەشی یەکەمی فایلی ناوبراو بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە کە ڕۆژی دووی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەلأت»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکەکەیەتی:

(لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

ئەنقەرە،

نهێنی،

ژمارە ١٨٢٢/٥٤،

بۆ:

بەشی ڕۆژهەلأت،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

---

(1) N.A., F.O., 371/140682, Eastren Department, General, Subject: Kurds, Turks in Iraq and the Kurds, General, 1959, Confidential.

بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست،

١- تکایە بگەڕێنەوە بۆ نامەی ژمارە ١٨٢٢/٤٤ی ڕۆژی بیست و حەوتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨مان دەربارەی هەڵوێستی ڕای گشتی لێرە «لە تورکیا - ك.م.» بەرانبەر تورکی عیراق.

٢- لە ڕاستیدا لەم چەندانەی دواییدا بڵاوکراوەکانی ئێرە بایەخێکی ئەوتۆیان بەم بابەتە نەداوە، بەڵام ژمارەیەك وتار لێرە دەربارەی مەترسیی کۆمۆنیزم لە عیراق و یەك دوو لێدوانیش دەربارەی مەترسییەکانی قاسم بەرانبەر کورد بڵاو کراونەتەوە، تایبەت داواکردنی قاسم لە مەلا مستەفا کە بگەڕێتەوە بۆ عیراق، وێڕای ئەگەری بەرپابوونی بزووتنەوەیەك لە پێناو سەربەخۆیی کوردستاندا.

٣- تەنها یەك وتار دەربارەی بابەتی تورکی عیراق لێرە بڵاوکراوەتەوە، کە ئەویش هەواڵنێری ڕۆژنامەی «جەمهوریەت»ی سەربەخۆ نووسیویە، کە زۆر نییە لە عیراق گەڕاوەتەوە. ئەو لە وتارەکەیدا نووسیویە دەڵێ تورکیا هیچ کات بایەخێکی ئەوتۆی بە تورکمانی عیراق نەداوە، تاوەکو لە لایەن کوردەوە لەم چەندانە هێرشیان کرایە سەر[٢]، بۆیەکا تورکی عیراق ئێستاکە لە بارودۆخێکی یەکجار ترسناکدان، بزووتنەوەی کوردستانی سەربەخۆ وەك پایتەختی حوکمەتی کورد دەڕوانێتە کەرکوك، لەم چەندانەشدا تورکی کەرکوك کەوتنە بەر شاڵاوی هێرشی ناصرییەکان و شیوعییەکان و کورد. ئەوان، واتا تورکمان، لە دەستووری نوێی عیراقدا ئاماژەیان بۆ نەکراوە و لە ڕاستیدا ڕووبەڕووی هەڕەشەی کوشتار بوونەتەوە، بەڵام هیوا هەیە کاربەدەستانی عیراق ئەو ئەرکانە بگرنە ئەستۆ کە بۆ پاراستنیان پێویستن.

---

[٢] مەبەستی ئەو هەڵە سیاسییە گەورانەیە کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ بە ماوەیەکی کورت کوردی کەرکوك و دەوروبەری تێی کەوتن، هەرچەندە هەڵەی تورکمانە توندڕەوەکانیش لە هەڵەی برا کوردەکانیان کەمتر نەبوو.

٤- ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە هەریەك لە بەغدا و تاران و بۆ دایەرەی سیاسی و هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا باڵوێز) [٣]



عەبدولکەریم قاسم و ژمارەیەك لە وەزیرانی کابینەکەی

بەشی دووەمی هەمان فایل بۆ هەمان بابەت تەرخان کراوە و ئەمەیش ناونیشانی ئەو بەشەیە:

---

(3) N.A., F.O., 371/ 140682, From: British Embassy, Ankara, confindential, No. 1822/54, January 2, 1959, To: Easetrn Department, Foreign Office, London, S.W.I.

«بەشی ڕۆژ هەڵات، گشتی، ١٩٥٩، بابەت: کورد، هەڵوێستی ڕای گشتی بەرانبەر تورکی عیراق– ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکان دەربارەی پێکدادانی نێوان تورکمان و کورد» [٤].

لە ناویشەوە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن هەڵگیراوە لەگەڵ حەوت لاپەڕە بۆ پاشکۆکانی ئەو نامەیە کە زۆر بە کورتی باسی هەڵوێستی ژمارەیەك ڕۆژنامەی عیراقیی، وەك «الرأي العام» و «إتحاد الشعب» و «ألاخبار» و ژمارەیەك ئیزگەی وەك بەغدا و قاهیرە، دەربارەی چالاکییە سیاسییەکانی ئەو ڕۆژگارە دەکەن، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی نامەکەی باڵوێزخانەی بەریتانییە لە ئەنقەرە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن:

(لە:
باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،
ئەنقەرە،
ژمارە ٣/١٨٢٢،
١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٥٩،
بۆ:
بەشی ڕۆژهەڵات،
وەزارەتی هەندەران،
لەندەن،
بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست،

١– تکایە بگەڕێنەوە بۆ نامەی ژمارە ١٨٢٢/٥٤ی ڕۆژی دووی کانوونی دووەممان دەربارەی هەڵوێستی ڕای گشتی بەرانبەر تورکی عیراق.

---

[4] Ibid, Eastern Department, General, 1959, Subject: Kurds, Public comment on question of Turks in Iraq- Newspaper Reports on clashes between Turks and Kurds.

٢- ژمارەیەك ڕۆژنامەی توركی سیازدەی كانوونی دووەم بە پشتیوانیی هەواڵەكانی ئیزگەی قاهیرە و بێروت ڕاپۆرتیان دەربارەی زنجیرەیەك پێكدادانی قورسی نێوان تورك و كورد لە كۆتایی هەفتەی ڕابردوودا لە ناوچەی كەركووك بلاو كردۆتەوە. بە پێی ئەو ڕاپۆرتانە ئەو پێكدادانە لە دووزخورماتوو دەستیان پێكردووە و ئینجا تەشەنەیان كردووەتە داقووق و دەڵێن سێ كەس كوژراون و هاتوچۆ قەدەغە كراوە، بە پێی ڕاپۆرتەكانیش بەرپرسی سەربازیی ناوچەكە توركمانەكانی لەوە دڵنیا كردووە كە «میری- ك.م.» پەنا دەباتە بەر گشت ئەو كارانەی كە پێویستن بۆ قەدەغەكردنی كوردە كۆمۆنیستەكان لە نانەوەی هیچ هەرایەكی دیكە.

٣- ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ باڵوێزخانەكانمان لە هەر یەك لە بەغدا و تاران و بۆ دایەرەی سیاسی و هێزەكانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا

باڵوێز) [٥].

بەشی سێیەمی هەمان فایل بۆ بابەتی «ڕەهبەری كورد مەلا مستەفای بارزانی» تەرخان كراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

(مەلا مستەفای بارزانی ڕەهبەرێكی شۆڕشگێڕی كوردی ناسراوە، ڕۆژی شەشی تەشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٥٨، دوای یازدە ساڵ پەنابەریی، لە ڕێگەی قاهیرەوە لە یەكیەتی سۆڤیەت گەڕایەوە بەغدا. لە ساڵی ١٩٣٠ وە ڕەهبەرێكی چالاكی سەربەخۆیی كوردە و ساڵی ١٩٤٧ هەڵهاتە ناو خاكی

---

[5] Ibid, From: British Embassy, Ankara, No. 1822/3, January 16 1959, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

یەکیەتی سۆڤیەتەوە دوای ئەوەی لە لایەن فەرمانڕەوایانی عیراق و ئێرانەوە بەزێنرا، ڕێگەی گەڕانەوەی بارزانیی بە فەرمانی سەرەك وەزیرانی عیراق قاسم درا و لە لایەن کەمینەی کوردی عیراقەوە بە ئەوپەڕی دڵخۆشییەوە پێشوازی لەو بڕیارە کرا. مەلا مستەفا، هەروەك چۆن زۆر باش ئەوە زانراوە یەکێکە لە عیراقییە دژەکانی ڕژێمی نووری سەعیدی پێشوو، کە بەخشینی لە لایەن حوکمەتی نوێی عیراقەوە بۆ دەرچووە، هەرچەندە بە تەواوی ئەوە نەزانراوە کەی بارزانی وەك ڕەهبەری کورد هەڵبژێردراوە، بەڵام گەڕانەوەکەی لە لایەن ئەو سێ ملیۆن کەسەوە پێشوازی لێکرا کە لەو ناوچانەی کەوتوونەتە نێوان سنووری ئێران و عیراق و تورکیاوە[٦] دەژین.

## سەرۆکی کۆمارە کوردییە ڕووخاوەکەی ساڵی ١٩٤٦:

مەلا مستەفا دوای چالاکییە وەبەرچاوەکانی بووە ڕەهبەرێکی ئەفسانەیی بەناوبانگ و لە ساڵی ١٩٣٠یەوە لە لایەن حوکمەتانی تورکیا و ئێران و عیراقەوە بە یاخیبوویەکی خەباتگێڕ لە پێناو مافەکانی کورد و سەربەخۆییدا سەیر دەکرێ، ساڵی ١٩٤٥ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر چەکداردا بەرەنگاری هێزەکانی سوپای عیراق بووەوە و دوای ئەوەی بەزێنرا لەگەڵ یاخیبووەکاندا هەڵهاتە ناو خاکی ئێران و لەوێ پێوەندیی لەگەڵ پیاوەکانی سۆڤیەتدا بەست و زۆری نەبرد بووە جەنەڕاڵ[٧] بەرزانی و بەرگی سەربازیی سۆڤیەتی پۆشی. کاتێك ئازەربایجانییە ئێرانییەکان ورووژان، کوردەکانیش

---

[٦] وا دیارە یەکێك لە کارمەندانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بە دەستخەت ناوی حوکمەتی سووریاشی خستۆتە سەر ناوی حوکمەتانی ئەو سێ وڵاتە.

[٧] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی جەنەڕاڵ "General" خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە، شایانی باسە لە ڕۆژگاری پاشاییدا پارتییەکان ئەو وێنەیەی بارزانییان بە بەرگی جەنەڕاڵییەوە بە نهێنیی دەفرۆشت، بۆخۆم دانەیەکم لە ڕێگەی خوالێخۆشبوو کاك فارسەوە، کە هەر بە دوکتۆر فارس ناسرابوو، دەستکەوت.

له ساڵی ١٩٤٦ بە پشتگیریی سۆڤیەت ڕاپەڕین و کۆمارێکی کوردییان بە ڕەهبەری قازی محەمەد دامەزراند کە زۆر نەژیا، چونکە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ سوپای ئێران تەواو دەستی گرت بەسەر ناوچەی کۆمارە کوردییەکەدا و مەلا مستەفا بە دیل گیرا[٨]، بەلام حوکمەتی عیراقی قایل نەبوو بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، بۆیەکا بارزانی ناچار بوو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پیاوەکانی بە زەبری چەك بگەڕێنەوە ناو خاکی عیراق و زۆربەی پیاوەکانیشی خۆیان بە دەست حوکمەتەوەدا[٩]، بەلام مەلا مستەفا و ئەوانی دیکە پەنایان بردە بەر ناوچە شاخاوییەکان و لەوساوە یارییەکی خۆ حەشاردان و بەدوو گەڕاندا[١٠] دەستی پێ کرد و سەرەنجام مەلا مستەفا توانیی خۆی لە دەست هەردووك سوپای عیراق و ئێران تەواو قوتار بکات و خۆی و نزیکەی سێ سەد کەس[١١] لە پیاوەکانی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ توانییان ڕووبارێك ببڕن[١٢] و بچنە یەکیەتی سۆڤیەت.

---

(٨) دیارە ئەوە هەڵەیە، چونکە بارزانی بە دیل نەگیرا و ماوەیەکی پێویست بوو تاوەکو خۆی و زۆربەی چەکدارەکانی کشانەوە ناو خاکی یەکیەتی سۆڤیەت.

(٩) لێرەیشدا وشەی زۆربە دروست نییە، چونکە تەنها ئافرەت و منداڵ و پیرەژن و پیرەمێردەکان بە ڕەهبەری شێخ ئەحمەدی برا گەورەی بارزانی خۆیان دا بەدەستەوە و حوکمەتی عیراقی شێخ ئەحمەدی خستە زیندانەوە و چوار ئەفسەرە کوردەکەی دابوویانە پاڵ شۆڕشی بارزان – عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی لە سێدارە دران.

(١٠) لە دەقی ئینگلیزییەکەدا وەها هاتووە:

“There followed a game of hide- and- seek in which Mulla Mustafa success Fully eluded both Iraqi and the Iranian forces” (P.2).

(١١) ژمارەیان لە سێ سەد کەس زۆرتر بوو.

(١٢) مەبەستی ڕووباری ئاراسە و لەوساوە ئاراس بووە ناوێکی باوی کوڕ و کچ لە ناو کوردەواریدا، تایبەت لە کوردستانی باشوور، باشترین بەرهەم دەربارەی ئەو ڕووداوە مێژووییە کتێبەکەی نووسەری فارس حسەین قلی پسیانە بەم ناونیشانە نازدارەوە «ئەز مەهابادی خونین تاگرانەهای ئاراس» (لە مەهابادی خوێنینەوە تاوەکو لێوارەکانی ئاراس).

## مانەوەیەکی دوور و درێژ لە یەکیەتی سۆڤیەت:

دوا بەدوای بانگدانی کۆماری عیراق لە چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨دا بە ماوەیەکی کورت مەلا مستەفا برووسکەیەکی پیرۆزبایی «بە ناوی ئەو خەباتگێڕانەی گەلەکەمەوە کە ناچاربوون بچنە وڵاتە سۆشیالیزمەکان»ەوە نارد بۆ جەنەراڵ عەبدولکەریم قاسمی «قارەمانی شۆڕشی سەرکەوتووی عیراق». برووسکەکە وەها دەست پێدەکات (کوردی عیراق شان بەشانی برا عەرەبە ئازادیخوازەکانیانەوە تێکۆشان)، دوای ئەوە داوای کرد ڕێگە بدرێتە خۆی و دوو شێخی کوردی دیکە[١٣] بگەڕێنەوە عیراق[١٤].

بەشی چوارەمی هەمان فایل بۆ بابەتێکی یەکجار بایەخدار دەربارەی پرسی کوردی تورکیا تەرخان کراوە کە بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ی عیراقی ورووژاندوویە. مەترسییەکانی شۆڕشی ناوبراو هەستی عەونی دۆغانی پشکنەری ناوچە کوردییەکانی تورکیا لە دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی عوسمانیدا دەبزوێنێ و دڵسۆزانە دەیەوێ بە پێی بۆچوونی خۆی چارەسەرێك بۆ کێشەی کوردی وڵاتەکەی بدۆزێتەوە لە پێناو پاراستنی برایەتیی نێوان تورك و کورددا و بۆ ئەو مەبەستە لە ڕۆژنامەی «وەتەن»ی تورکیدا وتارێکی قووڵ و دوورودرێژی پێنج ئەڵقەیی بڵاو دەکاتەوە کە پڕن لە دەرس و پەندی بەکەڵك، تایبەت بۆ فەرمانڕەوایانی تورکیا، ڕاستە نووسەری ئەو وتارە گشت ئامانجەکانی بە وردی نەپێکاوە و جاروبار کەوتۆتە هەڵە و هەڵسەنگاندنی ناڕەواوە، بەڵام ئەوانە لە ئاستی لایەنە چاکەکانی زۆر نانوێنن، ئەوەی باڵوێزی بەریتانی لە ئەنقەرە باش هەستی پێی کردووە، جا بەر لە وەرگێڕانی دەقی ئەو پێنج وتارە وا لە

---

(١٣) تێنەگەیشتم مەبەستی لەو دوو شێخە کێیە.

(14) N.A., F.O., 371/ 140682, Eastern Department,General, Confidential, Subject: Kurdish Leader Mulla Mustafa Barzani, Bureau of Intelligence and Research, Biografpic Brief, No. 324 October 9, 1958, Mulla Mustafa Barzani, Long- Exiled Kurdish Leader, Returns to Iraq.

خوارەوە دەقی وەرگێڕانی نامەیەکی باڵوێزی بەریتانی لە تورکیا کە ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی پێشکەش دەکەین:

(بەشی ڕۆژهەڵات،

نهێنی،

گشتی،

١٩٥٩،

بابەت: پرسی کورد،

تێبینی:

١- لەو وتارانەدا کە «وەتەن» بڵاوی کردوونەتەوە نووسەر وەها نیشان دەدات کە ئەو کاتێك پشکنەری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی «تورکیا-ك.م.» بووە بە بایەخێکی ورد و خۆشەویستییەوە ڕوانیویەتی کورد و دان بەوەدا دەنێ کە کێشەیەکی کوردی «لەو ناوچانەدا-ك.م.» هەیە کە پێویستییان بە ڕێگا و بان و خزمەتگوزاریی باشتر هەیە و ئەوەیش دیاردەیەکی زۆر دەگمەنە بە نیسبەت کارمەندێکی تورکەوە.

٢- بەڵام لەو بوارەدا نەخوێندەواری تەواو باڵی کێشاوە و «چارەسەر کردنی -ك.م.» پێویستیی بە بڕیاری زەحمەتە، لەوە دەچێ ئامانجی بیر و بۆچوونەکانی نووسەر فێرکردن یان دەرسدانی هەموو تورکێك بێ تاوەکو لە ڕێگەیەوە هانی کوردیش بدات ڕەگەزی خۆیان لە یاد بکەن، پیاو سەری لەوە سووڕ دەمێنێ کە ئایا سیاسەتێکی لەو جۆرە چۆن دەتوانرێ لەم ڕۆژانەدا پەیڕەو بکرێ لە کاتێکدا هەستی کوردایەتی بەجۆش لای کوردەکانی عیراقی ئەودیو سنووری «تورکیاوە-ك.م.» کۆشش تەنها بۆ ئازادیی کورد و دابینکردنی مافەکانیان وەك کورد دەکات لە کاتێکدا پڕۆپاگەندەی تورك دەیەوێ کورد لە زێدی خۆیان بکات، ئەوەی تا ڕادەیەکی زۆر لە سەر ئاڵوگۆڕەکانی ئیمڕۆی عیراق وەستاوە.

ئیمزا

هـ.م.کارلێس[15]،

١١ی شوباتی ١٩٥٩)[16].

ئەمانـــەی لای خـــوارەوەیش وەرگێڕانـــی وتارەکـــانی «وەتـــەن»ن لـــە ئینگلیزییەوە بۆ کـوردی چـونکە «بەشـی ڕۆژهـەلأت» بۆخـۆی وتارەکانی لـە تورکییەوە کردووە بە ئینگلیزی و بە داخەوە دەقی وتارەکـان بـە تـورکی لـە فایلەکەدا هەڵنەگیراون:

(وەتەن،

١٩ی تەشرینی دووەمی ١٩٥٨،

**زەنگەکانی ئینزار لێ دەدرێن**[17]

لە بەشی یەکەمی ئەو زنجیرە وتارەی لە پێنج بەش پێکهاتوون و عـەونی دۆغانی نووسەری، کە پشکنەری گشتیی ناوچەکانی ڕۆژهەلأتی تورکیا بـووە، لـە ڕۆژنامـەی «وەتـەن»دا بـلأوی کردوونەتـەوە، نووسـەر دەڵـێ: ڕاپـۆرتێکی قاهیرە کە دەورووبەری بیست ڕۆژ لەمەوبەر گەیشتووە دەڵێ:

«وەفدێك کە یەکێك لە ئەندامەکانی مەلا مستەفای بارزان بوو، لـە لایـەن عەبدولناسرەوە پێشوازی کران و وەفدەکە گفتی ئەوەیان پێدرا کە لە هەموو

---

[15] هەف میخائیل کارلێس (Hugh Michael Carless) ڕۆژی بیست و دووی نیسانی ساڵی ١٩٢٥ لـە دایـك بـووە، دەرچـووی زانکـۆی کامبریجـە، لـە نێـوان نیسـانی ١٩٤٣و تـەمموزی ١٩٤٧دا سـەرباز بـووە، لـە حەڤـدەی نیسـانی سـاڵی ١٩٥٠وە بـووە کارمەنـدی وەزارەتـی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، زوبانی فارسی دەزانی، لـە کـابوول و ڕیـۆدۆ جـانیرۆ و تـاران کاری کردووە، لـە تـەمموزی سـاڵی ١٩٥٨وە گوێزرایـەوە بارەگـای وەزارەتـی هەنـدەران لـە لەندەن. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960", London, PP.150-151.

[16] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, subject: Kurdish question, Minutes, H.M. Carless, February 11, 1959.

[17] لـە دەقـی بەڵگەنامەکـەدا «جەرەسـەکانی ئینـزار لـێ دەدرێـن» (Alarm Bell Are Ringing) بەو جۆرە خەتێکی بە ژێردا هێنراوە.



عەبدولناسر و بارزانی

ڕوویەکــەوە لــە پێنــاو دامەزرانــدنی کۆمارێکی کوردیی سەربەخۆدا پشتی خەباتیان دەگیری»[18].

دووەمــین ڕاپــۆرت لــە لایــەن «هــەواڵنێری تــورکی»یـەوە لـە بەغـدا نێــردراوە.... دەڵــێ: «وەك زانــراوە پێکدادانی خوێناوی لە نێـوان تـورك و کــوردی کەرکووکــدا قــەوماوە، ئــەو کوشتارە لەو کاتەدا ڕوویدا کە بارزانی گەیشتە کەرکوك لە ڕێگەی سلێمانی دوای گەڕانەوەکەی ئەم دواییيانـەی لـە ڕووسیاوە. نزیکەی پێنج هەزار کوردی چەکدار بەو چەکانەی ناسر بـە نهێنـی لە ڕۆژگاری نووری سەعیددا ناردبوونی، بۆ پێشوازی بـارزانیی لـە کـەرکووك کۆبوونــەوە، ئــەو کوردانــە دەســتیان کــردە خۆنیشــاندان لــە شــەقامەکانی کەرکووکـدا و هێرشـیان بـردە سـەر تورکـەکان و دەسـتیان کـردە تـاڵانیی دووکانەکانیان. گەلێك کەس لەو پێکدانانەدا بریندار بوون.

ڕاپۆرتەکەی «هەواڵنێری تورکی» گوتیشی مێجەرێکی بـە ڕەگـەز تـورکی ئەفسەر لە سوپای عیراقدا کوژرا و گەڕەکە تورکەکانی شار بۆمباران کران.

لەبەر چەند هۆیەکی نەزانراوی سیاسیی دەستکرد لە تورکیا هەر کەسێك زاراوی کوردایـەتی «کـوردیزم» و کوردسـتان، یـان تەنانـەت زاراوێکـی وەك «ناوچەکانی ڕۆژهەلات» بەکار بهێنێ تۆمەتبار دەکرێ، گشت جیهان ئاگاداری ئـەم بزووتنـەوە کوردییەیـە و ڕۆژنامـە و گۆڤـارە زانسـتییەکان و وەزیرانـی

---

[18] بارزانی لە ڕێگەی قاهیرەوە گەڕایەوە عیراق و جەمال عەبدولناسر لە ماڵی خۆی پێشوازی لە خۆی و هاوەڵەکانی، کە یەکێکیان تاڵەبانی بوو بە جلو بـەرگی کوردییـەوە، کرد و گشت ئێزگە و ڕۆژنامـەکانی جیهـان بایـەخێکی زۆریـان بـەو پێشوازییە دا، بـەڵام پێموایـە سـەرۆك جـەمال عەبدولناسر وەهـا بـە ئاشکرا باسـی دامەزراندنی کۆمـارێکی کـوردی سـەربەخۆی نەکردووە.

هەنـدەرانی ولاّتـان بـە درێـژی باسـی دەکـەن، لـە یـەرێڤانی «پایتـەختی ئەرمەنستانی سۆڤێتی–ك.م.» دەزگای تایبـەتی هەیـە کـە دڵسۆزانە کـار لـە سەر دانانی فەرهـەنگی تایبـەتی زوبـانی کـوردی دەکـەن، هـەروەها هـەن لـە کەمپـەکانی قەوقاسـدا مەشـقیان لەسـەر شـەڕی پـارتیزانی پـێ دەکـەن و ئیزگەیـەك هەیـە پڕۆپاگەنـدە بـۆ کوردایـەتی دەکـات، ئینجـا لەگـەڵ هـەموو ئەمانەیشدا لە ئێمە وایە گشت ئەم دیاردانە نامێنن هـەر ئەوەنـدە خۆمـان لـە ئاستیدا بێ دەنگ بکەین.

یەکەم کار کە پێویستە پـەنای ببرێتـە بـەر بـۆ خۆپاراسـتن لـە ئەگـەری مەترسـیی ئـەم ڕاسـتییانە لـە ڕووبەڕووبوونەوەیاندایـە نـەك لـە خسـتنە پشتگوێیان. ئەمە ڕاستییەکە تایبەت بۆ یەکێك ئەوە بخاتە مێشـکی خۆیـەوە کە لەگەڵ هەموو شتێکدا کوردزوبـان وەك هاوڵاتییـەکی تـورکی لـە تورکیـادا هـەن و وەك هـەر کەسـێکی دیکـەی ئەسـتەموولّ و ئەنقـەرە بـە پەرۆشـن بـۆ پاراسـتنی یەکیـەتیی نیشـتیمانی دوور لـە برینـدارکردنی هەسـت، وا باشـە پێوەندیی بەو جۆرە هاوڵاتییە دڵسۆزانەی ئـەم نیشـتیمانەوە بکـەین تـاوەکو هەمووان لە مافدا وەك یەك بن، مەترسی لەوەدایە کـە بیانییـەکان دەیانـەوێ ببنە کۆسپ لەبەردەم ڕوودانی دیاردەیەکی لەم جۆرە.

مـن لـەو بڕوایـەدام یەکـەم هـەنگاوی پێویسـت ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو درۆیانەیـە کـە قـاهیرە دەیانکـات و دان بـەوەدا بنـێین کـاتی ئـەوە هـاتووە ئاڵوگۆڕەکـان بـە شـێوازێکی کـراوە و بـە شـەرەفەوە هەڵبسـەنگێنین، بـۆ وەدیهێنانی بارودۆخێکی لەبار لەبەردەم گشت هاوڵاتییەکانـدا چ لـە بـاکوور و چ لە باشوور و چ لە ڕۆژهەڵات و چ لە ڕۆژئاوا لە پێناو یەکیەتیی نیشتیمانیدا. من ئەو کاتە هەست دەکـەم کـە فەرمانـەکانی سـەر شـانم بـەجێ گەیانـدووە ئەگـەر بتـوانم هاوڵاتییـەکانم وەخەبـەر بهێـنم و ئەگـەر تـوانیبێتم سـەرنجی بەرپرسان بۆ ئەم بابەتە ڕابکێشم. بەندە چوار وتاری دیکە بۆ ئەم بابەتانـەی لای خوارەوە تەرخان دەکەم:



شێخ عەبدولسەلام بارزانی

١- سەرگوزشتەی مەلا مستەفای بارزانی قارەمانی ڕووداوەکەی کەرکووك و ئەو ڕێبازە «تەریقەت»ەی ئەو پەیڕەوی دەکات و ئەو ڕۆڵەی ڕێبازی «نەقشبەندیی-ك.م.» لە ڕاپەڕینەکانی «کورددا-ك.م.» دیویێتی.

٢- کورتە پوختەیەکی مێژوویی دەربارەی بزووتنەوەی کورد و هەڵوێستی ئێستاکەی.

٣- کاردانەوەی یاخیبووەکانی «کورد-ك.م» لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا.

٤- ئەو کارانەی بۆ یەکیەتی نیشتیمانی پێویستن.

مەلا مستەفا یەکێکە لە ئەندامانی ئەو بنەماڵە ناسراو و بە نفووزانەی پێیان دەڵێن شێخانی بارزان، کە لە گوندی بارزانی سەر زێی گەورە لە دایك بووە، بارزان سێ سەعات لە شارۆچکەی بیرەکەپرەوە دوورە کە بە پایتەختی ناوچەی زێباری عێراق دەژمێردرێ، یەکێك لە باپیرانی مەلا مستەفا، شێخ عەبدولسەلام [19] وەرزێر بوو، شێخ عەبدولسەلام دایە پاڵ سەید تەهای باپیری سیناتۆر عەبدولقادر کە کەسایەتییەکی بایەخداری لقی خالیدیی ڕێبازی نەقشبەندی بوو و دەیویست ببێتە ڕەهبەری ئەم ڕێبازە، شێخانی بارزان هەمیشە خەریکی یاخیبوون و دووبەرەکی کردن بوون، ئەوان ماوەیەکی دووروودرێژ دژی هێزەکانی محەمەد فازیل پاشا جەنگین، شایانی باسە ئەو هێزانە بۆ سزادانی ئەو شێخانەی دژی ڕژێمی دەستووری ساڵی ١٩٠٨ ڕاپەڕین و بوونە هۆی کوشتنی سەدان ئەفسەر و سەربازی تورك کە

[19] شێخ عەبدولسەلام برا گەورەی مەلا مستەفای بارزانییە نەك باپیرەی، دوور نییە نووسەر مەبەستی شێخ عەبدولسەلامی یەکەم بێت.

نێردرابوون، شێخانی بارزان کاتی خۆی کشانەوەو پەنایان بردە بەر ناوچە شاخاوییەکان بە هۆی ئەو کارە سەربازییانەی دژیان ئەنجام دران، بەڵام لە لایەن نازم پاشای وەزیری جەنگی «کابینەی باڵا»وە[20] کە کرایە سەرکردەی سوپای شەشەم و حاکمی گشتیی بەغدا و بەسرە و مووسڵ لێبووردنیان بۆ دەرچوو، نازم پاشا بەو کارەی دەیویست لایەنگر بۆ «فیرقەی[21] حورییەت و ئیئتیلاف» پەیدا بکات کە بۆخۆی ئەندامی بوو، هەرچۆن بێ زۆری نەبرد کاتێك بارزانییەکان دیسانەوە ڕاپەڕینەوە و یاخیبوونی ئەمجارەیان تاوەکو دانانی سلێمان نەزیف بەگ بە والیی بەغدا بەردەوام بوو، سلێمان نەزیف ئەم مەسەلەیەی بە جدی وەرگرت و پەنای بردە بەر گشت هەوڵێك بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە و شێخ عەبدولسەلامی لە سێدارە دا و سزای توندی یاخیگەرەکانی دیکەی دا.

بە دەستووری باووباپیرانی، مەلا مستەفا ژیانی یاخیگەریی بردە سەر. دەوروبەری سیازدە ساڵ لەمەوبەر حوکمەتێکی کوردی لە ناوچەی مەهاباد، واتا ساوجبولاقی باشووری ئازەربایجانی ئێران دامەزرێنرا و مەلا مستەفا بووە وەزیری جەنگی[22] ئەو حوکمەتە کە قازی محەمەد سەرۆکی بوو. دوای ئەوەی حوکمەتی ئێران بە یاریدەی حوکمەتی بەریتانی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توانی ئەو «حوکمەتە»[23] لەناو بەرێ و مەلا مستەفا و لایەنگرەکانی کشانەوە ناو خاکی عیراق.

---

[20] ئەو ئەنجومەنی وەزیرانەی دوای بەرپابوونی شۆرشی ساڵی ١٩٠٨ دژی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دامەزرێنرا پێی دەگوترا «کابینەی باڵا (Great Cabinet).

[21] تورکەکان فیرقەیان بە واتای پارتی بەکار دەهێنا.

[22] سەیفی قازیی ئامۆزای قازی محەمەد بووە وەزیری جەنگی کۆماری کوردستان و بارزانیش بووە فەرماندەی سوپای کۆمار.

[23] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی «حوکمەت» (government) بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە و تەنانەت یەکەم پیتی وشەکەش بە گەورە کاپیتاڵ نووسراوە، واتا "Government" نییە وەك لە زوبانی ئینگلیزیدا پەیڕەو دەکرێ، هەر چۆن بێ هەستی شۆڤێنیی نووسەر لەو جۆرە شوێنانەدا بە زەقی خۆی دەنوێنێ.

هەرچۆن بێ بە هۆی ئەو کارە سەربازییانەوە کە حوکمەتی عێراق دژی سازی کردن مەلا مستەفا نەیتوانی لە عێراق بمێنێتەوە و لە ڕێگەی سێمدنیلی و ئۆسۆکیڤۆ و باش قەلاّ و مورادییە و دۆگۆ بایەزیدەوە[٢٤] توانیی پەنا بەرێتە بەر ڕووسیا و دە ساڵی ڕابردووی لە ناوچەی قەوقاس بردە سەر.

سۆڤیەتییەکان بایەخێکی زۆریان پێی دا و هەرچی لە توانایاندا بوو کردیان بۆ فێرکردنی هەموو جۆرە تەکتیك و کاریگەرترین شێوازی شەڕی چەتەگەریی ئەوانەی سەر بەو بوون، ئەو سەربازگایانەی زووتر لە قەوقاس دروست کرابوون، گشتیان بۆ ئەو پیاوە موغامیرە ئاوەدان کران. ئەم پیاوە پاڵەوانی[٢٥] ڕووداوەکانی ئەم دواییانەی کەرکووکە کە ناسریش لە قاهیرە گفتی دابوویێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ. هەڵبەت مەلا مستەفا زۆر خوێندەواری نییە، بەلاّم ڕەهبەرێکی یەکجار زیرەك و چاونەترسە.

شێخانی بارزان سەر بە ڕێبازی نەقشبەندین کە لە لایەن کەسایەتییەکی تورکەوە بە ناوی محەمەد بەهادینی خەڵکی گوندی نەقشبەندیی بوخاراوە دامەزرێنراوە، بەلاّم نەقشبەندییەکانی عێراق و ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی تورکیا سەر بە مەولانا خالیدی بەغدادین کە لقێکی ئەم ڕێبازەیە، مەولانا خالید کورد بوو، لە ناوچەی سلێمانی لە دایك بووە، هۆنراوە سۆفییەکانی هێندە زۆرن بەشی دیوانێکی گەورە دەکەن، بە پێی نەریتی ڕۆژگاری خۆی مەولانا خالیدیش گەشتی زۆری کردووە و چووەتە هیندستان کە لە بواری سۆفیزم و فەلسەفەدا بە ولاّتێکی دەوڵەمەندی داناوە و لەوێ بڕوانامەی قازی عەبدوڵلاّی

---

[٢٤] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکان بەم جۆرە نووسراون:
"....through Semdinli, Yukeshova, Bashkale, Muradiye and Dogu Beyazit...."

[٢٥] دیسانەوە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی «پاڵەوان» (hero) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

دەهلەویی وەرگرتووە و دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا بە ماوەیەکی کورت ناو و شۆرەتی دەرکردووە و نفووزێکی زۆری پەیدا کردووە.

کاتێك سولّتانی عوسمانی محەمەد بە کێشەی میسرەوە خەریك بوو ترسی ئەوەی لێ نیشت شێخ «خالیدی نەقشبەندیی-ك.م.» لە عیراق کێشەی دیکەی بۆ بنێتەوە، بۆیەکا شێخی بانگهێشت کردە ئەستەمووڵ، لەوێش زۆری نەخایاند کاتێك مەولانا خالید کاری کردە سەر گشت ڕەهبەرانی «ڕێبازی نەقشبەندی-ك.م.» لە ئەستەمووڵ، ئەوەی عەونی دۆغان کردوویەتە پارچە هۆنراوەیەك.

ئەم بارودۆخە سولّتان محەمەدی ورووژاند، بۆیەکا فەرمانی دایە مەولانا خالید بچێتە دیمەشق و لەوێش لە گەڕەکی سالّحییە نیشتەجێ بێ.

دەتوانرێ هەوێنی نهێنیی کاریگەریی و توانای مەولانا خالید «لەو قۆناغەدا-ك.م.» لەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی تورکیا بگێڕدرێتەوە بۆ نیشتەجێبوونی لە گەڕەکی سالّحییە[٢٦].

زۆربەی ئەوانەی لەو گەڕەکە دەژیان کورد بوون، مەولانا خالیدیش لە ڕێگەی ئەوانەوە توانیی ژمارەیەك لە کەسانی ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی تورکیا بۆ ڕێبازی نەقشبەندی ڕابکێشێ و بڕوانامە بداتە چەند کەسێك وەك خەلیفەی نەقشبەندی، شێخ عەلیی باپیرە گەورەی یاخیگەرای بەناوبانگ شێخ سەعیدی «پیران-ك.م.» یەکێك بوو لەو کەسانە، هەمان کات سەید تەها و حەسەن نوورانی و شێخانی عەینکاف و کەفرییەڤییەکان و[٢٧] سەید فەهیمی ئەرداس و شێخانی بارزان توانییان ڕێبازی نەقشبەندی بگەیێننە ناوچەیەکی فراوان. ڕێبازە «سۆفییەکانی-ك.م.» دیکە بە پێچەوانەوە پێویستییان بەوە

---

[٢٦] شایانی باسە بەشی هەرە زۆری کوردی دیمەشق لە گەڕەکی سالّحییە دەژین و هەر ئەو گەڕەکەیش بووە پەنای کوردە چالاکە هەلّهاتووەکانی تورکیا کە گەلێکیان، وەك بەدرخانییەکان، لەوێ کۆچی دواییان کردووە.

[٢٧] لە دەقی بەلّگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

"...Aynikaf Shaikhs, and the Kufrevis.., (P.3)."

نەبوو تەکیەی خۆیانیان هەبێ، ئەوان دەیانتوانی لە هەر شوێن بێ ئەرکە ئاینییەکانی خۆیان رابگەیێنن[٢٨].

پیاوانی شێخەکانی بارزان پەیڕەویی دسیپلینێکی بە حەزمیان دەکرد و تاوەکو رادەیەکی دیار نیمچە سوپایەکیان پێك دەهێنا و ئەو پیاوانە، وەك لە خوارەوە باسیان دەکەین، چوار جۆر بوون:

١- نوێکان، واتا ئەوانەی هێشتا سوێندیان نەخواردووە[٢٩]،

٢- موریدەکان، واتا ئەوانەی بۆ قۆناغی موریدی وەرگیراون[٣٠]،

٣- دێوانەکان، واتا ئەوانەی بێ هیچ جۆرە مەرجێك و تەواو خۆیان بۆ رێبازەکە و شێخ تەرخان کردووە دوای ماوەی تێگەیشتنی سەروبەری رێبازەکە[٣١]،

٤- رۆژووگران[٣٢]- ئەوانەی دەستەی سەرەکیی رێبازەکە پێکدەهێنن.

---

[٢٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوی ئەو کۆڕانە بەو جۆرە هاتووە: "hatmi hocekan" کە بە داخەوە بۆم ساغ نەبووەوە مەبەستی چییە.

[٢٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها نووسراوە:

" 1- novices who have not yet taken the vows."

بە پێی فەرهەنگی ئۆکسفۆردیش وشەی (novice) واتای ئەو کەسانە دەبەخشێ کە لە قۆناغی ئامادەکردندان بۆ کاری خواپەرستی «الرهبنة»، هەرچی وشەی (VOW) یشە واتای خۆتەرخانکەر دەبەخشێ.

[٣٠] وشەی (disciple) واتای مورید یان قوتابی و شاگرد دەگەیێنێ.

[٣١] وشەی (divanes) دەقاودەق دیوانەکەی لای خۆمانە و وشەی (indoctrination)یش واتای تێگەیشتنی قووڵ و تەواوی هەر رێبازێك دەگەیێنێ.

[٣٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە نووسراوە:

"4- the Zadmehors, those who fast, from the general staff of the sect".

وشەی (Zadmehors) لە هیچ فەرهەنگێکی ئینگلیزیدا نییە چونکە وشەیەکی بیانییە، لە رێگەی ئینتەرنێتیشەوە ماناکەیمان چنگ نەکەوت، سەرەتا وای بۆچووم وشەیەکی هیندی بێ، بەڵام هیندی زانەکانی ئەرشیف گوتیان هیندی نییە، هەرچۆن بێ ئەو وشەیە رۆژهەڵاتییە و بە پێی دارشتنی رستەکە ئەو کەسانە دەگەیێنێ کە دوای خودی شێخ دەگەنە بەرزترین پلەی رێبازی نەقشبەندی.

گشت ئەندامانی ڕێبازی نەقشبەندی لە هەر پلەیەکدا بن تەواو چەکدارن. هەر پێنج ڕاپەڕینەکەی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیادا دوای دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری بەرپا بوون لە لایەن شێخەکانەوە ڕەهبەرییان دەکرا»[٣٣].

«وەتەن، بیستی تەشرینی دووەمی ١٩٥٨، زەنگەکانی ئینزار لێ دەدرێن

لە دووەم ئەڵقەی وتارەکەیدا دەربارەی کێشەی کورد عەونی دۆغانی پشکنەری گشتیی پێشووی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەڵێ:

ئەو ناوچانەی ئێمڕۆکە پێیان دەگوترێت ڕۆژهەڵاتی تورکیا کاتی خۆی بە یاریدەی مەولانا ئیدریسی بدلیسی «واتا شەرەفخانی بدلیسی—ک.م.» لە ڕۆژگاری سوڵتان سەلیم یاوزدا بێ جەنگ خرانە سەر ئیمپراتۆری عوسمانی و تەنها لە دیاربەکر شەڕێکی بچووك قەوما و بۆ ماوەی دوو مانگ قەلای دیاربەکر بە سەرکردایەتیی بەگلی محەمەد پاشا گیرا و خودی مەولانا خالید بووە هۆی وەستاندنی ئەو شەڕەی دیاربەکر.

لە ڕێگەی مێژوونووسە فەرمییەکان و ئەولیا چەلەبییەوە ئەوە زانراوە کە سوڵتانەکان بە هۆی دەرەبەگە «کوردەکانەوە—ک.م.» ئەو ناوچانەیان حوکم دەکرد و بەو جۆرە دەزگا کارگێڕییەکانی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئێران وەك خۆیان مانەوە.

دوای گۆڕینی شێوازی کارگێڕیی بە سیستەمی ویلایەت ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتیش کرانە چەند ویلایەتێکی جیاواز، بەڵام ئەوە تەنها لەسەر نەخشە بوو، تەنها پایتەختە ناوچەییەکانی وەك دیاربەکر و وان و چەند مەڵبەندێکی کەمی دیکەی لێ دەربکەیت ئیتر کرمانجی و زازا، کە جۆرە زاراوێکی عەرەبی ئامێزە، زوبانی سەرەکیی دانیشتووانی گشت ئەو ناوچانەیە و خەڵکی بەو زوبانانە لەماڵەوە و لە بازاڕ و لە کێڵگەکان قسە دەکەن و تاوەکو دەوروبەری پەنجا ساڵ لەمەوبەر کتێبی کوردی نەبوو[٣٤] وە ژیانی

[33] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential,1959, Subject: Kurdish Question,- "Vatan", November 19, 1958.

[٣٤] بە پێویستم نەزانی ئەو جۆرە هەڵانەی لای هەمووان ئاشکران ڕاستیان بکەمەوە.

ڕووناکبیری ناوچەیی خەڵکەکە پشتی بە داستانی شیعری و حیکایەتی لەبەرکراو «فۆلکلۆر» دەبەست.

یەکەم هەنگاوی بایەخدار لە بواری بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کوردیدا بریتی بوو لەو بەرهەمەی بەناوی «مەم و زین»ەوە ئەحمەدی خانیی خەڵکی بایەزید دەوروبەری سەد و هەشتا ساڵ لەمەوبەر نووسی، «مەم و زین» داستانێکی ئەفسانەییە و تاوەکو ڕادەیەك لە «لەیلا و مەجنوون» و «خەسرەو و شیرین» دەچێ. هەمووان، تەنانەت خێزانە «کوردە—ك.م.» کۆچەرەکانیش بە ڕێزێکی قودسییەوە «مەم و زین» دەخوێننەوە و گوێی لێ دەگرن، ئەوانەی دەیخوێننەوە بە کوردی دەنگبێژیان پێ دەڵێن کە لە ناو سەرجەمی هۆزەکاندا هەن، ئەو دەنگبێژانە هەموو شت لە قووڵایی دڵەوە دەزانن و خەڵکی وەك مەولوودنامە گوێڕایەڵی «مەم و زین» دەبن، (عەونی دۆغان) لێرەدا چەند پارچەیەکی لە «مەم و زین» وەرگرتووە[٣٥] کە مەم تێیدا چاوەڕوانی ئەو «پادیشاهە کوردە مەزنە» دەکات کە دەتوانێ و لە خوێنی خۆمانە «نەتەوەکەمان لە چنگی کۆیلەیی تورك قوتار بکات» دۆغان هەروەها لە دەفتەری ڕۆژانەکەیدا نوسیویە چۆن کاتێك بە کاری فەرمیی لە ڕۆژهەلأت بووە دانەیەك لە «مەم و زین»ی بە تورکی دەستکەوتووە و یەکسەر نادوویە بۆ وەزارەتی ناوخۆ.

لە چاوی هەمووان‌دا من مرۆڤێکی بێ ئاگا دەبم ئەگەر بێت و وەها بیر بکەمەوە کە ئەم داستانە شیعرییە بۆ بزواندنی هەست و نەستی خەڵك گوتراوە و بە درێژایی چەند سەدەیەك دەگوترێتەوە کار ناکاتە سەر خەڵکی ئەو شاخانە[٣٦].

---

[٣٥] ئەمە تێبینیی ڕۆژنامەی «وەتەن» خۆیەتی.

[٣٦] دیارە مەبەستی خەڵکی کوردستانە.

دەتوانرێت قۆناغەکانی بزووتنەوەی کورد لە گۆڕەپانی پڕۆپاگەندەوە بۆ گۆڕەپانی سیاسیی ڕێکخراو و تەتبیق دابەش بکرێت بەسەر سێ قۆناغی سەرەکیدا کە ئەمانەن:

١- قۆناغی بەر لە دامەزرانی ڕژێمی دەستووری لە ڕۆژگاری عوسمانیدا،

٢- قۆناغی دوای دامەزراندنی ئەو ڕژێمە،

٣- قۆناغی دوای دامەزراندنی کۆماری تورکی.

ناشێ لە زنجیرە وتارێکی ڕۆژنامەنووسیدا باسی ئەو قۆناغانە بە دوور و درێژی بکەین، بۆیەکا بە گشتی باسی هەردووك قۆناغی یەکەم و دووەم دەکەم و پتر باسی ئەو ڕووداوانە دەکەم کە لە ڕۆژگاری خۆماندا قەوماون. لە قۆناغی بەر لە دامەزرانی ڕژێمی دەستووریدا تەنها دوو هەوڵی سەرەکیی بۆ دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردی درا، ئەو دووانەیش بریتین لە یاخیبوونەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا و ئەوەی ئیسماعیل خان کە بە سمکۆ ناسراوە و ئەندامی لقی عەبدۆی هۆزی شوان بوو[٣٧].

شێخ عوبەیدوڵڵا یەکێکە لە ئەندامانی بنەماڵەی سەید تەها کە لە ناودارانی ڕێبازی نەقشبەندین و باوکی سیناتۆر سەید عەبدولقادرە کە لە سێدارە درا. شێخ عوبەیدوڵڵا کە دەرکی ئەوەی کردبوو مەحاڵە حوکمەتێکی کوردی لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا دروست بکرێ ڕووی کردە ئێران. ئەو هەوڵەی شێخ بۆ دامەزراندنی حوکمەتێك نەریتێکی دێرین بوو، بە پێی میثۆلۆجیا (داستانێکی دێرین پیتی «ش» کە یەکەم پیتی شێخ و شا و شەیتانە جۆرە وێکچوون و گرێدانێك لە نێو ئەو وشانەدا دروست دەکات). مێژووی ئەم بەشەی جیهان پڕییە لە چیرۆکی ئەو شێخانەی هەوڵیانداوە سەڵتەنەتێك دابمەزرێنن.

---

[٣٧] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

."... who was a member of the Apdui branch of the tribe Shifan"

ساڵی ۱۲۹۷ی هیجری عوبەیدوڵڵا هێزێکی سەربازی ڕێکخست و عەبدولقادری کوڕە بچووکی کردە سەرکردەی باڵی چەپ و کوڕە گەورەکەی محەمەد سدیقی کردە سەرکردەی باڵی ڕاستی هێزەکە و بۆخۆیشی بووە سەرکردەی باڵی ناوەڕاستی ئەو هێزە و بەو جۆرە ڕووی کردە ئێران. عەبدولقادر لە ڕێگەی ساوجبولاقەوە ڕووی کردە میانی دوو ئاو و شاری تەورێزی خستە مەترسییەوە، بەڵام محەمەد بەر لەوەی بگاتە شووورای ورمێ[٣٨] بەزێنرا و ئابلۆوقە درا، بۆیەکا هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا کشانەوە و گەڕانەوە شەمدینان. شێخ کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ هێرشێکی نوێ، بەڵام سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هێرشێکی کردە سەر شێخ بۆ دەرسدادانی، ئەوە بوو خۆی و کوڕە بچووکەکەی دەستگیر کران و دوورخرانەوە بۆ مەدینە، عوبەیدوڵڵا لە مەدینە کۆچی دوایی کرد و عەبدولقادریش دوای دامەزراندنی ڕژێمی دەستووری «لە ساڵی ۱۹۰۸دا–ك.م.» گەڕایەوە ئەستەموول.

لە کەشوهەوای ئەو ڕۆژانەدا کاتێك ئازادیی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا خەڵکی وایان لێ هات هەر کەسێك لە لایەن «سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە–ك.م.» دوور خرابێتەوە بە چاوی «پاڵەوانی ئازادی»سەیری بکەن. لەو بارودۆخەدا عەبدولقادر کرایە سیناتۆر هەرچەندە بۆخۆی شایانی ئەو شوێنە بەرزە نەبوو. (دۆغان لە دەفتەری ڕۆژانەکەیدا نووسیویە زۆر شت هەیە دەربارەی عەبدولقادر و لە سێدارەدانەکەی دوایی لەو وتارەیدا کە تەرخان دەکرێ بۆ باسی یاخیبوونەکانی ڕۆژگاری کۆمار دەیاننووسێ)[٣٩].

«وەتەن، بیست و یەکی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۵۸– زەنگەکانی ئینزار لێ دەدرێن»

---

[٣٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە ڕومیێ (Rumiye) کە دەبێ هەڵەی چاپ بێ و مەبەستی شاری ورمێ بێ.

[39] N.A., F.O., 371/140682, Eastern, Department, Confidential,1959, Subject: Kurdish Question,- Vatan, November 20, 1958.

عەونی دۆغان لە سێیەم وتاریدا بۆ «وەتـەن» دەربـارەی کێشـەی کـورد دەڵێ:

(چالاکییەکانی سمکۆی هەلپەرست «موغـامیر» لـە پێنـاو دامەزرانـدنی حوکمەتێکی کوردیدا گەلێك جـار ئیتیجـاهی دەگـۆڕدرا. سمکـۆ هەنـدێك جـار دژی ئێران بە پشتیوانیی ئیمپراتـۆریی عوسمـانی خـەباتی دەکـرد و هەنـدێك جاری دیکە دژی ئیپراتۆری عوسمانی خەباتی دەکرد و هەڵدەهاتە ناو خـاکی ڕووسیا، ئەم یاخیبوونانەی ئەم چەتە فێڵبازە بەرپای دەکـردن چـەند سـاڵێك بەردەوام بوون، دوا جار ساڵی ١٩٢٧ خۆی دا بـە دەسـت کۆمـاری تورکیـاوە کە لە ناوچەی باکورگـە [٤٠] نیشـتەجێ کـرا. لـەو ڕۆژگـارەدا کـە بزووتنـەوەی کورد لە لایەن بەریتانییەکانـەوە هـان دەدرا سمکـۆ کەوتـە هاریکـاری لەگـەڵ ڕەهبەری نەسـتوورییەکاندا مـەلیك مـار شـەمعون، بـەڵام دوایـی خیانـەتی لـە نەستوورییەکان کرد و دەوروبەری سەد کەسی لە پیاوەکانی کوشت.

وەك لـە یـەکێك لـە وتارەکـانی پێشـووماندا ئاماژەمـان بـۆی کـرد دوای دامەزراندنی دووەمین ڕژێمـی دەسـتووریی لـە ڕۆژگـاری تورکیـای عوسمانیـدا بزووتنەوەی کورد بە ڕەهبەریی سـەرەك هـۆز و شـێخ و سـەرکردە چـەتەکان کەوتنـــە دامەزرانـــدنی چـــەند کۆمەڵەیـــەکی شۆڕشـــگێڕیی وەك "کۆمەڵـــەی بڵاوکردنـــەوەی خوێنـــدەواری«- کـــورد نەشـــری مـــەعاریفی جەمعییـــەتی» و «کۆمەڵـــەی هێـــدی» و[٤١] «کۆمەڵـــەی تـــەعالیی کـــورد» و «خۆییبـــوون» کـــە گشتیان هەوڵیان بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەدا.

ڕۆژگـاری قۆنـاغی دووەمـی دامەزرانـدنی ڕژێمـی دەسـتووری خـەباتی کەمینەکانی ناو ئیمپراتۆری عوسمانیی لە پێناو جیابوونەوە بە خـۆوە بینـی، لەو ڕۆژگارەدا ئەلبانی و عەرەب و ئەرمەن و گرێك «یۆنانی» و کـورد پـەنایان بردە بەر ئەو هەلە نوێیە بۆ جێبەجێکردنی ئاواتەکانیان و جاری وا هەبوو لـە

---

[٤٠] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا نووسراوە:

"... settled at the Bacurge sub- district.."

[٤١] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا "Hedi"نووسراوە کە دەبێ هەڵەی چاپ بێ و مەبەستی هێڤی بێ.

نێو خۆیاندا بۆ ئەو مەبەستە هاریکارییان دەکرد، بە وێنە «کۆمەڵەی خۆیبوون» هاریکاریی نێوان کورد و ئەرمەنی وەبەرچاو گرتبوو.

دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لە جەنگی یەکەمی جیهاندا لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ژێر کەوت بزووتنەوەی جیاخوازی گەیشتە لقە پۆپە و حوکمەتی ناوچەیی لە نیمچە دوورگەی عەرەب و سووریادا دامەزرێنرا و هەمان کات ئەو ناوچانە لە لایەن سوپای بێگانەوە داگیرکران و بزووتنەوەیەکی چەکدار سامسۆن و تەرابزوون و ناوچەکانی دەوروبەریانی گرتەوە. هەر چۆن بێ موسڵمانەکانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا تووشی خەیبەت هاتن کاتێك لە نێو دەوڵەتە سەرکەوتووەکاندا بیرۆکەیەك پەیدابوو دەیویست ئەو ناوچانەی لە ئەسکەندەروونەوە دەست پێ دەکەن لەگەڵ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا بدەنە ئەرمەن.

ئا لەو کاتەدا ئێمە دوو بزووتنەوە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەبینین کە وێك دەچوون و هەمان کات بێ ئەندازە لە ئامانجەکانیاندا جیاواز بوون:

یەکەم– کوردەکان، هی وەك شەریف پاشا، هەوڵیاندا لە ڕێگەی دەوڵەتە سەرکەوتووەکانەوە کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن بە هۆی ئەو ڕێککەوتننامەیەی لە لایەن شەیخولئیسلام صەبری بەناوی «حوریەت و ئیئتیلاف فیرقەسی» کە دەسەڵاتی بە دەستەوە بوو، هەروەها سیناتۆر سەید عەبدولقادر کە دواتر لە سێدارە درا بە ناوی کۆمەڵەی «تەعالیی کورد»ەوە مۆرکرا.

دووەم– بزووتنەووەیەکی دیکە کە ئامانجی دامەزراندنی ئیمارەتێکی کوردیی ئۆتۆنۆمی بوو لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا بەو مەرجەی دەوڵەتی عوسمانی بەرپرسی کاروباری سیاسەتی دەرەوەی ئەو ئیماراتە بێ، هەموو ئەمانەیش بە پێی پەیمانێك کە ژمارەیەك ڕووناکبیری ناسراوی لەدایکبووی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا کە هی وایان تێدا بوو یان خەڵکی ئەو ناوچانە بوون بەڵام بە ڕەگەز تورك بوون یان تورکی لەدایکبووی ئەو ناوچانە بوون، کۆبوونەوە.

ئـا لـەو کاتـە ناسـکەدا مسـتەفا کـەمال ئـەتاتورك گەیشـتە سامسـۆن و کۆنفرانسی ئەرزڕۆم وەك هـەنگاوی یەکـەمی وەرچـەرخانی ڕەوڕەوەی مێـژوو بەسترا. گشت دانیشتووانی ناوچـەکانی ڕۆژهـەڵات زۆر بـە گـەرمی بەشداریی ئەو خەباتەیان کرد کە لە پێناو یەکیەتیی نیشـتیمانی و سـەربەخۆییدا بـەرپا بوو، حاجی مووسا بەگ کـە گشـت هۆزەکـانی ناوچـەکانی ڕۆژهـەڵات ڕێزیـان دەگـرت بـە دڵ بەشـداریی ئـەو وەفـدەی کـرد کـە خـەریکی ئامـادەکردنی کۆنفرانسی سیواس بوو[٤٢].

ڕۆژانـی خـەبات گشـت تەقـەللای سیاسـییە کـوردە موغامیرەکـان لـە سەرجەمی ناوچەکەدا بە فیڕۆ چوو، ئـەم کەشـوهەوا ئاشـتیخوازانەیە تـاوەکو دامەزراندنی حوکمەتی ئەنجوومەنی نەتەوەیی لە ئەنقـەرە بـەردەوام بـوو[٤٣]. خەڵکی بە قیمەتی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات ڕۆڵی خۆیان وەك هـاوڵاتیی ڕێـزداری کۆماری تورکی لە چوارچێوەی «کۆنفرانس یـان میسـاقی نیشـتیمانی»دا دی، تۆمارەکـانی یەکـەم ئەنجوومـەنی نیشـتیمانی بەڵگەیـەکی زینـدووی ئـەم قسانەن.

دەستووری «کۆماریی—ك.م.» تورکیا گشت مەیلێکی ڕەگەزایەتیی ڕەفـز کرد و هەموو ئەوانەی ڕۆڵیان لە دیاریکردنی چارەنووسی ئـەم وڵاتـەدا هـەبوو بە تورك لە قەڵەم دران بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ڕەگەزیان[٤٤].

---

[٤٢] کوردی تورکیا بە هەموو چەشنێك پشتگیریی بزووتنەوەکـەی مسـتەفا کـەمال ئـەتاتورکیان گرت، تەنانەت شێخ مەحموودیش لە نزیکەوە، لە ڕێگـەی ئـۆزدەمیر پاشـاوە، پێوەنـدیی بـە مستەفا کەمالەوە کرد، ئەوەی پتر لە هەر شت ڕقی ئینگلیزی لێ هەڵساند، بەڵام بە داخـەوە ئەتاتورك نەك هەر ئەو هەڵوێستەی نەنرخاند بەڵکو لە مێـژوودا کـەس بـە ڕادەی ئـەو گـوڕزی ناڕەوای لە کورد نەوەشاند.

[٤٣] لەو قۆناغەدا لە تورکیا دوو دەسەڵات هەبوو، یەکەمیان دەسەڵاتی سوڵتان لـە ئەسـتەمووڵ کە تەواو پەرپووت بوو بوو، دووەمیشیان ئەو حوکمەتە بوو کـە مسـتەفا کـەمال لـە ئەنقـەرە دایمەزراند.

[٤٤] بـێ گومـان ئـەوە پیشـەی گشـت شـۆڤێنییە ڕەگەزپەرسـتەکانی جیهـانی نـوێ و هاوچەرخەکانە، ئەوانەی بوونەتە هۆی گەلێك مەینەتی بۆ گەلەکانیان.

ڕاپەڕینەکەی نوێنەری بدلیسی پێشوو یوسف زیا کە ئامانجی سیاسیی جیابوونەوەخوازی هەبوو ئەم بارودۆخە خۆشەی تێکدا، زۆری نەبرد کاتێک یاخیبوونەکەی شێخ سەعید دەستی پێکرد کە لەماوەی تەنها یەك هەفتەدا چوارده ویلایەتی گرتەوە و بووە هۆی قەڵەقێکی جیدی لە وڵاتدا، ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەورە «The Grand National Assembly» دەستوبرد زنجیرەیەك یاسای بۆ دابین کردنی نیزام لە وڵاتدا و دادگای سەربەخۆیی «محاکم الأستقلال»ی دامەزراند و بە پێویستیشی زانی داوای چەند ساڵێك لە وانەی لە تەمەنی خزمەتی سەربازیدا بوون بکات بۆ دامرکاندنەوەی یاخیبوونەکە.

بەو جۆرە دەستوبرد تواندرا یاجیبوونەکەی «شێخ سەعیدی پیران- ك.م.» دابمرکێنرێتەوە، بەڵام ئەنجامە ناخۆشەکانی چەند ساڵێك بەردەوام بوون، یاخیبوونەکانی ئۆرامار و دیلان و ئاگری یەك لە دوای یەکی هەڵگیرسان[٤٥]. ئەتاتورك لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا «نوتق»[٤٦] بەم جۆرە باسی یاخیبوونەکەی شێخ سەعیدی کردووە: «ڕاپەڕینێکی سیاسیی کۆنەپەرستی ڕێکخراو بوو». لە سەرەتای یاخیبوونەکەدا چالاکییەکانی شێخ سەعید و هاوەڵەکانی دژی ئەو چاکسازییانە ئاراستە کرابوون کە دەستکرابووە جێبەجێکردنیان، بەڵام کوردەکان توانییان خێرا بزووتنەوەکەیان بکەنە بزووتنەوەیەکی سیاسیی جیابوونەوەخواز.

---

(٤٥) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکان بەم جۆرە نووسراون:

" Oramar, Deylan and Agri rebellions followed each other."

(٤٦) لە دەقی ئینگلیزییەکەدا «نوتق» (نطق) کراوەتە (Speech)، ئەو کتێبە وەك یادداشتی مستەفا کەمال ئەتاتورك وایە، گشت وتار و دیدەنییەکانی تێدا کۆکراونەتەوە، بۆیەکا سەرچاوەیەکی گرنگ و ڕەسەنە، من بۆخۆم وەرگێڕانی ڕووسیی ئەو کتێبەم هەیە و لە نووسینەکانی خۆمدا کەڵکی زۆرم لێی وەرگرتووە، بە وێنە لە ڕێگەی «نوتق»ەوە زانیم ئەتاتورك تاوەکو چ ڕادەیەك ڕقی لە مێجەر نۆئێڵ چونکە لایەنی نەتەوەی کوردی گرتبوو، تەنانەت لە «نوتق»دا بە یەکەم هاندەری کوردی لە قەڵەم داوە.

بـەو جـۆرە هەسـتێكی دوو لایـەنیی نـاخۆش دروسـت بـوو لـە نێـوان حوكمەتی «تـوركی–ك.م.» كـە بەرپرسـی دابینكردنـی هێمنـی و سـەلامەتیی وڵات بوو لەگەڵ كۆمەڵانی خەڵكی كـورددا كـە هەرچـۆن بـێ دوور نـەبوون لـە سیاسییە كوردە موغامیرەكانەوە چونكە تەنها ئاواتیان پاراستنی یەكیەتی و دابینكردنی بارودۆخێكی كارگێڕیی چەسپاو بوو[٤٧].

«وەتـەن»، بیسـت و دووی تەشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩٥٨– زەنگـەكانی ئینزار لێ دەدرێن

عەونی دوغان لـە چـوارەمین ئەڵقـەی ئـەم وتارانـەدا دەربـارەی كێشـەی كورد دەڵێ:

(بـێ بڕوایـی لـە نێـوان دەزگـا كارگێڕییـەكان و دانیشـتووانی ناوچـەكانی ڕۆژهەڵاتی توركیادا بـووە هـۆی دروسـتبوونی بنەمایـەكی «لـەبار–ك.م.» بـۆ بزواندنی بزووتنەوەی كورد. پێویست بوو كارگێڕەكان تێكەڵ بە خـەڵكی بـبن و لێیان تێبگەن نەك كۆسپی دژواریان لەگەڵدا دروست بكەن.

جووتیارە «كوردەكان–ك.م.» لە بازاڕەكاندا لەسـەر ئـەوە سـزا دەدرێـن چونكە توركی نازانن، سزادەرەكان بە زوبانێـك دەدوێـن كـە ئـەو جووتیارانـە هەرگیز نە تێی دەگەن و نە دەشتوانن فێری ببن، خـەڵكی ناوچـەكە تێناگـەن بۆچی بەرپرسە كارگێڕەكان ڕەشـاش هەڵدەگرن لـەو شـوێنە سـتراتیژییانەی گوایە پێویستە بپارێزرێن لە كاتی زیارەتی یـەكێكی وەك وەزیـری نـاوخۆ بـۆ شاری دیاربەكر كـە بـە درێـژایی سـەدان سـاڵ گـەلێك كەسـی بـەهرەداری بـە نیشتیمان پێشكەش كردووە و ئێستاكەیش مەڵبەندێكی ڕووناكبیریی وڵاتە.

چالاكیی كوردی هەندەران و كۆمەڵـەكانیان لـەم ڕۆژگارەدا بـە جـۆرێكی وەبەرچاو پەرەی سـەندووە و هـەوڵ دەدەن لـە ڕێگـەی پڕۆپاگەنـدەی هەمـە چەشنەوە كار بكەنە سەر ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی توركیا، جـەلادەت بـەدرخان

---

(47) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential,1959, Subject: Kurdish Question,- "Vatan", November 21, 1958.

و عەلی بەگ و عەلیشان زادە [٤٨] چالاکییەکانیان گەیاندۆتە پاریس و سویسرە و ڕووسیا، ئەوانە هیواداربوون تورکیا لە جەنگی دووەمی جیهاندا بداتە پاڵ هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکان و کەوتنە پەرەپێدانی چالاکییەکانیان، بەڵام زۆری نەبرد تووشی خەیبەت هاتن «چونکە فەرمانڕەوایانی تورکیا مەیلی ئەڵەمانیای نازی و هاوپەیمانەکانی ئەو وڵاتەیان هەبوو–ک.م..»

لە ئەنجامی ئەوەدا کوردەکان ڕوویانکردە ئێران و لێرە بە یاریدەی ڕووسیا لە ساوجبولاق «بە کوردی مەهاباد» کۆمارێکیان بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد دامەزراند و مەلا مستەفای بارزان بووە وەزیری جەنگ[٤٩]. لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەیشدا کە درا هاوڵاتییەکانی ئێمە لە هیچ شوێنێك بایەخیان نەدایە ئەو کۆمارەی لە نزیك سنووری ڕۆژهەڵاتمانەوە دامەزرێنرا.

هەر وەك چۆن بەرلە ئێستا ڕوونم کردەوە مەلا مستەفا لەگەڵ بەشێك لە هێزەکانی «دوای کەوتنی کۆماری کوردستان–ک.م. » ڕوویانکردە عیراق، بەڵام لە ژێر فشاری عیراق و ئێران و تورکیادا ناچاربوو لە ڕێگەی باکووری تورکیاوە پەنا بەرێتە بەر ڕووسیا و لەوێ سۆڤیەتەکان پێشوازییەکی گەرمیان لە بارزانی کرد و بڕوانامەی سەربازیی شەرەفیان پێشکەش کرد.

ڕووسەکان هەمیشە ژمارەیەك کەمپی سەربازییان لە ناوچەی قەوقاسدا هەیە کە بۆ مەشقی شەڕی چەتەگەریی تەرخان کراون و بە پێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکان بەشێك لەو کەمپانە خراونەتە بەردەم مەلا مستەفا بۆ ئەوەی مەشقی جەنگاوەرە کوردە نەشارەزاکانی تێدا بکات.

ئینجا با لێرەدا بێمە سەر باسی هەراکەی کەرکووك لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییە زۆرانەدا کە پێشکەشم کردن. یەکێك لە تاکتیکەکانی سۆڤیەت بریتییە لە هاندانی تەنانەت بچووکترین و دواکەوتووترین هۆزەکانی ئاسیا و ئەفەریقا تاوەکو کێشە بۆ جیهانی ئازاد «العالم الحر» دروست بکات و

---

[٤٨] عەلیشان بەگ لە ئەشرافی هۆزی قۆچگیریی بەناوبانگ بوو.

[٤٩] وەك بەر لە ئێستاش ئامازەمان پێی داوە سەیفی قازی وەزیری جەنگ و بارزانی سەرکردەی سوپای کۆماری کوردستان بوون.

مومکین نییه عەبدولناسر لە خۆیەوە کێشەی کورد بورووژێنێ، بێ گومان ئەو کارە لە خودی مۆسکۆوە ئامادە کراوە.

لەم چەندانەدا بابەتێکی سەرنجڕاکێش لە ڕۆژنامەکانی سووریادا بڵاو کراوەتەوە دەربارەی ئەوەی ڕەهبەری حیزبی شیوعیی سووری خالید بەگداش بانگێشت کراوەتە مۆسکۆ و دەڵێن لە ڕێگەی گەڕانەوەیەوە لە مۆسکۆوە دەچێتە عیراق.

خالید بەگداش جێگەیەکی بایەخداری لە نێو کورددا هەیە و بە درێژایی چەند ساڵێك هانی دانیشتووانی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیای داوە بۆ ئەوەی دژی حوکمەت ڕاپەڕن، کاتێك هەموو ئەمانە وەبەرچاو دەگرین بایەخی ڕووداوەکانی کەرکووك دەردەکەون: لە سلێمانی، کە شارێکی عیراقییە، کوردەکان قوتابخانەی تایبەتییان کردۆتەوە و وا دەچێ بۆ سێ ساڵ مەشق بە ئیمامەکانی گوندەکان دەکەن تاوەکو بیاننێرنە گوندە کوردییەکانی ئێران و تورکیا، بە پێی هەواڵەکانی دیکەی هەمان بابەت کە لە هەمان سەرچاوەوە پێمان گەیشتوون ژمارەیەك لەو ئیمامە مەشق پێکراوانە بۆ کاری تایبەتی گەیشتوونەتە ئەو شوێنانەی بڕیار بوو بۆیان بچن.

هەموو ئەمانەیش ئاماژە بۆ ئامادەکردنی درامایەکی نوێ بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەکەن کە چاوەڕوانی مەترسیی زۆری لێ دەکرێ. ئەو دەنگانەی لە کەرکووکەوە دێنە گوێ دەڵێن زەنگەکانی ئینزار لێدەدرێن.

من بۆخۆم یەکێکم لەو کەسانەی لەو بڕوایەدام ئەو ڕووداوانە هیچ کارێك ناکەنە سەر هاولاتییەکانمان لە ناوچەکانی ڕۆرژهەلاتدا، چونکە ئەوان لە کەشوهەوای یەکیەتی نیشتیمانی و هاریکاریدا دەژین، بەلام ئەوەی بەلای هەر خێزانێکی بە ئاگاوە بایەخدارە بریتییە لەوەی کاتێك ئاگر بەردەبێتە خانوویەکی دراوسێ ئەویش پەنا دەباتە بەر ئەو هۆیانەی خانووەکەی لە کڵپەی ئاگرەکە بپارێزێ.

بە پێویستی دەزانم بە کورتی باسی زوبانی کوردی بکەم بەر لەوەی بێمە سەر باسی ئاوات و خەونەکانی کورد و چالاکییە سیاسییەکانیان.

یەکێك لە کتێبە هەرە بایەخدارەکان لە ڕووی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی کوردەوە کتێبەکەی دوکتۆر فریتزە [٥٠] کە لە لایەن ئەکادیمیای ڕۆژهەڵاتناسی بەرلینەوە بڵاو کراوەتەوە، وێڕای کتێبەکەی سێر جۆن مالکۆڵم دەربارەی مێژووی ئێران و وتارەکانی گۆڤاری «کوردستان» کە لە تاران دەردەچێ. هەمان کات لەم دواییانەدا ژمارەیەکی زۆر نامیلکەی پڕۆپاگەندە لە لایەن کوردەکان خۆیانەوە بڵاو کراونەتەوە کە قووڵ نین و بایەخی زانستییان نییە.

تەنانەت لە داستانە هەرە کۆنە کوردییەکانیشدا هیچ دەربارەی ڕابردووی کورد نییە و گشت چیرۆکە فولکلۆرییەکانی کورد بریتین لە گێڕانەوەی چیرۆکی پڕ لە موغامەرەی هۆزەکان. هیچ جۆرە ئاماژەکردنێك بۆ حوکمەت و یاسا و سامانی دەوڵەمەندی هونەری لەو جۆرەی لە نێو فولکلۆری گشت ئەو نەتەوانەدا هەیە کە سەربەخۆییان بەخۆیانەوە دیوە لە چیرۆکە کوردییەکاندا نین، تەنانەت هەرگیز وشەی «کورد»یشیان تێدا نەهاتووە.

هەرچی «شەرەفنامە» بەناوبانگەکەی شەرەفخانی بدلیسیشە، کە بۆ خۆی کوردە، نەژادی کورد لە ڕێگەی داستانە فارسییەکانەوە دەستنیشان دەکات، لە کتێبە مێژووییە بەناوبانگەکەی ئەلمسعودیشدا هەوڵێك دراوە جۆرە پێوەندییەك لە نێوان کورد و عەرەبدا نیشان بدرێ، بەڵام وەڵامی ئەمە لە لایەن کوردەکان خۆیانەوە نەدراوەتەوە [٥١].

---

[٥٠] من بۆخۆم ئەو کتێبەم نەدیوە بۆیەکا ڕۆژی بیست و چواری مایسی ساڵی ٢٠٠٨ لە لەندەنەوە بە تەلەفۆن پێوەندیم بە بەڕێز دوکتۆر کەمال فوئادەوە لە بەرلین کرد و ئەم زانیارییانەم لێی وەرگرت:

«ئەم کتێبە بە تورکیی عوسمانلی ساڵی ١٣٣٤ی کۆچی لە ئەستەموول لە چاپخانەی ئۆرخانییە چاپ کراوە و ٣٨٤ لاپەڕەیە و لەسەری نووسراوە: حاجی ئیسماعیل، کوردلر، تاریخی و إجتماعی تدقیقات، محرر: دکتر فریج، برلین شرق ئەقادیمیسی طرفندن نشریتیە بلیشیر، برینجی جلدك صوکی، گومانیش لەوە دەکرێ کاتی خۆی توێژەرێکی ئەڵەمانی بە ناوی «فریج» (فریتز)ەوە هەبووبێ».

[٥١] ئەی بەرهەمە سەنگینەکانی خوالێخۆشبوو مامۆستا ئەمین زەکی بەگی دەرچووی ئەستەموول و هاوشانی خوالێخۆشبوو مستەفا کەمال ئەتاتورك چی؟.

لە ژیانی کورددا دوای ئەوەی بوونە موسڵمان «قۆناغی مێژوویی» هەیە، بەڵام ئەو «قۆناغە مێژووییانە» نەبوونە هۆی دروستبوونی هەستی کۆمەڵایەتیی نەتەوەیی لای خودی کوردەکان خۆیان، بە وێنە ئەیووبییەکان بنەماڵەیەکی کوردن، بەڵام ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەیووبییەکان کتومت لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی قاجارییە تورکەکان دەچێ کە ساڵەهای ساڵ حوکمی ئێرانیان کرد. ئەو ڕاستییەی کە بنەماڵەی ئەیووبی کورد بوون نەبووە هۆی دروستبوونی هیچ جۆرە هەستێکی نەتەوەیی لای کورد.

بە پێی لێکۆڵینەوەکانی ئەکادیمیای زانستیی پەترەسبورگ وشەی «کورد» لە فەرهەنگی هیندۆ – ئەورووپیدا[٥٢] نییە، پەیدابوونی ئەم وشەیە، یان ڕاستێکەی دروستکردنی دەگەڕێتەوە دوا قۆناغەکانی ڕۆژگاری عەبباسی. ئاشکرایە کە جەنگیزخانی هاوچەرخی ئەو ڕۆژگارە دەسەڵاتی خۆی گەیاندە گەل و هۆزەکانی ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریی عەبباسی و کابرایەکی بەناوی" کێرد– Kerd" کردە ڕەهبەرێکی دەرەبەگیی ناوچەکە و وێکچوونی نێوان ناوی ئەم پیاوە و وشەی کورد شایانی توێژینەوەیە.

فیردەوسی لە «شانامە» کەی خۆیدا وشەی «کورد»ی وەك سیفەت بە واتای ئازا بە کار هێناوە و لەو فەرهەنگە ڕووسی– ئەڵەمانی– کوردییەدا کە ئەکادیمیای زانستیی پێتەربۆرگ دایناوە ٨٣٠٧ وشەی تێدایە کە ٣٠٨٠ وشەی تورکی و ٢٦٤٠ یان فارسی و ئەوانی دیکەیان عەرەبی و چەرکەسی و جۆرجی و ئەرمەنی و کلدانین.

لەبەر ئەوەی کە لە ڕاستیدا شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەو فەرهەنگە کوردییەی لە یەریڤان ئامادە کراوە نازانین بۆیەکا ناتوانین هیچ شتێك دەرحەقی بڵێین) [٥٣].

---

[٥٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە چاپکراوی نووسراوە: «فەرهەنگی ئاری»، بەڵام بە دەستخەت ئەو زاراوەیە کوژێنراوەتەوە و لە جێگەی نووسراوە «هندۆ– ئەورووپی».

[53] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential,1959, Subject: Kurdish Question,- "Vatan", November 22, 1958.

«وەتەن، بیست و سێی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ – زەنگەکانی ئینزار لێ دەدرێن

لە پێنجەم و دوا بەشی ئەم زنجیرە وتارەدا دەربارەی کێشەی کورد عەونی دۆغان دەڵێ:

(ئەوەی کورد دەیانەوێ ڕۆژی نۆی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٣ لە نامەیەکی کراوەدا ناردیان بۆ مستەفا کەمال ئەتاتورکی سەرەك كۆمار. لە نامەکەیاندا دەڵێن دەیانەوێ ئەو کوردانەی لە ئێران و عیراق و سوریا و تورکیا دەژین یەك بگرن و حوکمەتێکی سەربەخۆ پێکبهێنن.

هەوڵەکانی کورد بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە تاوەکو ئیمڕۆکە بە شێوازی جیاواز و هەمەجۆر بەردەوامن، لە کاری هاوبەشەوە لەگەڵ ئەرمەنەکاندا کە بۆغۆص نۆبار پاشا لە ڕۆژانی گفتوگۆکانی پەیمانی سێڤەردا نوێنەریان بوو، یان بە شێوازی هاریکاریی لەگەڵ ئەرمەندا لە ڕێگەی «کۆمەڵەی خۆیبوون»ەوە کە کۆمیتەی «داشناق»ی ئەرمەنی لە ڕۆژانی یاخیبوونەکەی ئاگری «داغ–ك.م.» دا دایمەزراند، بەردەوامن.

هەروەها کورد کەڵکیان لە پشتگیرییە سیاسییەکانی بەریتانیا و فەرەنسا بینی، کاتێك بەریتانیا حوکمی عیراق و فەرەنسا حوکمی سووریایان دەکرد ئەوان ڕوویان کردە ڕووسیای سۆڤیەتی تایبەتی دوای ئەوەی دەسەڵاتی بەریتانییەکان لە عیراق و فەرەنسییەکان لە سووریا یەك لە دوای یەك نەمان. بە هۆی بایەخدانی زۆریانەوە بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕووس کوردیان نەخستە پشتگوێ و مەلا مستەفای بارزانی بە ئەرکێکی بایەخدارەوە «لەلایەن یەکیەتی سۆڤیەتەوە–ك.م.» نێردرایە عیراق.

بۆ ئەوەی تەواو دەرکی مەترسییەکان لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا بکەین بە پێویستی دەزانین خشتەیەکی زوبان و تایبەتمەندییەکانی دیکەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات وەك هەن پێشکەشیان بکەین، ئەمەی لای خوارەوە لەم ڕووەوە لیستێکی سەرنجڕاکێشە:

١– ناوچەی هەکاری: لە ٨٥٪ی کورد زوبان و لە ٠,٤٥٪ی تورك زوبانن

٢- ناوچەی وان: ٧٥٪ی کورد زوبان و لە ٢٤,٥٥٪ی تورک زوبانن

٣- ناوچەی ئورفە: لە ٦١,٨٪ی کورد زوبان و لە ٣٢,٧٧٪ی تورک زوبانن.

٤- ناوچەی سعرد: لە ٦٤,٤٪ی کورد زوبان و لە ١٩,٤١٪ی تورک زوبانن.

٥- ناوچەی بدلیس: لە ٦٧,٧٤٪ی کورد زوبان و لە ٢٧,٧٠٪ی تورک زوبانن.

٦- ناوچەی مووش: لە ٦٤,٧٠٪ی کورد زوبان و لە ٣١,٩٦٪ی تورک زوبانن.

٧- ناوچەی دیاربەکر: لە ٧٠،٤١٪ی کورد زوبان و لە ٢٨,١٪ی تورک زوبانن.

٨- ناوچەی ماردین: لە ٦١,٨٪ی کورد زوبان و لە ١١,٦٪ی تورک زوبانن.

٩- ناوچەی بنگۆل: لە ٩٤,٤٪ی کورد زوبان و لە ٤,٦٦٪ی تورک زوبانن.

١٠- ناوچەی ئەلعەزیز: لە ٥١,٨٨٪ی کورد زوبان و لە ٤٧٪ی تورک زوبانن.

هەڵوێستەکە بەم جۆرە دەبێ ئەگەر بێتو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ڕووباری فوراتدا دابەش بکەین: لە ٨٥٪ی ئەوانەی لە ڕۆژئاوای فوراتدا دەژین تورک زوبانن، لە کاتێکدا کورد لە ٤٪ و بە زوبانەکانی دیکە ٨٪ن، بەڵام لەو ناوچانەدا کە کەوتوونەتە ڕۆژهەڵاتی فوراتەوە لە ٢٧٪یان تورک زوبان و ٦٥٪یان کورد زوبان و لە ٨٪یان سەر بە زوبانەکانی دیکەن، بەڵام کاتێك گشت ناوچەکە وەك یەك پارچە وەبەرچاو دەگرین ژمارەکسان بەم جۆرەیان لێ دێت: تورك زوبانەکان ٨٣٪ و کورد زوبانەکان١٣٪ و ئەوانی دیکەش ٤٪.

لەم ژمارانەیشەوە هۆی ئەوە دەردەکەوێ بۆچ کورد لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی فوراتدا کێشەیەکی گەورە بۆ تورکیا پێکدەهێنن، هەر چەندە لە ڕاستیدا ئەوان کەمینەیەکی گەورە نین. نابێ ئەوەش بخرێتە پشتگوێ کە لە

ولاتەکانی دراوسێی تورکیادا، واتا لە ئێران و عێراق و سووریادا، ئەو ناوچانەی کوردزوبانیان تێدا دەژین دراوسێی تورکیان.

هەموو ئەوانەی باسمان کرد ئەو کێشانە نیشان دەدەن کە خوێندن بە تورکی تاوەکو چ ڕادەیەك ئەرکێکی پێویستە و تاوەکو چ ڕادەیەکیش دەبێ بایەخ بەم بابەتە بدرێ.

ئەو دیاردەیە خۆی لە خۆیدا دیاردەیەکی باشە تاوەکو ئاواتی یەکیەتی کۆمەڵ ئاواتێکی جێگیر بێ، بەلام ناشێ بناغەی ئەو ئاواتە بریتی بێ تەنها لە قسە لە کاتێکدا زوبانێکی گشتیی بەشە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگایە پێکڕا نەبەستێتەوە. لەوانەیە بگوترێ یەکیەتی ئایین جێگەی ئەو پێویستییە بگرێتەوە، بەلام جیاوازیی ڕێبازە ئاینییەکان هێندە قووڵ ڕەگی داکوتاوە کە کارێکی ئەوتۆی کردووە ئایین لەبریتی ئەوەی ببێتە هۆیەکی پێکەوە بەستن بووەتە هۆیەکی لێك دوورخەرەوە.

هەمان کات گەلێك نەریت و ڕەوشتی جیاواز لە نێو ئەو هۆزانەدا هەیە کە کەوتوونەتە ئەودیو کێوە سەختەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیاوە و لەو ناوچانەدا هەر هۆزەی داب و نەریتی تایبەتیی خۆی هەیە و بە لایانەوە شوورەیییە بۆ ئەو جۆرە باسانە پەنا بەریتە بەر کارمەندانی میری، وێڕای ئەوەی هەمان کات شێخەکان کاریگەرییەکی زۆر گەورەیان لەسەر خەڵکەکە هەیە.

هەر شێخەی ناوچەی کاریگەریی تایبەتیی خۆی بەم جۆرەی لای خوارەوە هەیە:

١- سەید تەها و کوڕەکانی: ناوچەی شەمدینان و بەشێك لە جۆلەمێرگ و ڕۆژهەلاتی ڕەواندز.

٢- سەید عەبدولکەریم و کوڕەکانی: یوسێکۆڤا و باش قەلا و هۆشاب[٥٤].

٣- شێخ مەعسووم و براکانی: بەشێك لە ناوچەی وان و شەرناخ و ئێرسێلیش و ئادلسیڤەر و گێرڤاس[٥٥].

---

[٥٤] لە دەقی وتارەکەدا ناوەکان بەم جۆرە هاتوون: "Yüksekova, Bashkale, Hoshap"

٤- شێخانی خێزان: بدلیس و هێران و ناوچەی بەروارییی سەر بە سعرد.
٥- شێخانی عەینکاف: میدیات و ساڤوور و نەسیبەین.
٦- شێخانی قامشلی: سلێڤان و کولپ و بێشری.
٧- کوفریڤەکان: بدلیس و شێروان و ئانیلسیڤەر و مورادی یە و ئێلەشیرت و بوولانیك و مەلادزگەرد.

خوو و ڕەوشتی کورد یەکجار سەرنجڕاکێشن، کورد گەلێکی جیدی و بە تەحەمول و جێگەی بڕوان، زۆر سرپۆش و ئەمانەتپارێزن، ئافرەتی خراپ و پیاوی عەرەقخۆر لە نێویاندا نییە، بێ ئەندازە ڕێزی گەورەتر لە خۆیان دەگرن، جا خوای دەکرد ئەو کەسە تەنها یەك ساڵ لە خۆی گەورەتر بێ، یەکێك لە خووە هەر بەرزەکانیان بریتییە لەوەی کە هەمیشە خاوەنی قسەی خۆیانن و هەرگیز پەیمانشکێن نین، زۆر حەز لە تالآنی و غەزوو دەکەن، بەلآم ئەمە بە لای ئەوانەوە بریتییە لە گیانفیدایی «موغامەرە» یەك و نیشانەی ئازایەتییە. بە کورتی ئەوان دەتوانن ببنە هاوولآتییەکی نموونەیی بۆ هەر ولآت و نیشتیمانێك، وێرای ئەوەی ناوچەکەیان پڕ لە کانە نەوتە.

ئێمە هەمیشە پەنجەی خۆمان دەگەزین ئەگەر بێت و نەتوانین ئەم خەڵکە بە نرخە لە هەلپەرستە ناوەکی و دەرەکییەکان بپارێزین و ژیانێکی هێدی و بەختەوەریان لە چوارچێوەی کۆماری تورکیدا بۆ دابین نەکەین.

ئێمە کاتێك دەتوانین ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین ئەگەر بێتو بیخەینە سەروو گشت بەرژەوەندییەکی سیاسی و هەلپەرستیی حیزبییەوە. زۆر جێگەی داخ و پەژارەیە بۆ سەرجەمی ئەوانەی ولآت و نیشتیمان و مێژووی خۆیان خۆش دەوێ ڕێگە بدەن گەمە سیاسییە بچووکەکان لەم ناوچەیەدا تەشەنە بسێنن.

هەولم دا بە پێی توانا پانۆرامایەکی دروست و بابەتەکی دەربارەی

---

(٥٥) لە دەقی وتارەکەدا ئەم ناوانەیش بەم جۆرە هاتوون:
" Part of Van province, Shernak, Erceyish, Adilcivar, Gervash".

ناوچەکانی ڕۆژهەلاٌت پێشکەش بکەم، هەرچی ئەو هەنگاوە پێویستانەیشە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە کۆمەلاٌیەتییە گەورەیە دەتوانم بە دلنیاییەوە وەك کابرایەکی پێوەندیدار بە درێژایی چەند ساڵێك بەم کێشەیەوە ژمارەیەك پێشنیاز بکەم بێ ئەوەی لە سنووری ئەدەب دەربچم.

وەك لە راپۆرتێکمدا ئاماژەم پێداوە جارێکیان لە وەزارەتی ناوخۆوە کاتێك باسی ئەو کارانە کرا کە دەبێ لە ناوچەی ڕۆژهەلاٌتدا بکرێن نیشانم دا کە ئەو کارانە دوو جۆرن:

١- دانانی پرۆگرامێکی درێژخایەن بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە کۆمەلاٌیەتییە گەورەیە بەوەی گشت وەزارەتەکان و شارەزایانی دەوروبەری وەزارەتەکان هەوڵی تەواوی بۆ بدەن بێ ئەوەی گۆڕینی حوکمەت هیچ جۆرە کاریگەرییەك بکاتە سەر ئەو جۆرە پرۆگرامە.

٢- تاوەکو پرۆگرامێکی لەو جۆرەی «لە خاڵی یەکەمدا باسی کرا-ك.م.» ئامادە دەکرێ و بە سەرکەوتوویی جێبەجێ دەکرێ پێویستە چەند کارێك جێبەجێ بکرێن بۆ ئەوەی ببنە نیشانەی ئەوەی حوکمەت بۆخۆی بەرپرسی ئەو هەوڵێستانەیە کە پێویستن بۆ بەرهەڵستیی هەموو ئاڵوگۆڕێکی ناوەکی و دەرەکی و لەو پارچەیەی نیشتیماندا بکرێن، هی وەك:

(أ) جێبەجێکردنی ئەو پرۆژانەی بۆ هاوولاٌتییان پێویستن «ڕێگە و بان و نەخۆشخانە و ئەو جۆرە پرۆژانە».

(ب) هەوڵدانێکی فراوان لە بواری ڕووناکبیریدا، تایبەت دروستکردنی قوتابخانە بۆ ئەوەی خەڵکەکە فێری تورکی بکرێن.

بێ گومان ئامادەکردنی پرۆگرامێکی درێژخایەن کە قۆناغ بە قۆناغ «بەندەکانی-ك.م.» جێبەجێ بکرێن وەك لە خاڵی یەکەمدا باسیمان کردووە، پێویستیی بە چەند ساڵێك هەیە بۆ ئامادەکردنی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی قووڵ و نابێ هیچ کەمتەرخەمییەك لە جێبەجێکردنی ئەم کارەدا بکرێ، بۆخۆم لەو ڕۆژانەدا کە لەو ناوچانەدا فەرمانبەر بووم پێم لەسەر ئەوە دادەگرت و ئەنجامیش توانیم وەزیری ناوخۆی ئەوسا حیلمی تۆران قایل

بکەم گەشتێکی چڕوپڕ لەو ناوچانەدا بکات، ئەوەبوو لەژێر کاریگەریی ئەو دیاردانەدا کە بە چاوی خۆی لەوێ بینیی دوای گەڕانەوەی بۆ ئەنقەرە راپۆرتێکی دوور و درێژی پێشکەش بە ئەنجوومەنی وەزیران کرد کە تیایدا پێشنیازی کردبوو پێویستە ئەو پرۆگرامە درێژخایەنە بکرێتە بەردی بناغەی کارەکانی میری لە رۆژهەلاتدا، ئەنجوومەنی وەزیران ئەم پێشنیازەی پەسند کرد و دەسەلاتی ئامادەکردنی ئەو پرۆگرامەی دایە دەست وەزارەتی ناوخۆ.

زۆر بە داخەوە دوایی دەرکەوت کە بایەخدان بەم پرۆژەیە وردە وردە کەم بووەوە و ئەم ئەرکە گەورەیە پشتگوێ خرا و نێردرایە ئەرشیف بە هۆی نەبوونی سەرژمێری «إحصائیات»ی پێویست لای وەزارەتی ناوخۆ.

زەنگەکانی ئینزار لە رووسیا و لای عەبدولناسر لە رێگەی مەلا مستەفاوە دەنگ دەدەنەوە، هیوادارم فەرمانرەوایان و رای گشتیی «تورکیا-ك.م.» وەخەبەر بێن. رادەی سەرکەوتنی کاری رادیکالیی هەر حوکمەتێك لەم بوارەدا لەسەر رادەی بە پەرۆشیی ئەو لاو و نیشتیمانپەروەرە دلسۆزانەی لەدایکبووی هەر ناوچەیەك بن و خۆیان بۆ ئەم ئەرکە تەرخان کردووە وەستاوە، ئەمەیش یەکەم مەرجی پێویستە بۆ ئەوەی بتوانین تورکیا بکەینە لانەیەکی بەختەوەر و بێ کێشە بۆ ژیانی گشت هاوولاتییان).

(عەونی دۆغان لە دەفتەری رۆژانەکانیدا نووسیویە دانەری «مەم و زین» ئەحمەدی خانی سالی ١٠٦١ لە دایك بووە و سالی ١١٠٥ دیوانەکەی تەواو کردووە [٥٦].

شایانی باسە وەرگێرانی هەر پێنج زنجیرە وتارەکەی عەونی دۆغان لە رۆژنامەی «وەتەن»ی تورکیدا بۆ سەر زوبانی ئینگلیزی چواردە لاپەرەی ئەم بەشەی ناو ئەم فایلەی پڕ کردۆتەوە.

دوا بەدوای ئەم وتارەی عەونی دۆغان بەشی پێنجەمی هەمان فایل بۆ تێبینییەکانی ئێدمۆندسی بەناوبانگ دەربارەی پرسی کورد تەرخان کراون و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێرانی ئەو تێبینییانەیە:

---

(56) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential,1959, Subject: Kurdish Question,- "Vatan", November 23, 1958.

(نهێنی،

تێبینییەکانی میستەر ئێدمۆندس دەربارەی پرسی کورد،

لە:

هـ.م.کارلێسەوە [٥٧]،

بۆ:

بەشی ڕۆژهەلات،

میستەر لیٚ کیوسن [٥٨] و میستەر وێست [٥٩].

---

[٥٧] هەف میخائیل کارلێس (Hugh Michael Carless) ڕۆژی بیست و دووی نیسانی ساڵی ١٩٢٥ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، لە نیسانی ساڵی ١٩٤٣و تەمموزی ١٩٤٧دا سەرباز بووە، لە حەڤدەی نیسانی ساڵی ١٩٥٠ وە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، زوبانی فارسی باش دەزانی، لە کابوول و ڕیۆدی جانیرۆ و تاران کاری کردووە، لە تەمموزی ساڵی ١٩٥٨دا گوێزرایەوە بارەگای وەزارەتی هەندەران لە لەندەن. بڕوانە:

"The Foerign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960", London, PP.150-151.

[٥٨] چارلێس مارتین لیٚ کیوسن (Charles Martin Le Quesne) ڕۆژی دەی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٧ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە شازدەی مایسی ساڵی ١٩٤٠وە تاوەکو یەکی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ سەرباز بووە، لە ڕۆژی چواردەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، لە بەحرەین و پاریس و ڕۆما کاری دیپلۆماسیی کردووە، لە تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ وە گوێزراوەتەوە بەشی ڕۆژهەلات لە بارەگای وەزارەت لە لەندەن. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1959", London, PP. 325-326.

[٥٩] داڤید ثومسۆن وێست (Daved Thomson West) ڕۆژی دەی مارتی ساڵی ١٩٢٣ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە نێوان ساڵانی ١٩٤٢ و ١٩٤٥دا سەرباز بووە، لە ڕۆژی هەژدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و پاریس و لیما کاری دیپلۆماسیی کردووە، لە ڕۆژی شازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٦وە گوێزراوەتەوە بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی. بڕوانە:

١- میستەر سی.ج. ئێدمۆندس ڕۆژی شەشی شوباتی «ساڵی ١٩٥٩-ک.م.» بانگهێشت کرا و پێی ڕاگەیاندم کە وتارەکەی لە «گۆڤاری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست» دا دەربارەی ئاڵوگۆڕەکانی ئەم دواییانەی «کوردستان-ک.م» بە پێی ڕۆژنامە کوردییەکان لەم ڕۆژانەدا دەردەچێ. هەروەها گوتیشی ئەو ئێستاکە بە شێوازێکی سەرەکیی خۆی بۆ دەرکردنی بەرگی دووەمی کتێبەکەی «کورد و تورک و عەرەب» تەرخان کردووە. ئەو بەرگە تەواوکەری مێژووی بابەتە کوردییەکانە، وێڕای باسی کۆمیتەی سنووری نێوان عیراق و تورکیا و بابەتی دیکە لە نێوان سالآنی ١٩٢٥-١٩٣٣دا.

٢- ئێدمۆنس تێبینییەکانی خۆی دەربارەی ئاڵوگۆڕە نوێکانی کوردستان بە پشتیوانیی خوێندنەوەی ڕۆژنامە کوردییەکان نووسیوە و ئەمانەی لای خوارەوە سەرنجڕاکێشن:

(أ) کورد بە شێوازێکی وەبەرچاو کاریگەریی خۆیانیان لە عیراقی نوێی دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨دا پەرە پێ داوە. هاوڕێ کوردەکانم پێیان ڕاگەیاندووم کە لە کاتی بانگدانی یەکیەتی نێوان عیراق و ئوردوندا(٦٠) ڕەهبەرانی کورد چوونەتە لای نووری سەعید و ئەمیر عەبدولئیلا و داوایان لێ کردوون ناوی کورد لە «دەستووری نوێی -ک.م.» دەوڵەتی عیراقدا وەك نەتەوەیەك بهێنرێ، بەڵام ئەوان ئەم داوایەیان قبوڵ نەکردووە. هەرچی دەستووری نوێی «کۆماری عیراقە-ک.م» کە ڕۆژی بیست و حەوتی تەممووزی «ساڵی ١٩٥٨-ک.م.» بڵاو کرایەوە، بە پێچەوانەوە دانی بەوەدا ناوە کە عەرەب و کورد دوو نەتەوەی هاوبەشی نیشتیمانن و مافە

---

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960", London, P. 411.

(٦٠) بەو یەکیەتییە دەگوترا «یەکیەتیی هاشمی» کە بۆ خۆیشی هەنگاوێکی سیاسی بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی یەکیەتیی نێوان میسر و سووریا، گشت لایەنە چەپرەو و پێشکەوتنخوازەکانی کوردی عیراق بە دەستووری هێزە دیموکراسییەکانی ئەو وڵاتە و ناوچەکە دژی «یەکیەتیی هاشمی» وەستان.

نەتەوەییەکانیان دابین دەکرێن. میستەر ئێدمۆنـدس گوتیشـی دوای ئـەوەی کـورد بـە پێـی یاسـا یەکسـانیی خۆیانیـان وەرگـرت ئێسـتا تەنانـەت داوای ئەوەیش دەکەن کە مێژوو و زوبانی کوردی لە فێرگە عەرەبییە عێراقییەکانـدا بگوترێتەوە هەروەك چۆن مێـژوو و زوبـانی عـەرەبی لـە فێرگـە کوردییـەکانی عێراقدا—ك.م. دەگوترێنەوە.

(ب) هەرچـەندە کـوردی عـێراق بـە ژمـارە لـە کـوردی تورکیـا و ئێـران کەمترن، بەڵام مافی ڕەوای خۆیانە ئەگەر بڵێن ئەوان پێشـەنگی کوردایـەتین، چـونکە ئـەوان گشـت مافـە هاوسـانییەکانی خۆیانیـان لـە دەوڵـەتی عێراقـدا وەرگرتووە لەکاتێکدا کوردەکـانی ئـەودیو سـنووری «عـێراق—ك.م.» هێشـتا هـاووڵاتیی ژێـر دەسـتەن، شـاری سـلێمانی ئێسـتا بووەتـە مەڵبەنـدێکی سەرەکیی کوردایەتی و عەدواڵ بوونی یەکسانی[٦١].

هەواڵنێری تاسی «سۆڤیەتی—ك.م.» زیـارەتی سـلێمانی کـردووە و مـەلا مستەفایش دانی بەو ڕاستییەدا ناوە[٦٢].

---

[٦١] ڕستەکە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە داڕێژراوە:

"…. Sulaimania had become the headquarters of Kurdish Nationalism and irridentalism".

ئەم وشـەیەی دواییـان "irridentalism" تەنانـەت لـە فەرهـەنگی ئۆکسفۆردیشدا نییـە، لـە شـارەزایانی ئەرشـیڤم پرسـی ئـەوانیش ئـەو وشـەیەیان نەبیسـتبوو، بـەڵام لـە ڕێگـەی کۆمپیوتـەرەوە زانـیم واتـای بیروبـاوەڕ یـان سیسـتمی بیروبـاوەڕ دەبەخشـێ (a belief or system of belief).

[٦٢] دیارە مەبەستی لەوەیە کە بـارزانیش دانـی بـەوەدا نـاوە کـە شـاری سـلێمانی مەڵبەنـدی سەرەکیی کوردایەتییە.

(ج) ئـەو کوردانـەی لەگـەڵ وەفـدی ئاشـتیخوازاندا چـوونە یەکیـەتی سۆڤیەت و چین و کۆریـای بـاکوور دەورووبـەری ناوەنـدی کـانوونی دووەمـی «ساڵی ١٩٥٩–ك.م.» گەڕانەوە بریتی بوون لە:


گۆرانی شاعیر

یەکەم: شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود لـە هاوسـەرە گەورەکـەی کـە پیـاوێکی تونـدەڕەوە و کاتێـك شـۆڕش هەڵگیرسـا ئـەو چوار ساڵ بوو لە بەندیخانەدا بوو، شێخ لەتیف لە باوکەوە برای بابە عەلییە کە پێشتر وەزیری هاتوچۆ بوو.

دووەم: میرزا عەبدوڵڵای گۆران، شـاعیری گەورەی کورد کە لە ساڵەکانی جەنگی دووەمدا وەك موزیع لە ئێزگەی ڕۆژهـەڵاتی نزیـك «شـرق الأدنی» کاری بۆ ئێمە دەکرد. گۆرانیش لـە لایـەن شۆڕشـەوە لـە بەندیخانـە ئازاد کرا.

ئیمزا

هـ.م.کارلێس.

٩ی شوباتی ١٩٥٩) [٦٣]

دوا بەدوای ئەمە بەشی شەشەمی هەمان فایل بۆ دەسنووسی وتارەکـەی ئێدمۆندس تەرخان کراوە کە حەوت لاپەڕەی گەورەی پڕکردۆتـەوە و ئەمـەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(کورد،

نووسینی سی.ج.ئێدمۆندس.

---

(63) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential,1959, Subject: Kurdish Question, Minutes, Mr. Edmonds on the Kurdish question, To: Eastern Deparment, Le Quesne and Mr. West.

## زانیاریی گشتی[٦٤]

**١- کوردستان:** واتا ئەو ولاتەی زۆر کەم کوردی وەك کۆمەڵگایەکی یەکگرتوو تێدا دەژی و کەوتۆتە ناو سنووری تورکیا و عیراق و ئێرانەوە، کەمینەیەکی کوردیش لە سووریا و ئەرمەنستانی سۆڤیەتی دەژین. بەشی زۆری خاکی کوردستان ولاتێکی شاخاوییە، بەڵام لە باشووری ڕۆژئاوادا تێکەڵ بە دەشتایی دووئاوان «میسۆپۆتامیا» دەبێ، وێڕای ئەوەی لە چەند شوێنێکی دابڕاودا کورد هەن کە ئەوانیش سەر بە هەمان کۆمەڵگان.

**٢- ژمارەی کورد:** کوردی عیراق بە ڕاستی ملیۆن و چوار یەکی ملیۆنێك دەبن و بەوجۆرە یەك دەر پێنجی سەرجەمی دانیشتووانی عیراق پێك دەهێنن، ژمارەی کوردی ئێرانیش هەر ئەوەندە دەبن، بەڵام کوردی تورکیا ژمارەیان دوو ملیۆن و نیوە و بەو جۆرە کۆی کورد بە کوردی سووریا و ئەرمینیاوە دەگاتە پێنج ملیۆن و نیو.

**٣- ئایین:** بەشی هەرە زۆری کورد موسڵمانی سونی مەزهەبن، دەروێشایەتیش لە سەرجەمی کوردستاندا باوە.

**٤- لوڕ:** بە پێی بۆچوونی سیاسیی کورد ئەو لوڕانەی لە باشووری زاگرۆس لە ناو خاکی ئێراندا دەژین کوردن، هێڵی جیاکەرەوەی نێوان کوردی ڕاستەقینە و لوڕدا بریتییە لەو ڕێگەیەی کرمانشا بە کەڕەندەوە دەبەستێ و لەوێوە ڕاستەوخۆ دەگاتە مەندەلی لەسەر سنووری نێوان عیراق و ئێران، شایانی باسە نەك تەنها دانیشتووانی لوڕستان بەڵکو هەمان کات هۆزەکانی بەختیاری و مامەسانی و کوغیلویش "Kughilu" لوڕن، واتا ناوچەی لوڕەکان تاوەکو هێڵی بوشەهر- شیراز درێژ دەبێتەوە، سەرژمێرییەکی وردی لوڕ بە دەستەوە نییە، ئەوان شیعی مەزهەبن.

---

[٦٤] لە هەر شوێنێکی وتارەکەدا ناوونیشانەکان بە تۆخی نووسرابن، یاوەخود خەتێکیان بە ژێردا هێنرابێ ئێمە تەنها بەتۆخی نووسیومانن.

٥- پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان: ئابووریی کوردستان تاوەکو رادەیەکی زۆر ئابوورییەکی کشتوکاڵی و ئاژەڵییە، تاوەکو ئیمڕۆکەیش کۆمەڵگەی لادێ کۆمەڵگلیەکی هۆزایەتییە، لە کۆمەڵە گوندێکی دەرەبەگیدا کە سەر بە سەرۆکانی هۆزەکانن «ئەوانەی بە بەگ و ئاغا ناسراون»، یان دەروێشی شێخەکانن و هیچ جۆرە پێوەندییەکی خوێن لە نێو لادێیەکاندا نییە، ئەوەی دیاردەیەکی یەکجار ناهەموارە لە هەر شوێنێك وەها بێت. بە هۆی پەرەسەندنی خوێندەواری و جێگیربوونی دەسەڵاتی حوکمەتەوە ئەم سیستەمە نەماوە هەرچەندە پیشەسازییەکی کەم لە ئارادایە، بەڵام بیرە نەوتەکانی کەرکووك کەوتوونەتە سەر رۆخی وڵاتی کوردانەوە، ئەوان لەگەڵ ئەو کرێکارە زۆرەی لە کاری دروستکردنی بەند «سەد»ە گەورەکاندا خەریك بوون بوونە هۆی دروستبوونی هێزێکی کرێکاریی ئەوتۆ کە گەلێك جیاوازن لە کۆمەڵگە لەوەپێیەکانی رابردوودا.

## هەستی نەتەوایەتی

٦- هەستی نەتەوایەتیی کورد دەگەڕێتەوە رۆژگاری میرنشینە نیمچە سەربەخۆکان کە لە ئیمپراتۆریی عوسمانی «کە ئێستا دابەش بوونە بەسەر تورکیا و عیراق و ئێراندا» تاوەکو ناوەندی سەدەی نۆزدەمین بەردەوام بوون، لە رۆژگاری هاوچەرخیشدا ئەو هەستی نەتەوەیی کوردە شان بەشانی بزووتنەوە نەتەوەییەکانی عەرەب و ئەرمەن بەرەوپێش چوو. ساڵی ١٨٩٧[٦٥] یەکەم رۆژنامەی کوردی دەرچوو کە لەوساوە پچڕ پچڕ لە قاهیرە و جنێڤ و لەندەن و فۆلکستۆن تاوەکو ساڵی ١٩٠٢ دەردەچوو، دوای ساڵی ١٩٠٨یش «واتا دوای بەرپابوونی شۆڕشی تورکە لاوەکان» لە ئەستەمووڵ

---

(٦٥) وەك ئاشکرایە «کوردستان»ی یەکەم رۆژنامەی کوردی رۆژی بیست و دووی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە دەرچووە، شایانی باسە ئێدمۆندس لە کتێبەکەشیدا «کورد و تورك و عەرەب» کەوتۆتە هەمان هەڵەوە.

دەستکرایەوە بە بلاوکردنەوەی، لە قاهیرەش دیسانەوە لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهاندا سەری هەڵدایەوە. هەروەها ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەموولْ یەکەم یانەی سیاسیی کوردی دامەزرێنرا کە کۆمەڵەیەکی ڕووناکبیریی کوردیش دایە پاڵی.

٧- ساڵی ١٩١٨ بە دۆڕاندنی تورکیا لە جەنگی یەکەمدا و بەندی دوازدەمینی چواردە بەندەکەی سەرۆك ویدرۆ ویڵسن کە بەناوی «پرۆگرامی ئاشتیی جیهان»ەوە دەرچوو (ئەو بەندی دوازدەمینە دەربارەی ئۆتۆنۆمی بوو بۆ ئەو هاوڵاتیانەی ئیمپراتۆری عوسمانی کە تورك نەبوون)، وێڕای خاڵی بیست و دووەمی پێڕەوی «کۆمەڵەی نەتەوەکان» بوونە هۆی بزواندنی کەمینەکان، نوێنەرانی کورد ئامادەی کۆنفرانسی ئاشتی بوون و پەیمانی سێڤەریش «ئابی ساڵی ١٩٢٠» دانی نا بە دامەزراندنی نەك تەنها دەوڵەتانی عەرەب لە حیجاز و سووریا و عیراق، بەڵکو ئەرمینیا و کوردستانیش.

٨- پەیمانی سێڤەر بەهۆی وەخەبەرهاتنی تورکیاوە بە ڕەهبەریی مستەفا کەمال هەرگیز مۆر نەکرا و ساڵی ١٩٢٣ پەیمانی لۆزان جێگەی گرتەوە، ئەو پەیمانەی دانی بە دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە عەرەبانەدا نا کە خاکیان تاوەکو «ئاگربەستی مۆدرۆسی-ك.م.»ی ساڵی ١٩١٨ کەوتبوونە باشووری ئەو هێڵەوە[٦٦]، بەلام لۆزان توخنی باسی ئەرمینیا و کوردستان نەکەوت، هەرچی ویلایەتی مووسڵیشە لە ناوەرۆکی ئەو پەیمانە دوورخرایەوە و درایە دەست «کۆمەڵەی نەتەوەکان»، سەرەتا تورکیا بە بڕیاری ساڵی ١٩٢٥ی ئەو کۆمەڵەیە قایل نەبوو کە لە بەرژەوەندیی عیراق بوو، بەلام دوایی بە پێی پەیمانی ئەنقەرە کە لە ساڵی ١٩٢٦دا لە نێوان تورکیا و عیراق و بەریتانیای گەورەدا مۆر کرا تورکیا دانی نا بە دەسەلاتی عیراق بەسەر ویلایەتی مووسڵدا.

---

[٦٦] واتا تاوەکو ئەو شوێنەی سوپای دەوڵەتی عوسمانیی لە لایەن سوپای دەوڵەتە هاوپەیمانەکانەوە ڕاوەدوو نەنرابوو، بە نیسبەت عیراقەوە ئەو شوێنە دوازدە کیلۆمەتر کەوتبووە باشووری شاری مووسڵەوە، ئەوەی دوایی «کێشەی مووسڵ»ی لێ کەوتەوە.

٩- هەرچۆن بێ بەڵگەنامەیەکی نێو دەوڵەتی بوو دانی نا بە خەونی سەربەخۆیی کوردستاندا، ئەوەی هەرگیز لەیاد ناکرێ. پەیمانی ناوبراو هەرچەندە مۆر نەکرا، بەڵام بووە هۆیەکی بزوێنی کوردی ئێران بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆی یەکگرتوو. دوا بە دوای ڕاپەڕینە چەکدارەکانی ساڵی ١٩٢٠ کە هەرسێك ولاّتی گرتەوە کوردستانی باشوور بە ڕەهبەریی شێخ مەحموود بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە عیراق جیا بۆوە، لە تورکیاش بەناوبانگترین و گەورەترین یاخیبوون ئەوەکەی شێخ سەعید بوو لە ناوچەی خەرپوتدا ساڵی ١٩٢٥، وێڕای هی دیکەش لە سعرد و ئارارات و شوێنی دیکە. ساڵی ١٩٢٢ لە ئێرانیش سەید تەها و ئیسماعیل ئاغای شوکاك «سمکۆ» سەرکەوتنی گەورەیان بۆ ڕۆژگاری خۆیان وەدی هێنا. زۆرتریش بەملاوە کوردی موکری ساڵی ١٩٤٥-١٩٤٦ توانییان «کۆماری مەهابادی کوردی» دابمەزرێنن.

١٠- وەك هەر شوێنێکی دیکە زوبان دەبێتە نۆکەری هەستی نەتەوەیی و هەرچەندە کوردی زوبانێکی یەکگرتوو «یەك ستانداری» نییە، بەڵام زوبانێکە چەند ئیسپانی لە ئیتاڵییەوە دوورە ئەویش هێندە لە فارسییەوە دوورە. تاوەکو ساڵی ١٩١٨ وێڕای کەمێك کاری ڕۆژنامەنووسیی کە باسیمان کرد ئیتر چاپکردن بە کوردی یەکجار دەگمەن بوو، بەڵام ساڵی ١٩١٨ ئیدارەی سەربازیی بەریتانی زوبانی کوردی کردە زوبانێکی فەرمی لە کوردستانی باشوور. لەوساوە لە عیراقدا بەرهەم بە شێوازێکی ڕێکوپێك، هەرچەندە زۆر نا، بە زوبانی کوردی لە زۆر بواردا وەك ڕۆژنامەنووسیی و لە هەموو جۆرە کارێکی نوێدا بەکار دەهێنرێ، هەروەها بەگشتی کوردی بۆ نووسینی نامەی تایبەتی بە کار دەهێنرێ، وا دەچێ بۆ چەند ساڵێك ئێزگەی بەغدا پرۆگرامی خۆی بە کوردی پەخش دەکات. هەروەها لە مەهابادیش لە ئێران لە ڕۆژانی کۆماردا تا ڕادەیەك چالاکیی ڕۆژنامەنووسیی هەبوو، بۆ چەند ساڵێك مەڵبەندێکی ڕووناکبیری لە دیمەشقیش گۆڤارێکی بە ئەلفبای لاتینی بلاّو دەکردەوە، بەڵام ئەمە وەك ڕاهێنانێکی ئەکادیمیی بوو بۆ دەستەیەك

خوێندەوار. لە ئەرمینیای سۆڤیەتیش چەند پارچە هۆنراوەیەك بە ئەلفبای سلاڤی[٦٧] بلاو کراونەتەوە.

## کوردی عیراق بەر لە شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨

١١- لە ساڵی ١٩٤٥ەوە لە هەرسێك وڵاتدا «تورکیا و ئێران و عیراق - ك.م.» هەستی کوردایەتی کەم خۆی نیشانداوە. ڕەهبەر و ڕووناکبیرەکانی کورد لەو ساڵانەدا هاتبوونە سەر ئەو بڕوایەی هیچیان بەرانبەر بەربەرەکانێی حوکمەتانی ئەو سێ وڵاتە پێ ناکرێ، بۆیەکا پێویستە کورد چاوەڕوانی هەلێکی کتوپڕی لە باری نێو دەوڵەتی بن کە دەرفەتی ئەوە بۆخۆیان، یان ئەوەیان بڕەخسێ بتوانن بزووتنەوەکەیان ببووژێننەوە، لەگەڵ جۆرە هیوایەکی سەرکەوتندا.

١٢- ڕەنگبێ ڕق و کینەی کورد بەرانبەر فەرمانڕەوایانی ئەو سێ وڵاتە تەنها لای کوردی عیراق کەمتر بووبێ، چونکە ئەوان لە عیراق بە ڕاستی شت هەبوو پشتی پێ ببەستن: ئەوان تەنها لە عیراق وەك کەمینەیەکی خاوەن چەند مافێك دانیان پێدا نرابوو، زوبانەکەیان بۆ خوێندنی سەرەتایی بەکار دەهێنرا، کارگێڕیی ناوخۆیی بە دەست خۆیانەوە بوو، تۆمارگەی یاساییان هەبوو، وێڕای چالاکیی زیندووی ڕووناکبیری و ڕۆژنامەنووسی، ئەمانەیش ئەنجامی ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

(أ) تاوەکو ساڵی ١٩٢٣ «واتا تاوەکو بەستنی پەیمانی لۆزان» کوردی عیراق پشت بە دەسەڵاتی قەیمومەت «ئینتیداب» مافی دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیانیان هەبوو.

(ب) ئەو مەرجانەی کۆمەڵەی گەلان دەستنیشانیان کردبوون بۆ دانی ویلایەتی مووسڵ بە عیراق لە ساڵی ١٩٢٥ دا.

---

[٦٧] مەبەست لە سلاڤی زوبانەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپایە، وەك زوبانی ڕووسی و بەلگاری و ڕۆمانی.

(ج) ئەو مەرجانەی دەستنیشان کران و عیراق پێیان قایل بوو بۆ ئەوەی ساڵی ١٩٣٢ ببێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان»ی نێو دەوڵەتی، وێڕای ئەوەی هەمیشە کوردێک یان دووان دەکرانە ئەندامی هەر ئەنجومەنێکی نوێی وەزیران کە «لە ڕۆژگاری پاشاییدا–ک.م.» دابمەزرێندرایە.

١٣– بە گشتی هیچ کات «کوردی عیراق–ک.م.» هەستیان نەکردووە بەشی ڕەوای خۆیانیان لە بواری خزمەتە کۆمەڵایەتییەکاندا «تایبەت خوێندن» و پرۆژە ئاوەدانییەکاندا پێ نەبڕێ. گەلێک لە نەوە گەنجەکانی کوردی عیراق دەیانڕوانییە ڕووسیا وەک سەرچاوەی بیرو بۆچوونیان، ئەوەیش خۆی لە خۆیدا ئەنجامی ئەوە نەبوو کە ئەو لاوانە زۆر لە بیروباوەڕی مارکسیزم دەگەیشتن[٦٨] بەڵکو ئەو بارودۆخە وەهای نیشان دەدا کە ئەوان لە لایەن مۆسکۆوە هان دەدرێن.

١٤– وێڕای ئەوە ژمارەیەک لە کادرەکانی عیراق لە بواری سیاسەتی هەندەرانیدا ئەو جۆرە هەست و سەرنجەی پتەو دەکرد، هی وەک «پەیمانی بەغدا» کە بە زیندووکەرەوەی «پەیمانی سەعد ئاباد»ی ساڵی ١٩٣٧ دادەنرا و هەمیشە کورد وایان لە قەڵەم داوە کە سەعد ئاباد بەر لە هەمووان دژی کورد ئاراستە کرابوو، هەروەها کوردیش وەک گەلێکی موسڵمان بەشداریی ڕقی عەرەب دەکەن بەرانبەر جووی ئیسرائیل کە دەڕووانن ە وڵاتەکەیان وەک بەشێک لە جیهانی ئیسلام، بەڵام هەمان کات کورد هیچ جۆرە مەیلێکیان بەرانبەر پان ئەرەبیزم[٦٩] نییە کە بەلایانەوە زیان بە بەرژەوەندییە سەرەکییەکانیان دەگەیێنێ و لە هەمان قوژبنیشەوە دەیانڕوانییە یەکێتی

---

[٦٨] خاوەنی ئەم بەرهەمە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بە درێژی باسی ئەوەی کردووە چۆن لە پۆلی چواری ناوەندیدا بووەتە ئەندامی «یەکیەتی قوتابیانی عیراق» کە یەکێک لە رووکەشە چالاکەکانی ئەوسای حیزبی شیوعیی عیراقی بوو بەو هیوایەی لە ڕێگەی ئەو جۆرە دەزگایانەوە کورد دەتوانن بە مافە ڕەواکانی خۆیان بگەن.

[٦٩] مەبەست لە (Pan - Arabism) بزووتنەوەی نوێ و هاوچەرخی عەرەبە لە پێناوی یەکگرتندا، تایبەت لەو وڵاتانەدا کە بەشی ڕۆژهەڵاتی نیشتیمانی عەرەب پێک دەهێنن.

پێشـووی نێـوان عـێراق و ئـوردون، تایبـەت لەبـەر ڕۆشـنایی عـەرەبیی ئـەو یەکیەتییە و خستنە پشتگوێی کورد تێیدا.

## یەکەم دەنگدانەوەی شۆڕش

١٥- بۆیـەکا سـەیر نییـە هـەواڵی شۆرشـی عـێراق و دابـەزینی هێـزە ئەمەریکایی و بەریتانییەکان لە هەریـەك لـە لوبنـان و ئـودرون و هەڵکێشـانی ڕووسیا بۆ شمشێرەکەی[٧٠] بۆ گشت کوردپـەروەران، چ لـەناو کوردسـتان و چ لە دەرەوەی کوردستان، کە ئەمە لەوانەیە ئەو دەرفەتـە نێـو دەوڵەتییـە بـێ کە ئەوان چاوەڕوانی بوون و یەکسەر یادداشـتێکیان دەربـارەی پرسـی کـورد بـۆ «کۆنفرانسـی بـالا» «مـؤتمر القمـة» نـارد و ئـەوەبوو میسـتەر خرۆشـۆف وروروژاندی.

١٦- هەمان کات ڕەهبەرانی نوێی عێراق زۆر زیرەکانە ڕەفتاریـان لەگـەڵ کارتی کورددا کرد[٧١]، بەوەی:

(أ) بـەوەی کـورد کرایـە ئەنـدامی «ئەنجوومـەنی سـیادة - مجلـس قیـادە الثورة» کە کاری سەرۆکایەتیی پێ سپێردرا ؛ .

(ب) شێخ بابە عەلیی «کوڕی شێخ مەحموود و دەرچووی کۆلێژی ڤیکتۆریـا لـە ئەسـکەندەرییە و زانکـۆی کۆلۆمبیـا لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا» کرایە وەزیری هاتوچۆ.

(ج) شێخ لەتیف «کوڕێکی دیکەی شێخ مەحموودە و تونـدڕەوە» و شـێخی بارزان[٧٢]، برای مەلا مستەفا «بڕوانە ژمارە حەڤـدەی ئـەم ڕاپۆرتـە» و گشت بەند و دوورخراوە کوردەکان ئازاد کران ؛

---

[٧٠] لە دەقی وتارەکەی ئێدمۆندسـدا وەهـا هـاتووە: "... and the sabre- rattling Russi" کە بۆ هەڕەشە بە شمشێر بەکار دەهێنرێ.

[٧١] لە دەقی وتارەکەدا بەم جۆرە دارێژراوە:

"16- In the meantime, the new rulers of Iraq were playing their cards with great skill "(P.3).

(د) وێنەی ئەفسەرێکی کورد لە کاتی هێرشدا بۆ سەر کۆشکی پاشایی ڕۆژی چواردەی تەمموز برینداو کرابوو[٧٣] لە تەنیشت عەبدولکەریم قاسمەوە بە شێوازێکی فراوان و سەرنجڕاکێش بلاّو کرایەوە.

(و) «دەستووری کاتی» هەرچەندە عیراقی بە بەشێك لە نیشتیمانی عەرەب داناوە هەمان کات بەتایبەتی ناوی کوردی وەك هاوبەشی عەرەب هێناوە لە ڕووی مافە نەتەوەییەکانییەوە؛

(ز) پاش چەند هەفتەیەك دروشمێکی نوێی دەوڵەت دەرچوو کە تێیدا خەنجەری کورد شان بەشانی شیری عەرەب دانراوە؛

(ح) «ئازادی» و «برایەتی کورد و عەرەب» بوونە دروشمێکی باو وەك هۆی پاراستنی ولاّت چ لە بەغدا و چ لە شوێنەکانی دیکەی ولاّت.

١٧- ئەو ڕووداوەی سەرجەمی کۆمەڵگەی عیراقی هەژاند گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزان بوو لە سەرەتای مانگی تەشرینی یەکەمدا، ئەو سەرەك هۆزە یاخیبووەی ساڵی ١٩٤٥ ناچار بوو سنوور ببڕێ و ببێتە یەکێك لە ڕەهبەرانی «کۆماری مەهابادی کوردی» (بڕوانە پەرەگرافی نۆی ئەم وتارە) دوای کەوتنی کۆماری ناوبراو هەڵهاتە ئەرمینیای سۆڤیەتی[٧٤] و لەوێ پلەیەکی ئەفسەریی بەرزی پێدرا و هانی دامەزراندنی ئێزگەیەکی کوردیی لە یەریڤان دا، هەرچی بارزان خۆشییە ناوچەیەکی کەلا و لە ڕووی ئابوورییەوە هەژارە و کەوتۆتە نزیك سنووری تورکیاوە و هیچ کات مەیلی نیزامێکی ڕێکوپێکی نەبووە، بەلاّم بەر لە ساڵی ١٩٤٥ بزووتنەکانی بارزان پێوەندییان

---

[٧٢] مەبەستی شێخ ئەحمەدی بارزانە.

[٧٣] مەبەست مستەفا عەبدوڵلاّی خەڵکی سلێمانییە کە ئەفسەرێکی چەپڕەو بوو، ئەو ڕۆژە پشووی هەبوو بەلاّم یەکسەر دابوویە پاڵ ئەو هێزانەی هێرشیان دەبردە سەر کۆشکی پاشایی و دەستی هەبوو لە کوشتنی فەیسەڵی دووەم و عەبدولئیلاهدا، لە یادمە وێنەکەیان دەفرۆشت و هاواریان دەکرد «قاتل الوصي» واتا ئەو کەسەی وەصیی کوشت.

[٧٤] بارزانی و هاوەڵەکانی دوای ڕووخانی کۆماری ساوای کوردستان، لە ڕێگەی چەمی ئاراسەوە هەڵهاتنە ناو خاکی ئازەربایجانی سۆڤیەتییەوە نەك ئەرمینیای سۆڤیەتی وەك لە دەقی وتارەکەدا هاتووە.

به کوردایەتییەوە نەبوو. گەڕانەوەی مەلامستەفا چ لە لایەن عەرەب و چ لە لایەن کوردەوە وەك یەك پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێ کرا، نەك تەنها وەك ڕەهبەرێکی کورد بەڵکو وەك قارەمانێکی خەباتی هەمووان دژی «ڕژێمی پاشایی کۆنەپەرستی داردەستی ئیمپریالیزم». پاش تێپەڕبوونی دوازدە ساڵ بە سەر چوونیدا بۆ مەهاباد وەك میوانێکی شەرەفمەندی سۆڤیەت دەبێ ئیمڕۆکەی زۆر جیاواز بێ لەو سەرەك هۆزە ساکارەی ساڵی ١٩٤٥، بەڵام لێکدانەوەی ئەوە هەروا کارێکی ئاسان نییە بۆ ئەوەی ببێتە کەسایەتییەکی نیشتیمانیی گشت عیراقییەکان وێڕای ئەوەی ببێتە بەشێك لە زنجیرەی پڕۆپاگەندەی شیوعیی کە بە خێرایی سەرتاپای عیراقی گرتۆتەوە.

### بارودۆخی ئێستا:

١٨- دوور نەڕۆین هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە لە ڕێگەیەوە بزانین کوردی عیراق بەڕاستی چۆن بیردەکەنەوە، چونکە لە ژێر سایەی دەزگا کارگێڕییەکانی شۆڕشێکی سەربازیدا کە سەرقاڵی قایمکردنی جێپێیانن کەسێك زات ناکات تێبینییەکی نابەجێ بەلای ئەوانەوە بەرز بکاتەوە، بەڵام بەرانبەر بەوە هیچ شتێکی دیکە لە ئارادا نییە لەوە بچێ موناسیب نەبێ بۆ ئاواتەکانیان، وەك کورد[٧٥] چ جای ئەوەی پێچەوانەی ئەو ئاواتانە بن، بزووتنەوەی کوردی و سیاسەتی حوکمەتە عەرەبییەکان یان هیچ نەبێ سیاسەتی عیراق دەتواندرێت بخرێنە یەك قەوارەی خەباتەوە لە پێناو هەڵتەکاندنی کۆتی کۆنەپەرستی ئیمپریالیزمدا، لەو گۆشە نیگایەشەوە کورد بۆی هەیە بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەب بە هاوپەیمانی خۆی دابنێ، دوای کەوتنی عەبدولسەلام عارفی جێگری سەرەك وەزیرانیش مەترسیی نزیککەوتنەوەیەکی زۆر «لە میسرەوە کە لەوانەیە بۆ کورد-ك.م.» پتر مەترسیدار بێ لە یەکیەتییەکەی نێوان عیراق و ئوردون ڕەوییەوە.

---

[٧٥] لە دەقی وتارەکەدا ڕستەی (وەك کورد) (as Kurds) بەو جۆرە خەتێکی بە ژێردا هێنراوە.

١٩- تەمەنداران باش دەزانن چ «سەربەستییەکی» کەسایەتی لە پشت «تەوقی ئاسنین - الستار الحديدي»یەوە هەیە، ئەوەی تەنانەت ڕۆژنامە شیوعییە عیراقییەکان «بە ڕۆژنامە کوردییەکانیشەوە» ئاماژەیان بۆی کردووە، بۆیەکا دەبێ عیراقییەکان زۆر دڵیان بەو نزیککەوتنەوەیەی سیاسەتی حوکمەتی عیراق لەم چەند هەفتەیەی دواییدا لە ڕووسیاوە خۆش نەبێ، چونکە کۆت و فشاری ئاغا نوێکان کە خۆیان هەستی پێ دەکەن تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لەوانەی ڕۆژگاری نووری سەعید خراپترن، بەڵام هەروەك چۆن ئاماژەمان پێدا نەك تەنها زۆر لایەنی توێژە «ڕووناکبیرە»لاوەکان، بەڵکو گەلێك لە لادێییەکانیش لەو بڕوایەدان کە کۆماری عەبدولکەریم قاسمی سەر بە ڕووسیا و دروشمە بەلشەفییەکانی بە لای جووتیاران و کرێکارانەوە وەك فەرمانی کڵێسە وەهان و دەیانورووژێنن و پاڵیان پێوە دەنێن بە ڕق و کینەوە بڕواننە ئاغا و خاوەن زەوییەکان[٧٦].

٢٠- هەمان کات کورد بە شێوازێکی حەرفی و بە ئەوپەڕی بڕواوە ئەو بەشەی «دەستووری کاتی»یان وەرگرتووە کە بۆ بابەتی یەکسانیی «عەرەب و کورد -ك.م.» تەرخان کراوە. ڕۆژنامەکان هەمیشە ئەوە دووپات دەکەنەوە و دەیجوونەوە «پێویستە ئەوەیش لەبەر چاو بگیرێ» کە هەرگیز، تەنانەت ڕۆژگاری ئینتیدابیش، وەها ئازاد و بە دەنگێکی زوڵاڵ باسی مافی کورد نەکراوە. کۆماری عیراقی نوێ هەمیشە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کۆمار «هی کورد و عەرەب»ە، کەچی زۆر جاران دەنگ لە ناوچە کوردییەکانەوە بەرز دەبێتەوە و داوا دەکەن پێویستە زوبانی کوردی بکرێتە زوبانی خوێندن نەك تەنها لە چوار پۆلی سەرەتاییدا، بەڵکو لە گشت فێرگە ناوەندی و ئامادەییەکانیشدا، هەروەها زوبانی کوردی و مێژووی کورد لە فێرگە

---

(٧٦) لەدەقی وتارەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

".... and the Bolshevik slogans canonizing the peasnnts and workmen and stirring up scorn and harted...., that is the Aghas and the Landlords "(P.4).

عەرەبییەکانی ولاّتدا بوترێنەوە بە دەستووری وتنـەوەی زوبـانی عـەرەبی و مێژووی عەرەب لە فێرگە کوردییەکانی ولاّتدا.

٢١- هەڵبەت لەوانەیە عەبدولکەریم قاسم و دەستە و دایەرە کوردەکـەی بە شـێوازێکی دیکـە باسـی «دەستووری کـاتی» بکـەن، بۆیـەکا چاوەڕوانی دەسنووسی تەوجیهاتی نـوێ بە پەرۆشـەوە دەکرێ، بـەلاّم ڕەنگبێ ئێسـتا دووپاتکردنــەوەی هــەر جــۆرە لێکدانەوەیــەکی ئــەو پرســە ببێتــە هــۆی وروژاندنێکی زۆری هەستی ناڕەزایی لە نێو کورددا.

٢٢- شان بەشانی هەموو ئەمانە ڕۆژنامە کوردییە «عیراقییـەکان-ک.م.» ئەم دواییانە بە شێوازێکی گەلێك توند هێرش دەبەنە سەر تورکیا و ئێـران و داوای ئازادی بۆ «برا کوردە ژێر دەستەکان»یان لەو دیو سنوورەوە دەکـەن. هەرچەندە ژمارەی کوردی عیراق لە ژمارەی کوردی ئێران و تورکیـا کـەمترە، بـەلاّم بـارودۆخی ئــەوان مــەودای ئــەوەیان دەداتــێ بتــوانن بــە شــێوازێکی سەلمێنەر ڕۆڵـی نـەواتی دامەزرێنـەری کوردسـتانێکی سـەربەخۆی یـەکگرتوو بگێڕن، ئەم ئاواتە دژوارە زۆر بە زەحمەت لەگەڵ ئەوەدا یەك دەگرێتەوە کـە عـیراق بـە بەشـێك لـە نیشـتیمانی عـەرەب دادەنـرێ وەك لـە «دەسـتووری کـاتی»دا هـاتووە، بـەلاّم کاتێـك کـورد لـە ژێـر ئاسمـانی پـڕ لـە تەمومـژی ئیمپریالییەکاندا بوو لە ڕۆژگاری ڕژێمی پاشایی و ڕژێمی پێشووی ئینتیدابـدا و بــە ڕێککــەوتن لەگــەڵ ویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکا و هــەردووك ئیمپراتــۆری تورکیـا و ئێـران چ لـە ڕابـردوو و چ دواتـر گـەلێك شـت دەتـوانرا بخرێتە پشت گـوێ و گـەلێك شـتیش دەکـران بـەر لـەوەی ببنـە دیاردەیـەکی خودی ژیان.

٢٣- لــەم بــوارەدا ئــەوە وەك دەســتکەوتێکی گــەورە بــوو کــە فـەرمانڕەوایانی عیراقـی «ڕۆژگـاری پاشـایی-ک.م.» بڕیاریـان دا ئێزگەیـەکی کـوردی نـەك تـەنها بـە زاراوی ناوچـەی سلێمانی بـەڵکو بـە زاراوی بـادینی و فـەیلیش پرۆگرامـەکانی خـۆی پـەخش بکـات، بـا ئـەوەیش بڵێـێن کـە زاراوی بادینی زاراوێکـی بـاوی ئـەو ناوچـانەی بـاکووری عیراقـە کـە هاوسـێن لەگـەڵ

سنووری تورکیادا و زۆر نزیکە لە زاراوی دانیشتووانی ناوچە کوردییەکانی تورکیا، فەیلیش زاراوی لوڕەکانی لوڕستانە و ژمارەیەکی وەبەرچاو لوڕ لە بەغدا و شارەکانی دیکەی خوارووی ڕووباری دیجلە دەژین «حەماڵە کوردەکانی بەغدایش لوڕن»، بەلام زۆر زەحمەت بوو خزمەتگوزاری سەربەخۆ تەنها بۆ ئەوان دابمەزرێنرێ.

٢٤- هەمیشە ئەوە لەبەر چاو گیراوە کە ئەگەر بێت و سیاسەتی ڕووسیا ببێتە هۆی ڕوودانی هەر ئاژاوەیەکی ترسناك بۆ تورکیا، ئێران یان عیراق ئەوساکە پشتگیریی گرتنی «ڕووس-ك.م.» بۆ کوردستانێکی سەربەخۆی یەکگرتوو ئەوساکە دەبێتە داردەستێکی مردوو بە دەستەوە، بەلام پڕۆپاگەندەیەکی لەو جۆرە زۆر کاریگەر دەبێ چونکە ڕووسەکان بە کاری دامەزراندنی کۆمارە سۆڤیەتییە بچووکەکان و ئۆتۆنۆمییەکان ئەوەیان نیشان دا کە ئەوان لە کەمینەکانی خۆیان سڵ ناکەنەوە، بەڵکو تەنانەت ئامادەشن هانی هەستی نەتەوەیی و چالاکیە ڕووناکبیرییەکانیان بدەن و وەك بەربەرەکانێی ولاتە ڕۆژئاواییەکان کە مەبەستیانە یەکیەتی ئەو سێ ولاتە «واتا تورکیا و ئێران و عیراق-ك.م.» بپارێزن و ئەمان «واتا ڕووس» هەوڵ بدەن گشت کارتەکانی ئەو یارییە بگرنە دەست خۆیان.

## ڕەنگدانەوەی ژمارەیەك ئەنجام

٢٥- هیچ گومان لەوەدا نییە حوکمەتانی تورکیا و ئێران بە بایەخدانێکی زۆرەوە دەڕواننە گشت ئەم ئاڵوگۆڕانە و لەوانەیشە بە نیگەرانییەوە. دیسانەوە هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە لەوانەیە چاکسازیی لە بواری ڕێگاوبان و بەرەوپێشبردنی خزمەتگوزارییە کۆمەلایەتییەکان لە ناوچە کوردییەکاندا لە کۆشەنیگای پتەوکردنی هەستی هاونیشتیمانییەوە وەبەر چاو گیرابن، بەلام گرانترین بڕیار بریتییە لەو بڕیارانەی لە بواری خوێندن و چالاکییە ڕووناکبیرییەکاندا دەدرێن.

٢٦- یەکەم ئەرکی پێویستیش لەم بوارەدا بریتییە لە پێویستیی پێداچوونەوە بە سیاسەتی ڕابردوودا «ئەو سیاسەتەی لە شێوازی توندڕەودا لە تورکیا پەیڕەو دەکرا و تاوەکو ڕادەیەکیش لە ئێران» کە دانی بە بوونی کورددا نەدەنا و کۆسپی لەبەردەم گشت چالاکییە ڕووناکبیری و ئەدەبییە کوردییەکاندا دادەنا، یان هەر بە جارێك قەدەغەی دەکردن، تایبەت لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا، فەرمانڕەوایانی تورکیا و ئێران زۆر پشت بەوە دەبەستن کە خوێندن بە تورکی یان فارسی و خستنە پشتگوێی زوبانی کوردی لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی نەوەیەکی کورد لەوانەی کە بەرگری لە نیشتیمانی تورك یان فارس بکەن و یەکیەتیی خاکی ئەو دوو وڵاتە بپارێزن. ناتوانین بڵێین سیاسەتێکی لەو جۆرە زۆر سەرکەوتووە و زەحمەتیشە بزانرێ ئەو سیاسەتە چەند بەردەوام دەبێ و تاوەکو چ ڕادەیەك لەودیو سنوورەوە بەربەرەکانێی لێ ناکرێ.

٢٧- بەدیلی دووەم بریتییە لەوەی «تورکیا و ئێران-ك.م.» لاسایی ڕێبازی عێراق بکەنەوە، ئەو ڕێبازەی چ لە ڕۆژانی ئینتیدابدا و ئینجا لە لایەن «کۆمەڵەی نەتەوەکان»ەوە بناغەی داڕێژرا و کە سەرەتا بە دڵی فەرمانڕەوا عەرەبەکان نەبوو، لەوانەیە لەم گۆشەنیگایەوە ڕەخنە لەم ڕێبازە بگیرێ کە پتر لە هەر هۆکارێکی دیکە یەکیەتی نێو ڕیزەکانی کورد بەهێز دەکات و بە خێرایی دەبێتە هۆی دروستبوونی هەستی جیابوونەوەخوازی، بەڵام بۆ بەرپەرچدانەوەی بۆچوونێکی لەو بابەتە دەتواندرێ بگوترێ: ناتواندرێ ڕەوڕەوەی پەیوەندییەکانی هەستی نەتەوەیی کورد بگێڕدرێتەوە دواوە، هەروەها ئەگەر تورکیا وەك دەوڵەتێك کە زۆرترین کوردی تێدا دەژی، نەتوانێ هەستی کورد ڕابکێشێ ئەوساکە کوردی عێراق کە ژمارەیان لە ژمارەی کوردی هەرسێك وڵات کەمترە دەبێتە نموونەی ڕاکێشەری کوردەکانی دیکە، ئەگەری سێیەم ئەوەیە کە کۆسپەکانی یەکگرتنی کورد لە هەرسێك وڵاتدا و تایبەت کۆسپە جوگرافییەکانی لەبار نین بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی جیاواز بۆیەکا باشتر وەهایە حوکمەتانی ئەو سێ وڵاتە

بگەنە جۆرە چارەسەرییەکی زیرەکانەی ئەوتۆ پشت بە لیبڕالییەتێکی کراوە لە بریتی داپڵۆسین ببەستن.

٢٨- هەرچۆن بێ ئەم جۆرە بابەتە تیۆرییە ناچێتە چوارچێوەی ئەم وتارەوە و چ فەرمانڕەوایانی تورکیا و چ فەرمانڕەوایانی ئێران وەك یەك لەگەڵ بۆچوونی یەکەمدان.

## بەشی دووەم - ئیمڕۆ و دواڕۆژ

٢٩- ئەم بەشەی وتارەکەمان ناچێتە خانەی لایەنە زۆرەکانی بابەتی وریابوونەوەی کوردەوە، بەڵکو باسی کاریگەریی پرسی کورد لەسەر هاوسەنگیی هێزە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی دەکات، ئەوەی دەبێ هەمان کات لە بەڵگەنامەی سی.سی.سی، ١٤٧دا دەربارەی ئێران [٧٧] بیخوێنینەوە و بزانین ڕەنگدانەوەی پرسی کورد لەسەر دەستە جیاوازەکان چۆنە.

٣٠- تاوەکو ڕادەیەکی زۆر ئەوە زانراوە کە پشتگیریی ڕووسیا بۆ پرسی کورد لە هەرسێك وڵاتدا - عیراق و ئێران و تورکیا، لە ئەنجامی شۆڕشی «چواردەی تەممووزدا-ك.م.» دوو هێندە پەرەی سەند، وێڕای ئەوەی ناڕەزایی کەمینەی کورد لە هەر یەك لە ئێران و تورکیا کارێکی ئەوتۆی کردووە گشت کارتەکان بکەونە دەست سۆڤیەتییەکان.

ئەم جۆرە بۆچوونە نەیتوانیوە ئەوە بگرێتە بەرچاو کە لایەنە بابەتییەکانی نەتەوەپەرستیی کورد و عەرەب زۆر زەحمەتە یەك بگرنەوە، هەر چۆن بێ بووژاندنەوەی پرسی کورد لە عیراق کێشەیەکی گەورەیە بۆ هەر یەك لە ئێران و تورکیا، هیچ گومانێکیش لەوەدا نییە کە ئەو دیاردەیە هەمان کات دەبێتە هۆی دروستبوونی بارودۆخێکی ناسك بۆ ڕووس، چونکە ئەوە

---

[٧٧] لە دەقی وتارەکەدا بەم جۆرە دووجار دووپات بووەتەوە:

"….It should also be read with ccc.174 of Persia, and represents, the Group`s reaction to the impact the Kurdish question" (P.6).

خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی نوێیە بۆ چەسپاندنی دووبەرەکیی لە نێو جیهانی عەرەبدا، تایبەت دووبەرەکیی نێوان بەغدا لە لایەك و دیمەشق و قاهیرە لە لایەکی دیکەوە، بۆ دەربڕین و ڕوونکردنەوەی ئەمەیش گەلێك بەڵگە لە ئارادان.

٣١- ئەوە شتێکی ڕاستە و وەك لە بەڵگەنامەی سی.سی.سی، ١٤٧یشدا ئامازەی بۆ کراوە، حوکمەتی نوێی عیراق تەواو پێچەوانەی سیاسەتی نووری سەعید و ئەمیر عەبدولئیلاهە، بۆیەکا بە شێوازێکی زۆر زەق پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە بەرەی هاوبەشی عەرەب و کورد بووە هۆی دارشتنی برایەتییەکی «دژ بە ئیمپریالیزم»[٧٨]، بە هەمان شێواز ئەوەیش دروستە کە سۆڤیەتییەکان لە کوردیان گەیاندووە کە مەلا مستەفا و بنەماڵەی بارزانی ڕەهبەرانی ئیمڕۆی «نەتەوەی کوردن-ك.م.»، بەلام ئەگەر سەیری وێنەکە وەك خۆی چۆنە وەها بکرێ ئەو کاتە دەبێ مەیلیش بۆ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو بە ڕەهبەری عەبدولناسر لە ئارادا بێ.

٣٢- ئێستا ئەوە ڕوونە کە شۆڕشی عیراق وەك شەمەندەفەرێك وەهایە کە هەڵگری دوو بیر و بۆچوونی سیاسیی جیاوازە- یەکێکیان لە یەکیەتی عەرەب و ئەوی دیکەشیان عیراقێکی دوور لە عەرەب، «بڕوانە: سی.سی.سی، ١٦بڕگەی یەك تاوەکو پێنج کە نیشانی دەدات عیراق بە چ جۆر ولاتێکی تەنها عەرەبیی نییە». نوێنەرانی سەرنجی یەکەمیان بریتین لە ڕەشید عالی گەیلانی و «عەبدولسەلام-ك.م.» عارف، نوێنەری سەرنجی دووەمیش قاسمی سەرەك وەزیرانە. ڕەهبەرانی بزووتنەوەی یەکگرتن لەگەڵ میسر و سووریادا ئێستا دراونەتە دادگا و چاوەڕوانی حوکمی ئەبەدین، (تەنانەت ئەگەر شۆڕشێکی دیکە ڕوو بدات و حوکمدراوەکان ببنە فەرمانڕەوا ئەوساکە بزانین دژە تەوەرەکان چۆن دەبن). بە شێوەیەکی گشتی وەها پێدەچێ ئەمە ئەنجامی کاریگەریی سۆڤیەت بێ، یان با بڵێین قاسم دەبوو یان قاهیرە یان

---

[٧٨] لە دەقی وتارکەدا بەو جۆرە زاراوی «دژ بە ئیمپریالیزم» "anti- imperialist" خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

کـرێملن [٧٩] هەڵبـژێرێ و ئـەویش کرێملنـی هەڵبـژاردووە. بەڵگـەی ڕوون دەربارەی ئەمە بەدەستەوە نییـە و وەهـا دیـارە بەرژەوەندییـەکانی ڕووسـیا لەوەدایە پێوەندی لەگەڵ قاهیرەش باش بێ. زۆر لەوانەیە هەڵبـژاردنی قاسـم لە ژێر کاریگەریی بزووتنەوەی نەتـەوەیی کـورددا بـێ، تایبـەت چـونکە ئەمـە دەبێتە هۆی پتەوبوونی دژایەتیی مێژوویی بەغدا بۆ عەرەبیزمی سـووریا [٨٠].

ئێستا بە لایەنی کەمەوە بە لای هەستی عەرەبی شۆڕشگێڕی بەغـداوە باشـتر وەهایە هاوپەیمانی بزووتنەوەی کوردی بـێ، چـونکە ڕەهبـەرانی کـورد بـەوە ناسـراون کـە پـتر لـە دراوسـێ نزیکـەکانیان، واتـا لـە تورکیـا و ئێـران سـڵ دەکەنەوە وەك لە خەونی داپۆشراو و عاتیفی دەربـارەی یەکیـەتیی عـەرەب. جـاران لـە نێـو سۆشـیالیزمەکانی لای خۆمـان و هـەموو شـوێنێك باسـی سیاسەتیی بەریتانیی دابەش بکە و حوکم بکـە[٨١]ی خۆشـئاوازیان دەکـرد بـێ ئـەوەی دەرکـی هێـزە دابەشـکەرەکانیان بکردبـا ئەوانـە وێـڕای ئەوانـەی هیندستانیش، دەیاردەیەکی مێژووین [٨٢].

٣٣- کـوردی عـێراق هەمیشـە بـە چـاوی گومانـەوە ڕوانیویانەتـە هـەموو جـۆرە هەوادارییـەك بەرانبـەر یـەکگرتنی عـەرەب، وەك نموونـەیش دەتـوانین

---

[٧٩] لە دامێنی لاپەڕەی شەشی وتارەکەدا نووسراوە: دەربارەی ئەمە بڕوانـە وتـاری سـەرەکیی ڕۆژنامەی «تایمس»ی ڕۆژی نۆی شوباتی ساڵی ١٩٥٩.

[٨٠] لەدەقی وتارەکەدا وەها هاتووە:

"….. It is much more likely that Kasem`s choice is dicated by the influences of Kurdish nationalism, especially as these reniforce the historical antipathy of Baghdad for Levantine Arabism….."

دوا دوو وشەیش زاراوێکی جوگرافیی سووریای گەورە دەگەیێنن، واتـا وڵاتـی ئەمەوییـەکان کـە زۆرینەی عیراقییەکان، تایبەت شیعە، بە چاوی دوژمنی باوەکوشتە سەیریان دەکردن.

[٨١] مەبەستی ئەو پەندە سیاسییە باوەیە کە دەڵێ: «دابەش بکە و حوکم بکە» (قَسِّمْ واحكُمْ) یـان «فَـرِّق تَسُـدْ»ەو لـەدەقی وتارەکـەدا بـەو جـۆرە زاراوی "divided and rule" خـەتی بەژێردا هێنراوە.

[٨٢] لە ئەدەبی سیاسیدا وەها باوە کەس بە ڕادەی فـەرمانڕەوایانی بـەریتانیا پـەنای نەبردۆتـە بەر ئەو پەندە (دابەش بکـە و حـوکم بکـە)، ئـەوەی ئێدمۆنـدس بەلایـەوە شـتێکی کەمـە لـە ئاستی فرۆفێڵی حوکمدارانی ڕۆژهەڵاتدا چ لە ڕابردوویاندا و چ لە ئێستایاندا.

ئاماژه بۆ یەکیەتیی «هاشمیی–ك.م.» نێوان عیراق و ئوردون بکەین، وێڕای ئەوەی گشت کۆششیان دژی دانە پاڵ عیراقیان بۆ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو تەرخان کردووە و هەر حوکمەتێکی عیراقیش هەوڵێکی وەها بدات نابێ هەرگیز چاوەڕوانی پشتگیریی کورد بکات. هەموو ڕووداوەکانی وڵات لەو ڕۆژەوەی شۆڕشی عیراق سەرکەوتووە ئەوە دەسەلمێنن کە ڕەهبەرە عەرەبە عیراقییەکان ئەو پشتگیرییەی کوردیان زۆر لەسەر دەکەوێ. ڕاستییەکەی ئاواتەکانی کورد ئێمڕۆکە تاوەکو ڕادەیەکی زۆر کلیلێکی گرنگی ڕووداوەکانی بەغدان.

٣٤– بەڵام پێویستە لە گۆشەنیگایەکی فراوانترەوە بڕوانینە ئەم وێنەیە چونکە کوردی عیراق تەنها نزیکەی یەك دەر چواری کورد پێکدەهێنن، نیوەی کورد لە تورکیا و ئەو یەك دەرچوارەیان کە دەمێنێ لە ئێران دەژین. خۆ ئەگەر هاتوو هەر هێزێکی دەرەکی وەك ڕووسیا یان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یان بەریتانیا یان خودی عیراق خۆی چالاکانە پشتی کورد بگرن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی نوێ، «وەك ئەوەی لە پەیمانی سەرنەکەوتووی سێڤەری ساڵی ١٩٢٠دا هاتووە»، یان هەموویان پێکڕا بدەنە پاڵ کوردی عیراق ئەوساکە عەرەبچێتیی عیراق دەکەوێتە مەترسییەکی گەورەوە. بە گشت پێودانێك پتر لە پێنج ملیۆن کورد هەن، عەرەبی عیراقیش هەر هەموویان چوار ملیۆنن، ئەم ڕاستییە وەها دەگەیێنێ کە هەر چۆن بێ هەستی یەکیەتیی عەرەب و کورد لە بەغدا ئێستاکە دەتوانێ بڵێ هیچ حوکمەتێکی بەغدا نایەوێ پشتگیریی هەستی نەتەوەیی کورد بێ سێ و دوو بکات.

٣٥– هەرچی ڕووسیشە ژمارەیەك کورد لە ئەرمینیای سۆڤیەتی دەژین، ئەوانەی لە ساڵی ١٩٤٦ەوە وەك داردەستێکی «دژ بە ئیمپریالیزم» بەکاریان دەهێنن و ئەوان خۆیان باشتریان دەناسن وەك لە ئێمەومانان، بۆیەکا خۆیان تووشی ئەو گێژاوە ناکەن کە لەوانەیە بە هۆی پشتگیریکردنیان لە پرسی کورد لە چەند خاڵێکدا لە بەرژەوەندیی یەکیەتیی عەرەبدا نەگونجێ و

تەنانەت پشتگیرییەکی کەمیش بووە هۆی پتر ناڕەزایی بیری عەرەبیی نوێی بەغدا لە گۆشەنیگای ناوچە عەرەبییەکانی دەریای سپیی ناوەڕاستەوە[٨٣].

لەبەر ئەم هۆیانە وا پێ ناچێ مۆسکۆ پشتگیریی کورد بکات، یان حیزبی شیوعیی عیراقی[٨٤] تەواو دژی کۆماریی عەرەبیی یەکگرتوویی، بە پێچەوانەوە بۆ بەرژەوەندییە سۆڤیەتییەکان وەها باشە نەهێڵن ئەو ناکۆکییەی نێوان عیراق و میسر ئاڵۆزتر بێ.

٣٦- بە نیسبەت ڕۆژئاواییەکانەوە کێشەکە تاوەکو ڕادەیەك جیاوازە، هەرچی بەریتانیای گەورەیە هەمیشە لایەنگری ئەوە بووە عادیلانە ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکرێ، لە ڕاستیدا بەریتانییەکان بوونە هۆی ئەوەی عیراق باشتر ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکات (بە نموونە قوتابخانەی خۆیانیان هەبوو، لەو قوتابخانەدا زوبانی خۆیان بەکار دەهێنا، کارمەندانی ناوچەیی خۆیانیان هەبوو)، واتا ئەو شتانەی نە لە ئێران و نە لە تورکیا نین، بەلام تەنانەت ڕۆژانی ئینتیدابیش، تایبەت لە دوای بەستنی پەیمانی لۆزانی ساڵی ١٩٢٣وە، ڕێگەی ئەوەیان نەدرا بیر لە جیابوونەوە «لە عیراق-ك.م.» بکەنەوە، بە هەمان دەستوور بەریتانییەکان لەگەڵ جیابوونەوەخوازیی کوردی تورکیا و ئێرانیش نەبوون. لە ڕاستیدا پشتگیریکردنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد لە لایەن ئەندامێکی پەیمانی بەغداوە کارێکی کردەنی نەبوو، سەرەڕای ئەوەی ئەو ئەندامە دۆستی چ تورکیا و چ ئێران نەبوو، بەلام ئەمە نەبووە کۆسپ نە لەبەردەم ئێمەی بەریتانی و نە لە بەردەم ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا، ئەو ڕاستییە لە تورکیا و ئێران

---

[٨٣] لەدەقی وتارەکەدا بە ئینگلیزی وەها هاتووە:

".... Even limited support has already had the result of further estranging the new Arab idea in Baghdad from Mediterranian Arabism" (P.7).

[٨٤] لەدەقی وتارکەدا دەڵێ:«.... حیزبی شیوعیی بەغدا»:

".... The Communist Party of Baghdad" .

بگەیێنین کە باشترین ڕێبازی نەهێشتنی جیابوونەوەخوازیی کورد ئەوەیە کە لەگەڵ کەمینە کوردەکانی خۆیاندا پتر کراوە و دڵفراوان بن.

٣٧- دوا وشەیش کە بە پێویستی دەزانین لەم وتارەدا سەرنجی بۆ ڕابکێشین ئەوەیە کە هیواداریین سۆڤیەت باش ڕەفتاری جیهانی عەرەب بکەن و لەوە بگەن بەکارهێنانی هەستی نەتەوەیی کورد پتر لە پێویست وەك هۆکارێکی گەیشتنە ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوانەیە باش نەبێ، ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٤٦ نیشانیان دا چۆن ڕووس فەشەلیان هێنا لە جێبەجێکردنی هاوسەنگییەکی پێویست لە ناو هێزەکاندا، یان لە بارودۆخی ناوەکیی ئەم ناوچەیە لەو ڕۆژگارەدا، ئەوان لەوانەیە بە هەمان جۆر ڕەفتار بکەن و بکەونە هەمان هەڵەوە. بزواندنی هەستی ئازادیی ناوچەیەك یەکێکە لە ڕێگەکانی بەغدا، هەڵبەت هەوڵدان بۆ دابەشکردنی تورکیا یان ئێران یان هەردووکیان گەلێك دیاردە بۆ کرێملن ڕوون دەکاتەوە.

باشترین ڕێگەیش بۆ دڵنیاییبوون کە ئەمە ڕوو نادات ئەوەیە ڕۆژئاوا لەوە بگات کە ئەو هێزانەی لە کاردان مەترسییەکان بەفراوانی وەبەرچاو بگرن و ئەوەیش نیشان بدەن کە ئێمە ئامادەین)[٨٥].

بەشی حەوتەمی هەمان فایل بۆ ئەم بابەتە تەرخان کراوە: «گفتوگۆ لەگەڵ باڵوێزی ئێرانیدا لە بەغدا دەربارەی هەڵوێستی کوردی عیراق بەرانبەر ڕژێم»[٨٦] کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە لە بەغدا،

---

[85] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, The Kurds, by C.J.Edmonds, C.M.G., C.B.E., PP.1-7.

[86] 68 "Talk with Iranian Ambassador on attitude of Iraqi Kurds to the r`egime".

ژماره ۵۹/۲۲۱/۱۰۱۳،
۲ی نیسانی ۱۹۵۹،
بۆ:
بەشی ڕۆژهەلآت،
وەزارەتی هەندەران،
بەشی ڕۆژهەلآتی خۆشەویست،

۱- یەکێك لە ئەندامانی دەستەی باڵوێزخانەکەمان لەگەڵ باڵوێزی ئێران لێرە، میستەر ئەردەلآن باسی هەڵوێستی کوردی عیراقی بەرانبەر ڕژێمی نوێ کرد. میستەر ئەردەلآن کە بۆخۆی کوردە[٨٧] دەربارەی ئەم بابەتە گوتی:

۲- پڕۆپاگەندەی حوکمەتی عیراق دەربارەی یەکیەتی عەرەب و کورد و یەکسانییان یەکجار کاریگەرە و ئەوەیش شتێکی نوێیە بۆ کورد کە بەو ڕادەیە بایەخیان پێ بدرێ. میستەر ئەردەلآن گوتیشی دەتوانین بڵێین زۆربەی کوردی عیراق پشتی حوکمەتی «نوێ-ك.م.» دەگرن تەنها زەویدارەکان نەبن کە یاسای چاککردنی زەوی کاری تێ کردوون، لایەنگرانی مەلا مستەفای بارزان و شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموودیش پشتی ڕژێمی نوێ دەگرن، هەرچەندە لە ڕاستیدا ئەو دوو ڕەهبەرە هەمیشە دژی یەکدی بوون[٨٨]، بەلآم ئێستاکە ئەو جیاوازییانەیان دەرنابڕن. میستەر ئەردەلآن لەو

---

[٨٧] ئەردەلآنییەکان لە سنە خانەوادەیەکی زۆر گەورە بوون، لە نزیکەوە هاریکاریی پەهلەوییەکانیان دەکرد و تەنانەت بۆ ڕەزامەندیی ئەوانیش بووبوونە شیعە، سەرکردە ناسراوەکانیان لە تاران دەژیان و پیاوانی وەك عەلی قولی خان و ئەمانوڵلآ خانی ئەردەلآنی لەو ڕۆژگارەدا سەنگی خۆیان لە وەزارەتی هەندەرانی ئێرانا هەبوو.

[٨٨] ئەم بۆچوونەی باڵوێزی ئێران زۆر ئاو دەکێشێ، دووبەرەکی لە نێوان ڕەهبەرانی نەتەوە ژێردەستەکاندا دیاردەیەکی ئاساییە، بەلآم پێویستە ئەوەیش لەیاد نەکەین کاتێك بارزانیی لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا دوورخرابۆوە شاری سلێمانی شێخ لەتیفی شێخ مەحموود یەکێك لەو کەسانە بوو کە بایەخێکی زۆری پێی دا و بە یاریدەی ئەو بارزانیی لە سلێمانی هەڵهات و شۆڕشی بەرپا کردەوە، بەلآم بۆخۆم هەستم بەوە دەکرد شێخ لەتیف زۆر لە هەڵوێستی بەرانبەری دوای ڕێککەوتننامەی یازدەی مارتی ۱۹۷۰ ڕازی نەبوو.

بڕوایەدایە کە بارزانی بڕێك چەکی لە حوکمەتی عیراقی وەرگرتووە، هەمان کات میستەر ئەردەڵان پێی وایە دوورە پەرێزگرتنی بەرگریی میللی «المقاومة الشعبية» لە هەریەك لە سلێمانی و هەولێر و کەرکووك دەبێتە هۆی ڕوودانی جۆرە ئاژاوەیەك.

٣- میستەر ئەردەڵان بیستوویەتی کە بەشێك لە سوپای عیراق بەرەو باکوور نێردراوە «ئێمە بۆخۆیشمان ئەمەمان لە سەرچاوەی دیکەوە بیستووە و ڕاپۆرتمان دەربارەی نووسیوە»[٨٩]. بە پێی بۆچوونی میستەر ئەردەڵان هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شیوعییەکان توانیویانە حوکمەتی عیراقی بەوە قانیع بکەن کە هەڕەشەی تورکیا و ئێران لە ئارادایە و ئەوەیش پێویستیی بە پتەوکردنی ناوچە سنوورییەکانە، میستەر ئەردەڵان لەو بڕوایەدایە ناردنی ئەو هێزانە لەبەر ئەوە نییە کە حوکمەت چاوەڕوانی ئەوە بووبێ کورد نیازیان بێ ئاژاوە بنێنەوە.

٤- ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە هەر یەك لە ئەنقەرە و تاران و بۆ هێزە پێوەندیدارەکان.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا

باڵوێز)[٩٠].

بەشی هەشتەمی هەمان فایل دەبارەی گەڕانەوەی بارزانییەکانە لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بە کەشتیی جۆرجیا و لە ڕێگەی کەناڵی سوێسەوە بۆ

[٨٩] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە و ئەمەیش دەقەکەیەتی بە زوبانی ئینگلیزی:

(We have had reports of this fom another source too).

[90] N.A., F.O., 371/140682, Eastren Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, From: British Embassy, Baghdad, No. 1013/221/59, April 2, 1959, To: The Eastern Department, Foreign Office.

بەسرە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەرۆکی بەڵگەنامەی سەرەکیی ئەم بەشەیە[٩١]:

(نهێنی،

نامە،

٧ی نیسانی ساڵی ١٩٥٩،

لە:

وەزارەتی دەریاوانیی بەریتانیاوە «د.ن.ئای.»،

بۆ:

بەحرەین،

کۆنسوڵی گشتیی خاوەن شکۆ لە بەسرە،

یەکسەر:

١- ڕۆژنامەکانی ئیمڕۆی بەریتانیا باسی ئەوەیان کردووە کەشتیی نەفەرهەڵگری ڕووسی جۆرجیا، کە یازدە هەزار تەن دەگرێ، کەناڵی سوێسی بڕی و « ٨٠٠ چەکداری تەواو لە ڕەگەزی کورد»ی[٩٢] هەڵگرتبوو.

٢- ڕێگەی چاوەڕوانکراوی ئەم کەشتییە بەم جۆرەیە:

هەشتی نیسان بگاتە عەدەن.

یازدەی نیسان بگاتە بەحرەین.

دوازدەی نیسان بگاتە بەسرە.

بەڵام وەها نیشان دراوە کە کەشتیی ناوبراو دەچێتە ڕۆژهەڵاتی دوور – «الشرق الأقصی».

٣- تکایە هەر زانیارییەکتان لەم بارەیەوە دەست کەوت ئاگادارمان بکەن.

بۆ بەڕێوەبەری بەشی ئیستیخباراتی دەریاوانیی) [٩٣].

---

[٩١] بەشی هەشتەمی ئەم فایلە لە هەشت لاپەڕە پێکهاتووە کە بەشی زۆریان دووپاتکردنەوەی ناوەرۆکی بەڵگەنامەی بەشی یەکەمی ناوبراوە.

[٩٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ڕستەکە بەم جۆرە لە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکدا هاتووە:

"... carrying "800 armed and well equipped men of Kurdish orgin".

بەشی نۆیەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی دووورودرێژی جۆن ل. ستێبینگ[٩٤] بۆ بێرثوود[٩٥] دەربارەی بارزانی، ئەم بەشە لە سیازدە لاپەڕە پێکهاتووە، سەرەتا دەقی نامەکە بە دەستخەت و ئینجا بە چاپکراوی دانراوە، وێڕای سوپاسگوزارییەکی فەرمی، جا بەر لە هەر شت وا لە خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ناوەرۆکی نامەکە پێشکەش دەکەین:

(ژمارە أی/١٨٢/١٤،

بێرثوودی خۆشەویست،

ئەو ڕۆژەی کە بانگم کردی بۆ وەزارەتی هەندەران هەستم کرد نەمدەتوانی دووی ڕووداوەکان بکەوم و بگەمە ئەنجامێکی ڕوون. بیرمە قسەکانم بە چەند ڕستەیەکی ناتەواو دەست پێکرد و هەرچیم گوت بە با چوو و دڵنیام چ هاوڕێکانت و چ خۆت واتان بە بیردا هات لەوانەیە من تووشی نەخۆشی لە بیرچوونەوە هاتبم[٩٦].

---

(93) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, subject: Kurdish Question, Secret Massage, Date: 17 April 1959,From Admiralty (D.N.1), To:Behrain H.B.M. Consul General, Basra.

(٩٤) بە داخەوە ناوی جۆن ل. ستێبینگ لە لیستی ناوی کارمەندانی ئەو ڕۆژگارەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا نییە، لەوانەیە زوو لە عیراق بووبێ و گەلێك شتی دەربارەی بارزانی و بنەماڵەی بارزانی و خەباتیان زانیبێ.

(٩٥) مارتین سیمۆر بێرثوود (Martin Seymour Berthoud) ڕۆژی بیست و دووی تەمموزی ساڵی ١٩٣١ لە دایك بووە، لە ڕۆژی سێی ئابی ساڵی ١٩٥٥وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، لە ئابی ساڵی ١٩٥٦ەوە لە تاران کاری کردووە و لە مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ هێنراوەتەوە بارەگای وەزارەت لە لەندەن. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960", London, P.127.

(٩٦) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو دەستەواژەیە وەها داڕێژراوە:
".... Your colleague and you must hava thought me to be suffering from senile decay".

لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی دواییپانەدا ڕۆژنامەکان چەند جارێك لەسەر یەك باسی مەلا مستەفای بارزانییان کردووە وا پێدەچێ تۆ حەز دەکەیت گوێت لە بیر و بۆچوونێکی دیکە بێ دەربارەی ئەو کەسایەتییە، لەوانەیە ئینگلیزی دیکە هەبن، هی وەك ڤیڤیان هۆڵت، کە لە نزیکترەوە شارەزای بارزانی بن، بەڵام پێموایە من دوا کەسێك بم کە بەر لەوەی بارزانی هەڵبێتە ئەو ناوچانەی ئەودیو سنوور کە لە لایەن ڕووسەوە داگیر کراون، پێوەندیم پێوەی هەبوو.

من بۆ یەکەم جار مەلا مستەفام لەو ساڵانەدا دی کە دوور خرابۆوە سلێمانی لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی بارزاندا، ئەوساکە جلوبەرگی ساکار و بێ هێز و خەفەتبار و ڕەنگی زەرد بوو، وێڕای ئەوەی بێ ئەندازە بیری لە چارەنووسی بنەماڵە و هۆزەکەی خۆی دەکردەوە، پێموایە سەرەتا هەستی زۆربەی خەڵك لەگەڵ ئەو بوو، ئەو هەستەی کەمێك لەق بوو چونکە مەلا مستەفا هەمیشە هەمان داستانی دەگوت و دەگوتەوە بێ هیچ جۆرە جیاوازییەك...

پاش دەوروبەری هەژدە مانگ جارێکی دیکە مەلا مستەفام[97] دییەوە، ئەوە بوو لەو کاتەدا سێر کێنهان کۆرۆنوالیس ناردمییە ناو بارزان وەك ڕاوێژکار دوای تەوابوونی جەنگی «دووەمی جیهان–ك.م.» و دانانی نەخشەیەکی نوێ بۆ کوردستان، ئەمجار بارزانیم بە شێوازێکی دیکە هاتە بەر چاو، جلو بەرگی نەتەوەیی لەبەردا بوو، تەواو ڕێکوپێك و چالاك دیار بوو.

ئەوانەی لە بواری ئیستیخباراتدا کار دەکەن گەلێك وێنەی بارزانییان گرتووە، بەڵام ئەوانەی کاریان وەك کارەکەی من بوو دەرفەتی بینینیمان کەمتر بوو، جاری واش هەبوو بە هۆی سەروپێچەکەیەوە دەموچاویمان بە

---

هەرچی زاراوی (Senile Decay) یشە واتای نەخۆشیی لەبیرچوونەوە «فقدان الذاكرة» دەگەیێنێ کە بە زۆری تەمەنداران تووشی دێن.

[97] ستێبینگ لێرەدا تەنها (م.م)ی نووسیوە و دەڵێ زۆر جار هەر بەو جۆرە ناوی بارزانی دەهات، لەو بوارەدا بارزانی ڕەهبەرێکی سادە و ساکار بوو.

تەواوەتی نەدەبینی[٩٨]. پێم وایە ڕووی مەلا مستەفا لە کاتی حەوانەوەدا بە خۆی و کەمێك لووتە شۆڕەکەیەوە و لێوە باریکەکانییەوە تووڕەتر دیارە، بەڵام من بۆخۆم هەرگیز ئەوەم لەیاد نییە ڕۆژێك ئەو پیاوەم لە ئیسراحەتدا دیبێ، ئەو پیاوە هیچ کاتێك ئارامی نەبوو، چاوە ڕەشەکانی هەمیشە گەشاوە بوون و قسەکانی بێ پێچ و پەنا بوون... باڵای زۆر بەرز نییە، بەڵام داڕێژراو و لەوە ناچێ دەستی نەکراوە بێ.... سوارێکی چاپووکە، بەڵام هەمیشە لە گەشتی درێژخایەندا لەگەڵ پیاوەکانیدا بە پێ دەڕوات.

ئەمانە هیچیان لە نێو سەرەك هۆزەکانی کورددا باو نین، من وەك ڕاوێژکارێکی بیانی مافی موناقەشە و ڕێگەنیشاندان و ئیقناعکردنم نەبوو، مافی ئەوەیشم نەبوو دەست بخەمە ناو کار و پلان و نەخشەکانی هۆزەوە کە دەزانم لە کۆبوونەوەی تایبەتیی خۆیاندا لێیان دواون.

هەرچۆن بێ لە لێدوانەکانی لەگەڵ مندا مەلا مستەفا پیاوێکی مەعقول و عەمەلی و بەکەڵك بوو، ڕۆژانی دەربەدەریی شێخانی بارزان زەویوزاریان بەرەڵڵا بوون و هێزەکانی حوکمەت خانووەکانیانی لەگەڵ زەویدا تەخت کردبوو، وێڕای ئەوەی دار و پەردووی ئەو خانووانەیان بۆ دروستکردنی مەخفەری پۆلیس بەکار هێنابوو، مەڕ و ماڵاتیان زەوت کرابوون، یان فرۆشرابوون بۆ پارەی بەخێوکردنی دوورخراوەکانیان. سەرباری هەموو ئەمانەیش سەرجەمی هەموو کوردستان بۆ ماوەی چەند ساڵێك بە دەست نەهاتییەوە دەیانناڵاند و نرخی خۆراك هێند بەرز بووبۆوە کە لە وێزەی پیاوە ڕەمەکییەکانی هۆزەکاندا نەبوو. لەم بارودۆخەدا مەلا مستەفا ڕووی دەمی تێ کردم داوا لە بەغدا بکەم کەلوپەلی خانوو دروستکردن و کشتوکاڵ و ئامرازی دیکە و تۆ و گاسن و ئاژەڵ و پارەیان بۆ بنێرن تاوەکو هۆزەکەیان تا کاتی دروێنەی داهاتوو دەبەنە سەر، حوکمەتیش لە لایەن خۆیەوە

---

[٩٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەم ڕستەیە بەم جۆرە داڕێژراوە:
"...These in my possession are too small to be of intrest and show him with his face partly hidden by his turban...".

پەیمانی جێبەجێکردنی ئەم داخوازییانەی دا کە گشتیان ڕەوان و هیچ کۆسپێکی ڕەوا لەبەردەم یاریدەدانی هۆزەکەدا بۆ دامەزراندنەوەی جێگە و ڕێگەی خۆیدا نابینن، لەم بوارەدا، هەر چۆن بێ، من نازانم تاوەکو چ ڕادەیەك عیزەت عەبدولعەزیز، کە ئەفسەرێکی سوپای عیراق بوو کاتی شۆڕش دابوویە پاڵ شۆڕشگێڕان، کاری کردبووە سەر مەلا مستەفا، بەڵام گومان لەوە نەدەکرا کە عیزەت عەبدولعەزیز ئەو جۆرە نامانەی بۆ مەلا مستەفا دەنووسی چونکە ئەم بۆ خۆی نەیدەتوانی نامە بە زوبانی عەرەبی بنووسێ. ئەوەی ڕاستی بێ مەلا مستەفا ئامادەیی نیشان دا کە ئاڵوگۆڕی پێویست لە ڕیزەکانی هۆزی بارزاندا و تەنانەت لە بواری نەریتی ئایینیی بارزانییەکاندا بکات و لە لایەن خۆیەوە چەند هەنگاوێکیشی بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە نا.

بە وێنە من بۆخۆم بە ناوی حوکمەتی بەریتانییەوە ئەفسەرێك و دوو بارە ئێستر و دەرمانم بۆ بارزانییەکان نارد و بۆخۆیشم لەگەڵ ئەو کەلوپەلانەدا چوومە ناوچەکە و بە هۆی یاریدەدانی مەلا مستەفای بارزانییەوە توانیمان فەحسی ئافرەتەکانیان و پیاو و منداڵەکانیان بکەین و تەنانەت خودی مەلا مستەفا خۆی بانگی کردینە ژووری ئافرەتانی بنەماڵەی شێخانی بارزان، هەرچی زڕخوشکە خۆشەویستەکەی مەلا مستەفایە کە تووشی "خەلعی ویلادی" بووبوو، ڕێگەی پێداین بە ئازادی فەحسی بکەین.

لەو ڕۆژانەدا گفتوگۆ دەربارەی بەنداوی بێخمە لە ئارادا بوو، من بۆخۆیشم زۆرم حەز دەکرد جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە ببێتە هۆی ئاوەدانیی ناوچەی بارزان و زۆر جاران بیر و بۆچوونەکانم لەم بارەیەوە لەگەڵ مەلا مستەفادا هەڵدەسەنگاند. ئەویش بۆ خۆی بایەخێکی زۆری دەدا بەو کارە و پەیمانی دا کە چ شێخ ئەحمەد و چ بۆخۆی هەموو جۆرە یاریدەیەکمان دەدەن بۆ جێبەجێکردنی ئەو پرۆژە «بەریتانیی»ە [٩٩]، تەنات ئەگەر ئەوە پێویستی بە ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی هەبێ لە شێوازی ژیانی هۆزایەتیی

---

[٩٩] شایانی باسە بۆ سەرنجراکێشان لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی بەریتانییەکان "The British" خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

بارزانییەکانیشدا. هەرچۆن بێ لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوەیش بڵێم کە بارزانییەکان حەزیان دەکرد بخرێنە ژێر چاودێریی بەریتانیاوە.

جارێکیان هەوڵم دا بزانم بارزانی چۆن دەربارەی ڕووس بیر دەکاتەوە. لە وەڵامدا سوێندی خوارد ئەو وەك موسڵمانێك و مەلایەك و ئەندامێکی بنەماڵەی شێخی بارزان هەرگیز نەیتوانیوە هیچ جۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ ئەو خوانەپەرستانەدا هەبێ.

هەر چۆن بێ بارزان هەمووی بەسەر یەکەوە چەند میلێك لە سنووری ئازەربایجانەوە[100] دوورە، کە لەو ڕۆژگارەدا لە لایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە داگیر کرابوو، وێڕای ئەوەی هەرگیز نە تورکیا و نە ئێران ویستوویانە ببنە پەناگەی ڕەهبەرە کوردە یاخیبووەکان، دەبوو مەلا مستەفایش دەرکی ئەوە بکات کە دوای بەزاندنی لە لایەن سوپای عیراقەوە ئازەربایجان و ڕووس تاکە پەناگەی کراوە بوون لەبەر دەمیدا.

من بۆخۆم ئەوە نازانم لەوێ چۆن ڕەفتاریان لەگەڵیدا کردووە، بەڵام هەمان کات ئاگاداری ئەوەم کە مەلا مستەفا پێوەندیی بە ئەندامانی بنەماڵەی سەید تەهاوە هەبوو کە تاوەکو ئەوسایش هەر لە ئازەربایجان دەژیان و وا بزانم پێوەندییەکی ژن و ژن خوازی لە ڕێگەی کچێکی بنەماڵەی سەید تەهاوە لە نێوانی هەردووك لادا هەبوو، لەوانەیە مەلا مستەفا یەك دوو جاریش سنووری بڕیبێ و چووبێتە ئەو ناوچانە. سەرباری ئەوە ئازەربایجان وەك ناوچەیەکی سەر بە بزووتنەوەی ئۆتۆنۆمی تەواو شوێنێکی لەبار بوو، بابەتەکە بۆ خۆیشی گفتوگۆی زۆری هەڵدەگرت، تایبەت لە تەورێز، بۆیەکا ئەگەر «بارزانی–ك.م.» بە ڕاستی ئەو یەك دوو جارە سنووری بڕیبێ ئەوە خۆی لە خۆیدا شتێك نییە بشاردرێتەوە.

وا دیارە پێوەندیی مەلا مستەفا لەگەڵ پیاوەکانی و شەرکەرەکانیدا لە هۆزی بارزان باشە، من نازانم هەڵوێستی بەرانبەر سامانی هۆزەکەی چۆنە،

---

[100] هەروەك چۆن تاوەکو ئێستا چەند جارێك ئاماژەمان پێی داوە مەبەست لە ئازەربایجان و ئازەربایجانی ئێران کوردستانی ڕۆژهەڵاتە.

بەلأم پێم وایە لە هەموو دیاردە دیموکراسییەکاندا ئەو بڕوای بە مافی خواوەندیی پاشاکان هەیە(۱۰۱). کۆمەلأنی خەڵك وەك پیرۆن سەیری ئەو کەسانە دەکەن(۱۰۲)*.

ڕاستێکەی من مستەفا بارزانیم هێندەی ژمارەیەك لە پیاوە دڵسۆزەکانی خۆش نەدەویست، پێم وابوو بە ڕاستی کەسایەتییەکی وەك مۆسۆلینییە، ڕاستییەکەی ئەویش وەك ئەو چالاکە، پیاوێکی خاوەن توانا و ئاگادار و خاوەن بیرە و لەنێو هەموو ئەو ڕەهبەرە کوردانەدا کە من دەیانناسم ئەو تاکە کەسە کە ئامادەیە بیر و باوەڕی نوێ وەربگرێ بەو مەرجەی ئەو بیر و باوەڕانە بە شێوازێکی موباشیر نەبنە هۆی نارەحەتیی خۆی، بۆیەکا ناتوانم یاریدەی ئەو بۆچوونە بدەم کە دەیەوێ «ئێمەی ئینگلیز-ك.م.» لایەنە چاکەکانی ئەو بەو ڕێگەیەدا بەرین کە مەبەستمانە، من پێموایە ئەو ئێستاکە تێکەڵ بە بیر و بۆچوونی ڕووسەکان بووە نەك هی ئێمە.

خۆزگە دەمانزانی ئایا ڕووسەکان هیچ دەسەلأتێکیان پێ داوە یان ماوەی ئەو هەموو ساڵە وەك داردەست بەکاریان هێناوە. هەڵبەت ئەگەر دەستەپاچە دابنرێ ئەوساکە پێم وایە ورە بەردەدات و بە دەستووری ئەو سالأنەی دوور خرابۆوە سلێمانی هیوای نامێنێ.

---

(۱۰۱) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو ڕستەیە بەم جۆرە داڕێژراوە:

"… I think he still belived in the divine right of kings"

ئەوەیش دەقاودەق «نظرية الحكم الالهى للملوك» دەگەیێنێ.

(۱۰۲) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

".… all the same, it must have looked good to them, as Peron`s must have looked to his deseamisados".

وەك ئاشکرایە پیرۆنیش ڕەهبەرێکی ئەرجەنتینیی دڵسۆزی ناسراو بوو، بە ڕەگەز ئیسپانی بوو، وشەی (des camisados)یش وشەیەکی ئیسپانییە کە واتای جلوبەرگی سادە و ساکار دەگەیێنێ.

* سەرنج: هەندێك تێبینی نووسراون من دڵنیانیم و بەلامەوە پەسەند نەبوون.

هەمان کات خۆزگە ئەوەیشمان دەزانی تاوەکو چ ڕادەیەك «لەو ماوەیەدا کە لە سۆڤیەت بووە—ك.م.» خۆی پێش خستووە، جاران بەر لە هەر شت بیری لە ناوچەی بارزان دەکردەوە و کەم بایەخی بە بەرژەوەندییەکانی کوردستان بە گشتی دەدا و پێوەندیشی بە سەرەك هۆزەکانی دیکەوە زۆر باش نەبوو، ئەوانیش زۆربەیان بە چاوی پیاوێکی طەموح و تا ڕادەیەك ئاژاوەچی سەیری دەکەن لە کاتێکدا کە قازانجەکان لە بەغداوە دێن. هەرچۆن بێ ساڵی ١٩٥٦ — ١٩٥٧ من هەستم کرد وەك قوربانییەکی بیر و باوەڕ سەیریان دەکرد. بێ گومان ئەو کاتە ئەو تاکە «دەنگی کورد—ك.م.» بوو لە ئیزگەکاندا و داوای هیچ یاریدەیەکی لە خەڵکی نەدەکرد.

هیوادارم ئەم ڕاپۆرتە نەبێتە هۆی هیچ جۆرە ناڕەحەتییەك بۆتان، هەرچۆن بێ گەلێك بەختەوەر دەبم لە هەر هەواڵێك دەربارەی گێراوەکانی «مووسڵ—ك.م. » و ئەو جۆرە شتانە ئاگادارم بکەن، پێموایە ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵەکانمان بە هۆی کودێتاکەی مووسڵەوە گیراون[١٠٣].

دڵسۆزتان

ئیمزا

جۆن ل. ستێبینگ)[١٠٤].

لە هەمان بەشی نۆیەمی هەمان فایلدا نامەیەکی فەرمیی سوپاسگوزاریی گەرم هەڵگیراوە کە «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەران ئاراستەی جۆن ل. ستێبینگی کردووە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو نامەیەیە:

---

[١٠٣] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێ: "Mosul putsch" کە دیارە مەبەستی یاخیبوونەکەی مووسڵی عەبدولوەهاب شەوافە.

(104) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, No. 1821/14, Brare Cottage, CLent, Stour Bridge, Woeestershire, 11April, 1959, M.C.Berthoud, Esq., Foreign Office, London, S.W.1.

(لە:

م.س.بێرشوودەوە،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

س.دەبل یو. ١،

١٤ی نیسانی ١٩٥٩،

بۆ:

ڕێزدار ج.ل.ستێبینگ،

بریار کۆتەیج،

کلێنت،

ستۆر بریج وورکس.

ئەم نامەیە تەنها بۆ دەربڕینی سوپاسێکی زۆرە بەرانبەر نامە هەرە بایەخدارەکەی ڕۆژی یازدەی نیسانتان، ئەو زانیارییانەی دەربارەی بارزانی بۆتان ناردووین دەبنە سەرچاوەیەکی یەکجار بایەخدار بۆ ئێمە.



وێنەی شەهیدانی بزووتنەوەی شەواف لە مووسڵ

وێـڕای لـە سـێدارەدانی چـوار ئەفسـەری فڕۆکـەوان شـتێکی تـەوتۆمان دەربارەی گیراوەکانی دوای یاخیبوونەکەی مووسڵ نەزانیوە، هـەر هـەواڵێکی نوێمان بگاتێ دەربارەیان ئاگادارتان دەکەم، هەواڵەکانی ئەم دواییـە باسـی ئەوە دەکەن کە قاسم بڕیاری ئازادکردنی سێ کەسـی لـە بەرپرسـانی ڕژێمـی پاشایی دەرکردووە «کەسێکیش لـەو سـیانە بڕیـاری زیندانییەکـەیان پـتر لـە سێ ساڵ نییە»، وا پێدەچێ قاسم بە هیچ جۆر نەیەوێ خۆی تووشی گێـژاوی توندڕەوی بکات.

بەم بۆنەیەوە حەز دەکەم ئەوەیش بڵێم کاتێك سەردانت کردین ئێمـە بـە هیچ جـۆر هەسـتمان بـە پیربوونتـان نـەدەکرد، لەگـەڵ ئەوەیشـدا هیـوادارین تەندروستیت زۆر باش بێ، هەر چەندە ئێمە لە کاتی بینینتـدا تـەنها گوێمـان لە قسە بە نرخەکانت گرت.

ئیمزا

م.س.بێرثوود) [١٠٥].

هـەمان کـات «بەشـی ڕۆژهـەلاَت»ی وەزارەتـی هەنـدەرانی بـەریتانی بـە پێویستی دەزانێ باڵویزخانەی بەریتانی لە بەغدا لە نـاوەڕۆکی ئـەو نامەیـەی ج.ل.ستێبینگ بێ بۆیەکا ڕۆژی یەکی مایس وێنەی ئەو نامەیەی بەم جـۆرەی لای خوارەوە بۆ دەنێرێ:

(لە:

وەزارەتی هەندەرانەوە،

س.دەبل یو. ١،

ژمارە إی ١٨٢١/١٤،

نهێنی،

١ی مایسی ١٩٥٩،

---

[105] Ibid, From: M.S. Berthoud, Foreign Office, Londom, S.W.1. April 14, 1959, To: J.L. Stebbing, Esq.,Briar Cottage, Clent, Stour bridge, Worcs.

بۆ:
باڵوێزخانەی بەریتانی،
بەغدا،
باڵوێزی خۆشەویست
هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەماندا وێنەی نامەیەکی میستەر ستێبینگتان بۆ دەنێرین کە ڕۆژی یازدەی نیسان ناردوویە، پێمانوایە ئەو وێنەیەی دەربارەی مەلا مستەفای بارزان کێشاوییە بایەخێکی تایبەتیی هەیە.
هەمیشە دڵسۆزتان
بەشی ڕۆژهەلاًت) [١٠٦].

بەشی دەیەمی هەمان فایل بریتییە لە برووسکەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە مۆسکۆوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی بە بەرواری چواردەی نیسانی ساڵی ١٩٥٩ کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:
(لە:
مۆسکۆوە،
بۆ:
وەزارەتی هەندەران،
نهێنی،
ژمارە ١٧٢٣/١٤/٤،
لە سێر د.پ.ڕییللایەوە [١٠٧]

[106] Ibid, From: Foreign Office, S.W.1, No. E1821/14, Confidential, May 1, 1959, To: British Embassy, Baghdad.

[١٠٧] سێر دارسی پاتریك ڕییلای (Sir D`arcy Partrick Reily) ڕۆژی حەڤدەی مارتی ١٩٠٩ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە ڕۆژی دوازدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٣وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، فارسییەکی باشی زانیوە و دوایی

برووسکەی ژمارە ٣٢،

١٤ی نیسانی ١٩٥٩،

بۆ ئاگاداری وێنەی لێ دراوەتە بەغدا- ژمارە سیازدە و ئەنقەرە ژمارە بیست و یەك و واشنتۆن ژمارە سەد و بیست و هەشت و تاران ژمارە چواردە.

١- ڕۆژنامە سۆڤێتییەکان ڕۆژی دوازدەی نیسان لێدوانێکی کورتی تاسیان دەربارەی ئەو ڕاپۆرتانەی ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەکان «کە بە شێوازێکی سەرەکی لە ڕۆژنامەکانی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا ئاماژەیان بۆ دەکرێ[١٠٨] کەوا ٨٥٥ لاوی کوردی سۆڤیەتیی چەکدار» کە باش لەسەر شەڕی چەتەگەری «حرب العصابات» ڕاهێنراون[١٠٩] لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بەرەو عیراق کەوتوونەتە ڕێ.

٢- ئەو لێدوانەی تاس گوتووشییە ئەو کوردانەی کە بە کەشتیی «جۆرجیا» لە ئۆدێساوە سەرەتای نیسان سەفەریان کردووە ٤٥٩یان پیاون «کە سەدیان پیرەمێرد و کەفتە کارن» و ٣٩٤یشیان یان ئافرەتن یاوەخود منداڵن. ئەو کەسانە ساڵی ١٩٤٧ لە عیراقەوە پەنایان هێنایە بەر «یەکیەتی

---

فێری زوبانی یۆنانیش بووە، گەلێك فەرمانی گرنگی پێ سپێردراوە و لە زۆر وڵاتی وەك جەزائیر و فەرەنسا و یۆنان و شوێنی دیکە کاری کردووە و لە خودی بارەگای وەزارەتی هەندەرانیش پۆستی گەورەی پێ دراوە و لە ڕۆژی بیست و یەکی شوباتی ساڵی ١٩٥٧یشەوە کراوەتە باڵوێزی فەوقەلعادەی بەریتانی لە یەکیەتی سۆڤیەت، بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular year Book 1960", London, P.344-345.

[١٠٨] لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە:
"particulary wibespread in the press of the U.A.R".

[١٠٩] دیسانەوە لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە:
"well trained for guerilla warfare".

سۆڤیەت–ك.م. » و «گەلێكیان بە دەست ڕژێمی كۆلۆنیالیی كۆنەپەرستی نووری سەعیدەوە چێشت»[110] ئەوانە بە پێی ڕێككەوتننامەیەك لەگەڵ حوكمەتی عیراقدا و وەك «كارێكی مرۆڤانە– عمل أنسانی» [111] گەڕانەوە.

٣– پێم وایە لە یادتانە مانگێك لەمەوبەر ئاگادارمان كردن كە باڵوێزی عیراق لەمۆسكۆ ڕایگەیاند كە ژمارەیەك داوای لە پەنابەرە عیراقییەكانەوە دەربارەی گەڕانەوەیان پێ گەیشتووە و زۆربەی ئەو كوردانەی دەیانەوێ بگەڕێنەوە ئێستا كراونەتە شیوعیی[112] بڕوانە نامەی ژمارە ٣/٢/١٩٠٥٨ی ڕۆژی دووی مانگی مارتی باڵوێزخانەكەمان بۆ بەشی ڕۆژ هەلات) [113].

بەڵگەنامەی دواتری هەمان بەشی دەیەمی ئەم فایلە بۆ ناوەرۆكی ڕاگەیاندنەكەی تاس تەرخان كراوە كە كراوەتە ئینگلیزی، وێڕای دوو ڕوونكردنەوەی دیكە، چونكە وەها دیارە ڕۆژنامە میسرییەكان مەسەلەی گەڕانەوەی بارزانییەكانیان زۆر گەورە كردووە و ئێزگەی لەندەنیش پەیتا پەیتا ئەو هەواڵانەی بڵاو كردۆتەوە، ئەم ئاگادارییەی تاسیش، كە دەقی

---

[110] لە دەقی بەڵگەنامەكە خۆیدا ئەو ڕستەیەش بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت كەوانی بچووكەوە:

"... suffered under "the persection of the reactionary colonialist r`egime of Nuri Said".

دیارە باڵوێزی بەریتانی بەو جۆرە نایەوێ دان بە سروشتی ڕژێمی پاشایی عیراقدا بنێ.

[111] ئەو ڕستەیەش لە دەقی بەڵگەنامەكەدا خراوەتە نێوان دوو جووت كەوانی بچووكەوە:

".... as a "humane measure".

[112] دەقی ئینگلیزیی ئەو ڕستەیە بەم جۆرەیە:

"... and that most of the kurds wishing to return are now convinced communist".

[113] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, subject: Kurdish Question, From: Moscow, TO: Foreign Office Confidential, No. 1823/14/4, From Sir D.P.Reilly, Savinggram No. 32 April 14, 1959.

وەرگێڕانەکەی بڵاو دەکەینەوە، بۆی هەیە تیشك بخاتە سەر لایەنەکانی ئەم بابەتە:

«لە کۆتاییدا هەواڵنێرەکەی «تاس–ك.م.» گوتوویە ڕۆژنامەکانی قاهیرە ڕایان گەیاندووە گوایە کەشتییەکی سۆڤیەتی بەناوی ئیڤانۆڤەوە؟[114] کە چەکداری پێ بووە کەناڵی سویسی بڕیوە، ڕاستیی ئەم بەند و باوە بریتییە لەوەی کەشتییەکی سۆڤیەتی نەوتی خاوی دەبرد بۆ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو وە هیچ چەکدارێك، یان ئەسەریان، لە ناو ئەو کەشتییەدا نەبووە، ئەوانەیش کە بۆ خۆیان دەیانەوێ لە ڕۆژنامەکانی قاهیرە دڵنیابن دەتوانن بچنە کەناڵی سوێس و بە چاوی خۆیان ببینن» [115].

بەشی یازدەمینی هەمان فایل بریتییە لە سێ بەڵگەنامە دەربارەی هەمان بابەت، دووەمیان ڕەشنووسی سێیەمیانە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی بەڵگەی یەکەمیانە:

(لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

تاران،

نهێنی،

ژمارە ٥٩/١٨٢١،

بۆ:

بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

---

[114] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئیڤانۆڤ، کە ناوێکی زۆر باوە لەنێو رووسدا، بەو جۆرە خراوەتە نێوان دووجووت کەوانی گەورەوە و پرسگەیەکی لاوە دانراوە چونکە، وەك ئاشکرایە، بارزانییەکان بە کەشتیی جۆرجیا نەك ئیڤانۆڤ گەڕانەوە.

[115] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, Soviet Kurds: Moscow denies Cairo Shipping Rumours.

لەندەن،

س.دەبل یو. ۱،

بەشی ڕۆژ هەلاّتی خۆشەویست،

۱- بە درێژایی هەفتەی ڕابردوو ڕۆژنامە ئێرانییەکان زۆر بە چڕی ئەو ڕاپۆرتانەیان بلاّو دەکردەوە کە لە قاهیرە و گەلێك شوێنی دیکەوە دەگەیشتن و باسی ئەوەیان دەکرد کە دەورووبەری هەزار کورد بە کەشتی لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە گەیشتوونەتە عیراق.

۲- وەك بۆ خۆتان هەستی پێ دەکەن ئەم هەواڵانە کاریگەرییەکی زۆریان کردە سەر بەرپرسە ئێرانییەکان کە زۆر دوودڵن و گومانکەرن بەرانبەر هەر کردارێك لەوانەبێ ببێتە هۆی ئەوەی ئەو کوردانە بە شێوازێکی ئاشکرا یان بە نهێنی دژی ئێران بە کار بهێنرێن «تکایە بڕواننە نامەی ڕۆژی نۆی نیسانی ژمارە ۵۹/۱۱۹۲ گ ی باڵوێزخانەکەمان بۆ فرانسێس براون» [۱۱٦].

۳- هەرچی وەزارەتی هەندەرانی «حوکمەتی بەریتانییە-ك.م.» هەواڵی تەواوی دەربارەی ئەم دەستە کوردە بە دەستەوە نییە، بەلاّم وەها پێدەچێ زۆربەیان لەوانە بن کە لە کاتی جیاوازدا عیراقیان بە جێ هێشتووە.

---

[۱۱٦] بە داخەوە لە دەقی بەلگەنامەکەدا ناوی باڵوێزی بەریتانیی ئەو ڕۆژگارەی لە ئێران نەنووسیوە، بەلاّم بە پێی لیستی ناوی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی ساڵی ۱۹۵۹ و ۱۹٦۰ دەرکەوت ئەو کاتە سێر جیوفری وێد گوود هاریسۆن (Sir Geoffrey Wedgwood Harrison) باڵوێزی بەریتانی بووبێ لە تاران، ناوبراو ڕۆژی هەژدەی تەمموزی ساڵی ۱۹۰۸ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، زوبانی یابانیی زانیوە، لە ڕۆژی بیست و یەکی تەشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۲ەوە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و وێڕای بارەگای وەزارەت لە لەندەن، گەلێك ولاّتی وەك ئەڵەمانیا و یابان و بەلجیکا و یەکیەتی سۆڤیەت و ئەرجەنتین کاری کردووە و لە ڕۆژی سێی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۵۸ەوە بووەتە باڵوێزی فەوقەلعادەی بەریتانی لە ئێران. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular year Book 1959", London, PP.231-233.

ئێمە بۆ خۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکەمان لە بەغدا.

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز

ئیمزا) [117].

بەشی دوازدەمینی هەمان فایل یەکێکە لە بەشە هەرە گەورەکانی ئەم فایلە، ژمارەی لاپەڕەکانی بریتییە لە نۆ لاپەڕە و بەشی هەرە زۆریان لە هەردووك دیویان بە چڕ و پڕی چاپ کراون. یەکەم بەڵگەنامەی ئەم بەشە بریتییە لە دووپاتکردنەوەی دەسنووسی وتارە گرنگەکەی س.ج.ئێدمۆندس کە بەشی چوارەمی هەمان فایلی بۆ تەرخان کراوە و بریتییە لە سی و حەوت خاڵی تێر و تەسەل و دەقی وەرگێڕانەکەیمان پێشکەش کردووە، بەڵام ئەمجاریان پێشەکییەکی خراوەتە سەر چونکە بەرپرسانی حوکمەتی بەریتانی وایان بە باش زانیوە ژمارەیەکی زۆر لە کارمەندانی بەریتانی ناوەرۆکی ئەو وتارە بخوێننەوە، جا وا لە خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ئەو پێشەکییەش پێشکەش دەکەین:

(ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،

ژمارە ۱۸/۳/۵۹،

ئەنجوومەنی کۆمۆنوێلث،

بۆ دابەشکردن،

ژمارە سی.سی.سی۱۵۲،

(117) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, From: British Embassy, Tehran, Confidential, No. 1821/59, April 16,1959, To: Eastern Deparment, Foreign Office, London.S.W.1.

## کورد و ولاّتانی پەیمانی بەغدا (١١٨)

ئەم وتارە بەر لە هەوڵی کوّدیتاکەی (١١٩) مووسڵ نووسراوە، بەڵاّم وەك دەیبینین لە خاڵی سێ و دووەمیندا «ئێدمۆندس—ك.م.» بەرپابوونی یاخیبوونێکی وەهای بە دوور نەبینیوە، دوای بەرپابوونی یاخیبوونەکە ئەو پێی وایە شەواف لە هەڵبژاردنی مووسڵدا «کە چواردەورە دراوە بە هۆزی کورد» (١٢٠) کەوتە هەڵەوە، ئەوەیش بوو یاخیبوونەکە دڕندانە دامرکێنرایەوە و گشت فاکتەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە «کوّدێتای ناوبراو—ك.م.» بریتی بوو لە پێکدادانی نەتەوەپەرستیی کورد و یەکیەتی عەرەبدا و ئەوەیش خۆی لە خۆیدا کارێکی یەکجار ناسکە بۆ کرێملن، چونکە یەکیەتیی سۆڤیەت ناتوانێ لایەنی هەردووك لا بگرێ» (١٢١).

دوا بە دوای ئەمە بەڵگەنامەی هەمان بەشی فایلەکە بۆ باسی ژمارەی کورد تەرخان کراوە کە ئەمەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(ژمارە إی ١٨٢١،

کورد،

---

(١١٨) لەدەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە خەتێك بە ژێر ڕستەی کورد و ولاّتانی پەیمانی بەغدا دا هێنراوە:

The Kurds and the Baghdad Pact Powers.

(١١٩) بە هەمان دەستوور لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە خەتێك بە ژێر وشەی کوّدێتاکەدا (Putsch) هێنراوە.

(١٢٠) بەو جۆرە ئەو ڕستەیەش لە دەقی بەڵگەنامەکەدا خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی گەورەوە:

".... Shawaf made the ill choice of Mosul (surrounded by Kurdish Tribes) and that the revolt....".

(121) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, subject: 'Kurdish Question, Mediterranean- Middle East Gorup, No. 18/3/59, Conservative Commonwealth Council, For Circulation, Ref. CCC 152.

١- ژمارەیان:

ژمارەکانی ئێمە دەربارەی کورد کەمێك جیاوازن لەو ژمارانەی لە «وتارەکەی ئێدمۆنسدا-ك.م.» هاتوون، ئەمانەی لای خوارەوەیش ژمارەکانن:

تورکیا ١٥٠٠٠٠٠

ئێران ١٠٠٠٠٠٠

عیراق ١٠٠٠٠٠٠

سوریا ١٥٠٠٠٠

یەکیەتی سۆڤیەت ١٠٠٠٠٠

٢- واقیعی وێنەکە ئیمڕۆکە:

وتاری ناوبراو بێ گومان بەر لە یاخیبوونەکەی مووسڵ نووسراوە، ئەوە ڕاستە کورد بە دڵسۆزی بۆ قاسم مانەوە، دوایش دیارە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، ئەگەر چی موباشریش نەبووبێ لە دامرکاندنەوەی یاخیبوونەکەدا، ئامانجێکی هەنگاوەکانی دواتری شۆڕش پتەوکردنی برایەتیی کورد و عەرەب بوو لە وڵاتدا و تاوەکو پێوەندییەکانی نێوان عیراق و کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو وەك خۆی بمێنێ و بیرۆکەی یەکیەتیی عەرەب وەلا بنرێ، عیراقییەکان دەتوانن هەستی کەمینەی کورد ڕابکێشن چونکە ئەوان بێ گومان دژی پێوەندییەکی زۆر نزیکن لە نێوان عیراق و کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا، واش پێ ناچێ کوردی عیراق ئەو پەیمانانەی حوکمەت دەربارەی کوردستانێکی یەکگرتووی دوارۆژ داونی لە یادیان بکەن.

گەیشتنی ئەم دواییانەی کوردەکانیش لە یەکیەتیی سۆڤیەتەوە بە کەشتی بۆ بەسرە بێ گومان بەردەوامبوونی هەمان پرۆسەیە کە بە گەڕانەوەی بارزانی و ڕەهبەرە کوردەکانی دیکە دەستی پێکرد، هیچ هۆیەکیش لە ئارادا نییە وەها لە پیاو بکات بڕوا بەو ڕاپۆرتەی قاهیرە بکات کە بە نیگەرانییەوە باسی گەڕانەوەی کوردەکان دەکەن وەك هۆکارێکی

دەستتێوەردانێکی بیانیی بە نیازی فشار خستنە سەر نەتەوەپەرستیی «عەرەب—ك.م.» لە عیراقدا.

٣- گشتی:

کوردستانێکی یەکگرتووی سەربەخۆ لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە «کە زۆربەیان لە وتارەکەی ئێدمۆنسدا ئاماژەیان بۆ کراوە» خەونێکی دوورە «یان کارێکی یەکجار زەحمەتە—ك.م.»:

(أ) ئەو کارە دژی بەرژەوەندییەکانی تورکیا و ئێرانە چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی بەشێك لە دانیشتوان و خاکیان لە کیس بچێ.

(ب) دژی بەرژەوەندییەکانی عیراق دەبێ چونکە دەبنە هۆی ئەوەی یەك دەر پێنج یان یەك دەر شەشی ژمارەی دانیشتوان و بەشی هەرە زۆری ناوچە نەوتییەکانی لە دەست بچێ، وێڕای ئەوەی بەرهەڵستیی کورد بۆ هیچ جۆرە یەکیەتییەکی عەرەب «بە دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتووی سەربەخۆی کوردستان—ك.م.» عەرەبی عیراقی ئەو هاوسەنگییەیان نامێنێ بەرانبەر داواکارانی دامەزراندنی جۆرە پێوەندییەکی نزیك لەگەڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا.

(ج) هەمان کات ئەو کارە دژی بەرژەوەندییەکانی یەکیەتی سۆڤیەت دەبێ کە بە پێویستی دەزانێ پێوەندییە باشەکانی ئێستای لەگەڵ حوکمەتی عیراقدا بەردەوام بێ، کلیلی بەردەوامبوونی نزیکیی عیراق لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤیەتدا و دوور لە ڕۆژئاوا لەوانەیە بریتی بێ لەوەی یەکیەتی سۆڤیەت ڕۆڵێکی گەورە دژی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ ببینێ.

دوور نییە لە ئارەزووی پاراستنی ئەو دۆستایەتییەی لەگەڵ عیراقدا هەیەتی یەکیەتی سۆڤیەت هەمان کات، بەڵام هەر بە قسە، پشتگیریی نەتەوەپەرستیی عەرەب دەکات... [١٢٢] و حەز ناکات پەنا بەرێتە بەر فشار بۆ

---

[١٢٢] لێرەدا ئەم ڕستەیە لە نێوان دوو کەوانی گەورەدا هاتووە کە واتای ڕوون نییە و بەر لە منیش کەسانی دیکە کە هەمان بەڵگەنامەیان خوێندۆتەوە بە قەڵەمی ڕەش پرسگەیەکیان لە لاوە داناوە:

دامەزراندنی کوردستانێکی یەکگرتوو، لە هەمان کاتیشدا ئیدیعا بکات کە ئەو پشتگیریی نەتەوەپەرستیی عەرەب دەکات.

(د) سروشتی گوندایەتی و پەرش و بڵاوی و دژایەتیی کورد کارێکی ئەوتۆیان کردووە، هیچ نەبێ بەم زووانە نەتوانن یەکیەتییەکی سیاسی پێکەوەبنێن[١٢٣].

(ه) هەرچۆن بێ[١٢٤] کوردی سووریا و یەکیەتی سۆڤیەتیش هۆکارێکن دەتوانن بە شێوازێکی دیکە بێنە دەست)[١٢٥].

بەشی سیازدەمینی هەمان فایل بریتییە لە ڕاپۆرتێکی چڕوپڕی باڵوێزی بەریتانی کە لە بەغداوە ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن و پاشکۆیەك و لێدوانێکی ڕۆژنامەی «سکۆتسمان»ی بەریتانی دەربارەی گەڕانەوەی بارزانییەکان و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی هەر سێکیانە:

(لە،
باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،
بەغدا،
نهێنی،
ژمارە ١٠١١/١٤/٥٩،

---

(with the long term possibility of some king of Arab unity)?

(١٢٣) دەقی ئەو خاڵە بە ئینگلیزی بەم جۆرە داڕێژراوە:

(d)The rural, scattered and inchoesive nature of the Kurdish population makes it, at least for the time being, unlikely that they could become a political unity.

(١٢٤) ئەم خاڵە بە دەستخەت نووسراوە و ئەمەیش دەقەکەیەتی:

(e) the kurds in syria and in the USSR are also factors, which could, however, work either way.

(125) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, No. E1821, Kurds.

٣٠ی مایسی ١٩٥٩،

بۆ:

بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

س. دەبل یو. ١،

بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست،

١- هەروەك چۆن لە برووسکەی ژمارە پەنجاو سێی حەڤدەی نیساندا هاتووە کەشتیی سۆڤیەتی «جۆرجیا» ڕۆژی شازدەی نیسان ئەو کوردە بارزانییانەی گەیاندەوە کە لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە گەڕاونەوە، وەك لە ڕاپۆرتی هەواڵەکانی ڕووسیادا هاتووە کەشتیی «جۆرجیا» ڕۆژی دووی نیسان لە بەندەری ئۆدێساوە کەوتە ڕێ و ٨٢٠ کوردی پێ بوو «٤٦٠ پیاو و ١٠٨ ئافرەت و ٢٥٢ منداڵ» و سێ ئەندامی خاچی سووری سۆڤیەتیشیان لەگەڵدا بوو.

٢- شیوعییەکانی بەسرە زۆر بە گەرمی پێشوازی ئەو کوردانەیان کرد، ئەو شیوعییانە لە نزیك بازاڕی شارەوە لە هەموو ڕوویەکەوە دڵنیا کران، هاوپێچیش لەگەڵ ئەم نامەیەماندا وەرگێڕانی هەستی ئەو بارزانییانەتان بەو بۆنەیەوە پێشکەش دەکەین:

مەلا مستەفا بۆ خۆی ڕۆژێك لەوەوبەر لە بەغداوە گەیشتە بەسرە و زۆر بە گەرمی خەڵکەکە پێشوازییان لێی کرد و بە قەراغ شەتولعەرەبدا چووە خوڕەمشەهر بۆ پێشوازیی کەشتیی «جۆرجیا»، ئەو بەلەمەی بارزانیی سواری بوبو لە لایەن ژمارەیەك کەشتییەوە دەپارێزرا و لەوسەریشەوە دوو کەشتیی دیکەی هێزی دەریایی «عیراقی-ك.م.ش» خرانە تەکی.

٣- لیژنەی پێشوازیی کوردەکان لە وێستگەی شەمەندەفەری بەسرەوە

چاوەڕوان بوون و نوێنەرێکی «حیزبی شیوعیی عیراقی لە بەغداوە»[١٢٦] بە ناوی حەمزە سەلمانەوە لەگەڵدا بوو کە بەر لەوە ئێمە ناویمان نەبیستبوو، ئەو و مەلا مستەفا وتاری بەخێرهاتنیان پێشکەش کرد و تێیدا سوپاسی هەستی یەکیەتیی سۆڤیەتیان بەرانبەر بە کورد کرد، وێڕای ئەوە هەمزە عەبدوڵلایش وتارێکی بەناوی «پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان»ەوە خوێندەوە.

٤- شەمەندەفەرێکی تایبەتی ئەو کوردانەی گەیاندە بەغدا و دوای تەنها دوو سەعات حەوانەوە بەرەو هەولێر کەوتنە ڕێ، بە پێی ڕۆژنامە عەرەبییەکان زۆر بە گەرمی لە هاوینەهەوارەکانی شەقلاوە و سەلاحەددین پێشوازییان لێ کراوە و دوای ئەوەی گەیشتنە باکوور ئیتر هەواڵیان نازانین.

٥- ڕاپۆرتەکانی باڵوێزخانەکانمان لە کابول «ژمارە ١٠٦٢١/ ٥٩»ی شەشی نیسان و لە تاران «ژمارە ٥٩/١٨٢١»ی شازدەی نیسان دەربارەی پێشوازی بارزانییەکان سەرنجڕاکێشن و ئێمە هیچ ئاگادارییەکمان دەربارەی ئەوەی ئەو کوردانە مەشقیان پێ کراوە یان نا نییە، بەڵام لەو بڕوایەداین کە مێشکیان تەواو بە بیر و بۆچوونی مارکسی ئاودراون[١٢٧].

ژمارەیەك لەو گەڕاوانە لە کاتی دیدەنیی ئێزگەی بەغدادا لە گەڵیاندا زۆر بە گەرمی سوپاسی دڵفراوانیی یەکیەتیی سۆڤیەتیان کرد و باسی ئەوەیان کرد چۆن دەرگای قوتابخانە و کۆلێج و کارگەکان لەبەر دەمیاندا ئاواڵە کرابوون.

---

[١٢٦] لەدەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دووجووت کەوانی بچووکەوە.

[١٢٧] پێم وایە ئەو بۆچوونە ورد نییە، دووان لەو بارزانییانەی لە سۆڤیەتەوە گەڕابوونەوە، دوکتۆر سەعید بارزانی و خوالێخۆشبوو دوکتۆر حسەین فەقێ ئەحمەد بارزانیم لە نزیکەوە دەناسی و نامەی دوکتۆرای هەردووکیانم بە ڕووسی خوێندۆتەوەو بە ئەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم هەردووکیان بەر لە هەر شت بارزانی و کورد بوون.

٦– ڕۆژنامــە عیراقییــەکان و ئیزگــەی بەغــدا زۆر بــە تونــدی بەرپەرچــی درۆکانی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوویان دایەوە دەربارەی ئەوەی گوایە «ئەو بارزانییانە لـە یەکیـەتی سـۆڤیەت بـە تایبـەتی–ک.م.» مەشـقیان پـێ کـراوە تاوەکو ببنە بەشێك لە سوپای شیوعیی لـە عـیراق و وا هـاوپێچ لەگـەڵ ئـەم نامەیەماندا دەقی لێدوانی تاستان دەربارەی ئەم بابەتە بۆ دەنێرین کە ڕۆژی یـازدەی نیسـان ڕۆژنامــەکانی بەغـدا بڵاویـان کردۆتـەوە. هـەروەك کۆنسـوڵی گشتیی «بەریتانی–ک.م.» لە بەسرە ئاگـاداری کـردین پێشـوازیی ڕووسـەکان لەو کوردانە یەکجار لەوە گـەرمتر بـوو وەك لـەوەی «هـەواڵنێرەکانی–ک.م.» کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو باسیان کردبوو.

بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە هەریـەك لـە ئەنقەرە و بێرووت و کابوول و مۆسکۆ و تاران.

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز

ئیمزا) [١٢٨].

دوا بــەدوای ئەمــە لــە هــەمان بەشــی یــازدەمینی هــەمان فایلــدا ئــەم بەیاننامەیە هەڵگیراوە کە ڕۆژنامەی «المنار»ی ڕۆژی شازدەی نیسـانی سـاڵی ١٩٥٩ بە بۆنەی گەڕانەوەی بارزانییەکانەوە بڵاوی کردۆتەوە:

وەرگێڕان لە ڕۆژنامەی «المنار»ی شازدەی نیسانی ١٩٥٩وە،

(بانگەوازی لیژنەی پێوەندیی ڕێکخراوە دیموکراسی و کۆمەڵایەتییـەکانی بەسرە.

---

[128] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, From: British Embassy, Baghdad, Confidential, No. 1011/14/59, April 30,1959, To: Eastern Deparment, Foreign Office, London.S.W.1.

سـبەینێ ژمارەیـەك لـە بـرا کوردەکـانی بـاکوور دەگەنـە شـارە قارەمانەکەمان، ئەو برایانەی دژی ڕژێمی زۆرداریی ڕژێمی ڕووخـاو خـەباتیان کرد و ناچار بوون لە تاو تیرۆری ڕەشی ئەو ڕۆژگارە عیراقـی خۆشەویستمان جێ بهێڵن و پەنا بەرنە بەر یەکیەتی سۆڤیەتیی گەورە دۆستی گەلەکەمان.

ئـەی کۆمـەلانی خـەڵك!، داواتـان لـێ دەکـەین بـە گـەرمی پێشـوازیی هەڵۆکانی باکوور، هەڵۆکانی چیا سەرکەشەکان و قارەمانانی شۆڕشی بارزانی گەورە بکەن، ئەوانە دەگەڕێنـەوە بۆ ئـەوەی درێـژە بـە خـەباتیان بـدەن لـە پێناو پاراستنی کۆمارە دیموکراسییەکەماندا، کۆماری عەرەب و کورد.

هەر بژی قارەمانی ئاشتیی یەکیەتی سۆڤیەتیی گەورە.

هەر بژی برایەتیی کورد و عەرەب.

هەربژی کۆمارە دیموکراسییە پاڵەوانەکەمان.

هەر بژی سەرۆکی عەرەب و کورد عەبدولکەریم قاسم) [١٢٩].

لـە هـەمان لاپـەڕەدا ئـەم بەیاننامەیـەی ڕۆژنامـەی «البصـرة»ی ڕۆژی شازدەی نیسانی ساڵی ١٩٥٩ دەربارەی هەمان بابەت هەڵگێراوە:

وەرگێران لە ڕۆژنامەی «البصرة»ی شازدەی نیسانی ١٩٥٩وە،

(بانگەوازی لیژنەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی بەقاڵەکانی بەسرە.

ئەی کۆمەلانی خەڵکی تێکۆشەر لە پێناوی ئازادی و دیموکراسیدا!

ئەی ڕۆڵەکانی بەندەری کۆمارەکەمان.

لـەم ڕۆژانـەدا بـرا هاوخەباتـەکانمان، براکانمـان لـە کـۆڕی پاراسـتنی دەسـتکەوتەکانی شۆڕشـی چـواردەی گەلاوێـژدا، ئـەو برایانـەمان کـە ڕژێمـی پاشایی ڕووخاوی نۆکەری ئیمپریالیزم زوڵمی لێ کردن و ناچـاری کـردن پـەنا بەرنە بەر یەکیەتی سـۆڤیەتیی دۆسـتی گـەورەی گەلەکـەمان، دەگەڕێنـەوە، بەڵێ وا دەگەڕێنەوە عیراقی نیشتیمانیان دوای ئەوەی خۆری ئازادی بە هـۆی شۆڕشی گەل و سوپاوە بە سەرکردایەتیی ڕۆڵەی گەل عەبدولکەریم قاسمەوە ڕۆژی چواردەی گەلاوێژ هەڵهات، ئەی جـەماوەری بـە شـەرەف! پێمـان وایـە

---

(129) Ibid, Translation From "Al-Manar "of April, 16,1959.

پێویستی سەر شانمانە لە پێشوازیی کوردە بارزانییە تێکۆشەرە دڵسۆزەکاندا بەشدار بین و ئێمە بەش بە حاڵی خۆمان بڕیارمان داوە دووکان و شوێنەکانی کارمان لە ڕۆژی هاتنەوەیاندا دابخەین بۆ ئەوەی بچینە پێشوازییان، بۆیەکا تکاتان لێ دەکەین چیتان پێویستە لە میوە و سەوزە بەر لەو ڕۆژە کە جاڕ دەدرێ بیانکڕن.

هەربژی برایەتی عەرەب و کورد.

هەر بژی کۆماری عیراق، کۆماری کورد و عەرەب.

هەر بژی ڕۆڵەی بە شەرەفی گەلەکەمان عەبدولکەریم قاسم) (١٣٠).

لاپەڕەی داهاتووی بەشی سیازدەمینی هەمان فایل بۆ ئەم ڕاگەیاندنەی (حیزبی شیوعیی عیراقی – لقی بەسرە) دەربارەی هەمان بابەت تەرخان کراوە:

ئەو ڕاگەیاندنەی لیژنەی ناوچەیی حیزبی شیوعیی عیراقی ڕۆژی پازدەی نیسان لە بازاڕی بەسرە بڵاوی کردۆتەوە دەڵێ:

(بەخێر بێنەوە برا قارەمانە بارزانییەکانمان.

لە ماوەی دوو ڕۆژی داهاتوودا برا بارزانییەکانمان دەگەڕێنەوە دوای ئەوەی پتر لە دە ساڵ دوور لە وڵات و وەك میوانی یەکیەتی سۆڤیەت بردە سەر، کە لەو ماوە دوور و درێژەدا داڵدەی سەدەهایانی دا بە شێوازێك وەك لە وڵاتی خۆیان بن.

بزووتنەوەی بارزانییەکان ئەڵقەیەك بوو لە زنجیرەی خەباتی گەلی عیراقیدا دژی داگیرکەرە ئیمپریالییەکان و نۆکەرە دڕندەکانیان کە بوونە بارێکی گران لە ئەستۆی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازاندا. ئیمپریالییەکان و نۆکەرەکانیان دڕندانە بەربوونە گیانی گەورە و بچووك و منداڵ و ئافرەتی برا بارزانییەکانمان و ئەوانەیان کە لە مەرگ ڕزگاریان بوو ناچاربوون هەڵبێن و پەنا بەرنە بەر یەکیەتی سۆڤیەت کە تاکە وڵاتی دراوسێ بوو ڕێگەی دانێ

---

(130) Ibid, Translation From (Al-Basra) of April. 16.

بچنه ناو خاکییەوە لە کاتێکدا سوپای هەر یەك لە تورکیا و ئێران و عێراق ڕاووەدوویان دەنان.

شۆڕشی گەلاوێژی سەرکەوتوو هەموو مافێکی بارزانییەکانی گێڕایەوە، بەندەکانی بەردان و دوورخراوەکانیشیانی گێڕایەوە: ئێستایش شۆڕش ئەو کارەی گەیاندە لقە پۆپە بەوەی بڕیاری گەڕانەوەی بارزانییەکانی بۆ وڵاتی خۆیان، بۆ لای براکانیان و گەلەکەیان بە ئەوپەڕی ڕێز و تەقدیرەوە دەرکرد.

لیژنەی ناوچەی حیزبی شیوعیی عیراقی لە کاتێکدا بە ڕێزەوە باسی هەڵوێستی پیاوانەی یەکیەتی سۆڤیەت دەکات بە گەرمیش بەخێرهاتنەوەی بارزانییەکان دەکات و داوا لە جەماوەر و گشت ڕێکخراوەکان دەکات بە خێرهاتنەوەیەکی گەرمی ئەو خەباتگێڕە خۆڕاگرانە بکەن کە سەروماڵیان لە ڕێگەی ئازادیی گەل و نەتەوەدا پێشکەش کرد.

هەر بژی پارتیزانی دیموکراسی عەبدولکەریم قاسم!

هەر بژی یەکیەتی سۆڤیەت- دۆستی دڵسۆزی گشت گەلان!) [١٣١].

دوا بابەتی بەشی شازدەمینی ئەم فایلە بۆ وتارێکی ڕۆژنامەی «سکۆتسمان» تەرخان کراوە، کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(ڕووناکبیریی کورد لە لایەن سۆڤیەتییەکانەوە بەرەو پێش دەبرێ، سکۆتسمان، ٧ی مایسی ١٩٥٩،

دوا بەڵگەی هەوڵە بەردەوامەکانی سۆڤیەتەکان لە بواری بەرەوپێشبردنی ژیانی ڕووناکبیریی کوردی سۆڤیەت لەسەر زاری ڕۆژنامەی «کۆمۆنیست»ی سۆڤیەتییەوە هاتووە کە دەڵێ ئەم کارە بە شێوازێکی تایبەتی لەبەر خاتری کوردی ئەودیو سنووری سۆڤیەتەوە بایەخی پێ دراوە، ئەوانەی زۆربەیان لە تورکیا و سوریا و ئێران و عێراق دەژین، وەرچەرخانی نوێ لەو بوارەدا

(131) Ibid, Pamphlet distibuted in the souk on April 15 by the Local Committee of Iraqi Communist Party in Basra.

بلاوكردنەوەی رۆژنامەی «رێیا تازە»یە لە پەرێڤانی پایتەختی ئەرمەنستانی سۆڤیەتی، وێڕای پەخشی ئیزگەیەك بە زوبانی كوردی، هەروەها بلاوكردنەوەی بەرهەمی نووسەرە كوردەكانی «ئەرمەنستان-ك.م.» یش دیاردەیەكی هیوابەخشە.

پێنج بەرهەمی كۆكراوەی نووسەرە كوردە سۆڤیەتەكان بلاو كراونەتەوە، هەروەها هەولێكی زۆریش دراوە بۆ بلاوكردنەوەی بەرهەمی هونەریی كوردی.... هەمان كات بەرهەمی وێژەیی یەكجار گرنگی نووسەرە كوردەكان بایەخێكی زۆریان پێدراوە.

لەو كۆنفرانسەیشدا كە ئەكادیمیای زانستیی باكۆ لە مانگی مارتدا سازی كرد دوو وتاری دەربارەی «خەباتی كورد لە پێناوی سەربەخۆیی نەتەوەییدا» پێشكەش كران[١٣٢] و ساڵێك لەمەوبەر «دیسانەوە لە باكۆ-ك.م.» ئاهەنگی تێپەربوونی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی پەیمانگای رۆژهەلاتناسیی ئەكادیمیای زانستیی ئازەربایجاندا ساز كرا)[١٣٣].

بەشی چواردەمینی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەكی نهێنیی بالوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی هەلهاتنی بەشێك لە هۆزە كوردە عیراقییەكان بۆ ناو خاكی توركیا كە بەشی هەرە زۆریان، وەك دەلێ، لە ناحەزە دێرینەكانی بارزانییەكانن و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو نامەیەیە:

---

(١٣٢) پێمواية ئەو دوو وتارە لە لایەن خوالێخۆشبووانەوە دوكتۆر رەحیمی برا بچووكی سەیفی قازیی وەزیری جەنگی كۆماری كوردستان و دوكتۆر عەلی گەلاوێژەوە پێشكەش كران، هەردووكیان پەنابەری سیاسی بوون لە یەكیەتی سۆڤیەت و یەكەمیان لەوێ دوكتۆرای لە مێژوودا و دووەمیان دوكتۆرای لە ئابووریدا وەرگرتبوو، هەردووكیشیان دوو ئەندامی چالاكی ئەو دەزگایە بوون لە شاری باكۆ.

(133) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question,Kurdish Culture Development by Soviets-"Scotsman",7 may, 1959.

(نهێنی،

لە:

ئەنقەرەوە:

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

سێر ب. بۆرۆس[١٣٤]،

ژمارە ٦٥٧،

٢٩ی نیسانی ١٩٥٩،

تایبەت:

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٦٥٧ی ڕۆژی بیست و نۆی نیسان،

بەغدا و تاران و ئەم بەشانەی وەزارەت ئاگادار دەکرێن:

بەشی ڕۆژهەلات،

بەشی باشوور،

بەشی ئاگاداریی سیاسی،

بەشی بەڕێوەبردن،

بەشی لێکۆلینەوە،

بەشی نەتەوە یەکگرتووەکان،

---

[١٣٤] سێر بێرنارد ئەلێکسەندەر برۆکاس بۆرۆس — (Sir Bernard Aleexander Brocas Burrows) لە ڕۆژی سێی تەمموزی ساڵی ١٩١٠ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە ڕۆژی پازدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٤وە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، لە ئەفغانستان و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەحرەین کاری کردووە، وێرای ئەوەی چەند ساڵێك سەرۆکی «بەشی ڕۆژهەلات»بووە لە وەزارەت و لە ڕۆژی بیستی تەشرینی دووەمی ١٩٥٩وە کرایە بالوێزی فەوقەلعادەی بەریتانی لە ئەنقەرە. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1961", London, P.147.

بەشی هەواڵەکان،

١- بە پێی ڕاگەیاندنی ئێزگەی بی.بی. سیی ئاڕاستەکراو بۆ ئەورووپا و لە زاری سکرتێری گشتیی وەزارەتی هەندەرانی تورکیاوە لە ڕۆژی بیست و حەوتی نیساندا چەند سەد کەسێك لە هۆزە کوردەکانی عیراق ڕۆژێك لەوەو بەر سنووری تورکیایان بەزاندووە و چوونەتە ناوچەی هەکاری، ناوبراو گوتیشی بە پێی ئەو زانیارییانەی گەیشتوونەتە ئەنقەرە ژمارەی ئەو پەنابەرانە دووسەد تا سێ سەد پیاو دەبن، وێڕای ئافرەت و منداڵ، بەڵام پەڕینەوە هێشتا بەردەوامە.

٢- هەمان کات وەزارەتی هەندەرانی تورکیا ئەوەیشی بە ڕۆژنامەنووسان ڕاگەیاندووە کە ئەو پەنابەرانە دوژمنی هۆزی بارزانن، بەڵام ئێمە نەمانتوانیوە ئەوە بزانین کە بۆخۆیان سەر بە کام هۆزن.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەین وێنەی ئەم نامەیەمان بە شێوازێکی تایبەت بگەیەنێتە بەغدا و تاران، وێڕای ئەو دوو برووسکەیەم کە ژمارەکانیان شەست و حەوت و نەوەد و یەکن)[١٣٥].

بەشی پازدەمینی هەمان فایل بۆ هەمان بابەت تەرخان کراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

ئەنقەرە،

ژمارە ١١/١٨٢٢،

---

[135] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, Confidential,From: Ankara, To: Foreign Office, Cypher/ OTP, Sir B.Burrows, No. 657, April 29,1959, Priority, Distributed to: Eastern Deparment,southern Deparment, Infromation Policy Deparment…., News Deparment.

٦ی مایسی ١٩٥٩،

بۆ:

بەشی باشوور،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

س.دەبل یو. ١،

بەشی باشووری خۆشەویست،

١- تکایە بگەڕێنەوە بۆ برووسکەی ژمارە ٦٥٧ی بیست و نۆی نیسانم دەربارەی هاتنی هۆزە کوردەکانی عیراق بۆ ناو خاکی تورکیا.

٢- بە پێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکان سەید ڕەشیدی[١٣٦] سەرۆکی یەکێك لە هۆزە کوردییەکان بە بەرپرسە تورکەکانی شەمدینانی گوتووە ئەوان هیچ دەرفەتێکیان لە بەردەمدا نەماوەتەوە دوای ئەوەی ڕەهبەری کورد مەلا مستەفای بارزانی هەوڵ دەدات دەست بەسەر باکووری عیراقدا بگرێ، هەمان کات سەید ڕەشید گوتیشی ژمارەیەکی زۆر لە هۆزە کوردەکان دژی بارزانی و ڕژێمی قاسمن و ئەو هۆزانە بە هەموو جۆر درێژە بە خەباتی خۆیان دەدەن بێ ئەوەی گوێ بدەنێ چەندیان لەسەر دەکەوێ. گوتیشی «لە دواڕۆژێکی نزیکدا زۆر لە کوردی عیراق-ك.م.» هەڵدێنە تورکیا.

٣- بەڕێوەبەری گشتیی پاراستنی تورکیا م.گۆتان بە کۆنسوڵی بەریتانی گوتووە ئەو پەنابەرە کوردانە سەر بە هۆزی لۆرانن.[١٣٧] یاریدەری م.گۆتان دەڵێ ژمارەی پەنابەرە کوردەکان لە ٦٥٠ کەس تێپەڕیوە، بەڵام خودی م.گۆتان لەو باوەڕەدایە ژمارەیان ٨٠٠ کەس دەبێ کە بەشێکی زۆر کەمیان لاون، ئەوانی دیکەیان تەمەندار و نەخۆش و ئافرەت و منداڵن،

---

(١٣٦) مەبەستی شێخ ڕەشیدی لۆلانە کە لە دێر زەمانەوە دژی بارزانییەکان بوو.

(١٣٧) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە مەرەکەب خەتێك بە ژێر وشەی (Loran)دا هێنراوە کە وادیارە یەکێك لە کارمەندانی «بەشی باشوور»ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی نەیزانیوە مەبەست لەکام هۆزی ناوچەی بادینانە.

بەرپرسانی تورك ئێستا هەر ئەوەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان کە پەناگە و خواردەمەنی بدەنە ئەو پەنابەرانە، بە لای م. گۆتانەوە ژمارەی ئەو هۆزانەی دژی بارزانییەکانن خۆی لە پازدە هەزار کەس دەدات و چالاکییەکانیان بەردەوامن لە بەرهەڵستیی بارزانییەکاندا.

٤- بە پێی قسەی سەرۆکی بەشی ڕاگەیاندنی وەزارەتی هەندەران باڵوێزی تورکیا لە بەغدا ڕۆژی بیست و نۆی نیسان زیارەتی قاسمی کردووە بۆ ئەوەی بە فەرمی هەواڵی ئەو پەنابەرە کوردانەی پێ ڕابگەیێنێ. هەمان کات وەزارەتی هەندەرانی تورکیا باڵوێزی عیراقی لە ئەنقەرە دەربارەی هەمان بابەت ئاگادار کردووە. باڵوێزی تورکی لە بەغدا لە لایەن حوکمەتەکەیەوە ڕاسپێردراوە کە پەنابەرە کوردەکان دژی سیاسەتی سەر بە سۆڤیەتیی حوکمەتی عیراقن، بەڵام هیچ ڕاگەیاندنێکی فەرمیی وەزارەتی هەندەرانی عیراقیی دەربارەی ئەو بابەتە نییە.

٥- ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە بەغدا و تاران.

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز

ئیمزا) [١٣٨].

بەشی شازدەمینی هەمان فایل بۆ بەیاننامەیەکی لیژنەی ناوەندیی «پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عیراق»ی ڕۆژی پێنجی مایسی ساڵی ١٩٥٩ تەرخان کراوە. سەرەتا باڵوێزی بەریتانی بەم جۆرەی لای

---

(138) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, Confidential,From: British Embassy, Ankara, No. 1822/11, May 6,1959, To :Southern Deparment, Foreign Office, London, S.W.1.

خوارەوە «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی ئەو بەیاننامەیە ئاگادار دەکات:

(لە:
باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،
بەغدا،
ژمارە ۱۰۱۲۹/۱/۵۹،
۱٤ی مایسی ۱۹۵۹،
بۆ:
بەشی ڕۆژهەڵات،
وەزارەتی هەندەران،
بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست،

۱- وا هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەماندا دەقی «وەرگێڕانی -ك.م.» بەیاننامەیەکی «پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان»تان بۆ دەنێرم، هیچ شتێکی چاوەڕوان نەکراو لەو بەیاننامەیەدا نییە کە پشتگیریی پارتی بۆ سیاسەتی حوکمەتی عێراق و بیرۆکەی یەکیەتیی نێوان عەرەب و کورد دەردەبڕێ. هەروەها «پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان» لە بەیاننامەکەیدا ئاماژە بۆ پێوەندیی دۆستانەی خۆی لەگەڵ حیزبی شیوعیی عێراقی و حیزبی نیشتیمانی دیموکراسی - الحزب الوطني الديمقراطي دەکات.

۲- ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیە و هاوپێچەکەی دەنێرین بۆ هەر یەك لە باڵوێزخانەکانمان لە ئەنقەرە و تاران.

هەمیشە دڵسۆزتان
باڵوێز
ئیمزا) [۱۳۹].

[139] Ibid, From British Embassy, Baghdad, No. 10129/1/59. May 14, 1959, To: Eastern Deparment, Foreign Office, London, S.W.1.

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی بەیاننامەکەی پارتییە لە ئینگلیزییەوە:

لە ڕۆژنامەی «الأهالی»یەوە،

٧ی مایسی ١٩٥٩،

بەیاننامەی «پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان»ە لە عیراق کە پێمان گەیشتووە:

(لەو ڕۆژەوەی بەشی سیاسیی پارتی لە ڕۆژی حەڤدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٩دا بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە گەلێك ڕووداو و وەرچەرخانی گرنگ ڕوویان داوە کە گشتیان بوونە هۆی پتەوکردنی سیاسەتی دیموکراسیی کۆمارەکەمان چ لە بواری ئابووری و چ لە بواری کۆمەڵایەتیدا، یەکێك لەو ڕووداوانە پیلانەکەی شەواف بوو، ئەوەی یەکیەتیی عەرەب و کورد و کەمینەکانی دژی دوژمنانی کۆمار و ڕەهبەریی ڕۆڵەی گەل عەبدولکەریم قاسمی نیشان دا و لە لایەکی دیکەشەوە پێوەندیی نێوان ئیمپریالیزم و فەرمانڕەوایانی عەرەب و کۆنەپەرستانی عیراق لە دەرەبەگان و هەتیوەکانی ڕژێمی پاشایی و بەعسییەکان و ئەوانی دیکەی وەك پەیمانی بەغدای گۆڕبەگۆڕ دەرخست، هەمان کات پتەوکردنی پێوەندییە ئابووری و ڕووناکبیرییەکان لەگەڵ وڵاتە سۆشیالیزمەکان و لە سەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتدا و خاوێنکردنەوەی دەزگاکانی میری لە کارمەندە بەدفەڕەکانی و بڵاوکردنەوەی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ و دامەزراندنی بەرگری میللی «المقاومة الشعبية» لە گشت پارچەکانی وڵاتدا و دانی ئازادی بە نەقابە و پارتە دیموکراسییەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و پێشکەشکردنی خائینان و پیلانگێڕەکان بە دادگا و پشتگرتنی ئەو نەتەوە عەرەبانەی خەبات بۆ ڕزگاری دەکەن و دانانی وەزیرە نوێکان هەر هەموویان نیشانەی ئەو ڕووداو و وەرچەرخانە گرنگانەن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەی سەرەوەدا کۆمیتەی ناوەندیی پارتی هەست بە پێویستیی داڕشتنی سیاسەتێك دەکات کە بۆ تێگەیشتنی ئەم ئاڵوگۆڕانە چ

بۆ ئیمڕۆکە و چ بۆ دوارۆژ پێویستە. هەروەك چۆن لە کۆبوونەوەی ڕابردووی کۆمیتەی ناوەندیدا ئاماژەمان پێی داوە ئێستا کاتی ئەوە نییە چاو بە بەشێك لەم وەرچەرخان و ئاڵوگۆڕانەدا بخشێنینەوە، بەلاّم بەشێکیان پێویستییان بە چاککردن یان گۆڕین هەیە بۆ ئەوەی ڕەوڕەوەی بەرەوپێشچوونی شۆڕش خێراتر بکەین.

یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی پارتی لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنییەوە بریتییە لە خەباتی بێ وچان لە پێناو دامەزراندنی حوکمەتێکی عێراقیی دیموکراسیدا، لە ماوەی سیازدە ساڵی ڕابردوودا تاوەکو بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ حیزبەکەمان خەباتی بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئاواتە کردووە. پارتییەکەمان یەکێك بوو لە باڵەکانی بزووتنەوەی نیشتیمانیی عێراقی چونکە گشت پارتییە دیموکراسیخوازەکان و سەرجەمی گەلی عێراق هەمان ئامانجیان هەبوو — دامەزراندنی کۆمارێکی دیموکراسی.

مستەفا بارزانیی تێکۆشەری گەورە لە وتارە بەناوبانگەکەی ئابی ساڵی ١٩٤٦یدا کە تێیدا پیرۆزبایی لەو پارتییە دیموکراسییە نوێیانە کرد کە بۆ وەدیهێنانی ئەم ئاواتە تێدەکۆشن، گوتی:

«من هەرگیز دژی گەلی عێراق نەجەنگیوم و نە دەجەنگم، چونکە من بۆخۆم یەکێکم وەك ئەوان، بەلاّم من هەمیشە و ئێمە هەمیشە دەبێ دژی ئیمپریالیزم و ئەو کۆنەپەرستە نەفامانەی هاریکارییان لەگەڵدا دەکەن و خوێنی نەتەوەکەم دەڕێژن و شەرەفی نیشتیمانەکەم دەخەنە ژێر پێیانەوە بین».

کاتێك پارتی کوردستانی کردە مەڵبەندی چالاکی و خەباتی تەنها داوای ئەوەی کرد پشتی گەلەکەمان بگیرێ و هەموومان پێکڕا لەگەڵ عەرەب و کەمینەکاندا بچینە کۆڕی خەباتەوە بۆ وەدیهێنانی ئازادی و دیموکراسیی گەلی عێراق و پاراستنیان لە ئیمپریالییەکان و کۆنەپەرستان و هەڵگرانی بیر و بۆچوونی نەتەوەپەرستیی دوژمنکاری و ئینعیزالی. پارتیمان هەمیشە خەباتی کردووە و دەیکات دژی ئیمپریالیزم و هێزە کۆنەپەرستەکان و

دەرەبەگایەتی، ئەو هەمیشە بەرگری کردووە و بەرگری دەکات لە بەرژەوەندییەکانی سەرجەمی گەلی عیراق بێ هیچ جۆرە جیاوازییەك و بەرگریش دەکات لەو بەشانەی کۆمەڵ کە دوژمنی ئیمپریالیزم و دەرەبەگایەتین.

کاتێك پارتییەکەمان لە کوردستان کار دەکات هەمیشە ئەوەی لە یادە شۆڕش چیی کردووە و چ لە حوکمەتە دیموکراسییەکەمان بە ڕەهبەریی عەبدولکەریم قاسم لە بواری مافە نەتەوەییەکانیدا چاوەڕوانە و پشتیشی بەو برایەتییە پتەوەی هەردووك نەتەوەی برا بەهێزە کە دەست لە ناودەست بەرەوپێش دەڕۆن لە پێناوی وەدیهێنانی ئامانجە دیموکراسییەکاندا و بۆ پشتگیریی سەربەخۆیی کۆمار و پاراستنی گشت دەستکەوتە ئابووری و ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتییەکانمان. پارتییەکەمان بە هەموو توانایەوە پشتی خەباتی نەتەوەی عەرەب لە پێناوی وەدیهێنانی ئازادی و دیموکراسیدا دەگرێ. پارتییەکەمان پرسی کوردی عیراق بە بەشێك لە پرسی خودی عیراق دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ دادەنێ و ئەو پێشکەوتنانەی دوای ئەوە دێنە دی دەبنە هۆی وەرچەرخانێکی سەرەکیی بنەمای ئەو برایەتییەی عەرەب و کوردی عیراق پێکەوە دەبەستێ. ئێستا عەرەب و کورد یەك ئامانجیان هەیە و پێوەندییەکانی نێوانیان لەسەر بنچینەیەکی ئازادی و یەکسانی بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و ڕژێمێکی دیموکراسیی پتەو داڕێژراون، بۆیەکا هەر حیزبێکی کوردی دوژمنایەتی عەرەب بکات و دژی ئازادیی عەرەب بێ هەمان کات دوژمنی گەلی کورد و ئازادیی نەتەوەیی گەلی کوردە، ئەو کوردانەی ئێستا دوورەپەرێز وەستاون دوژمنن، کۆنەپەرستانی کورد کە دژی دیموکراسین خراپترین دوژمنی گەلی کورد و پارتیمانن.

پارتی دیموکراتی یەکگرتوو پێوەندیی زۆر دۆستانەی لەگەڵ هەردوو حیزبی شیوعیی «عیراقی —ك.م.» و حیزبی نیشتیمانی دیموکراسی و هەموو ڕێکخراوە دیموکراسییەکانی دیکەدا هەیە و گشت ناکۆکییەکانیان بە هەستێکی برایەتی چارەسەر دەکەن. پارتیمان دڵسۆزانە پشتگیری لە بەرەی

نیشتیمانی – دیموکراسیی هێزە عێراقییەکان دەکات. بە پشتیوانیی ئەم بۆچوونە پارتی هەوڵ بۆ یەکگرتنی ڕێکخراوە دیموکراسییەکان و نەقابە عێراقییەکان دەدات و دژی گشت هەوڵێك بۆ وەدی نەهێنانی ئەو یەکگرتنە دەوەستێ، چەکی پارتیمان بۆ خزمەتی بەرژەوەندییەکانی گەلی عێراقە، بۆ پاراستنی کۆمارە دیموکراسییەکەمان و دەستکەوتەکانی و پشتگیریی ئاواتە دیموکراسییەکانییە بە سەرکردایەتیی ڕۆڵەی گەل عەبدولکەریم قاسم.

کۆمیتەی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان لە عێراق، ڕۆژی پێنجی مایسی ساڵی ١٩٥٩) [١٤٠].

بەشی حەڤدەمینی هەمان فایل دیسانەوە بۆ بابەتی پەنابەرە کوردەکانی عێراق تەرخان کراوە، بەڵام ئەمجارەیان بۆ ناو خاکی ئێران، لەم بەشەیشدا تەنها یەك بەڵگەنامە هەڵگیراوە کە بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزی بەریتانی لە تاران بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە: تارانەوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

لە:

سێر گ. هاریسۆنەوە[١٤١]،

---

(140) Ibid, Ahali, May 7,1959, The Declaration of the United Democratic Party of Kurdistan in Iarq.

(١٤١) سێر جیوفری وێدگوود هاریسۆن (Sir Geoffrey Wedgwood Harrison) ناوبراو ڕۆژی هەژدەی تەمموزی ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، زوبانی یابانیی زانیوە، لە ڕۆژی بیست و یەکی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ەوە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و وێڕای بارەگای وەزارەت لە لەندەن لە گەلێك وڵاتی وەك ئەڵەمانیا و یابان و بەلجیکا و یەکیەتی سۆڤیەت و ئەرجەنتین کاری کردووە و لە ڕۆژی سێی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ەوە بووەتە باڵوێزی فەوقەلعادەی بەریتانی لە تاران. بڕوانە:

ژماره ٤٩٨،

٢٣ی مایسی ١٩٥٩،

تایبەت،

نهێنی.

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٤٩٨ی بیست و سێی مایسی وەزارەتی هەندەران،

١- برووسکەی ژمارە ٨٢١تان دەربارەی پەنابەرە کوردەکان.

جێگری وەزیری هەندەران ئێمرۆکە بەیانی داوای کردم بۆ باسی کێشەی کورد. ئەو گوتی چەند سەد کەسێك لە پەنابەری عیراقی ئێستا وان لە کوردستانی «ئێران-ك.م.» و دوور لە هەر شت ئەوانە لە بارێکی کارگێڕیی یەکجار قورسن و لە چەند مانگی داهاتوویشدا ژمارەیان زۆرتر دەبێ، هەر بۆ نموونە گوتی هەمووی یەك - دوو ڕۆژ لەمەوبەر سەرەك هۆزێکی کورد بۆخۆی هاتە تاران بۆ ئەوەی ڕێگەی پێ بدرێ گشت هۆزەکەی لە عیراقەوە بگوازێتەوە ئێران، کێشەیش لەوەدایە ئایا «ئێرانییەکان-ك.م.» دەتوانن بە یەکجاری سنوور دابخەن و پەنابەری سیاسیی وەرنەگرن، ئەو دەربارەی ئەو بابەتە سەرنجی منی ویست.

٢- پێم گوت میستەر حیکمەت[١٤٢] باسی ئەم کێشەیەی لە لەندەن کردووە. من ئاگاداری ئەوەیشم کە حوکمەتی عیراقی یەکجار گومان لەوەیش دەکات دراوسێکانی ئەو جۆرە پەنابەرانە دژی بەکار بێنن. لە لەندەن بە توندی لەو بڕوایەدان هیچ ناکرێ بۆ شێواندنی بارودۆخی ئەو ناوچەیە، هەرچەندە سیاسەتی تەقلیدیی ئێران دڵکراوەییە، لەگەڵ هەموو کوردێکدا و

---

The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1959, London,P.235.

[١٤٢] دیارە ئەو میستەر حیکمەتە باڵوێزی ئێران بووە لە لەندەن، هیچم دەربارەی ژیانی دەست نەکەوت.

لایەنی مرۆڤایەتیش لەبەرچاو دەگرێ، بەڵام وا بزانم لە گۆشەنیگای سیاسی و عەمەلییەوە وەها باشە ڕاوێژی ئێران بکرێ هەوڵ بدات چەند دەتوانێ هێند ژمارەی ئەو پەنابەرانە کەم بن.

٣- دوکتۆر سەدر[١٤٣]گوتی ئەویش دەربارەی هەمان بابەت پێوەندیی بە باڵوێزانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و تورکیاوە کردووە و ئەو مەسەلەیە پتر دەرس دەکەن دوای گەڕانەوەی میستەر حیکمەت «بۆ تاران- ك.م.» لە هەفتەی داهاتوودا. تکایە بە برووسکە ئاگادارم بکەن ئەگەر لەم بارەیەوە هیچی ترتان لە بەندە دەوێ.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم نامەیەم بنێرێ بۆ هەریەك لە باڵوێزخانەکانمان لە ئەنقەرە و بەغدا و کەراچی و واشنتۆن و هەروەها ئەم برووسکانەیشمان بۆ بنێرن- ژمارە ١٠٨ و ٤٣ و ٢٧ و ٣٨ و ٥١)[١٤٤].

بەشی هەژدەهەمینی هەمان فایل کە هەمان کات دوا بەشیشە لە هەر حەڤدە بەشەکەی دیکەی ناو هەمان فایل گەورەترە و بریتییە لە سیازدە لاپەڕە و هەر هەموویان بۆ باسی کوردی ئێران تەرخان کراون. لاپەڕەی یەکەمی بریتییە لە ڕاپۆرتێکی چڕوپڕی شەش خاڵی کە بە چاپکراوی هەردووك دیوی لاپەڕەکەی گرتۆتەوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

---

(١٤٣) مەبەست موحسینی سەدر «صدر الأشرف»ە، سیاسییەکی زۆر کۆنەپەرست و لاواز بووە، فەرمان فەرمای باپیری یەکێك لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی مەشرووتە «شۆڕشی دەستووریی ١٩٠٥- ١٩١١» بووەو لە دواقۆناغی ڕژێمی قاجاریدا وەزیری هەندەران بوو و سەرۆکی ئەو دادگایە بووە کە دادگایی ڕەهبەرانی مەشرووتەی کردووە، بۆیەکا نیشتیمانپەروەرانی ئێران نازناوی خوێنرێژ «جەلاد»یان بۆی هەڵبژاردووە، هەرچی سەدریشە ساڵی ١٩٤٥ بۆ ماوەیەکی کورت بووە سەرەك وەزیران و ساڵی ١٩٥٧ بووە سەرۆکی ئەنجوومەنی پیران و ساڵی ١٩٦٢یش کۆچی دوایی کرد.

(144) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, subject: Kurdish Question, From: Tehran To: Foreign Office, Cypher/ OTP, Sir G.Harrison, No. 498, May 23, 1959, Priority, Confidential.

(بەشی ڕۆژ هەڵات،

بابەت:

وتووێـژ لەگـەڵ میسـتـەر سـەنەندەجیدا[145] دەربـارەی ئـەو کوردانـەی «عیراق—ك.م.» کە دەچنە ئێران،

تێبینی،

لە:

میستەر کێلاسەوە[146]،

تاران.

١– پێویستە ئەم نامەیە لەگەڵ برووسکەی بەغدای ژمارە ٥٠٧ «أی کیـو ٥/١٠٢١» و لەگەڵ برووسکە پێوەندیدارەکانی تارانی ژمارە بیست و یەك «أی کیـو ٦/١٠٢٦» و برووسـکەی تـارانی ژمـارە ٤٨٩ «أی کیـو ٢٩/١٨٢١» و پـەرەگرافی دووەم و شەشـەمی برووسـکەی ئەنقـەرەی ژمـارە ٥٧«أی کیـو ٣١/١٠٧١»دا بخوێنرێتەوە.

---

[145] لە گشت بوارەکانـدا شـاری سـنە و دەوروبـەری هەمیشـە یـەکێك لـە پێشـەنگە دیارەکانی کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات بـوو، گـەورەپیاوی هەڵکـەوتووی لـە بـواری سیاسـیەت و ئـەدەب و مێـژوودا تێـدا هەڵکـەوتووە، ئـەردەڵانی و موشـیری و سـەنەندەجی لـە خانـەوادە هـەرە بەناوبانگـەکانی سـنەن و سـەنەندەجی لـە دەزگـای محەمـەد ڕەزا شـای پەهلەویـدا جێگـەی ئیعتیبار بوو.

[146] ئارثـەر ڕۆی هاندەسـاید کێلاس (Arthur Roy Handasyde Kellass) ڕۆژی شەشـی مایسی ساڵی ١٩١٥ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لـە ڕۆژی بیسـتی ئـەیلوولی ساڵی ١٩٣٩وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، زوبانی فارسی باش دەزانـی و بۆ یەکەم جار ڕۆژی بیستی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٤ لە باڵوێزخانەی بـەریتانی لـە تـاران بـووە سکرتێری دووەم، وێڕای بارەگای وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە بەغدا و قاهیرەیش کـاری کـردووەو لـە ڕۆژی هـەژدەی تـەمموزی سـاڵی ١٩٥٨ وە بووەتـە کۆنسـوڵی ڕۆژهـەڵاتی لەباڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران، بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1961", London, P.363.

٢- گومانێکی کەم لەوە دەکرێ کە کوردی عیراق و بە ڕادەیەکی کەمتر کوردی تورکیا ئێستاکە لە بارودۆخێکی نائارامدا بن، هەرچۆن بێ بەندە وێڕای ئەوە وەهای بۆ دەچم مەترسیی ئەو وەزعە لە واقیعەکەوە نەهاتووە، بەڵکو لە ئەگەری ڕووداننییەوە هاتووە، کورد هەمیشە لە سەنگەری یاخیبووندان، بەشێکی هۆی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خودی سروشتی کورد و بەشێکیشی بۆ ئەو ڕاستییەی کە وا دەچێ بۆ چەند سەدەیەك نیشتیمانی کورد بە هۆی سنووری نێو دەوڵەتییەوە دابەش کراوە. ئەوەندەی من ئاگاداریم میستەر سەنەندەجی هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی بە دەستەوە نییە کاتێك دەڵێ ئێران نیشتیمانی دایکی گشت کوردانە، تەنانەت ئەو ڕۆژگارەیش کە کوردستان تەنها لە ڕێگەی سنوورەوە لە نێوان هەردووك ئیمپراتۆری عوسمانی و ئێرانیدا دابەش کرابوو تورکەکان نەیاندەتوانی کوردەکانی لای دیوی خۆیان دابین بکەن. لەو کاتەیشەوە و دوای پەیدابوونی سنووری تورکیی- عیراقی لەگەڵ تەواوبوونی جەنگی یەکەمیی جیهانیدا حوکمەتی عیراق تاوەکو ڕادەیەکی کەم لە هەڵوێستیدا بەرانبەر بە کورد سەرکەوتوو بوو، لە ساڵی ١٩١٨وە بە لایەنی کەمەوە دوو ڕاپەرینی زۆر گەورەی گشتیی کوردی بەرپا بووە، دووەم جاریان لە ساڵی ١٩٤٦دا سوپای عیراقی دوای دوو ساڵ هێرشبردن و بە یاریدەی سوپای ئێرانی ئینجا توانیی مەلا مستەفای بارزان و لایەنگرانی ڕاوەدوو بنێنە ناو خاکی یەکیەتی سۆڤیەتەوە.

٣- هەرچەندە پیاو دەتوانێ لە هۆیەکانی ئەوە تێبگات کە پێشوازی کردنی حوکمەتی کۆماری عیراقی لە گەڕانەوەی مەلا مستەفا و لایەنگرانی بۆ عیراق لە ساڵی پاردا تەنها لە بەرژەوەندیی ڕووس بوو، بەڵام ئەوە ئیمڕۆ یان سبەی دەبێتە هۆی ئاژاوەنانەوە بۆ خودی عیراقییەکان، هەر چەندە لەوانەیە مەلا مستەفا و لایەنگرانی بەرز ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێ.

پیاوەکانی سۆڤیەت، وێڕای سروشتی ئاژەوەچێتی کورد خۆیان، ئێستاکە بوونەتە هەوێنی پڕۆپاگەندەی نەتەوەپەرستیی کوردی کە لە لایەن مۆسکۆوە گەورەترین کەمینەی عیراق دەبزوێنێ.

٤– ئامانجە نەتەوەییەکانی کورد لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تورکیا و عێراق و ئێران ناگونجێن، چونکە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دەبێتە هۆی لە کیسدانی هەر سێك وڵات بۆ بەشێکی گەورە یان بچووکی خاکیان، ئەمەیش کارێکی ترسناکە بە تایبەتی بۆ عێراق، چونکە کورد یەك دەر پێنج یان دەر شەشی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێك دەهێنن، وێڕای ئەوەی گشت کانە نەوتەکانی مووسڵ دەکەونە کوردستانەوە.

٥– تاوەکو ئێستاکە هەروەك چۆن بێ بۆ خۆم هەستم پێی کردووە، قاسم و حوکمەتەکەی حەز بە پێوەندیی کوردەکان لەگەڵ بەشێك لە عێراقییەکاندا[١٤٧] ناکەن،، هەرچەندە لەمەیشدا شتێك دەستکەوتیان چنگ کەوتووە، وەك پشتگیریی کورد لە دامرکاندنەوەی یاخیبوونەکەی مووسڵدا. ڕاستە لەم چەندانەی دواییدا لە نێوان کورد و پۆلیس و سوپای عێراقیدا هاریکارییەکی وەبەرچاو هەبوو لە ڕاوەدوونانی «دوژمنانی کۆماردا–ك.م.» لە ناوچە دوورەکانی باکووردا، بەڵام کێشەکانی ئەو ناوچە دوورەدەستانە تا ڕادەیەکی زۆر ئەنجامی ناکۆکیی نێوان هۆزەکان و بەرەڵاییانە وەك لەوەی کارێکی دژ بە میری بێ. ڕاستە بەشێك لە پەنابەرە کوردەکانی عێراق چ لە تورکیا و چ لە ئێران لە دەست میری هەڵهاتوون، بەڵام بەشێکی دیکەیان لە تاو فشاری ئەو هۆزانە هەڵهاتوون کە لە هۆزەکانی خۆیان بە هێزترن، یان با بڵێین هۆی سەرەکیی ئاژاوەکانی ئێستای کوردستانی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەونەکردنی یاسا و بەرەڵایی نەك بریتین لە بەربەرەکانێیەکی گشتی دژی میری. سەرباری ئەوە هەتا حوکمەتی سۆڤیەتی پشتی قاسم بگرێ، ناشێ کورد دژی هان بدات و سیاسەتی ئێستای لە کوردستان لەوە بەدەر نییە کە مەنجەڵەکە لەسەر ئاگرێکی کز دابنێ وەك داردەستێکی ئامادە بۆ هەر کاتێك بیانەوێ کێشەی بۆبنێنەوە[١٤٨]. ئێستا سۆڤیەتییەکان دارێکیان

---

[١٤٧] دوور نییە مەبەستی شیوعییەکان بێ.

[١٤٨] ئەم قسانە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە دارێژراون:

بە دەستەوەیە کە هەردووك سەری پیسن، چونکە نە دەتوانن تاوەکو کۆتایی یاری بە کارتی نەتەوەیی کوردەوە بکەن و بەو جۆرە تورکیا و ئێران دژی خۆیان بورووژێنن و هەمان کاتیش لەم لاوە قاسم هێند نەورووژێنن کە زیان بگەیەنێ بە بەرژەوەندییەکانی ئێستایان. لەمەوە دەردەکەوێ کە بەرژەوەندیی زۆر گەورە تورك و فارس و عیراقییەکان توندوتۆڵ پێکەوە دەبەستێتەوە لە کاتی بەرپابوونی هەر ئاژاوەیەك لە کوردستاندا، هەرسێك لایان تاوەکو چ ڕادەیەك پێویست بێ هاریکاریی دەکەن.

٦- لە برگەی دوو و شەشی بروسکەی ژمارە پەنجاو حەوتی «باڵوێزخانەی بەریتانی - ك.م.» لە ئەنقەرە وەها دەردەکەوێ کە تورکەکان ئاگاداری ئەم ڕاستیانەن بۆیەکا ژیرانە لەم بوارەدا ڕەفتاریان کرد و لە نزیکەوە پێوەندییان بە حوکمەتی عیراقەوە کرد. بە داخەوە ئێرانییەکان بەو ڕادەیە سەرکەوتووانە ڕەفتاریان نەکرد. لەو قسانەوە کە میستەر سەنەندەجی بە میستەر کێلاسی گوتوون دیارە ئێرانییەکان تاوەکو ئێستا لە هەوڵەکانیاندا لەگەڵ عیراقییەکاندا سەرکەوتوو نین و بە پێی برگەی بیست و دووی بروسکەی میستەر ڕەسێل [١٤٩] ئێرانییەکان مەسەلەکەیان زۆر بە

"…. So long as the Soviet Government are backing Qasim, it is unlikely that they will wish to provoke the kurds against him, and their current policy in Kurdistan is not likely to go beyond keeping the pot gently simmering, as a rod in pickle for the Iraqi Government if at any time they should wish to proveke difficulties with it".

[١٤٩] بریان هاربرا ئەشفۆرد ڕەسێل (Brian Harborough Ashford Russell) ڕۆژی بیست و سێی ئابی ساڵی ١٩١٤ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، لە ڕۆژی حەقدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٧ەوە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، زوبانی ڕووسیی بە باشی دەزانی، لە نەمسا و یەکیەتی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئیتاڵیا و ئێران کاری کردووە و لە ڕۆژی دووی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ەوە کرایە سەرۆکی «بەشی هەواڵەکان» لە بارەگای وەزارەتی هەندەران لە لەندەن. بڕوانە:

جـدی وەرنـەگرتووە. دوا ڕسـتەی بڕگـەی دووی برووسـکەی ژمـارە ٥٠٧ی «باڵوێزخانەی بەریتانی – ك.م.» لە بەغدا گومان لەوە دەکات کە دوور نییـە ئێسـتا ئێرانییـەکان چـالاکانە خـەریکی نانـەوەی ئـاژاوە بـن لـە کوردسـتان «هەروەها بڕوانە بڕگەی شەشی برووسکەی ژمارە پەنجاو حـەوتی ئەنقـەرە». ئەگەر بە ڕاستی ئێرانییەکان کارێکی وەهایـان کردبـێ ئـەوە سـەرەڕۆییەکی زۆر گەورەیە لەوانـەوە، خـۆ ئەگـەر وایش نـەبێ ئـەوان پێویسـتە بـە جیـدی بڕواننــە بـارودۆخی کوردسـتان، برووسـکەی ژمـارە ٤٩٨ی سـێر جیـۆفری هاریسـۆن دەرفـەتی ئـەوەمان بـۆ دەڕەخسـێنێ بگەڕێینـەوە بـنج و بنـاوانی تۆمەتەکە، بۆیەکا من ڕەشنووسی برووسکەکەتان بۆ دەنێرم.

وێنەی بۆ بەغدا و ئەنقەرە.

ئیمزا

س.م.لێ کۆیسن[١٥٠]،

٢٧ی مایسی ١٩٥٩[١٥١]،

دوا بە دوای ئەم نامەیە نامەیەکی دیکەی کونسوڵی ڕۆژهەلاتی گشتیی لە باڵوێزخانەی بەریتانی لە تـاران ئـارثـەر کێلاسـەوە دەربـارەی هـەمان بابـەت هەڵگیراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

باڵوێزخانەی بەریتانی،

تاران،

ژمارە ١٠٨١/٥٩گ،

---

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1961", London, P.363.

[١٥٠] ناویم لە لیستی ناوی کارمەندانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لەو ساڵانەدا نەدۆزییەوە.

[151] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, Talk with Mr.Sanandaji on influx of Kurds in to Iran, Minutes From Mr. Kellas, Tehran.

١٢ی مایسی ١٩٥٩،

نهێنی،

تۆماری گفتوگۆ.

١- ئیمڕۆ لە بارەگای وەزارەتی هەندەرانی «ئێرانی - ك.م.» لەگەڵ میستەر سەنەندەجیدا گفتوگۆمان کرد دەربارەی ئەو هەرا و بگرە کوردییەی برووسکەی ژمارە ٥٠٧ی هەشتی مایسی «باڵوێزخانەی بەریتانی - ك.م.» کە لە بەغداوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی «بەریتانی - ك.م. » باسی کردووە.

٢- میستەر سەنەندەجی گوتی: ئەو هیچ شتێکی تایبەتیی ئەوتۆی دەربارەی هاتنی کوردی «عیراق - ك.م.» بۆ ئێران لا نییە، دەوروبەری مانگێك لەمەوبەر و لەوەتەی شۆڕشی عیراق بەرپا بووە نزیکەی چوار سەد کورد سنووریان بڕیوە و دوای ئەوەیش ژمارەیەکی دیکە پەنایان هێناوەتە بەر ئێران. سەنەندەجی ئاگای لەوەیشە دەوروبەری سێ سەد کەس لە هۆزی برادۆست چوونەتە تورکیا «ڕاپۆرتەکانی ڕۆژنامە تورکییەکان زێدەڕۆیی لە ژمارەکاندا دەکەن».

٣- میستەر سەنەندەجی پتر لەوەیش گوتی هەمیشە بە پێی سیاسەتی ئێران، ئێرانی بە نیشتیمانی هەر کوردێك لە سەرانسەری جیهاندا داناوە لەو گۆشەنیگایەوە کە ئێران نیشتیمانی هەموو کوردێکە، بۆیەکا کاربەدەستانی ئێران دەبوو پەنا بدەنە هەر کوردێك بیەوێ بێتە ئێران، لە لایەکی دیکەوە حوکمەتی ئێران بە هیچ جۆر هەنگاوی نەناوە بۆ هاندانی ئاژاوە لە عیراقدا، بەڵکو لە ڕاستیدا لە وەڵامی نامەی ئەو بەگ و خانە کوردانە ناردوویانن بۆ ئێران بە هیچ جۆر هانی نەداون بێنە ئێران، خۆ ئەگەر بەگێکیش بێ پیاوەکانی سنووری بڕیبێ هەمیشە تێی گەیەنراوە کە سەنگی ئەو بە پیاوەکانییەوەیە.

٤- میستەر سەنەندەجی گوتی بە هەر حاڵ ئەو دەتوانێ بە فەرمی دڵنیام بکات کە حوکمەتەکەی هەرگیز نیازی نییە ئاژاوە لە نێو کوردی

عیراقدا بنێتەوە و نایەوێ هیچ جۆرە کێشەیەك بۆ حوکمەتەکەی جەنەڕاڵ قاسم دروست بکات، هەروەها گوتیشی حوکمەتی ئێرانی تەواو هاوبیری حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانییە کە دەبێ یاریدەی حوکمەتی عیراقی دژی دوژمنەکانی بدرێ، تایبەت دژی عەبدولناسر.

٥- بە لای ئەوەوە کێشەکە لەوەدایە چۆن بتواندرێ گومانەکانی قاسم بڕەوێنرێنەوە و حوکمەتی ئێران ئاگاداری ئەوەیە کاتی خۆی وەزیری دارایی عیراقی بە هەر دووك باڵوێزی بەریتانی و ئەمەریکایی لە بەغدا گوتووە کە حوکمەتەکەی گومانی لە نیازەکانی ئێران بەرانبەر کوردستان هەیە. میستەر ئەردەلانی باڵوێزی ئێرانی لە بەغدا لەوە ئاگادار کردووە کە دەبێ هەوڵ بدات بۆ ڕەواندنەوەی ئەو بۆچوونە، وێڕای ئەوەی مولحەقی سەربازیی ئێران هەفتەی ڕابردوو نێردرایەوە بەغدا و فەرمانی درابووێ کە خودی جەنەڕاڵ قاسم لە نیازە خاوێنەکانی ئێران دڵنیا بکات و هەر زانیارییەکی ئیستیخباراتی کە لەوانە بێ یاریدەی عیراق بدات پێشکەشی بکات، بەلام وەك سەنەندەجی گوتی بە داخەوە میستەر ئەردەلان زۆر سەرکەوتوو نەبوو وە کۆلۆنێل مەنسوور پووری «مولحەقی سەربازیی ئێران - ك.م.» نەیتوانی جەنەڕاڵ قاسم بە تەنها ببینێ، چونکە هەمیشە بە دوو سێ ئەفسەر چواردەورە درابوو کە مولحەقی سەربازیی ئێران نەیدەناسین. هەرچی باڵوێزی عیراقیشە لە تاران هیچ کەڵکی نەبوو، چونکە ئێرانییەکان لەو بڕوایەدان کە جێگەی بڕوای حوکمەتی عیراقی نییە.

٦- میستەر سەنەندەجی لەو بڕوایەدایە کە حوکمەتانی بەریتانیا و تورکیا و ئێران لەسەر ئەوە کۆکن کە پێویستە هیچ نەکەن ببێتە هۆی نیگەرانیی ڕژێمەکەی قاسم. بەلام ئەو لە هەڵوێستی ئەمەریکاییەکان وەڕسە، هەرچەندە باڵوێزی بەریتانی لێرە «لە تاران - ك.م.» لەوە دەچێ وەك ئێمە بیر بکاتەوە، بەلام دوا کۆنفرانسی ڕۆژنامەنووسیی میستەر

جێرنـەگان [152] سـەرنجی پێچـەوانەی نوانـد، بۆیـەکا بـاڵوێزی ئەمـەریکی پێشنیازی بۆ میستەر ئەفشار کرد کە کۆنفرانسێکی بالاّ بکرێ بۆ ئەندامانی پـەیمانی بەغـدا بـۆ هەڵسـەنگاندنی بـارودۆخی عـیراق و گەیشـتن بـە یـەك سیاسەت.

٧- میستەر سەنەندەجی ئەوەیشی گوت کە دوا زانیارییەکانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکـەن کـە موزەفـەر فـەیرووزی «مـیری ڕەش» [153] گەیشـتۆتە بەغـدا، ئەمەیش وەرچەرخانێکی ناخۆشە.

٨- میسـتەر سـەنەندەجی لـە ئەنجامـدا گـوتی حوکمـەتی ئێـران گـەلێك منەتباری باڵوێزی حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانی لـە بەغـدا دەبـێ ئەگـەر بێتوانێ یارمەتی باڵوێزی بدا بەوەی کە قەناعەت بە جەنەڕاڵ قاسم بکـات کـە هەڵوێستی حوکمەتی ئێرانی «بەرانبەر عیراق- ك.م.» لـە گەشـت ڕوویەکـەوە هەڵوێستێکی ئاشتیخوازانە و باریدەدەرە و دەتوانێ نفـووزی لـە کوردسـتاندا بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکات ئەگەر بێت و بارودۆخەکە لە کوردستان بەرەو ئاستێکی بێ هیـوا وەرچـەرخێ و لـەو حاڵەتـەدا بـیری ئێرانییـەکان بـۆ ئـەوە دەچێ کە لەوانە بێ بتوانـدرێ حاڵـەتی ڕۆژگـاری هاشمییـەکان لـە بەغـدا لـە خودی کەسایەتیی مەلیك حوسەیندا زیندوو بکرێتەوە.

ئیمزا

أ.ر.هـ.کێلاس،

١٢ی مایسی ١٩٥٩ » [154].

---

[152] ئاماژە بۆ ناو و کاری نەکراوە.

[153] موزەفـەر فـەیرووزی، کـە لـەناو بەڵگەنامەکـەدا بـە مـیری ڕەشـیش نـاوی هـاتووە، لـە بنەماڵەیەکی ناسراوی کرمانشایە و نزیکترین باریدەدەری قەوامولسـەڵتەنەی سیاسـەتمەداری بـە توانـا و بـە ناوبـانگی ئێـران بـووە کـە ویسـتوویەتی محەمـەد ڕەزا شـای پەهلـەوی بـە دەستووری پاشایانی ئەورووپا تەنها ڕەمز بێ، بۆیەکا ئەو سـەردانەی موزەفـەر فـەیرووزی لـە بەغدا لەو ڕۆژگارە ناسکەدا فەرمانڕەوایانی ئێرانی تەواو پەشۆکاندووە.

دوا بە دوای ئەمە ڕاپۆرتێکی دوور و درێژی دیکە دەربارەی هەمان بابەت هەڵگیراوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

بۆ تاران،

برووسکەی ژمارە ٢٧٥،

بۆ زانیاریی نێردراوە بۆ:

ئەنقەرە و بەغدا و واشنتۆن،

ژمارە ٢٤٥،

٢٨ی مایسی ١٩٥٩،

دابەشکردنی: وەزارەتی هەندەران و هۆڵی سپی،

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٤٩٨تان بە ناوی کوردەوە.

١- ئێمە بەختەوەرین چونکە وەها دیارە حوکمەتی ئێرانی بارودۆخی کوردستانی بە سەرنجێکی وردتر سەیر دەکات وەك لەوەی برووسکەی ژمارە بیست و دووی میستەر ڕەسێل باسی کردووە. هەر چەندە ناتواندرێ زانیاریی ڕێکوپێك لەم بوارەدا وەچنگ بکەوێ، بەڵام ئێمە پێمان وەهایە هەراوبگری ئێستای کوردی عیراق بەر لە هەر شت دەگەڕێتەوە هەوڵی بەغدا بۆ داچەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی دوای بەرپابوونی شۆڕش، وێڕای هەڵوێستە سەرنجڕاکێشەرەکانی بیر و بۆچوونی شیوعییەکان و نەتەوە پەرستانی کورد، ئەوانەی مەلا مستەفای بارزانی هێناونی و ئیزگەی مۆسکۆ پتر لە هەر بەرهەڵستییەك بۆ حوکمەتی عیراق دەیانورووژێنێ. بە ڕاستی قاسم پتر لە پێویست «عیراقچێتی» [155] کورد دەکات و کوردەکانیش یاریدەی هێزەکانی

---

[154] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, British Embassy, Tehran, No. 1081/59G, May 12,1959, Confidential, Record of Conversation.

[155] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا زاراوی عیراقچێتی بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە: "Iraqiness".

میرییـان دژی یاخیبوونەکـەی مووسـڵ دا. بزووتنـەوەی ئێستای هێزەکـانی میریش لـە بـاکووری عـیراق لـەوە دەکـەن مەبەستیان گێڕانـەوەی هێمنـی و نەهێشتنی ناکۆکیی نێوان هۆزەکان بێ نەك دامرکاندنەوەی یاخیبوونێك.

٢- هیچ گومان لەوەیشدا نییە کە ڕووسەکان بەختەوەرن بەوەی تاوەکو ئەوپەڕی یاری بە ئاواتەکانی کورد بکەن دژی تورکەکان و ئێرانییـەکان و بـە پشتیوانیی قاسم، هەر چەندە، هەرچۆن بێ، ئاواتـە نەتەوەییـیەکانی ئەگـەر بگەنە ئامانجەکانیان «واتـا دامەزرانـدنی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ» لەوانەیـە زۆرتر عیراق بورووژێنێ وەك لە ئێران و تورکیـا کـە لـەوە ناچـێ هـەوڵ بـدەن یاری بەم کارتە بکەن چونکە تاوەکو ئێستا هەردووکیان پشتگیریی قاسـم لـە بەغدا دەکەن. کەوابێ مەترسیی نەتەوەپەرستیی کـورد پـتر لـە چوارچێوەی ئەگەرەکانـدا هەڵدەسـەنگێنرێ وەك لـە واقیـع، بـەڵام بـە هـەر حـاڵ ئـەوە داردەستێکی گەورەیە بە دەست ڕووسەوە ئەگەر هەر کاتێك بیانەوێ گلۆڵەی ئەو سێ دەوڵەتە بخەنە لێژی.

٣- لەمەوە دەردەکەوێ کە هەر سێك حوکمـەتی ئـەو وڵاتانـە وەك یـەك هیوادارن ئاژاوەکانی ئێستای کوردستانی «عـیراق – ك.م.» دابمرکێنرێنـەوە. بۆخۆیشـتان دەتـوانن لـە برووسـکەی ژمـارە پـەنجاو حـەوتی «باڵوێزخانـەی بەریتانی – ك.م.» لـە ئەنقـەرە هەسـت بـەوە بکـەن تورکـەکان دەرکـی ئـەو ڕاسـتییەیان کـردووە و هـەنگاویان نـاوە بـۆ ئـەوی پێوەنـدییان بـە عیراقییەکانـەوە هـەبێ. ئێمـە پێمـان ناخۆشـە کـە لـە ڕێگـەی گفتوگۆکـانی میستەر کێلاسەوە لەگەڵ میستەر سەنەندەجیدا هەسـت بـەوە بکـەین کـە لـە نزیـك کەوتنـەوەی ئێرانییـەکان لەگـەڵ عیراقییەکانـدا دەربـارەی ئـەم بابەتـە کەمتر سەرکەوتووە. تۆ باشت بە میسـتەر سـەدر گوتـووە کـە ئێـوە هیچـتان نەکردووە بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، تکاتان لێ دەکـەم ئێـوە بۆخۆتـان دووی ئەم بابەتە بکەون لەگەڵ میستەر حیکمەتدا و هانی بدەن «ئێرانییەکان – ك.م.» چەند دەتوانن لەم بوارەدا نزیـك بـن لەگـەڵ عیراقـی و تورکەکانـدا. دەتـوانی ئەوەیشـی پـێ بڵێـی کـە میسـتەر هـەمفری ترێڤێلیـانی «وەزیـری

هەندەرانی بەریتانی —ك.م.» لەم بوارەدا ئامادەیە بە هەموو جۆرێك یاریدەی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا بدا.

٤– برگەی شەشەمی برووسکەی ژمارە پەنجاو حەوتی سێر بێرنارد بۆرۆی «باڵوێزی بەریتانی لە تورکیا – ك.م.» دەربارەی ئەوەی ئێرانییەکان وەها بیر دەکەنەوە کە ئەوان دەتوانن «کەڵك لە توانای»[١٥٦] هەڵوێستی کورد وەربگرن زۆر نیگەرانی کردووین. بە لای ئێمەوە ئەم هەڵوێستە هەم ترسناکە و هەم واقیعی نییە، هەم هەڵوێستێکی پڕ لەخۆباییبوونە. دەتواندرێ ئەم هەڵوێستەیش لەگەڵ هەڵوێستی نارەوای ئەفشاردا بەراورد بکرێ، ئێمە دەتوانین یاریدەی ئەو هەڵوێستە سیاسییە گومان لێکراوە و رارایەی ئێران بدەین و وەها پێدەچێت سەدر هەوڵ دەدات یاریدەدانی ئێمە بخاتە قاڵبێکی زیرەکانەوە، تکا دەکەم هەوڵ بدەن بە وردی بزانن ئێرانییەکان چییان مەبەستە، چونکە تاکە هەڵوێست لە کوردستاندا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەواندا بگونجێ ئەوەیە کە ئەوپەڕی هەوڵ بدرێ بۆ دابینکردنی هێمنیی ناوچەکە.

٥– سێر ب. بۆرۆ دوودڵە لەوەی دەربارەی ئەم بابەتە لەگەڵ تورکەکاندا قسە بکات، لەوانەیە سێر هەمفری ترێڤێلیانیش بە هەمان شێواز دوودڵ بێ دەربارەی ئەم بابەتە لە گەڵ هاوڕێ ئێرانی و تورکەکانیدا بدوێ.

ئیمزا[١٥٧].

---

[١٥٦] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە ئەو رستەیە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە:

"4- We are disturbed at the statement in paragraph 6 of Sir Bernard Burrows telegram No.57 Saving that the Iranians may think that in certain circumstances they may be able to (exploit the potentialities) of the Kurdish situation".

(157) N.A:, F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, Address to Tehran, Saving, Telegram No. 275, Ankara- Baghdad- Washinton, No. 245, May 28, 1959, Distribution: Foreign Office and Whitehall.

ئەم بەڵگەنامەیەی سەرەوە هەڵەی چاپی زۆری تێکەوتبوە کە هەموویان بە دەستخەت ڕاست کراونەتەوە و دیسان هەمان بەڵگەنامە بێ هەڵە چاپ کراوەتەوە و سێ لاپەڕەی داهاتووی هەمان دوا بەشی ئەم فایلەی بۆ تەرخان کراوە.

دوا بەدوای ئەمە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی هەمان بابەت هەڵگیراوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

نهێنی،

لە:

ئەنقەرەوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

دابەشکردنی وەزارەتی هەندەران و هۆڵی سپی،

سێر ب.بۆرۆز،

ژمارە ٨٧٤،

٢ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

وێنەی لێ دراوەتە:

تاران و بەغدا و واشنتۆن و بەشی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٢٧٥تان بۆ تاران دەربارەی کورد.

١- ڕۆژی دووی حوزەیران لەگەڵ سکرتێری گشتیی وەزارەتی هەندەرانی «تورکیادا - ک.م.» دەربارەی بابەتەکانی ناو ئەم برووسکەیە قسەم کرد، تاوەکو ئێستا میستەر زۆرلۆ نەگەڕاوەتەوە ئەنقەرە، هەرچی ئێسێبیلیشە[١٥٨] گوتی چەند ڕۆژێک لەمەوبەر وەزیری هەندەرانی ئێران بە

---

[١٥٨] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئاماژە نە بۆ ناوی تەواوی و نە بۆ کاری نەکراوە.

ئەستەموولدا تێپەڕی و دروست باسی ئەو کێشانەی کۆچڕەوی کوردەکانی عیراقی بۆ کاربەدەستە ئێرانییەکانی دروست کردووە، بەلام بە هیچ جۆر وەهای نیشان نەدا کە کاربەدەستانی ئێران نیازیانە کەلک لەو وەزعەی کورد وەربگرن.

٢- ئیسێبیل بە گشتی لەگەڵ ئەو سەرنجەدایە کە کێشەی ئێستای کوردی کارێکی ناوخۆی نێو هۆزەکانە و هەڵوێستی دروستی تورکیا و ئێران پێویستە لەبەر ڕۆشنایی ئەم بۆچوونەدا دابڕێژرێ و چی دەتوانن بیکەن بۆ ئەوەی نەهێڵن ئەو کارە ببێتە بابەتێکی نێودەوڵەتی. گوتیشی ئەو بۆ خۆی وەزیرەکانی تورکیا ڕادەسپێرێ کە بەو جۆرە مەسەلەکە عەرزی شا بکەن کاتێك ڕۆژی سێی حوزەیران بە ئەستەموولدا تێدەپەڕێ و هانی بدەن کە بە تایبەتی ئاگادار بێ و لەسەر هەوڵەکانی بەردەوام بێ کە عیراقییەکان لەوە دڵنیا بکات هیچ جۆرە پیلانێکی ئێرانی لە ناوچەکانی سنووردا لە ئارادا نییە.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم برووسکەیە بنێرن بۆ تاران ژمارە ١٢١ و بەغدا ژمارە ٨٣ و واشنتۆن ژمارە ١٢١ و بەشی سیاسیی هێزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ژمارە ٩٦)[١٥٩].

دوا بەدوای ئەمە برووسکەیەکی دیکەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە دەربارەی هەمان بابەت دانراوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە:

ئەنقەرەوە،

---

[159] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Department, Confidential, 1959, Subject: Kurdish Question, From: Ankara, To: Foreign Office, Cypher/OTP, Foreign Office and Whitehall Distribution, Sir B.Burrows, No 874, June 2,1959, Reported for Infromation to: Tehran, Baghdad, Washington. P.O.M.E.F.

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

سێر ب. بۆرۆس،

ژمارە ٩٠٢،

٦ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

وێنەی لێ دراوەتە: تاران و بەغدا و بەشی سیاسیی هێزی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و کەراچی.

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٧٨٤م دەربارەی کورد.

وەزیری هەندەرانی تورکیا ئاگاداری کردم کە وا ڕۆژی پێنجی حوزەیران لە کاتی وتووێژدا لەگەڵ شادا لە ئەستەموول لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ نیشتیمان گوتی: وەزیرەکانی تورکیا پێیان وایە پێویستە لەگەڵ بابەتە کوردییەکاندا بە شێوازێك ڕەفتار بکرێ کە دواڕۆژ وەبەرچاو بگیرێ، گوتووشیانە ئەوان لەو باوەڕەدان لەم بوارەدا کاربەدەستە ئێرانییەکان لە ڕاستیدا بە هیچ جۆرە چالاکییەکی ناپەسند هەڵنەستاون. هەرچۆن بێ شا ئەوەی نیشان دا کە لە ڕووی کارگێڕییەوە ئێرانییەکان بایەخ دەدەن بە لێشاوی کوردە پەناهێنەرەکان. تورکەکان بە شایان ڕاگەیاندووە کە ئەوان ئامادەن ژمارەیەك لەو کوردانەی پەنایان هێناوەتە بەر «ئێران — ك.م.» وەربگرن چونکە بۆ ئەوان ئاسانترە وەك لە ئێران بیانگوێزنەوە ناوچەیەکی دوور لە سنووری عیراق.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم برووسکەیەم بنێرن بۆ باڵوێزخانەکانمان لە تاران و بەغدا لەگەڵ ئەو دوو برووسکەیەی ترمدا کە ژمارەیان «١٢٧ و ٨٦»ە، وێڕای بەشی سیاسیی هێزی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و واشنتۆن و کەراچی، هەروەها ئەو برووسکانەیشم کە ژمارەکانیان «١٠٣ و ١٢٥ و ٨٨»ە.

ئیمزا) [١٦٠].

دوا بەڵگەنامەی ئەم دوا بەشەی ناو هەمان فایل بریتییە لەم نامەیەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا کە ڕۆژی حەڤدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ دەربارەی هەمان بابەت ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەلآت»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

نهێنی،

لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

بەغدا،

ژمارە ١٠٣٩/٢٤/٥٩،

١٧ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

بۆ:

بەشی ڕۆژهەلآت،

وەزارەتی هەندەران

لەندەن،

س دەبل یو. ١،

بەشی ڕۆژهەلآتی خۆشەویست،

١- بە بایەخ پێدانەوە ناوەڕۆکی گفتوگۆکەی ڕۆژی دوازدەی مایسی میستەر کێلاسم لەگەڵ میستەر سەنەندەجیدا خوێندەوە. باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا چیی پێ بکرێ بۆ هاندانی باڵوێزی ئێران «لە بەغدا - ك.م.» بۆ ئەوەی هەوڵ بدات حوکمەتی عیراقی قایل بکات کە گشت نیازەکانی حوکمەتی ئێرانی ئاشتیخوازانە و یاریدەرانەیە، هەرچەندە بە دەستووری

(160) Ibid, Confidential, From: Ankara, To: Foreign Office, Cypher/OTP, Sir B. Borows, No. 902, June, 6,1959.

باڵوێزی «بەریتانی – ك.م.» لە تاران ئێمەیش گومان لەوە دەکەین کە گشت پێوەندیدارە ئێرانییەکان هاوهەستن لەوەدا، تایبەت سوپای ئێران لە ناوچە کوردییەکاندا.

٢- ئێمە لە پەرەگرافی شەشی ناو گفتوگۆکەدا لەو قسانە تێنەگەیشتین کە دەربارەی کۆنفرانسەکەی ئەم دواییانەی میستەر جێرنێگان نووسراون. هەرچۆن بێ بۆچوونەکانی میستەر جێرنێگان دەربارەی وەزعی عێراق و ئەو سیاسەتەی ئەو پەیڕەوی کردووە تەواو لەگەڵ بۆچوونەکانی ئێمەدا دەگونجێن.

ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران.

هەمیشە دڵسۆزتان

باڵوێز

ئیمزا) (١٦١).

* * *

گەلێك فایلی دیکەی بایەخدار و دەگمەن و دەوڵەمەندی ئەرشیفی نیشتیمانیی بەریتانی بۆ بابەتی قۆناغەکانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ لە ڕۆژی بەرپابوونییەوە تاوەکو ڕۆژی کەوتنی لە هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣دا تەرخان کراون و بێ گومان سەرچاوەیەکی ڕەسەن و کەم هاوتان بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو شۆڕشە کە کارێکی زۆری کردە سەر هاوسەنگیی هێز «تناسب القوی» لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و لە ڕۆژگارێکی یەکجار ناسکی دووبەرەکیی نێوان بەرەی سەرمایەداری و بەرەی سۆشیالیزمیدا. هەر بۆ نموونە سەرجەمی فایلێکی «دیوانی سەرەك وەزیران»ی (١٦٢) حوکمەتی بەریتانی کە ژمارەکەی (١١/٢٨٢٠)ەو ژمارەی

---

(161) Ibid, Confidential, From: British Eambassy, Baghdad, No. 1039/24/59, June 17,1959, To Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1

(162) N.A., PREM (Prime Minister), No.11/2820, Sudan 1958-1959.

لاپەڕەکانی حەفتاو سێ لاپەڕەیە بۆ بابەتی مەترسییەکانی فەرمانڕەوایانی ئەوسای سودان لە بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمموز تەرخان کراون، شایانی باسە بەشی هەرە زۆری ئەو حەفتاو سێ لاپەڕەیە لە هەردووک دیویان نووسراونەتەوە و لەیەکەم ڕۆژی دوای بەرپابوونی شۆڕشی ناوبراوەوە، واتا لە پازدەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨وە، تاوەکو ڕۆژی چواری مارتی ساڵی ١٩٥٩ بۆ ئەو بابەتە تەرخان کراون.

باڵوێزی بەریتانی لە خەرتووم بە ئاسانی هەستی بەوە کردووە چۆن فەرمانڕەوایانی ئەوسای سوودان لە سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨ی عێراق تۆقیون و لەوە زراوەترەك بوون نەبا جەماوەر و سوپای سوودانی بە هەمان شێواز تەخت و تاراجی ئەوان تێك بدەن. لە فایلی ناوبراودا گەلێك راپۆرتی چڕوپڕی پڕ لە زانیاریی دانسقە هەڵگیراون کە هی وەهایان تێدایە وێنەی لێ دراوەتە ژمارەیەکی زۆر لە دەزگا تایبەتییەکانی پایتەختەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و کەسایەتییە بەرپرسەکانیان کە تەنانەت یەکێکیان داڤید بن گوریۆنی سەرەك وەزیرانی ئیسرائیلە[١٦٣] و لەسەر بەڵگەنامەکانی ئەو جۆرەی ناو ئەم فایلەدا ئەم دوو ڕستەیە نووسراون — «یەکجار نهێنی» "Top Secret" و «نهێنی و شەخسی» "Secret and Personal"، جا ئاخۆ «هەڵوێستی کۆنەپەرستانی عەرەب بەرانبەر شۆڕشی چواردەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ ی عیراقی لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە

---

[١٦٣] داڤید – بن گوریۆن (David Ben – Gurion) یەکێکە لە ڕەهبەرە زایۆنیستە هەرە ناسراوەکانی جیهان، ساڵی ١٨٨٦ لە شارۆچکەی پلۆسکیی پۆڵۆنیا لە دایك بووە و قوتابخانەی جووەکانی ئەو شارەی تەواو کردووە، نەك هەر یەکەم سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل بوو، بەڵکو تاوەکو ئێستاش هیچ کام لە سەرەك وەزیرانی ئەو وڵاتە بە ڕادەی ئەو حوکمی ئیسرائیلیان نەکردووە -بن- گوریۆن دەورووبەری پازدە ساڵ سەرەك وەزیران بوو لە ساڵی ١٩٤٨وە تاوەکو ساڵی ١٩٥٣ و لە ساڵی ١٩٥٥وە تاوەکو ساڵی ١٩٦٣، ساڵی ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووە.

نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا» چ نامەیەکی دوکتۆرای دەگمەن و ڕەسەن و پێویستی لیٚ دەردەچیٚ؟.

* * *

لە گەلێك فایلی دیکەی ئەرشیڤی نیشتیمانیی بەریتانیدا باسی پێوەندیی کورد بە گشتی و کوردی عیراق بە تایبەتی بە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژەوە کراوە، جاری وا هەیە ئەو بەلگەنامانە کەمێك گەڕاونەتەوە دوا قۆناغی ڕۆژگاری ڕژێمی پاشایی لە عیراق بۆ دەستنیشانکردنی ئەو هۆیانەی وایان لە زۆرینەی کوردی عیراق کردبوو حەز بە کەوتنی ئەو ڕژێمە بکەن، بە وێنە ژمارەیەك لە بەلگەنامەکانی فایلی ژمارە ٣٧١/١٣٤٢٥٥ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی کە پەنجاو پێنج لاپەڕەیە و «کوردی عیراق» ناونیشانییە[١٦٤] تەرخان کراوە بۆ باسی ئەوەی چۆن پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەب بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بووەتە مایەی مەترسیی کوردان، مێژووی یەکەم بەلگەنامەی ناو ئەم فایلە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژی چواری مارتی ساڵی ١٩٥٨ و سەرجەمی دەربارەی ئەو بابەتەیە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

نهێنی،

لە:

بەغداوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

یەکجار نهێنی،

لە:

---

(164) N.A., F.O., 371/134255, Kurds of Iraq.

سێر م. ڕاینەوە[١٦٥]،

ژمارە ٣٦٦،

٤ی مارتی ١٩٥٨،

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٣٦٦ی چواری مارت، بۆ ئاگاداری وێنەی لێ دەدرێتە: واشنتۆن و تاران و ئەنقەرە و عەممان.

١- ڕاپۆرتەکانی کۆنسوڵی خاوەن شکۆی «بەریتانی - ک.م.» لە کەرکووکەوە، وێڕای ژمارەیەك سەرچاوەی دیکە، دەڵێن جۆرە مەترسییەك لە نێو کوردی عیراقدا هەیە لە ئەنجامی پێکهێنانی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو و «پەرەسەندنی بزووتنەوەی - ک.م.» یەکیەتی لە نێو عەرەبدا.

٢- هەڵوێستی سەرەکیی کوردی عیراق «کە ژمارەیان ملیۆنێك دەبێ لە کۆی شەش ملیۆن و نیو» بریتییە لەوەی هەرچەندە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی ئاواتێکی دێرینیانە، بەڵام دەزانن باری ژیانیان چ لە ڕووی سیاسی و چ لە ڕووی ئابوورییەوە باشترە لە باری ژیانی کوردی تورکیا و ئێران، بۆیەکا بەرە بەرە وایان لێ هاتووە هەست بە عیراقێتی خۆیان بکەن و لەوەیش گەیشتوون ئەو وەزعەیان پتر بە ڕژێمی پاشایەتیی وڵاتەوە بەستراوەتەوە، بەڵام وەها پێدەچێ لەوە دڵنیا نین کە ئایا بارودۆخی

---

[١٦٥] سێر میخائیل ڕۆبێرت ڕایت (Sir Michael Robert Wright) ڕۆژی سێی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠١ لەدایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە ڕۆژی پێنجی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ەوە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و یەکەم کاری وەك سکرتێری سێیەم لە واشنتۆن بوو، ساڵی نەخایاند گوێزرایەوە بارەگای وەزارەت لە لەندەن و کرایە سکرتێری دووەم، دوای ئەوە بە ڕیز لە پاریس و قاهیرە و دیسانەوە لە واشنتۆن کرایە ئەندامی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە سنغافوورە و لە ڕۆژی بیست و یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٥یشەوە بووە باڵوێزی بەریتانیا لە بەغدا. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1958", London, P.478.

بەرژەوەندییەکانیان چیی بەسەر دێ لە ژێر سایەی یەکیەتیی عەرەبدا[١٦٦].

٣- من دەربارەی ئەوە لەگەڵ وەصیدا گفتوگۆم کرد و ئەویش دروست بایەخی ئەوەی هەڵسەنگاند کە پێویستە چۆن لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا رەفتار بکرێ و گوتی کورد شوێنی دیاری خۆیان دەبێ لە نێو نوێنەرە عیراقییەکاندا وەك لە پەرلەمان و دەزگاکانی میریدا.

٤- لە درێژەی وتووێژەکەماندا وەصی گوتی ئەگەر هاتوو ڕژێمی پاشایی لە عیراق نوشوستیی هێنا «واتا عەبدولناسر سەرکەوێ» ئەوساکە زۆر لەوانەیە کوردی عیراق لە بەشەکانی دیکەی وڵات جیا ببنەوە، منیش لەو بڕوایەدام.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم نامەیەم بنێرن بۆ واشنتۆن و ئەنقەرە و تاران و عەممان و بێروت، وێڕای ئەم برووسکانەم ٥١- و ٢٣ و ٤٦ و ١٥ و ٣٥ و ٢٧ یەك لە دوای یەك)[١٦٧].

دوا بەدوای ئەمە ڕاپۆرتێکی دوور و درێژی هـ. ن. بوولەری[١٦٨] کۆنسوڵی بەریتانی لە کەرکووك هەڵگیراوە کە ڕۆژی بیست و چواری شوباتی ساڵی

---

[١٦٦] دیارە مەبەستی یەکیەتیی نێوان عیراق و ئوردونە، کە بە «یەکیەتی هاشمی» ناسرابوو و بریتی بوو لە وەڵامدانەوەیەکی سیاسی بۆ هێنانە کایەی هاوسەنگییەکی دەستکرد لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو لە نێوان میسر و سووریادا.

(167) N.A., F.O.,371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, From: Baghdad, To: Foreign Office, Cypher/ OTP, Sir M. Wright, No.366, March 4,1958, Confidential.

[١٦٨] هەبێرت نۆرمان پولەر (Hubert Norman Pullar) ڕۆژی بیست و شەشی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٨وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و بە ڕیز لەم شارانە کاری دیپلۆماسی کردووە - ئەستەموول و شیکاغۆ و دیترۆیت و واشنتۆن و کرمانشا و کازابلانکاو شوێنی دیکە و بڕوانامەی لە زوبانی فارسیدا وەرگرتووە و لە ڕۆژی بیست و چواری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٧وە بووەتە کۆنسوڵی بەریتانی لە کەرکووك. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1958", London, PP.391-392.

سلێمانی و هەڵەبجە و بە دوور و درێژی چ لەگەڵ موتەسەڕیف و چ لەگەڵ کەسانی دیکەدا لەم بارەیەوە گفتوگۆیان کردووە، بۆ خۆیشم لەگەڵ فەوزی سائیبدا[١٧٢]، کە ئێستا جێگری موتەسەڕیفی هەولێرە، قسەم دەربارەی هەمان بابەت کردووە. تەنانەت گەلێك کەس لە شاری سلێمانی نەهاتنە ئەو ئاهەنگەی شارەوانی بە بۆنەی دامەزراندنی یەکیەتیی هاشمییەوە گێڕای، نەك تەنها لە بانگکراوەکان، بەڵکو تەنانەت لە خودی سەرپەرشتیکارانی ئاهەنگەکەیش. هەر لە سلێمانیش وەفدێکی تایبەتی چوونە زیارەتی موتەسەڕیف و ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ زۆربەی ئەندامانی بریتی بوون لە نووسەر و پارێزەر و ئەو جۆرە گەنجانەی بێ هیچ جۆرە دوودڵییەك هەستی بێزاریی خۆیانیان دەردەبڕی. ئەوان بە موتەرسەڕیفیشیان گوت ئەو وەك

---

تۆماس بۆرگێسە (George Thomas Burgess) کە لەو دەورووبەرەدا کارمەندی باڵوێزخانەی بەریتانی بووە لە کوێت، ئەوی دیکەشیان جۆن سیسیل بۆرگیسە- (John cecil Burgess) کە لەو ڕۆژانەدا کونسوڵی بەریتانی بووە لە مووسڵ و دیارە ئەم لەگەڵ کابرای ئەمەریکیدا چووەتە هەولێر. جۆن سیسیل بۆرگیس ڕۆژی دوازدەی مارتی ساڵی ١٩٠٤ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٤٠وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و ماوەیەك لە عەممان کاری کردووە و لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨یشەوە بووەتە جێگری کونسوڵی بەریتانی لە مووسڵ. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1958", London, P.192.

١٧٢ نەوەی جەمیل سائیب بە ڕیز بریتی بوون لە محەمەد عەلی کە دیپلۆماسییەکی ناسراوی ڕۆژگاری ڕژێمی پاشایی بوو، هاوەڵە عەرەبەکانی لە خۆشەویستیدا هەر بە کاکە ناویان دەهێنا، دوای ئەو فەوزی و ئینجا نەسرینی هاوسەری جەمالی میرزا فەتاحی حاجی شەریف دێ و هەرسێکیان لە ژنی یەکەمی جەمیل سائیب بوون، دوای ئەوان نەوزاد و ئازاد و بەهزادی فرۆکەوان و ڕووناك و شازاد دێن کە لە حەپسە خانی ژنی دووەمی جەمیل سائیب بوون، هەر هەموویان بە شیری ڕەسەنی کوردایەتی «لەخەوما» و دڵسۆزیی پیرەمێردی هەمیشە زیندوو گۆش کرابوون. لەو نەوەیە ئێستا هەر کاك ئازاد و خوشکە ڕووناك ماون، خوا تەمەنیان درێژ بکات، زۆر لە نزیکەوە خوالێخۆشبووان نەسرین خان و نەوزاد و بەهزادم دەناسی، لە گشت ڕوویەکەوە نموونە بوون، حەپسەخانیش شتێکی ئەوتۆی لە حەپسەخانی نەقیب کەمتر نەبوو.

عەرەبێك ناتوانێ بە دروستی هێزە پاڵپێوەنەرەكانی ئەوان هەڵبسەنگێنێ. لە وەڵامدا موتەسەریف پێی گوتن كاربەدەستانی بەغدا گەلێك بە پەرۆشن گوێیان لە بۆچوونەكانم دەربارەی هەڵوێستی كورد، تەنانەت ئەگەر پتر لەوەیش بۆخۆم كورد بوومایە. ئەندامانی وەفدەكەش گوتیان پێیان وایە ژیانی كورد لە ژێر سایەی عیراقدا گەلێك لە ژیانی براكانیان لە توركیا و ئێران باشترە و هەرگیز ئەوان، چ لە ڕووی كار و چ لە ڕووی داهاتەوە، وەك ئێستا نەبوون، بەڵام گوتیان «فەوزی سائیبیش لە سلێمانییەوە ئاماژەی بۆ هەمان هەڵوێست كردووە»، ئەوان عەرەب نین و بانگدانی یەكیەتیی عەرەب هیچ بۆ ئەوان ناگەیەنێ و پێویستە «ئەوەیش لەیاد نەكرێ—ك.م.» كە بە پێی دەستووری كۆمەڵگای عیراق لە سێ ڕەگەز پێكهاتووە، – كورد و توركمان و عەرەب و بۆ ئەوەی ئەو هاوسەنگییەش تێكنەچێ پێویستە دووبارە ئاماژەی بۆ بكرێت ئەگینا بایەخیان كەمتر دەبێ و لە ئاستی بۆچوونەكانی مەلیك سعوود و عەبدولناسردا و ڕەنگ و ڕوخساری جارانیان نامێنێ.

٢– موتەسەریفی سلێمانی حەپەسابوو لەو ڕەنگدانەوە قووڵەی «یەكیەتیی نێوان عیراق و ئوردون—ك.م.» دروستی كردبوو، هەرگیز نەشیدەزانی پێوەندیی «كوردستان—ك.م.» بە بەشەكانی دیكەی عیراقەوە هێند لاوازە هەرچەندە پێوەندیی ئابووریی هەردووك لا كەم نییە. هەرچی فەوزی سائیبیشە ڕاستە كارمەندێكی فەرمییە، بەڵام هەستی لەگەڵ هەڵوێستی كورددایە و باسی هێزی كورد دەكات و چۆن ئەوان دەتوانن كێشە «بۆ عیراق—ك.م.» دروست بكەن. بە پێی بۆچوونی ئەو گوێ لە قسەی پەرلەمانتارانی كورد دەگرن. بەڵام لە بەغدا بایەخی پێ نادەن، هەروەها كارمەندە گەورەكانی میری حەز دەكەن بیر و بۆچوونەكانیان دەربڕن، بەڵام بەلای فەرمانڕەوایانەوە گرنگتر لە دەربڕینی كێشەكانی باكوور دڵسۆزیی خودی خۆیانە بۆ كۆشك. ئەو حەز دەكات لە بواری بەرژەوەندیی بەریتانی و ئەمەریكاییەكاندا پێوەندیی هەردووك لایان لەگەڵ كورددا باش بێ، چونكە بە پێی قسەی ئەو لێكدانەوەی دیاردەكان ئەوە نیشان دەدەن كە كورد پتر

له عەرەب باوەڕیان پێیانە، فەوزی سائیب لە گشت ئەو هەڵوێستانەیدا خۆی وەك كوردێكی دڵسۆز نیشان دەدات، بەڵام هەمان كاتیش تەعبیر لە ڕای گشتی دەكات، تەنانەت لێرەیش لە كەركووك ڕای كورد شێوێنراوە و یەكێك لە پەرلەمانتارە توركمانەكان كە زۆر نییە لە بەغدا گەڕاوەتەوە دەڵێ تەواو جیاوازی هەیە لە نێوان سەرنجی كەركووك و بەغدادا، بەڵام ئەو جیاوازییە نەگەیشتووەتە ئاستی جیاوازیی نێوان سلێمانی و هەولێر لەگەڵ بەغدادا. كە لە فەوزیم پرسی ئەو گوتی لەوانەیە كورد پشتی «پەیمانی بەغدا» دژی یەكیەتیی عەرەبیی بەرفراوان بگرن كە لەوانەیە بە ڕەهبەریی عەبدولناسر بێ چونكە سیان لە ئەندامانی «پەیمانی بەغدا» كەمینەیەكی كوردیان تێدا دەژی و چ بەریتانیا و چ ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا دەتوانن گوێڕایەڵیان بن و بۆ خۆیان كەڵك لە كاریگەریی ئەو كوردانە وەربگرن.

٣- بەشی سەرنجڕاكێشی ئەم هەست دەربڕینە بریتییە لەوەی كە وەها دەردەكەوێ لە مەترسیدان هەرچەندە هیچ لە ئارادا نییە ئەوان بیدۆڕێنن[١٧٣]. لەوەیش ناچێ ئەو پڕۆژانەی لە ئارادان بەرەوپێش نەچن، یان كوردەكان سەر بۆ ئەفسەرە ئوردونییەكان شۆڕ بكەن[١٧٤]، حوكمەتیش ئەوەی خستووەتە پشتگوێ، چونكە نابێتە هۆی پڕۆپاگەندەیەكی باش بۆ حوكمەتی عیراق، چونكە حوكمەتی ناوبراو دەتوانێ هۆكانی ئەو ناڕەزایەتییە لە ڕێگەی چەند پڕۆژەیەكی هەرزانی وەك دروستكردنی بەربەست «سدود» و كردنەوەی ڕێگەو بان و پڕۆپاگەندەیەكی لەبار بۆ خۆی لە ناو كورددا بكات، هەمان كات حوكمەتی عیراق دەتوانێ لەڕێگەی ئێزگەوە بەرهەڵستیی عەبدولناسر بكات[١٧٥]، وەك پێیان ڕاگەیاندووم پرۆگرامە كوردییەكانی

(١٧٣) پێموایە مەبەستییە بڵێ كورد نەك دەوڵەت بەڵكو مافیشیان نییە بۆیەكا هیچ لە ئارادا نییە تاوەكو ئەوان بیدۆڕێنن.

(١٧٤) لە دەقی ئینگلزییەكەدا وەها هاتووە:

"....or that the Kurds will foot the bill for Jordan`s officers".

(١٧٥) لە دەقی ئینگلیزییەكەدا وەها هاتووە:

"The Iraqi Government have also to counter Nasser on the wireless".

«ئیزگەی —ك.م.» بەغدا بە پەرۆشەوە گوێی لێ دەگرن، بەلاَم هەرچی پرۆگرامەكانی قاهیرەیە تەنها لە نێو ئەو كوردانەدا بایەخیان پێ دەدەن كە زوبانی عەرەبی چاك دەزانن.

٤– ئەمانە هەموو بوونەتە بنەمای نوكتەیەك «لە نێو كورددا—ك.م.» كە سەرچاوەكەی سووریایە و دەڵێ باشتر وایە كەمینە كوردەكانی عیراق و ئێران و توركیا لە ژێر سایەی ئینتیدابێكی توركیدا كۆ ببنەوە تاوەكو بە جۆرە خودموختارییەك بگەن. بۆ هەر كوردێك نوكتەیەكی لەو بابەتە خۆی لەخۆیدا جۆرە جنێوێكە[١٧٦] بە هۆی ڕەفتاری خراپی توركیاوە لەگەڵ كەمینەكاندا، مۆسكۆ ئەوەی قۆستۆتەوە، چونكە دەڵێ ئەگەر كورد ڕقیان لە توركیایە تەنها ڕووسیا دەتوانێ ئەو ئاسوودەیی و ئۆتۆنۆمییەیان بۆ مسۆگەر بكات كە بۆخۆیان دەیانەوێ. خۆشبەختانە بیرەوەریی ئەوەی چۆن ڕووسیا دەستبەرداری قازی محەمەد بوو زیندووەو كوردەكان ناتوانن وەپشت گوێی بخەن، بەلاَم وەها دیارە حوكمەتی عیراقیش لەم بوارەدا كەمتەرخەمە و تەنانەت میكانیزمی پڕوپاگەندەیشی ئاوڕی پێویست لەم بابەتە ناداتەوە و ناڕوانێتە ڕۆژئاوا چۆن ڕەفتار دەكات، خۆ ئەگەر هاتوو هیچ كۆششێك لەم بوارەدا نەكرا ئەوساكە پرسی كورد لەوانەیە جارێكی دیكە بێتەوە سەر نەخشە «یان سەرهەڵداتەوە»[١٧٧].

٥– من بۆخۆم وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرم بۆ مووسڵ و بەشی شام.

---

[١٧٦] لە دەقی بەڵگەنامەكەدا وەها هاتووە:
"Such a rumour is calcuted to annoy the Kurds, for many of whom Turkey is anathema because of ther treatment of minorities".

هەرچی وشەی (Anathema)یشە بە واتای لەعنەتی كڵێسە دێت.

[١٧٧] لە دەقی بەڵگەنامەكەدا وەها هاتووە:
"If nothing is done, The Kurdish question may be back on the map".

ئیمزا

هـ.ن.پولەر)[١٧٨]

بەڵگەنامەی دواتر کە سێ حەفتە بەر لە ڕووخانی ڕژێمی پاشایی عێراق نووسراوە تەرخان کراوە بۆ بابەتی کێشە سنوورییەکانی نێوان عێراق و ئێران لە ناوچەی کوردستاندا و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامەیەیە کە ناوەڕۆکەکەی دیسانەوە ئەوە نیشان دەدات کە وڵات بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ گیرۆدەی گەلێك کێشە هاتبوو:

(نهێنی،

لە:

بەغداوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

سێر م. رایت،

ژمارە ١١١٨،

٢٣ی حوزەیرانی ١٩٥٨،

١- جێگری وەزیری هەندەرانی «عێراق-ك.م.» لای یەکێك لە کارمەندانی ستافەکەم باسی هەڵوێستی ئێرانی دەربارەی قەدەغەکردنی هۆزی هەرکی و جاف بۆ چوونە لەوەڕگە هاوینە ئاساییەکانیان لە ناو خاکی ئێراندا کردووە، ژیانی ئەو هۆزانە لەسەر ئەو لەوەڕگانە وەستاوە و بە پێی قسەی گەیلانی[١٧٩] پەڕینەوەی ئەو هۆزانە بۆ ناو خاکی ئێران مافێکی چەسپاوی دێرینە و

---

(178) N.A., F.O., 371/134255,The Kurds in Iraq, Confidential, From: British Consulate, Kirkuk, February 24, 1958, To: British Eambassy, Baghdad, PP.8-9.

(١٧٩) گەیلانی یەکێك بوو لە دیپلۆماسییە ناسراوەکانی دوا قۆناغی ڕۆژگاری ڕژێمی پاشایی لە عێراق و گەیشتە پلەی جێگری وەزیری هەندەران، خاتوو فەیمەی کچی میرزا فەرەجی حاجی

بەر لە ئێستا فەرمانڕەوایانی ئێران هەرگیز نەیان ورووژاندووە، گردبوونەوەی پیاوانی ئەو هۆزانە و ئاژەڵەکانیان لەسەر سنوور بوونەتە هۆی نیگەرانییەکی زۆر بۆ کاربەدەستانی عیراق.

٢- وێڕای ئەوە گەیلانی گوتیشی ئێرانییەکان ئەم هۆیەیان کردۆتە بیانووی هەنگاوەکەیان - گوایە حوکمەتی ئێران داوای کردووە دەستەیەکی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی جوگرافیی سوپای ئێران کە لە هەشت ئێرانی و نۆ ئەمەریکایی پێکهاتوون ڕێگەی پێ بدرێ کارەکانیان لە ناوچەیەکی نزیک شاری سلێمانی ئەنجام بدەن بۆ تەواوکردنی نەخشەکانیان، بەڵام حوکمەتی عیراقی تاوەکو ئێستا وەڵامی ئەو داوایانەی نەداوەتەوە، بە پێی قسەی گەیلانی ئەو داوایە ئێستا لەبەردەم وەزارەتی بەرگریدایە، وێڕای ئەوەیش ئێرانییەکان ئەوە ساڵێکە هێشتا وەڵامی ئەو داوایەی حوکمەتی عیراقییان نەداوەتەوە کە ڕێگە بدرێتە تیمێکی تایبەت لە نزیك ناوچەی دەربەندیخانەوە بپەڕنەوە ناو خاکی ئێران تاوەکو بزانن ئاوی بەربەستەکەی دەربەندیخان هیچ ناوچەیەکی ئێران دادەپۆشێ یان نا.

٣- گەیلانی ئاماژەی بۆ ئەمانە کرد وەك نموونەی بچووك، بەڵام هیلاککەرن لە بواری پێوەندییەکانی نێوان عیراق و ئێراندا. گەیلانی بە شێوازێکی تایبەتیی داوای نەکرد ئێمە «واتا بەریتانییەکان-ك.م.» بکەوینە بەینەوە، بەڵام لە نێوان قسەدا گوتی ئەوەی ئێمە دەتوانین لە بواری پەڕینەوەی هۆزەکاندا بیکەین زۆر بەرز «لە لایەن عیراقەوە-ك.م.» دەنرخێنرێ، ئەمەیان تاوەکو ڕادەیەك پرسێکی جدییە و لێرە پێیان وایە پێویستە لە مەسەلەکانی دیکە جیا بکرێتەوە و ئێرانییەکان ڕێگە بەو هۆزانە بدەن بپەڕنەوە بەر لەوەی تووشی زیانی گەورە بێن. هەڵبەت لەوانەیە گشت

---

شەریفی خەڵکی شاری سلێمانی هاوسەری بوو، میرزا فەرەج بازرگانێکی دەوڵەمەند و نوێنەری سلێمانی بوو لە «ئەنجوومەنی دامەزرێنەر (المجلس التأسيسي) دا.

ئەو قسانەی عیراقییەکان یەك لایەنی، یان ڕاست نەبن) [180].

بەڵگەنامەی دواتری ناو هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی دوورودرێژی حەوت خاڵی نوێنەرایەتی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەستەموول کە ڕۆژی هەژدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨، واتا تەنها چوار ڕۆژ دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ، ناردوویە بۆ «بەشی وڵاتی شام» لە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی ڕووداوەکانی عیراق و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە:

نوێنەرایەتیی باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

ئەستەموول،

١٨ی تەمموزی ١٩٥٨،

بۆ:

بەشی وڵاتی شام،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

س. دەبل یو. ١،

بەشی وڵاتی شامی خۆشەویست،

١- ئێمە قەناعەتمان پەیدا کردووە ئەو هەواڵە دروستە کە دەڵێ کوردی عیراق بەرهەڵستیی حوکمەتی شۆڕشیان لە بەغدا کردووە وەك هەوڵێك بۆ جیابوونەوە لە عیراق و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عیراق.

---

(180) N.A., F.O.,371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, From: Baghdad, To: Foreign Office, Cypher/ OTP, Sir M. Wright, No.118, June 23, 1958, PP.12-13.

٢- ئەگەر بێت و شتێکی لەو بابەتە بقەومێ حوکمەتی تورکی «زۆریش لەوانەیە حوکمەتی ئێرانیش» بێ گومان تاوەکو رادەیەکی یەکجار زۆر لەوە دەترسێن ئەوە کار بکاتە سەر کوردستانی تورکیا و «کوردستانی ئێرانیش» ببێتە هۆی سەرهەڵدانەوەی دروشمی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ. ئەوان لەوەیش دەترسێن کە لەوانەیە رووس و عەبدولناسر، کە زۆر نییە ئێزگەیەکی کوردی دامەزراندووە[١٨١]، هەوڵ بدەن بزووتنەوەیەکی لەو جۆرە بکەنە سەرمایە بۆخۆیان.

٣- زۆر لەوانەیە کارێکی لەو جۆرە پاڵ بە حوکمەتی تورکییەوە بنێ ناوچە سنوورییە هاوبەشەکانی ناو عێراق داگیر بکات بۆ بەربەستکردنی هەموو جۆرە بزووتنەوەیەك لە پێناو سەربەخۆیی کورددا و رێی تێدەچێ ئەوە هانی تورك بدات «پرسی مووسڵ - قضية الموصل» زیندوو بکەنەوە، ئەو پرسەی هەرگیز لێرە «واتا لە تورکیا -ك.م.» لە یادی ناکەن و هەمیشە دەیانەوێ داواکەیان کەرکووکیش بە کانە نەوتەکانی و زۆرینەیەکی دانیشتووانی زوبان تورکییەوە بگرێتەوە.

٤- بێ گومان گشت ئەو بیر و بۆچوونانە لەم قۆناغەدا تاوەکو رادەیەکی زۆر لێڵ و مایەی تێڕوانینە، ئێمە بۆخۆمان هیچ جۆرە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە ئەوە نیشان بدات کە تورك نیازیانە هیچ هەنگاوێك لەوانەی سەرەوە بنێن و لە رۆژنامەکانی تورکیاشدا هیچ ئاماژەیەکیان بۆ نەکراوە، تەنها ئەو یەك دوو قسەیە نەبێ کە رۆژی شازدەی تەمموز مسیۆ زۆرڵوو دای بە گوێی باڵوێزی بەریتانیدا دەربارەی پێویستیی پاراستنی کەمینەکان لە عێراق لە هێرشی درندانە[١٨٢]بروانە برگەی دووی برووسکەی ژمارە ١٣٩ی

---

[١٨١] مەبەست ئەو ئێزگەیەیە کە عەبدولناسر لەسەر داوای سدیق شەنشەل ساڵی ١٩٥٧ لە قاهیرە دایمەزراند و هۆشیار بابان دەیبرد بەڕێوە.

[١٨٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

"The only conceivable straw in the wind so far has been Monsieur Zorlu`s remark to the Ambassador on July 16 about the necessity of protecting the

٢- ئەگەر بێت و شتێکی لەو بابەتە بقەومێ حوکمەتی تورکی «زۆریش لەوانەیە حوکمەتی ئێرانیش» بێ گومان تاوەکو ڕادەیەکی یەکجار زۆر لەوە دەترسێن ئەوە کار بکاتە سەر کوردستانی تورکیا و «کوردستانی ئێرانیش» ببێتە هۆی سەرهەڵدانەوەی دروشمی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ. ئەوان لەوەیش دەترسێن کە لەوانەیە ڕووس و عەبدولناسر، کە زۆر نییە ئێزگەیەکی کوردی دامەزراندووە[١٨١]، هەوڵ بدەن بزووتنەوەیەکی لەو جۆرە بکەنە سەرمایە بۆخۆیان.

٣- زۆر لەوانەیە کارێکی لەو جۆرە پاڵ بە حوکمەتی تورکییەوە بنێ ناوچە سنوورییە هاوبەشەکانی ناو عیراق داگیر بکات بۆ بەربەستکردنی هەموو جۆرە بزووتنەوەیەك لە پێناو سەربەخۆیی کورددا و ڕێی تێدەچێ ئەوە هانی تورك بدات «پرسی مووسڵ – قضية الموصل» زیندوو بکەنەوە، ئەو پرسەی هەرگیز لێرە «واتا لە تورکیا –ك.م.» لە یادی ناکەن و هەمیشە دەیانەوێ داواکەیان کەرکووکیش بە کانە نەوتەکانی و زۆرینەیەکی دانیشتووانی زوبان تورکییەوە بگرێتەوە.

٤- بێ گومان گشت ئەو بیر و بۆچوونانە لەم قۆناغەدا تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لێڵ و مایەی تێڕوانینە، ئێمە بۆخۆمان هیچ جۆرە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە ئەوە نیشان بدات کە تورك نیازیانە هیچ هەنگاوێك لەوانەی سەرەوە بنێن و لە ڕۆژنامەکانی تورکیاشدا هیچ ئاماژەیەکیان بۆ نەکراوە، تەنها ئەو یەك دوو قسەیە نەبێ کە ڕۆژی شازدەی تەمموز مسیۆ زۆرلوو دای بە گوێی باڵوێزی بەریتانیدا دەربارەی پێویستیی پاراستنی کەمینەکان لە عیراق لە هێرشی دڕندانە[١٨٢] بڕوانە برگەی دووی برووسکەی ژمارە ١٣٩ی

---

[١٨١] مەبەست ئەو ئێزگەیەیە کە عەبدولناسر لەسەر داوای سدیق شەنشەل ساڵی ١٩٥٧ لە قاهیرە دایمەزراند و هۆشیار بابان دەیبرد بەڕێوە.

[١٨٢] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

"The only conceivable straw in the wind so far has been Monsieur Zorlu`s remark to the Ambassador on July 16 about the necessity of protecting the

ئەستەمووڵ. مسیۆ زۆرڵوو ئەوەیشی بۆ باڵوێز ڕوون کردەوە کە مەبەستی یەکەمی ئەو «دوو سەد هەزار کەسە بە ڕەگەز تورکە»یە(١٨٣) کە نیشتەجێی عیراقن.

٥- بێ گومان ئەگەر هەر بەو دەستوورەیش کە ئێمە هیواداریین بتوانرێ ئەوە نیشان بدرێ کە دەتوانرێ بارودۆخی عیراق بپارێزرێ، ئەوساکە ئەو ئاڵوگۆڕانەی لە سەرەوە ئامازەیان بۆ کرا دەبنە کارێکی هەڵەشە، بەلام لە لایەکی دیکە ئەگەر هاتوو ئاڵوگۆڕەکان بە لایەکی خراپدا شکانەوە ئەوساکە گومان لەوەدا نییە کانە نەوتەکانی باکوور دەکەونە دەست تورکیا و بەوەیش هیچ نەبێ عەبدولناسر لەو سامانە بە نرخەی عیراق بێبەش دەبێ.

٦- بێ گومان ئێمە بەردەوام دەبین لە بەدووچوونی ئەم ئاڵوگۆڕەدا لە نزیکەوە و پێمان وایە ئێوەیش ئارەزوو دەکەن بەشێك لەم بۆچوونانە بە پێی بیری خۆتان تەتەڵەیان بکەن.

٧- ئێمە بۆ خۆمان وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ نوێنەرانی بەریتانی لە عەممان و بێرووت و واشنتۆن و تاران و «دایەرەی سیاسی» و هێزەکانمان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا) (١٨٤).

دوا بەدوای ئەمە لە هەمان فایلدا بەڵگەنامەیەکی دیکەی بایەخدار

---

minorities in Iraq from brutal attacks.... monsieur zorlo made it clear that by minorities he had in mind the "200,000 pepole of Turkish race settled in Iraq"(P.16).

دیارە زۆرلۆ کارمەندێکی گەورەی ئەو ڕۆژگارەی تورکیا بووە.

(١٨٣) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

(184) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, secret, From: British Eambassy Residence, Istanbul, July 18, 1958, To: Levant Deparment, Foreign Office,London, S.W.1. PP.16-17.

هەڵگیراوە کە ئاماژە بۆ یارییەکانی ڕژێمی پەهلەویی ئێران لەو ڕۆژگارە ناسکەدا دەکات و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

برووسکەی ژمارە ١١٤٧،

ڕۆژی هەشتی ئابی ١٩٥٨،

وێنەی بۆ:

ئەنقەرە و عەممان و بێروت و واشنتۆن،

لە:

تارانەوە،

ڕۆژی بیست و چواری تەممووزی «ساڵی ١٩٥٨-ک.م.» هۆمەر بیگارت _ Homer Bigart لە ڕۆژنامەی «نیۆیۆرك تایمس» دا باسی قسەکانی جەنەڕاڵ بەختیاری[(١٨٥)] کردووە کە گوتوویە ئەگەر کوردی عێراق و سووریا داوای یەکگرتن لەگەڵ ئێراندا بکەن ئەوساکە داوایەکی لەو بابەتە بە بایەخێکی زۆرەوە سەیر دەکرێ[(١٨٦)]. هەروەها گوتیشی گشت ئەو کوردانەی لە دەرەوەی ئێران دەژین خۆیان بە ئێرانی دەزانن و ئەو لەوە دڵنیایە ئەو کوردانە هەرگیز پێوەندیی خۆیان بە نیشتیمانی دایکەوە لە یاد ناکەن[(١٨٧)].

---

(١٨٥) جەنەڕاڵ بەختیار یەکێك بوو لە پیاوە ئەڵقە لە گوێکانی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی و کاربەدەستێکی بێ ئەندازە توندڕەو و دژی تودە و دەستە و دایەرەی دوکتۆر موصەدەق و هەموو نیشتیمانپەروەرێکی ئێرانی بوو، سەرۆکی دەزگای سیخوڕیی ساواك بوو، خودی شا لە دەسەڵاتی زۆری دەترسا بۆیەکا ویستی ڕادەیەکی بۆ دابنێ، لە وەڵامدا جەنەڕاڵ بەختیار هەڵهاتە عێراقی دوژمنی شا و کەوتە پیلان گێڕان دژی ڕژێمی پەهلەوی، سەرەنجام محەمەد ڕەزا شا توانیی لە ڕێگەی ئەو ساواکییانەوە کە لە عێراق لە دەوروبەری جەنەڕاڵ بەختیار کۆبوبوونەوە زەفەری پێ بەرێ و بیکوژێ.

(١٨٦) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

(187) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, From: Foreign Office, To: Tehran, En Clair and by Bag, Foreign Office (Secret) and Whitehall (Secret) Distribution, No. 1147, August 8, 1958, P.19.

یەکسەر دوا بە دوای ئەم بەڵگەنامەیە برووسکەیەك بە هەمان ناوەڕۆك دەربارەی قسەكانی جەنەڕاڵ بەختیار لە ڕۆژنامەی «نیۆیۆرك تایمس»دا بڵاو کراوەتەوە و هەڵگیراوە، بەڵام ئەمجارەیان لە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانییەوە بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران (١٨٨).

هەرچی بەشی پێنجەمی هەمان فایلە بریتییە لە نامەیەكی نهێنیی بایەخدار كە ڕۆژی پازدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ كۆنسوڵی گشتیی بەریتانیا لە بەسرەوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

(نهێنی،

لە:

بەسرەوە،

كۆنسوڵی گشتیی خاوەن شكۆ،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

ژمارە ٣٩،

١٥ی تەمموزی ١٩٥٨،

یەكسەر.

١- بە پێی لێكۆڵینەوەی بڵاوكراوەكانی ئێزگەی بەغدا دەركەوت لە نێوان ئەوانەدا كە برووسكەی پیرۆزباییان ناردووە بۆ حوكمەتی نوێی «عیراق -ك.م.» برووسكەی هیچ سەرەك هۆزێكی كورد و زۆربەی سەرەك هۆزانی ناوچەی فوراتیان تێدا نییە. ئەمە لەوانەیە زۆر بایەخدار بێ ئەگەر

(188) Ibid,, Telegram From Tehran, Cypher, No. 1148, August 8, 1958, To: Foreign Office, Distribution,: Foreign Office(secret), Whitehall (Secret), P.20.



عەبدولحەمید (حامید) بەگی مەجید بەگی وەسمان پاشای جاف

بێت و «نووری سەعید –ك.م.» بتوانێ پەنا بەرێتە لایان[189].

٢– ڕووباری دیجلە پڕییە لە بەلەمی چەکداری عێراقی)[190].

بەشی شەشەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی دوور و درێژی ن. پوولەر کە ڕۆژی هەژدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرانبەر شۆڕش و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(بەشی وڵاتی شام،

بابەت:

دەربارەی ڕووداوەکانی عێراق،

ڕای کوردە بایەخدارە بێ لایەنەکان،

لە:

میستەر ن. پوولەرەوە،

١٨ی تەمموز،

هەرچەندە ئەوەی ئاماژەی بۆ دەکەم بۆ ئێستاکە زۆر گرنگ نییە، بەڵام پێم وایە حەز دەکەن هەستی یەك دووانێك لە کوردە ناسراوەکان دەربارەی ڕووداوەکانی عێراق بزانن.

حامید جاف کە نوێنەری هەڵەبجەیە لە پەرلەمانی عێراقیدا و بێ گومان

---

[189] ڕۆژی پازدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ نووری سەعید هێشتا دەستگیر نەکرابوو.

[190] N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, From: Basra, Her Majesty`s Consul General, To: Foreign Office, Cypher, No.39, July 15, 1958, Immediat, P.22.

زانیاریتان دەربارەی هەیە، دەڵێ تاکە دۆڕاوی ڕاستەقینە لە شۆڕشی عیراق کوردە، کە عەبدولناسریان خۆش ناوێ و بەوە قایل نابن شوێنێکی بچووکیان لە یەکیەتی عەرەبیدا بە ڕەهبەریی ئەو هەبێت. حامید «بەگی جاف –ك.م.» گوتیشی ئەگەر جۆرە پشتگیرییەکی ڕۆژئاوا بۆ ئاواتی سەربەخۆیی ئەوان هەبووایە کورد حەزیان دەکرد بجەنگن، بەلام ئەو نەیتوانی بە درێژی بلێ مەبەستی تەواوی ئەو سەربەخۆییە چییە. هەرچۆن بێ حامید جاف دڵنیایە لەوەی کوردی باشوور و باکووری عیراق یەك دەگرن و پێکڕا دەتوانن کاروباری خۆیان بە ڕێوە ببەن. ویڕای ئەوەی گوتیشی ئەو هەمیشە ڕووبەڕووی بەغدا داوای سەربەخۆیی کوردی کردووە، بەلام لەوەدا سەرنەکەوت، چ سەرەك وەزیرانی پێشووی عیراق و چ وەزیری ناوخۆ[191] ئامادەن کورد بە تەواوەتی بفرۆشن. بە پێی بۆچوونی حامید جاف[192] عەقڵ نایبڕێ کورد لە پێناوی مەلیکی پێشووی عیراقدا بجەنگن کە ئەوان تەنانەت ڕێزیشیان نەدەگرت، تەنانەت لەوەیشدا کە سوێندی دڵسۆزییان بۆی خوارد ڕاستگۆ نەبوون. کە گوتیشی زۆر کەس هەن، تایبەت لە نێو لاوانی کورددا، ئاماژەی بۆ ناوی کەس نەکرد، هەروەها بێ دەنگیش بوو کاتێك پێیم گوت لەوانەیە بەڵگەی سەلمێنەری بۆچوونەکانی هەبن. هەرچی پێوەندیشی بە

---

[191] مەبەست ئەحمەد موختار بابان و سەعید قەزازە، پێم وا نییە هەڵوێستی حامید بەگی جاف بەرانبەر ئەحمەد موختار بابان و تایبەت سەعید قەزاز بەو جۆرە بووبێ.

[192] بەهێ خانی کچی حامید بەگی جاف کە تا ئێستا نیشتەجێی لەندەنە دەڵێ: کاتێك شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ بەرپا بوو باوکم لە بەغدا بوو، بەلام بە پێی دەقی بەڵگەنامەکە وەها دیارە ئەو ڕۆژانە حامید بەگ لە لەندەن بووە، چونکە دەقی بەڵگەنامەی ناوبراو لێرەدا دەڵێ:

"Although it is of minor importance at the moment, you may like to know the reactions of one or two fairly prominent kurds who are in London, to Events in Iraq.
Hamit Jaf, a deputy from Halebja, about whom you no doubt have Information...."(Ibid,P.24).

سووتاندنی کۆشکەوە و کوشتنی ئەوانەی تێیدا بوون هەمان هەڵوێستی هەبوو، سەریشی لەوە سوڕما چۆن چاوەڕوان دەکرا پۆلیس و سوپا بیپارێزن.

ئەم پرسیارانەی سەرەوەو وەڵامەکانیان پازدە دەقیقەیان خایاند و لەو ماوەیەدا نەمویست بە هیچ جۆر لێی دوور بکەومەوە و دەمویست چەند بتوانم بیبزوێنم بۆ ئەوەی ڕاستییەکانی لێ دەربهێنم، پێموایە حامید بەگ ژمارەیەك لە پرسیارەکانمی بە دڵ نەبوو، بەڵام هەمیشە بە شێوازێکی یەکجار ڕێکوپێك وەڵامی دەدامەوە. چ ئەو و چ ئەوانەی وەك ئەون و زۆریشن هەموو کات جێگەی بڕوا نین و ئامادەن بۆ قۆستنەوەی ئەو دەرفەتانەی لە سەرەوە دێن و هەرگیز هەنگاوێکی عەمەلییان بەرەو سەربەخۆیی نەناوە، بەڵام هەمیشە ڕۆڵێکی سەلبیی بەهێزیان هەیە بە دەستووری درکێك لە بڕبڕاگەی دەسەڵاتداراندا. نەوتی کەرکووك نەوتێکی کوردییە «وەك چۆن ئەوەم عەرزی سام فەیل[193]ی کردووە» وێڕای ئەوەی بێ گومان ئەوان ئەگەر بێت و بیانەوێ، توانایان هەیە هەردووك بەربەستەکەی باکوور بڕووخێنن[194].

کوردی دووەم عەبدولقادر بابانی خەڵکی کەرکووکە کە نەیتوانیوە باش لە ڕووداوەکانی عیراق تێبگا. ئەویش وەك حامید جاف گوتی کورد بە بارودۆخی ئێستای عیراق قایل نییە. ئەو لەو بڕوایەدایە فیرقەی دووی سوپای عیراق دژی بەغدا دەبزوێ «هەروەك چۆن بە ڕەهبەریی سەرکردەکەی ئەوسای جەنەڕاڵ ساڵح زەکی کردی»، بابانیش بارودۆخی باڵوێزخانەی بەریتانی وەبەر چاو نەگرت، بەڵام دۆستی بەریتانیایە، هەر چەندە تاوەکو ڕادەیەك پیاوێکی بێ دەسەڵاتە و بیر لەو مەترسییانە دەکاتەوە کە لەوانەیە

---

(193) مەبەست سامۆئێل فەیلە (Samuel Falle) کە ئەوساکە یەکێك بوو لە کارمەندانی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا. دەربارەی پوختەی ژینامەی فەیل بڕوانە پەراوێزی ژمارە ۱۷۱.

(194) مەبەستی هەردووك بەربەستی دوکان و دەربەندیخانە.

تووشیان بێت، وەك ئەندامێكی بنەماڵەی بابان ئێستا بگەڕێتەوە عیراق، بێ گومان هەمان كات پۆستی قایمقامی كەركووكی لە كیس دەچێ.
نموونەی سێیەمی كورد كاكە حەمەی خانەقایە كە یەكێكە لە پەرلەمانتارە چەپڕەوە نوێكانی ناو حوكمەتی پێشوو، چاوەڕوانیش نەدەكرا قسە بكات. ئەو لە هەر شت پتر دژی بەریتانییەكانە، هەرچەندە لەوانەیە هەڵوێستی خۆی لەو بوارەدا بگۆڕێ.
كوردەكان شڵەژاون و بێ ڕەهبەرن و لەوانەیە ئێستاكە زەرەرمەند بن، لەگەڵ ئەوەیشدا بەڵگە بە دەستەوەن كە ئەوان بە هەر حاڵ حەز ناكەن بخرێنە سەر توركیا و لەوانەیە لەگەڵ ڕژێمی نوێی عیراق پێك بێن، هەر چەندە لەوانەیشە ببنە هۆی نانەوەی كێشە بۆ كۆماری نوێ. هەرچی ڕۆڵی خالید نەقشبەندیشە[١٩٥]. وەك ئەندامی ئەنجوومەنی سەركردایەتیی شۆڕش لە هەڵوێستی هەمووان سەر سوڕهێنەرترە، ئەوەی بە لای منیشەوە هەر وایە. تۆ بۆ خۆت دەتوانی لە كاتی ئەم گەشتەی دواییدا لە بەریتانیا ببینی. بێ گومان بۆ ڕازیكردنی كورد ئەو پۆستەی دراوەتێ تاوەكو كەمتر دژی ڕژێمی نوێ بن. ئەو كوردانەی «قسەم لەگەڵیاندا كرد-ك.م.» كەم باسی خالید نەقشبەندیم لەگەڵ كردن.
هەرچی هەستی عەبدولناسریشە بەرانبەر بە كورد وەك لە ڕادیۆدا باسی دەكرێ دوور نییە گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی كاری تێ بكات. پێم وایە عەرەبی عیراق زۆر بە وردی دەڕواننە ئەم بۆچوونە.
هیچ كام لەوانەی سەرەوە نهێنی نین)[١٩٦].

---

[١٩٥] خالید نەقشبەندی پیاوێكی هێمن و بێ وەی بوو، بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ زۆر ناسراو نەبوو، ئەفسەر بوو لە سوپای عیراقیدا و بەر لە بەرپابوونی شۆڕش لەگەڵ عەبدولكەریم قاسمدا كاری كردبوو، هەر لەبەر ئەوەیش كرایە یەكێك لەو سێ ئەندامەی «ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش- مجلس قيادة الثورة»یان پێكهێنا كە دەبوو یەكێكیان كورد بێ.

[198] N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, PP.24-25.

بەشی حەوتەمی هەمان فایل بۆ سێ برووسکەی هەولێر و سلێمانی تەرخان کراون کە ڕۆژانی بیست و چوار و بیست و حەوتی تەمموز و شەشی ئابی سالّی ١٩٥٨ ناردوویانن بۆ هارۆڵد ماکمیلانی [١٩٧] سەرەك وەزیرانی بەریتانی بۆ پشتگیری کردنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

برووسکەی یەکەم

(بۆ:

میستەر هارۆڵد ماکمیلانی سەرەك وەزیرانی بەریتانیای گەورە،

لەندەن،

٢٤ی تەممووزی ١٩٥٨،

لە: سلێمانییەوە.

ئێمەی کوردی کوردستانی عێراق و دانیشتووی شاری سلێمانی لە ناخی دەروونەوە پشتگیری کۆماری نوێی عێراق دەکەین، کە بە کارێکی پاڵەوانانەی سوپا گەورەکەمان ڕۆژی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨ دامەزرێنرا، کارێك کۆتایی بە فەرمانڕەوایی پاشایی بێزراوی تەمەن چل سالّی هێنا کە فەرمانڕەواییەکی تۆقێنەری قێزەون بوو، هەروەها ڕادەی بۆ ئاغا ئیمپریالییەکانیان دانا. هەمان کات ئێمە ئامادەین شان بەشانی برا عەرەبەکانمان بەرگری لە کۆماری عێراقی بکەین و بجەنگین بۆ پشتگیریی سوپا قارەمانەکەمان و پاراستنی سەربەخۆیی عێراق و زۆر بە توندی دژی

---

[١٩٧] هارۆڵد ماکمیلان (Harold Macmillan) یەکێکە لە دیپلۆماسییە بەناوبانگەکانی بەریتانیای هاوچەرخ، ڕۆژی دەی شوباتی ١٨٩٤ لە لەندەن لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە نێوان سالآنی ١٩٥١ و ١٩٥٤دا چەند جارێك بووە وەزیری بەرگری و هەندەران و لە نێوان سالآنی ١٩٥٧ و ١٩٦٣یشدا بووە سەرەك وەزیران و ڕۆڵێکی گەورەی لە پتەو کردنی پێوەندییەکانی نێوان بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بینی، لە دوا سالآنی تەمەنیدا هارۆڵد ماکمیلان بووە بەڕێوەبەری دەزگای بلآوکردنەوەی بنەماڵەکەی تاوەکو ڕۆژی بیست و نۆی مانگی کانوونی یەکەمی سالّی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کرد.

هـەموو جـۆرە دەسـتتێوەردانێكی بیـانین لـە كاروبـاری نـاوخۆی عیراقـدا بـۆ ئـەوەی ڕێگـە نـەدەن گـەلی عـیراق بـە دڵـی خـۆی ئـەو ڕژێمـەی دەیـەوێ دایبمەزرێنێ، داواش لە جـەنابتان دەكـەین دەسـەلاَتی بـەرزی خۆتـان بخەنـە گەڕ لە پێناو پاراستنی ئاشتیی جیهان و مافی چارەنووسیی گەلان. هەر بژی كۆماری عیراق.

سێ هەزار و پێنج سەد ئیمزا و دە هەزار خۆنیشاندەر)[۱۹۸].

<u>بررووسكەی دووەم:</u>

(بۆ:

میستەر هارۆلد ماكمیلانی سەرەك وەزیران،

لەندەن،

۲۷ی تەمموزی ۱۹۵۸،

ئەربیل،

ئێمەی كوردی كوردستانی عیراق و دانیشتووی شاری ئـەربیل لـە نـاخی دەروونـەوە پشـتگیریی كۆمـاری نـوێی عـیراق دەكـەین، كـە بـە كـارێكی پاڵەوانانەی سوپا گەورەكەمان ڕۆژی چواردەی تـەمموزی ۱۹۵۸ دامـەزرێنرا، كارێك كۆتایی بە فەرمانڕەوایی پاشایی بێزراوی تەمـەن چـل ساڵی هێنـا كـە فەرمانڕەواییـەكی تۆقێنـەری قێـزەون بـوو، هـەروەها ڕادەی بـۆ ئاغـا ئیمپریالییـەكانیان دانـا، هـەمان كـات ئێمـە ئامـادەین شانبەشـانی بـرا عەرەبەكانمان بـەرگری لـە كۆمـاری عـیراق بكـەین و بجـەنگین بـۆ پشـتگیریی سوپا قارەمانەكەمان و پاراستنی سـەربەخۆیی عـیراق و زۆر بـە تونـدی دژی هەموو جۆرە دەستتێوەردانێكی بیانین لە كاروباری ناوخۆی عیراقدا بۆئەوەی ڕێگە نەدەن گەلی عـیراق بـە دڵـی خـۆی ئـەو ڕژێمـەی دەیـەوێ دایبمـەزرێنێ، داواش لە جەنابتان دەكەین دەسەلاَتی بـەرزی خۆتـان بخەنـە گـەڕ لـە پێنـاو

([198]) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, PP.27-33.

پاراستنی ئاشتیی جیهان و مافی چارەنووسیی گەلان. هەر بژی کۆماری عیراق.

بەسام مستەفا و ١٧٨١ ئیمزا) [١٩٩].

<u>برووسکەی سێیەم:</u>

بۆ:

میستەر هارۆڵد ماکمیلان،

لەندەن،

ئینگیلتەرە،

٦ی ئابی ١٩٥٨،

ئەربیل،

عیراق.

ئێمەی کوردی کوردستانی عیراق لە ناخی دەروونەوە بە خوێن کۆمارەکەمان دەپارێزین کە بەرهەمی خەباتی کورد و عەرەبە. هەر بژین.

سەید عەزیز و ٤٦٣ ئیمزا.

ئەربیل) [٢٠٠].

بەشی هەشتەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی پرسی کورد دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ و قسەکانی جەنەڕاڵ بەختیار دەربارەی پێوەندیی کورد بە ئێرانەوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە:

---

(199) Ibid,PP.37-41.

(200) Ibid, P.44.

تارانەوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

دابەشکردنی وەزارەتی هەندەران، «نهێنی» و هۆڵی سپی «نهێنی»،

سێر ر. ستێڤینس[٢٠١]،

ژمارە ٦٥٥،

١١ی ئابی ١٩٥٨،

بۆ ئاگاداری وێنەی لێ دەدرێتە:

ئەنقەرە،

عەممان،

بێروت،

واشنتۆن،

ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست.

١- نیشانە بە برووسکەتان ژمارە١١٤٧ و ١١٤٨ دەربارەی پرسی کورد.

نە من و نە باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لێرە قسەکانی جەنەراڵ بەختیارمان بە هەند وەرنەگرت. ئێرانییەکان ئەو جۆرە قسانە بە کارێکی ئاسایی ڕۆژانەی خۆیان دادەنێن، هەرچی بەختیاریشە کەسایەتییەکی یەکجار ئێرانیستە.

---

[٢٠١] سێر ڕۆجەر بێنثەم ستێڤینس (Sir Roger Bentham Stevens) ڕۆژی هەشتی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٦ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە نۆزدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ەوە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، لە بۆینس ئایرس و ڤالێنسیا و دێنڤەر و واشنتۆن و ستۆکهۆڵم کاری کردووە و لە حەفتەی شوباتی ساڵی ١٩٥٤دا بۆ ماوەیەك بووە باڵوێزی فەوقەلعادەی بەریتانی لە ئێران و پاش ئەوە بە ماوەیەك گوێزرایەوە بارەگای وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1959", London, P.426.

٢- وەك لە حیكمەتەوە تێگەیشتم قسەكانی بەختیار تاوەكو ڕادەیەك بوونەتە هۆی نیگەرانیی، حیكمەت گوتی ئەو فەرمایشتانە دەربارەی كێشەی كورد توركیاشیان دەگرتەوە، بەڵام بە شێوازێكی نەرمونیان، واتا ئەوەی وەبەرچاو گرتووە كە پێویستە بەرهەڵستیی پڕۆپاگەندەی قاهیرە بكرێ چ دژی تورك و چ لە كوردستان.

تكا لە وەزارەتی هەندەران دەكەم وێنەی ئەم نامەیەم بنێرن بۆ ئەنقەرە و عەممان و واشنتۆن وێڕای ئەم برووسكانەم - ژمارە ٩٤ و ٣ و ٣٠ یەك لە دوای یەك [(٢٠٢)].

بەشی نۆیەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەكی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی پرسی كورد دوای بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

(لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

تاران،

ژمارە ٥٨/١٨٢١،

١٤ی ئابی ١٩٥٨،

نهێنی،

بۆ:

بەڕێز د. م. هـ. ڕیچس [(٢٠٣)]،

---

(202) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, From: Tehran, To: Foreign Office, Cypher/ OTP, Foreign Office (Secret) and Whitehall (Secret)Distribution, Sir Stevens, No.55,August 11,1958, Priority, PP.46-47.

(٢٠٣) دێرێك مارتین هەری ڕیچس (Derek Martin Hurry Riches) ڕۆژی بیست و شەشی تەمموزی ساڵی ١٩١٢ لە دایك بووە، زانكۆی لە لەندەن تەواو كردووە، لە ڕۆژی بیستی

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن،

س. دەبل یو. ١،

دێرێکی خۆشەویست.

١- نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٦٥٥ی ڕۆژی یازدەی ئابم دەربارەی کورد.

٢- لەوانەیە لەو ڕۆژەوەی برووسکەکەی ژمارە ١٢٧٦ی ئەنقەرەم خوێندۆتەوە حەز بکەیت دوا بۆچوونم دەربارەی هەردوو برووسکەی ١١٤٧ و ١١٤٨ات لە بەر ڕۆشنایی برووسکەکەی ئەنقەرەدا بزانیت.

٣- لێرە یەکجار نیگەرانن دەربارەی ڕووداوەکانی کوردستان کە بوونەتە بابەتێکی لێدوانی سیاسی.

هۆی ئەمە تاوەکو ڕادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ کێشە چاوەڕوان کراوەکانی کوردستانی ئێران کە لە نامەی ژمارە نەوەد و پێنجی ڕۆژی نۆی تەممووزمدا، واتا بەر لە کۆدێتاکەی عیراق، باسیم کردووە. لەو کاتەوەیش کە پڕۆپاگەندەی عەرەبی پەرەی سەندووە مەترسیی ئەوەیش هاتووەتە ئاراوە کە پڕۆپاگەندەیەکی لەو جۆرە کار بکاتە سەر کوردی ئێران. هەر لە گۆشەنیگای ئەم ڕاستییەشەوە هەولم داوە هەلوێستی حوکمەتانی تورکیا و

---

کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٤ەوە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و یەکسەر کرایە جێگری کونسولی بەریتانی لە بێرووت و شوباتی ساڵی ١٩٣٧ بڕوانامەی لە زوبانی عەرەبیدا وەرگرت، پاش ماوەیەك لە قاهیرە کرایە یاریدەری سکرتێری ڕۆژهەلاتیی بالوێزی بەریتانی، هەژدەی شوباتی ساڵی ١٩٤١ گوێزرایەوە حەبەشە و وێرای بارەگای وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە کابوول و جەددە و خەرتووم کاری کردووە و لە بیست و چواری تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥ەوە کراوەتە سەرۆکی «بەشی ڕۆژهەلات» لە بارەگای وەزارەت، لە ڕۆژی بیست و پێنجی ئابی ساڵی ١٩٥٨یشەوە کراوەتە سەرۆکی «بەشی ولاتە عەرەبییەکان» لە بارەگای وەزارەت. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960", London, P.347.

ئێران ڕوون بکەمەوە. لەبەر ڕۆشنایی ڕووداوەکانی ئێستادا دەتوانم بڵێم بڕوا ناکەم ئێرانییەکان بیر لە هاندانی کوردی دەرەوەی ئێران دەکەنەوە. هەرچۆن بێ ئێرانییەکان بە پێچەوانەوە بیر لە هاندانی کورد لە لایەن عەرەبەوە دەکەنەوە و تاوەکو ڕادەیەکیش گومان لەوە دەکەن ئاخۆ شێوازی ئەو هاندانە چۆن دەبێ.

٤- ئەوەی کە جەنەڕاڵ بەختیاریش گوتوویە گوایە کوردی عیراق و سووریا لەوانەیە داوای یەکگرتن لەگەڵ ئێراندا بکەن بەلای منەوە قسەیەکی بێ مانایە. بارودۆخی کوردی عیراق لەگەڵ بارودۆخی کوردی ئێراندا بەراورد ناکرێ و من بۆخۆم ناتوانم بڕوا بکەم کەسێك لێرە هەبێ بیر لەوە بکاتەوە گوایە کوردی عیراق دەیانەوێ بدەنە پاڵ ئێران.

٥- هەر چۆن بێ دوو ئەگەری دیکە لە برگەی دووەمی برووسکەکەی ئەنقەرەدا هاتووە کە ئەوانیش بریتین لە ئەگەری دەوڵەتێکی کوردیی تابیع و ئەگەری بوونی عیراق بە ئەندامی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو. بێ گومان یەکەمیان دەبێتە سەرکەوتنێکی گەورەی پڕۆپاگەندەی عەرەب لە نێو کورددا کە دوور نییە ببێتە هۆیەکی سەرەکیی بۆ کوردی ئێران و کوردی تورکیاش بۆ ئەوەی دژی فەرمانڕەوایانی ئێستایان ڕاپەڕن. ئێرانییەکان ئامادەن چییان لە تواناندا بێ بیکەن بۆ ئەوەی نەهێڵن شتێکی لەو جۆرە ڕوو بدات و دوور نییە هەوڵ بدەن پەنا بەرنە بەر پێچەوانەی ئەوە، واتا هەستی پان کوردیزمی عیراقی ببزوێنن، بەلام پێموا نییە هێشتا بارودۆخەکە گەیشتبێتە ئاستێکی وەها، یان ئەوان ئەوە بە ڕێبازێکی زۆر گەشبین ببینن.

٦- ئەگەرێکی دیکە لە ئارادایە کە ئەویش بریتییە لەوەی لەوانەیە عیراق بداتە پاڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو، ئەوەی لای گەلێك لایەن وەرچەرخانێکی ناپەسندە، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا وەهای بۆناچم ئێرانییەکان لە حاڵەتێکی وەهادا پەنا بەرنە بەر هیچ جۆرە دەستتێوەردانێك لە ڕێگەی کوردەوە، یان لە هەر ڕێگەیەکی دیکەوە بێ. من بۆخۆم هەر چۆنێك بێت ئێرانییەکان هان دەدەم لە بواری کوردی عیراقدا کار بکەن و

تێیان بگەیێنن کە ئەوان لە ئۆقیانووسێکی عەرەبدا نقوم دەبن و پێناسەی نەتەوەیی خۆیان دەدۆڕێنن. لەوانەیە کورد وەها هەست بکەن بۆ ئەوان باشتر وەهایە ئەندامێکی سەربەخۆ بن لە کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا وەك لەوەی هەنگاوێك بنێن بۆ بەستنەوەی کوردی عیراق بە ئێرانەوە، یاوەخود ببنە هۆی هیچ جۆرە ئاڵوگۆڕێکی سنوور لە ڕێگەی هێزەوە.

٧- من بۆ خۆم وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانمان لە ئەنقەرە و عەممان و بێرووت و واشنتۆن و بۆ سکرتێری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا) (٢٠٤).

بەشی دەیەم، کە هەمان کات دوا بەشی ئەم فایلەیە تەرخان کراوە بۆ چەند بەڵگەنامەیەك دەربارەی هەمان بابەت و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامانەیە:

(لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

بەغدا،

نهێنی،

بابەت: زانیاری دەربارەی کوردستان،

١٤ی ئابی ١٩٥٨،

بۆ:

بەشی وڵاتی شام،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن س. دەبل یو. ١،

---

(204) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, From: British Eambassy, Tehran, No. 1821/58 August 14, 1958, Confidential, To: D.M.H.Riches Esq., C.M.G., Foreign Office, London, S.W.1., pp.48-50.

بەشی ولآتانی شامی خۆشەویست،

١- وا هاوپێچ بۆ ئاگاداریتان ئەو تێبینییانەی سکرتێری باڵوێزخانەکەمان میستەر بەلفۆرتان[٢٠٥] بۆ دەنێرم کە بریتین لە پوختەی ئەو زانیارییانەی لە ڕێگەی میستەر ولیەم ئەمینی کارمەندی باڵوێزخانەی حوکمەتی خاوەن شکۆ لە تاران پێمان گەیشتووە، میستەر ئەمین ڕۆژانی بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمموز لە عیراق بووە و چەند ڕۆژێکە گەڕاوەتەوە تاران، هەر چەندە قسەکانی زۆرن، بەلآم وەك خۆیان بۆتانی دەنێرین چونکە پێمان وایە ئاماژەی بۆ گەلێك خاڵی بایەخدار کردووە.

٢- لە کاتێکدا ئێمە لەو بڕوایەداین کە هەڵوێستی کوردی عیراق دەربارەی بابەتی دانە پاڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو جیاوازە، بەلآم بەشی هەرە زۆری کورد دژی یەکیەتی عیراقن لەگەڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا، ئەوەی کار دەکاتە سەر هەڵوێستی حوکمەتی نوێی عیراق وەك هەر هەنگاوێکی دیکە لەو بوارەدا. هەر چۆن بێ گومان لەوە ناکرێ کە حوکمەتی نوێی عیراق کێشە بۆ خۆی دەنێتەوە ئەگەر ئاگاداری ئەوە نەبێ چۆن دەبێ ڕەفتار لەگەڵ کورد و هەر کەمینەیەکی دیکەی ولآتدا بکات.

---

[٢٠٥] رایمۆند لویس بەلفۆر (Raymond Lewis Balfour) ڕۆژی بیست و سێی نیسانی ساڵی ١٩٢٣ لە دایك بووە، لە تەممووزی ساڵی ١٩٤٢وە تاوەکو مایسی ساڵی ١٩٤٧ لەگەڵ هێزەکانی سوپای بەریتانیدا کاری کردووە، لە ڕۆژی بیست و نۆی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ەوە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و گوێزرایەوە فرانکفۆرت و لە هەژدەی شوباتی ساڵی ١٩٤٨ەوە گوێزرایەوە میونیخ و ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٩گوێزرایەوە بێروت و ڕۆژی شەشی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ گوێزرایەوە ژدانسك لە یەکیەتی سۆڤیەت و ڕۆژی بیستی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٤ گوێزرایەوە بارەگای وەزارەت لە لەندەن و لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٦یشەوە کرایە جێگری کونسوڵ لە بەغدا و لە ئابی ساڵی ١٩٦٠یشدا گوێزرایەوە خەرتووم. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1963", London, P.117.

٣- ئێمە هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەماندا وێنەی دیکەی خودی نامەکە و هاوپێچەکەیتان بۆ دەنێرین بۆ ئەوەی بۆخۆتان بیاننێرن بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران لەبەر ئەوەی هیچ هۆیەکی پێوەندیی ڕاستەوخۆمان پێوەی نییە.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا) [٢٠٦].

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەگێڕانی خودی قسەکانی ولیەم ئەمینن: (نهێنی،

١- میستەر ولیەم ئەمین یەکێکە لە کارمەندانی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران، بۆخۆی کوردە بەڵام بە هەست بەریتانییە، دەوروبەری هەشت حەفتە لەمەوبەر بۆ سەردانی کەسوکاری چووە سلێمانی و میستەر ولیەم دوای گەیشتنی پێوەندیی پێوەکردم و لەو دیدەنییەدا گەلێك قسەی بایەخداری بۆ کردم کە وا بۆ ئاگاداری بۆتانی دەنووسم. شایانی باسە میستەر ئەمین کاتی خۆیشی لە قبرص و ناوچەی کەناڵی سوێس لەگەڵ بەریتانییەکاندا کاری کردووە. ڕۆژی بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز ئەو لە سلێمانی بوو، بەڵام سێ ڕۆژ لەمەوبەر هاتە بەغدا بۆ ڕێکخستنی کاروباری گەڕانەوەی بۆ تاران، پێم وایە تێبینییەکانی گرنگن.

٢- ئێزگەیەکی کوردی هەیە بەناوی «دەنگی هەق - صوت الحق»ەوە کە هەموو ئێوارەیەك بۆ سێ چارەك سەعات پرۆگرامەکانی خۆی پەخش دەکات. ئێزگەی ناوبراو بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمووزیش پرۆگرامەکانی خۆی لە قاهیرەوە لەسەر هەمان شەپۆل بلاو دەکردەوە. میستەر ئەمین پێی

---

(206) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Levant Department, Subject: InFromation on Kurdistan, From British Embassy, Baghdad, August 14,1958, Secret, To: Levant Department, Foreign Office, London, S.W.1., PP.51-52.

وایە لەبەر ئەوەی ناوەرۆکی پرۆگرامەکانی ئەو ئیزگەیە وەك پرۆگرامەکانی جاران نییە دەبێ هەمان ئیزگە پرۆگرامەکانی ئێستای بە هەمان شێواز باسی سەربەخۆیی کوردستان بە ڕەهبەریی ڕەشید عالی دەکات کە ئەویش بێ گومان دژی سیاسەتی ڕاگەیێنراوی حوکمەتی شۆڕشە، ئەو ئیزگەیە زۆر جاران دژی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو دەدوێ.

٣- بە پێی قسەی میستەر ئەمین لە کوردستان پێشوازیی لە شۆڕش کرا، لەگەڵ ئەوەیشدا ماوەیەکی زۆری خایاند تاوەکو هیچ نامەیەك یان وەفدێکی پیرۆزباییان بۆ بەغدا نارد، هەر چەندە شێخ لەتیفی برای بابە عەلی یەکێك بوو لەو بەندە سیاسییانەی زۆر زوو ئازاد کران. ئەوەی کورد سڵی لێ دەکەنەوە بریتییە لەوەی عیراق ببێتە ئەندامی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو. بە لای ئەوانەوە هەستی عەبدولناسر بە لای نەتەوەپەرستیی عەرەبدا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا وەك کەمینەیەك لە دەوڵەتێکی عەرەبیی یەکگرتوودا ناگونجێ، هەڵبەت لە دەوڵەتێکی لەو جۆرەدا سەنگیان وەك کەمینەیەك تەنانەت لەوەیش کەمتر دەبێ.

٤- میستەر ئەمین گوتیشی کاتێك کۆلۆنێل عەبدولسەلام عارف چووە زیارەتی شاری سلێمانی چوار ڕەهبەری کوردی لەگەڵدا بوو، یەکێکیان بابە عەلیی و ئەوی دیکەیان خالید نەقشبەندی بوو «نەقشبەندی لە سەردانەکانی کۆلۆنێل عارفدا بەشداری دەکات» و هەر ئەویش پرسیویە کە ئایا وەك دەستووری لوبنان یەکێك لەو دوو پۆستە - سەرەك کۆمار یان سەرەك وەزیران دەدرێتە کورد و پۆستەکەی دیکەیش لە لایەن عەرەبێکەوە پڕ دەکرێتەوە، لە وەڵامدا کۆلۆنێل عارف گوتوویەتی جارێك زووە هیچ گفتێك بدرێ، یان هیچ دەربارەی دەستوور بگوترێ.

٥- دەنگوباوێکی دیکە لە ئارادایە کە سەعید قەزاز و بەهجەت عەطیە لە شاری سلێمانی لە سێدارە دەدرێن. وا دیارە ئەو دوو کاربەدەستەی ڕژێمی پێشوو لای کورد زۆر بێزراون، چونکە ئەوان بوونە هۆی بەندکردنی شێخ لەتیف و ڕێگەیان نەدا لە ناشتنی باوکیدا بەشدار بێ.

٦- میستەر ئـەمین سـێ دواڕۆژی لەگـەڵ هـاوڕێ عەرەبـەکانی لـە بەغـدا بردە سەر و یەك دوو تێبینیی سەرنجڕاکێشیش لەم بارەیەوە هەیە:

(أ) سەعات یەك بە کاتی ناوخۆ هەموو ڕۆژێك پرۆگرامێك لەسەر شـەپۆلی سی و دوو مەتریی کورت پەخش دەکرێ و لە بەغدا بە ئاسانی دەبیسترێ کە دژی قاسم و دژی شۆڕش وتار بڵاو دەکاتەوە. ئێزگەکە هەمیشە هەوڵ دەدات جیاوازییـە ئاینییـەکان ببـزوێنێ، وەك ئـەوەی کـە هـەوڵ دەدات ئـەوە بسەلمێنێ کە حوکمەتی شۆڕش دژی ئایینە و وەك نموونە کوشتنی مـەلیکی سوننی مەزهەب فەیسەڵ و قەدەغەکردنی یادکردنەوەی مانگی موحەڕڕەم لـە لایەن شیعەکانەوە دەهێنێتەوە. بە شـێوازی قسـەکردنی ئێزگەکـەدا میسـتەر ئەمین وەهای بۆ دەچێ ئێزگەی «إخوان المسلمين» بێ.

(ب) لـەم دواییانـەدا لـە ڕۆژنامـە عێراقییەکانـدا باسـی ئـەوە دەکـرێ ژمارەیەکی زۆر لە موزیعەکانی ڕادیۆی بەغدا میسرین «مـن بۆخـۆم وا دەچـێ بۆ پتر لە دوو حەفتە هەست بە ژمارەیـەکی زۆر لـەو کەسانە دەکـەم کـە لـە میسـری دەچـن لـە ئێزگـەی بەغـدا، ئـەوەیش دەزانم کـە دوو میسـری و سـووریيەك بـەردەوام پرۆگرامـەکان و جاروبـاریش هەواڵـەکان پێشـکەش دەکەن».

(ج) ڕۆژی حەوتی ئاب لە ئوتێلی سەمیرئەمیس لە یەکێك لە یاساوڵەکانی سەرەك وەزیرانی بیستووە، کـە نـاوی کۆلۆنێـل ئەحمـەدە، وردە ناکۆکییـەك لەنێوان لیوا قاسم و کۆلۆنێل عارفـدا لەسـەر هەڵوێسـت بەرانبـەر ئەنـدامێتیی عێراق لە کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا ڕووی داوە، لیوا قاسم لەگـەڵ ئـەوەدا نییە پەلە بکرێ و کۆلۆنێل عارفیش دەیەوێ بێ دواخستن جێبەجێ بکرێ.

(د) میستەر ئەمین گوتی بە پێی ڕاپۆرتی یەکێك لە ڕۆژنامە عێراقییـەکان «کـە وەرگێڕەکـەم لـە بـیری چـوو ناوەکـەی بنووسـێ» حوکمـەت بـیر لـەوە دەکاتـەوە گشـت ئاسـوورییەکان لەیـەك ناوچـەدا نیشـتەجێ بکـرێن. لـەم بارەیەوە میستەر ئـەمین گـوتی لەگـەڵ خوێنـدەوارێکی ئاسووریدا دواوە کـە پێـی گوتـووە ئـەوان لـەوە دەترسـێن لـە شارۆچـکەی دۆرە دوور بخرێنـەوە

چونکە دەزگای ئاسایش حەز ناکەن ئاسوورییەکان لە نزیک پالآوتەکانەوە «المصافي» بن، ئەمەیش دەبێتە هۆی زیانێکی ئابووریی گەورە بۆ ئاسوورییەکان چونکە ئەوان لە ماڵەکانی ئەو پرۆژەیەدا دەژین. بە پێی لێکدانەوەی گەلێك لە ئەفسەرانی هەراکەی ڕەشید عالیی ساڵی ١٩٤١ ئەو کارە پێوەندیی هەیە بە ڕووداوەکانی فەلووجەی ئەوساڵەوە. ئاسوورییەکان بۆ ئەوەی خۆیان لە ڕژێمی نویٚ نزیك بخەنەوە زۆر بە توندی خەتی سیاسیی دژی ئیمپریالیزمیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە و ڕێگەیان دراوەتیٚ یەکشەمەی ڕێککەوتی دووی ئاب خۆنیشاندانێك ساز بکەن، وێڕای ئەوەی پێنج سەد دیناری عیراقیشیان بۆ قوربانییەکانی پایتەخت بە هۆی سووتانی مەخزەنەکانی نەوتەوە کۆکردۆتەوە) (٢٠٧).

هەر لەم بەشەیشدا نامەیەکی نهێنیی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران دەربارەی قسەکانی جەنەڕاڵ بەختیار لەسەر کوردی عیراق و سووریا هەڵگیراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە: وەزارەتی هەندەرانەوە،

بۆ:

تاران،

بە شفرە و جانتای دیپلۆماسیی،

دابەشکردنی وەزارەتی هەندەران «نهێنی» و هۆڵی سپی «نهێنی»،

ژمارە ١١٤٨،

وێنەی بۆ:

عەممان ژمارە ٣٦٢،

بێرووت ژمارە ٥٣١،

---

(207) N.A., F.O., 371/134255, Kurds in Iraq, Confidential, PP.54-55.

واشنتۆن ژمارە ٣٨٣٣،

ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ژمارە ٧٠٨.

١- ئاماژە بە برووسکەی ڕاستەوخۆی پێشووم،

جەنەڕاڵ بەختیار لە قسەکانیدا مەبەستی ئەگەری هەوڵی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو بووە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی ئەوتۆ کە ببێتە پردێك لە نێوان یەکیەتی سۆڤیەت و کۆماری عەرەبیی یەکگرتوودا، بەم بۆنەیەوە سەرم سوڕماوە لە بڕگەی سێیەمی نامەی باڵوێزی بەریتانی لە ئەستەمووڵ کە ڕۆژی هەژدەی تەمموز ناردوویە بۆ «بەشی وڵاتانی شام» کە چۆن دەشێ تورك و ئێرانییەکان خەریکی خۆ ئامادەکردن نەبن بۆ کردارێك دژی کوردستانی عیراق کە بە نیازی دابەشکردنی لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا.

٢- بەختەوەر دەبم ئەگەر لەم بارەیەوە لە بۆچوونی خۆتانم ئاگادار بکەن [٢٠٨].

[208] Ibid, From: Foreign Office, To:Tehran, Cypher /TOP and Bag, Foreign Office, (Secret) and Whitehall (Secret) Distribution, No. 1148, August 8,1958, Reported for·inFromation To: Amman No.362, Beirut No.531, Washington No.3833. P.O.M.E.F. No. 708, P.53.

## کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا و
## شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ

لە بەشی هەشتەمی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا تیشک خراوەتە سەر گەلێك لایەنی چالاکییەکانی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا» وەك دەزگایەکی سیاسیی کوردایەتیی گرنگ کە سەرنجی زۆر لایەنی ڕاکێشابوو، کاتێکیش خەریکی ئامادەکردنی بابەتەکانی بەرگی دووەم بووم ژمارەیەك بەڵگەنامەی نوێم دۆزییەوە کە ناوەڕۆکیان تەواوکەری ناوەڕۆکی بەشی یەکەمە و زۆرتر ئەو پێشنیازە دەچەسپێنێ کە پێویستە یەکێك لە زانکۆکانی کوردستان پڕۆژەی نووسینی نامەیەکی دوکتۆرای مێژوویی دەربارەی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا» بگرێتە ئەستۆی خۆی وەك ئەرکێکی زانستیی پێویست.

ڕاستیەکەی تا ئێستا لە ئەرشیڤخانەی نیشتیمانیی بەریتانیدا فایلێکی سەربەخۆم دەربارەی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا» نەدیوە، بەڵکو لەو فایلانەی کە باسی خەباتی کورد و هەڵوێستیان بەرانبەر بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ دەکەن پڕن لە بەڵگەنامەی چڕوپڕ و بە نرخ دەربارەی چالاکییەکانی کۆمەڵەی ناوبراو. بە وێنە فایلی ژمارە ١٤٠٦٨٣/٣٧١ ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بەم ناونیشانەوەیەوە:

«بەشی ڕۆژهەلات، گشتی، نهێنی، ١٩٥٩» [٢٠٩].

فایلی ناوبراو ژمارەی لاپەڕەی لەسەر نییە، بە پێی ژماردنی خۆم حەفتاو پێنج لاپەڕەیە و لە شازدە بەش پێکهاتووە و سەرجەمی بەڵگەنامەکانی بۆ پرسی کورد لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨وە تەرخان کراون، یەکەم و گرنگترین بەشی ئەم فایلە

---

[209] N.A., F.O., 371/140683, Eastern Departmant., Confidential,1959.

بۆ «هەڵوێستی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا» تەرخان کراوە و ئەمەیش ناونیشانەکەیەتی:

(بەشی ڕۆژهەڵات، گشتی، ژمارە إی ٣١/١٨٢١، بابەت: ت.م.ئەمین [٢١٠]، کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد، ڕاپۆرت دەربارەی گفتوگۆ لەگەڵ باڵوێزی تورکیا «لە بەریتانیا–ک.م.» و داواکردنی گرتنی ت.م.ئەمین کە نامەیەکی ناردووە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ توێژینەوەی «پرسی–ک.م.» کورد [٢١١].

ئەم بەشە لە شەش لاپەڕە و نەخشەیەکی کوردستان پێکهاتووە، لاپەڕەی یەکەمیان بۆ ئەو زانیارییانە تەرخان کراوە کە دەربارەی تەحسین محەمەد ئەمین هەورامی دەست «بەشی ڕۆژهەڵات» کەوتوون و بە دەستخەت نووسراونەتەوە، تایبەت ئەوەی لە بەشی پاسپۆرتی بیانیانیان پرسیوە و ئەوانیش لە وەڵامدا بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»یان نووسیوە:

(ناوبراو خوێندکارە، دەوروبەری ساڵی ١٩٥٣ هاتۆتە بەریتانیا، لە دایکبووی شاری هەڵەبجەیە کە کەوتۆتە ناوچە کوردییەکانی باکووری عیراقەوە، ئەندامی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد»ە و هەرچۆن بێ لە بەشی پاسپۆرت بە دروستی نازانن هەمان ئەو تەحسین محەمەد ئەمینەی کۆمەڵەیە یان نا.

هەروەها بە هۆی نەبوونی ناوی تەواو و ئەدرێسییەوە ناتوانرێ بە دڵنیاییەوە بزانرێ کە ئایا هەر ئەوە کە ئەو نامەیەی ناردووە بۆ نەتەوە

---

[٢١٠] مەبەست تەحسین محەمەد ئەمین هەورامییە کە لە بنەماڵەی جافەر سوڵتانە و یەکێك لە ڕەهبەرە چالاك و دڵسۆزەکانی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا» بووە و بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بە چەند ساڵێك لە بەریتانیا خوێندوویە و لەنزیکەوە پێوەندیی زانستی بە ئێدمۆندسەوە هەبووە کە بایەخێکی تایبەتیی بە ناوچەی هەورامان دابوو «لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە ئەم زانیارییەم لە بەڕێز دوکتۆر کەمال فوئاد لە ئەڵمانیا وەرگرتووە».

[211] N.A., F.O., 317/140683, Eastern, Deparment, Confidential, 1959, General, No.1821/31. Subject: T.M.Amin-Kurdish Students Society, Rercord of Conversation with Turkish Ambassador- Request To retain T.M.Amin who had Addressed Leter To U.N.-discussion on Kurds.

یەکگرتووەکان. وێڕای ئەوەی تەحسین محەمەد ئەمین ناوێك لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٨دا بەریتانیای بەجێ هێشت و بە هۆی نەبوونی ناوی تەواو و ئەدرێسی ماڵەکەیەوە ناتوانین لەوە دڵنیا بین کە ئایا ئەو تەحسین محەمەد ئەمینە و نووسەری نامەکەی نێردراوە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان هەمان کەسن. وەها پێدەچێ هەردووکیان هەمان کەس بن، بەلاّم وەزارەتی ناوخۆ دەڵێ ناوبراو مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٨ بەریتانیای جێ هێشتووە و هیچیش بە دەستەوە نییە ئاماژە بۆ گەڕانەوەی بکات، ئەوەیش بۆخۆی ئەگەری ئەوە دروست دەکات کە لەوانەیە میستەر ئەمین کاتێك ئەو نامەیەی بە ناوی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردەوە ناردووە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان هەمان ئەدرێسی لەندەنی خۆی نووسیبێ.

شایانی باسە تەحسین محەمەد ئەمین هەڵگری پاسپۆرتێکی عیراقییە کە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٧ لە لایەن باڵوێزخانەی عیراقییەوە لە لەندەن پێی دراوە) [٢١٢].

بەڵگەنامەی دووەمی ئەم بەشە بریتییە لە نامەیەکی بێ مێژووی د.م.ڕۆس بۆ باڵویزخانەی تورکیا لە بەریتانیا دەربارەی تەحسین محەمەد ئەمین هەورامی کە ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە:

میستەر أ.د.م.ڕۆسەوە [٢١٣]،

---

(212) Ibid, PP.1-2.

(٢١٣) سێر ئارجیباڵد داڤید مانیستی ڕۆس (Sir Archibald David Manisty Ross) ڕۆژی دوازدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١١ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، فارسیی زانیوە، لە ڕۆژی چواردەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٦وە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، لە ئەڵەمانیا و سوید و ئێران و ئیتاڵیا و پورتوگال کاری کردووە، وێڕای بارەگای وەزارەت لە لەندەن، لە هەشتی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٢وە بووە سەرۆکی «بەشی ڕۆژ هەلاّت» لە وەزارەت و لە هەژدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٦یشەوە کرایە یەکێك لە یاریدەرانی جێگری وەزیری هەندەران. بروانە:

بۆ:

باڵوێزی تورکی،

١- دوای ئەوەی هەفتەی ڕابردوو لەسەر داوای جەنابتان یەکترمان دی پەیمانم دانێ پێتان ڕابگەیێنم کە ئەو تەحسین محەمەد ئەمینە کێیە، کە بە ناوی ئەو کۆمەڵەیەی کە پێی دەڵێن «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا»وە نامەی ناردووە بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی کورد.

٢- ئێمە ناتوانین بزانین ئایا ئەو میستەر ئەمینە هەمان ئەو کەسەیە، هەر چۆن بێ ئەگەر ئەو کەسە بێ کە بیرمان لێی کردۆتەوە ئەوا خەڵکی عیراقە و ئەوەندەی ئێمە ئاگادار بین ئێستا ئەو لە دەرەوەی ئەم وڵاتەیە)[٢١٤].

دوا بەدوای ئەمە گرنگترین نامەی ئەم بەشە هەڵگیراوە کە بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی دوور و درێژی هەمان سێر ڕۆس کە ڕۆژی سیازدەی مایسی ساڵی ١٩٥٩ ناردوویە بۆ چەند بەشێکی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی دیدەنییەکەی لەگەڵ باڵوێزی تورکیا و چییان دەربارەی تەحسین محەمەد ئەمین هەورامی گوتووە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە:

أ.د.م.ڕۆسەوە،

نهێنی،

١٣ی مایسی ١٩٥٩،

بۆ:

---

"The Foreign Office List and Diploamatic and Consular Year Book 1962", London, P.364.

(214) A.N., F.O., 371/140683, Eastern Deparment, Confidential, 1959, From: Mr. A.D.M.Ross, To: The Turkish Ambassador, P.3.

بەشی باشوور،

وێنەی بۆ:

سێر ف. هۆیێر میللەر[٢١٥]،

بەشی ڕۆژهەلات،

بەشی نەتەوە یەکگرتووەکان.

١- بالۆێزی تورکی ئەم بەیانییە بانگهێشتی کردم و گوتی گەلێك سوپاسم دەکات بۆ ئەو زانیارییانەی دەربارەی «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد» داوای کردبوو و ئێمە بۆمان ناردبوون و ویستیشی بە شێوازێکی تایبەتی و نافەرمی باسی ئەو نامەیە بکەین کە سەرۆکی لقی بەریتانیای «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد» ناردوویە بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی ئەوەی گوایە وەزعی کوردی تورکیا و ئێران خراپە. بە پێی بۆچوونی وەفدی تورکیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان نابێ دەزگای ناوبراو لە نامەی لەو جۆرە بکۆڵێتەوە و هەردووك حوکمەتی تورکیا و ئێران ناچار نین هیچ بایەخێکی پێ بدەن و لەم بارەیەوە ئەم دوو حوکمەتە پێوەندییان بە یەکترەوە کردووە و ئەوان پێیان وایە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەتوانێ میستەر ئەمین لە چالاکیی لەو بابەتە قەدەغە بکات.

---

[٢١٥] سێر فرەدریك ڕۆبێرت هۆییێر میللەر (Sir Fredreick Robert Hoyer Millar) ڕۆژی شەشی حوزەیرانی سالی ١٩٠٠ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، زوبانی عەرەبی زانیوە، لە ڕۆژی پازدەی حوزەیرانی سالی ١٩٢٢وە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، لە بەلجیکا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و میسر و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کاری کردووە، وێرای ئەوەی گەلێك پۆستی گەورەی دراوەتێ و چەند جارێك بووەتە نوێنەری بەریتانیا لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا و ڕۆژی چواری شوباتی سالی ١٩٥٧ کرایە جێگری وەزیری هەندەرانی بەریتانی و پاش چەند سالێك خۆی خانەنشین کرد. بڕوانە:

"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1962", London, P.310.

٢- من له وه‌لاّمدا بۆچوونی خۆمم پێی گوت كه‌ تـاوه‌كو ڕاده‌یـه‌كی زۆر ناتوانین هیچ دژی میسته‌ر ئه‌مین بكه‌ین چونكه‌ ئه‌و نامه‌یه‌ی ئه‌و ناردوویه‌ بـۆ سكرتێری گشتیی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان كارێك نییه‌ نه‌گونجێ له‌گه‌ڵ یاسـا و ڕژێم و نه‌ریتی بـه‌ریتانیادا. هـه‌روه‌ها ئه‌وه‌یشـم بـۆ بـاڵوێز ڕوون كـرده‌وه‌ كـه‌ گریمان میسـته‌ر ئـه‌مین تاوانبـار كـرا، بـه‌لاّم بـه‌ هـه‌ر جۆرێك كاربه‌ده‌سـتانی به‌ریتانیا توخنی بكه‌ون ئه‌و كاره‌ زیـانی لـه‌ قـازانجی زۆرتـر ده‌بێـت، زۆریـش به‌وه‌ به‌خته‌وه‌رم كه‌ ئاگادارتان بكه‌م باڵوێز ته‌واو له‌گه‌ڵ بۆچوونه‌كانمدا بـوو، گفتیشم پێی دا هه‌وڵ بده‌م بـه‌ دروسـتیی بـزانم میسـته‌ر خـه‌ڵكی چ ولاّتێكـه‌، «پێشم گوت ئه‌گه‌ر ئه‌و تورك بێ ئه‌وساكه‌ له‌وانه‌یه‌ حوكمه‌تی توركیـا بتـوانێ ڕێگـه‌ نـه‌دا لـه‌م ولاّتـه‌دا بمێنێتـه‌وه‌ هه‌رچـه‌نده‌ نـه‌ م.بێرگـی[٢١٦] و نـه‌ مـن ئاماژه‌مان بۆ ئه‌گه‌رێكی وه‌ها نه‌كرد».

٣- له‌ گفتوگۆیه‌كی گشتیدا ده‌رباره‌ی كورد م. بێرگی گوتی: كێشه‌كه‌ و ڕێبازی چاره‌سه‌ركردنی له‌ هه‌رسێك ولاّت «واتا له‌ عیراق و توركیـا و ئێـران — ك.م.» جودایه‌ و به‌ هه‌ر حاڵ كاریگه‌ریی ده‌ره‌وه‌ زۆرتره‌ وه‌ك لـه‌ كاریگـه‌ریی ناوخۆ، هه‌رچی ئێرانه‌ ڕووسه‌كان كاریان بۆ دامه‌زرانـدنی ده‌وڵـه‌تێكی كـوردی كرد، تاكتیكی عیراقیش له‌گه‌ڵ كورددا بریتی بوو له‌وه‌ی به‌غدا كـارێكی وه‌هـا بكات كوردی عیراق توندوتۆڵ به‌ به‌غـداوه‌ ببه‌سـتێ و بـه‌و جـۆره‌یش هه‌سـتی كـوردی ئێـران و توركیـا بـۆ لای خـۆی ڕاده‌كێشـێ، هه‌رچـی توركیاشـه‌ سیاسه‌تێكی په‌یڕه‌و ده‌كرد كه‌ ده‌بووه‌ هۆی دروستبوونی كێشه‌ له‌ نێو كـورد و حوكمه‌تدا. م. بێرگی گوتیشی ئه‌وه‌ی ئێستا ڕوو ده‌دات ئه‌نجامی هه‌ڵه‌كانی ڕابردوون چ له‌لایه‌ن ولاّته‌ ئه‌ورووپییه‌كانه‌وه‌ كه‌ كوردییـان هـان ده‌دا ببـزوێن و هـه‌روه‌ها هه‌ڵـه‌كانی حوكمـه‌تی تـوركیش كـه‌ زوڵمـی لـه‌ كـورد ده‌كـرد و ده‌یخستنه‌ پشت گوێ، به‌لاّم ئه‌و پێی وایه‌ لـه‌وه‌ ناكـات كـورد بتـوانن ئێسـتا

---

[٢١٦] ناوی باڵوێزی توركیا له‌ به‌ریتانیا م.بێرگی (M.Birgi) بووه‌.

کێشەی گەورە بنێنەوە هیچ نەبێ لە ولآتەکەی ئەودا. ئەو بە دڵنیاییەوە گوتیشی بزووتنەوەی کورد لە هەندەران گەلێك بەهێزترە وەك لە ناوەوە.

ئیمزا

أ.د.م.ڕۆس

١٣ی مایسی ١٩٥٩) (٢١٧).

لاپەڕەی پێنجەمی هەمان بەشی یەکەم بۆ نامەیەکی نهێنیی سێ خاڵی بێ ژمارە و مێژوو دیسانەوە بۆ زانیاری دەربارەی تەحسین محەمەد ئەمین هەورامی تەرخان کراوە کە ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(١- سکرتێری لقی بەریتانیای «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا» میستەر ت.م.ئەمین «کە ئەمە ناونیشانییە: س/ و، شەقامی مەلیك، لەندەن، دەبل یو. سی. ٢» نامەیەکی ناردووە بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، وێنەی ئەو نامەیە هاوپێچ پێشکەش دەکەین.

٢- ئاشکرایە کە داوایەکی لەو جۆرە ناشێ لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە گفتوگۆی دەربارە بکرێ، چونکە ئەندامانی «کۆمیتەی مافی مرۆڤ - لجنة حقوق الأنسان» و ولآتە پێوەندیدارەکان ئامادە نین وەڵامی نامەیەکی وەها بدەنەوە.

٣- ئێمە زۆر لەگەڵ ئەوەداین ئەو جۆرە چالاکییانە قەدەغە بکرێن) (٢١٨).

هەرچی لاپەڕەی شەشیشە تەرخان کراوە بۆ خودی نامەکەی تەحسین محەمەد ئەمین هەورامی کە ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(وێنە،

(217) N.A., F.O., 371/140683, Eastern Deparment, Confidential,1959, From: A.D.M.Millar, May 13, 1959, To:Southern Deparment,, Copy To: Sir F.Hoyer Millar, Eastern Deporment,,U.N. Deparment,P.4.

(218) Ibid, P.5.

کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا،
لقی بەریتانیا،
س/و٣٧،
شەقامی مەلیك،
لەندەن،
دەبل یو. سی. ٢،
٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٥٩،
بۆ:
کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان،
سکرتێری گشتی،
پایە بەرز،

وا وێنەی دوو نامەی پرۆتێستان پێشکەش دەکەم کە دراونەتە هەردووك حوکمەتی تورکیا و ئێران دەربارەی بارودۆخی کورد لەو دوو وڵاتەدا بۆ ئەوەی لێیان بکۆڵنەوە.

بۆ ئەوەی پرۆتێستە ڕەواکانمان شوێنی خۆیان لە نەتەوە یەکگرتووەکان بگرن بە کڕنووشەوە داوا لە پایەبڵندتان دەکەم بە پێی دەسەڵاتتان پەنا بەرنە بەر ئەو کارانەی کە بە پێویستیان دەزانن بۆ پرسی کورد، تایبەت لەگەڵ ئەو دوو حوکمەتە پێوەندیدارەدا، هەڵبەت ئەوە سەرکەوتنێکی گەورە دەبێ بۆ ئاوەڕۆك و ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەگەر بێت و ئەو سکاڵایەمان لە لایەن دەسەڵاتە بەرپرسەکانەوە چارەسەر بکرێ.

ئێمە ڕێگە بە خۆمان دەدەین سەرنجی شکۆمەندتان ڕابکێشین کە بە پێی برگەی سێی بەندی یەکەمی «پێڕەوی نەتەوە یەکگرتووەکان–ك.م» دووەم ئامانجی دەزگاکەتان بریتییە لە «گەشەپێدانی پێوەندیی دۆستانەی نێو نەتەوەکان لەسەر بنەمای یەکسانی و مافی چارەنووسیی گەلان و ئەو کارانەی دەبنە هۆی پتەوکردنی ئاشتیی جیهان». تا ئەو ڕۆژەیەش کە کورد

مافی ئەوەی دەدرێتێ بۆ خۆی دواڕۆژی خۆی دیاری بکات دڵنیاین لەوەی شکۆمەندتان ئارەزوو دەکەن ئەوان دادپەروەرانە، وەك کەمینەیەکی نەتەوەیی، ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ، ئەوەیش بێ گومان لەگەڵ ئاشتیی گشتیدا دەگونجێ.

دڵسۆزتان

ئیمزا

ت.م.ئەمین

سکرتێری لقی بەریتانیای کۆمەڵە) [٢١٩].

دوای ئەوەیش وەك پاشکۆ و بێ هیچ جۆرە لێدوانێك نەخشەیەکی کوردستان دانراوە کە بە پێی ژمارەکانی ناشێ «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا» بە نەخشەیەکی وەها قایل بێ کە ژمارەی دانیشتووانی کوردی کەرکووك و هەولێر بە لە سەدا بیست کەمتر لە کۆی دانیشتووانی ئەو دوو شارە سەرەکییەی کوردستان دابنێ.

(219) Ibid, Copy, Kurdish Students Society in Europe, U.K.Branch. c/o 37, King Street, London, W.C.2.,20 January, 1959, To: United Nations Organization, The Secretary- General, P.6.

## ڕووداو و ئاڵوگۆڕەکانی دیکەی کوردستان دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ لە هەمان فایلی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیدا

گشت بەڵگەنامەکانی دیکەی ناو هەمان فایل بۆ باسی ڕووداو و ئاڵوگۆڕەکانی کوردستان لەو ڕۆژگارە ناسکەدا تەرخان کراون، تەنها دووەم بەشی ئەو فایلە نەبێ کە بریتییە لە یەك نامەی باڵوێزخانەی بەریتانی کە ڕۆژی بیست و هەشتی مایسی ساڵی ١٩٥٩ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی شەڕێك کە لە نێوان پۆلیس و ئەندامانی هۆزی شەممەڕدا لە ناوچەی تەل کۆچك قەوماوە[٢٢٠].

سێیەم بەشی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە واشنتۆن کە ڕۆژی هەشتی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ ناردوویە بۆ «بەشی ڕۆژهەڵات»ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و وێنەی لێ دراوەتە باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران دەربارەی بڕیاری حوکمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە کەلوپەل بنێرێ بۆ پەنابەرە کوردەکانی عیراق لە ئێران[٢٢١].

بەشی چوارەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و خودی وەزیری هەندەران هـ. تریڤێلیان دەربارەی بارودۆخی کوردستانی عیراق کە ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە: بەغداوە،

بۆ:

---

[220] Ibid, Eastern Deparment, P.8.

[221] Ibid, P.9.

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

بۆ: سێر هـ. ترێڤێلیان،

ژمارە ٧٢٦،

١١ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

وێنەی لێ دەدرێتە:

تاران و ئەنقەرە و واشنتۆن و ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست،

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٢٧٥تان بۆ تاران دەربارەی کوردستان.

لە کاتی کۆبوونەوەی بالۆێزانی دەوڵەتە ئەندامەکانی پەیمانی «بەغدای پێشوو ك.م.» لە ڕۆژی دەی حوزەیراندا گشتیان دەربارەی ئەوە هاوبیر بوون کە یاخیگەری لە کوردستاندا دژی بەرژەوەندیی هەموانە و قازانجی تەنها بۆ کۆمۆنیستەکان هەیە. هەر دووك هاوەڵم بالۆێزانی تورکیا و ئێران گوتیان کە سیاسەتی حوکمەتەکانیان لەم بوارەدا بریتییە لەوەی ناونووسی پەنابەرە «کوردەکانی عیراق–ك.م.» بکەن و چەند بتوانن هێند بە ژمارەی کەم دایانبنێن و لە گۆشەنیگای مرۆڤایەتییەوە خزمەتیان بکەن.

بۆ وەزارەتی هەندەران و تاران و ئەنقەرە و واشنتۆن و ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و لەگەڵ ئەم برووسکانەمدا– ژمارە ١٣٧ و ١٢٠ و ١٨٦ و ١٦١ )[٢٢٢].

بەشی پێنجەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی دوو لاپەڕەیی دەربارەی هەمان بابەت کە ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

برووسکەی ناوخۆ،

---

[222] Ibid, Secret, From: Baghdad, To: Foreign Office, Cypher/OTP, Sir H.Trevelyan, No.726, June 11,1959, P. 10.

له:

تارانەوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە جانتای دیپلۆماسی،

دابەشکردنی وەزارەتی هەندەران و هۆڵی سپی،

سێر گ. هاریسۆن [٢٢٣]،

ژمارە ٢٥،

٩ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

وێنەی لێ دراوەتە:

ئەنقەرە و بەغدا و واشنتۆن و ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،

پەنابەرە کوردەکان،

نیشانە بە برووسکەی ژمارە ٤٩٨م و برووسکەی ژمارە ٢٧٥ی ئێوە.

١- سەرەك وەزیران و وەزیری ناوخۆی «ئێران-ك.م.» بۆ ماوەی چوار ڕۆژ، لە ڕۆژی بیست و سێی مایسەوە تاوەکو ڕۆژی بیست و شەشی مایسی ١٩٥٩، چوونە زیارەتی کوردستان. لە کاتی گفتوگۆیەکی ئەم چەندانەی دواییدا لە سەرەك وەزیرانم پرسی بارودۆخی کوردستانت چۆن هاتە بەر چاو، لە سەرەتای وەڵامەکەیدا گوتی ئەو تەواو دڵنیایە لە دڵسۆزیی کوردی ئێران،

---

[٢٢٣] سێر جیۆفری وێدگوود هاریسۆن (Sir Geoffrey Wedgwood Harrison) ڕۆژی هەژدەی تەمموزی ساڵی ١٩٠٨ لە دایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، لە ڕۆژی بیست و یەکی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ەوە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، وێڕای بارەگای وەزارەت لە لەندەن لە زۆر وڵاتی وەك یابان و یەکیەتی سۆڤیەت و بەلجیکا کاری کردووە، لە ڕۆژی سێی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٨یشەوە بووەتە باڵوێزی فەوقەلعادەی بەریتانی لە ئێران. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1960", London, PP. 232-233.

ئەو دڵسۆزییەش هێندەی دیکە جۆش درا کە زانییان لەودیو سنوورەوە لە کوردستانی عیراق چی ڕوو دەدا. لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی ئەو یەکجار نیگەرانە بە هۆی پەنابەرە کوردەکانی عیراقەوە کە ژمارەیان چەند هەزار کەسێك دەبێ «ئەو ژمارانەی دەیانڵێن جیاوازن– لە سێ هەزار کەسەوە تاوەکو دە هەزار کەس»، ئەوان هەمان کات کێشەیەکی دارایی و نیشتەجێکردن و ئەمنی پێکدەهێنن، ئەوە ئەگەر توخنی گیروگرفتە سیاسییەکان لەگەڵ جەنەڕاڵ قاسمدا نەکەوین، ئەو بابەتەی پاڵی پێوە نام لە دوکتۆر سەدر بپرسم بۆ ئاگاداریی خۆم و ئاگاداریی هەردووك باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و تورکیا، کە تاوەکو چ ڕادەیەك لە گۆشەنیگای پێوەندییە نێو دەوڵەتییەکانەوە سەیری ئەم بابەتە دەکات.

٢– من ئەم هەلەم بە دەرفەت زانی بۆ دووپاتکردنەوەی ئەوەی عەرزی بکەم کە دڵنیام لەوەی ئەو بێ ئەندازە لەوە دەترسێ کە هیچ نەکرێ بۆ ئارامکردنەوەی بارودۆخی ئەم ناوچەیە. لە وەڵامی ئەمەدا سەرەك وەزیران یەکسەر گوتی ئەو نیازی نییە پشتی هیچ ئاژاوەیەك بگرێ کە تەنها زیانی بۆ ئێران لێ دەکەوێتەوە، هەروەك چۆن حەزیش ناکات هانی پەنابەرە عێراقییەکان بدات، بەڵام ژمارەیەکی دیار لەو سەرەك هۆزە کوردە عێراقییانەی هەڵهاتوونەتە ناو خاکی ئێران ئامادەیی خۆیان نیشان داوە کە بە هەزاران کەس لە پیاوەکانیان ئاودیوی ئێران بکەن، ئێمەیش بە هیچ جۆرێك هانمان نەداون کارێکی وەها بکەن، بەڵام بە هیچ جۆر ناتوانرێ بە تەواوەتی دەرگای سنووری وڵات دابخرێ لەبەر هۆکاری عەمەلی و لە ئەنجامی ئەو سیاسەتی میوانداریيەی نەریتێکی ئێرانییە.

٣– سەرەك وەزیران لەسەری ڕۆیشت و گوتی ئەوەی لە کوردستانی عیراق قەوما بە شێوازێکی یەکسەر و بایەخدار لە بەرژەوەندیی ئێرانە و هەر لەبەر ئەوەیشە کە کاربەدەستە ئێرانییە پێوەندیدارەکان ناچار بوون بە زنجیرەیەك چالاکیی ئیستیخباراتی لەودیو سنووری عیراقەوە هەڵبستن، تایبەت لەم قۆناغەدا کاتێك سۆڤیەتەکان یان شیوعییە عیراقییەکان لەو

ناوچەیەدا یەکجار چالاکن و تەنانەت چەکیشیان بەسەر هۆزەکاندا دابەش کردووە. هەرچۆن بێ سەرەك وەزیران دیسانەوە ئەوەی دووپات کردەوە کە ڕێگە نادات ئێرانییەکان لەودیو سنووری عێراقەوە هیچ کارێکی ڕووخێنەر بکەن و گوتیشی باڵوێزی ئێران لە بەغدا ڕاسپێردراوە کە جەنەڕاڵ قاسم لەوە دڵنیا بکات. باشترین کارێکیش جەنەڕاڵ قاسم لەم بارەیەوە بیکات بریتییە لە پێڕەوکردنی سیاسەتێك کە ڕادە بۆ یاسای چاککردنی کشتوکاڵ و شیوعییەکان دابنێ، چونکە ئەوە کوردی عێراق لە دواڕۆژیان دڵنیا دەکات. سیاسەتی عێراق، نەك هاندانی ئێران، بووە هۆی وروژاندنی ئێستای ناوچە سنوورییەکانی عێراق[(٢٢٤)].

بەشی شەشەمی هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی بۆ «بەشی ڕۆژهەلأت»ی وەزارەت لە لەندەن دەربارەی هەندێك بڵاوکراوەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(نهێنی،

لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

بەغدا،

ژمارە ١٠١١٣/٦٩/٥٩،

١٠ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

بۆ:

بەشی ڕۆژهەلأت،

وەزارەتی هەندەران،

---

(224) N.A., F.O., 371/140683, Eastern Deparment, Confidential, Inward Saving Telegram, From: Tehran, To: Foreign Office,. By Bag, Foreign Office and Whitehall Distribution, Sir G.Harrison, No.25 Saving, June 9,1959, PP.11-12.

بەشی ڕۆژهەلاتی خۆشەویست،

١- دایەرەی ڕۆژنامەنووسیی «بالۆێزخانە-ك.م.» وێنەی گۆڤارێکی عیراقیی ڕۆژی چواردەی حوزەیرانی ناردووە بۆ «بەشی لێکۆڵینەوە»ی وەزارەت، ئەو گۆڤارەیش بریتییە لە هەفتەنامەیەکی ئینگلیزی کە ڕۆژنامەی «إتحاد الشعب» بلاوی دەکاتەوە.

٢- گۆڤاری ناوبراو وتاری ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندیی «حیزبی شیوعیی عیراقی»جەمال حەیدەری[٢٢٥] بە ناونیشانی «پرسی کورد»ەوە بلاو کردۆتەوە. لەبەر ئەوەیش کە ڕاپۆرتەکە پڕییە لە بەندەکانی ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی کۆنفرانسی حیزب لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٦دا، واتا لەو کاتەدا کە هێشتا حیزبی شیوعیی عیراقی لەگەڵ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆدا بوو، بۆیەکا ئێمە هەست دەکەین دەبێ بایەخێکی زۆر بە توێژینەوەی ئەو وتارە بدرێ، وا دیارە سیاسەتی حیزبی ناوبراو «دەربارەی پرسی کورد-ك.م.» گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە وەك ئێمە بیرمان لێی دەکردەوە.

هەمیشە دڵسۆزتان

ئیمزا

باڵوێز[٢٢٦].

بەشی حەوتەمی ئەم فایلە لە گشت بەشەکانی دیکەی گەورەترە، بریتییە لە ٣٦ لاپەڕەی گەورە و سەرجەمیان تەرخان کراون بۆ وەرگێڕانی دەنگوباس و لێدوانەکانی ئیزگەکانی قاهیرە و بەغدا لە مانگی حوزەیرانی

---

[٢٢٥] جەمال حەیدەری یەکێك بوو لە ئەندامە هەرە چالاك و خوێندەوارەکانی مەکتەبی سیاسی نەك کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعیی عیراقی.

[226] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds, Confidential, From: British Embassy, Baghdad, No.10113/69/ 59, June 10, 1959, To: Eastern Depornent, Foreign Office, P.13

ساڵی ١٩٥٩دا و بەشی هەرە زۆریان بۆ کورد و کوردستان و پرسی نەتەوەیی و مێـژووی کـورد تـەرخان کـراون و شـتی یـەکجار بایەخـدار و چـاوەڕوان نەکراویان تێدایە کەوا لە خوارەوە چەند نموونەیـەکی کـەمیان لـێ پێشکەش دەکەین:

لـە لاپـەڕەی یەکەمـدا لـە ژێـر ناونیشـانی «هەواڵـە کوردییـەکان»دا نووسراوە:

(أ) باسی یەکـەم دیـدەنی ڕۆژنامەنووسیی عەبدولکەریم قاسـم دوای دە ڕۆژ لـە سـەرکەوتنی شۆڕشـی چواردەی گەلاوێـژی سـاڵی ١٩٥٨ دەکـات کـە عەبدولکەریم قاسم نە ناوی ڕۆژنامەکە و نە ناوی ڕۆژنامەنووسەکەی لە یادە.

(ب) وتـارێکی ڕۆژنامـەی «إتحـاد الشـعب» بـە بۆنـەی یـادی «ڕۆژی منـدالآن»ەوە. ڕۆژنامـەی «ژیـن»ی کـوردی وتـارێکی دەربـارەی شۆڕشـی چواردەی گەلاوێژ بلاو کردۆتەوە(٢٢٧).

(ج) ڕۆژی چواری حوەزیران ڕادیۆی بەغدا ئەم لێدوانەی پەخش کردووە:

«دوای شۆڕشـی چـواردەی گەلاوێـژ چـالاکییەکانی پـۆلیس لـە ئێـران و تورکیا و پاکستان و لوبنان و ئوردون بە پشتگیریی لەنـدەن و واشـنتۆن دژی ئازادیخواهان و نیشتیمانپەروەران لەم وڵاتەدا «واتە لە عیراق–ک.م.» کۆتایی هـات، بـەڵام کاربەدەسـتانی قـاهیرە لەسـەر ڕاوەدوونـانی ئازادیخواهـان بـەردەوامن. بـە لای عیراقییەکانـەوە کـارێکی بـێ ئەنـدازە سـتەمە ئەڵقـە لـەگوێکانی مـەلیك فـاروق ئـازاد بـن، لـە کاتێکـدا نیشـتیمانپەروەرە ڕاستەقینەکان ئەشکەنجە دەدرێن. پیاوەکـانی عەبدولناسـر ئێسـتا هـەر لـە کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە تـاوەکو کەنـداوی بەسـرە دژی عـیراق کار دەکەن، بەڵام سەرئەنجامی گشت پیلانەکانیان سەرەونگوم کردنە».

(د) ئەستەموول: شـای ئێـران لـە پاریسـەوە گەیشـتە ئەسـتەموول دوای ئـەوەی سـەردانی گـەلێك لـە وڵاتـە ڕۆژئاواییـەکانی کـرد و گفتوگۆی لەگـەڵ

---

(227) Ibid, P.15.

سەرۆکەکانیاندا کرد.

نیۆیۆرك- پتر لە دوو هەزار ئەمەریکایی لە نامەیەکیاندا بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان داوای داماڵینی چەکی ئەتۆمییان کرد» (۲۲۸).

(ڕۆژنامەی «إتحاد الشعب» داوای لە هەموو کورد کرد ڕژێمی کۆماری بپارێزن و سەرنجی ڕاکێشان بۆ پیلانی ئیمپریالییەکان و تایبەت نۆکەرەکانیان لە ئەندامانی پەیمانی بەغدا، داواشی لێ کردن یەکیەتی ڕیزەکانیان بپارێزن) (۲۲۹).

(ڕۆژنامەی «ئازادی»ی کوردی نووسیویە دەڵێ: کرێکارانی عیراق بە درێژایی ڕژێمی پێشوو دەچەوسێنرانەوە، بەڵام شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ ڕادەی بۆ ئەو چەوسانەوەیە دانا، بەرانبەر بەوە هەرچۆن بێ ئیمپریالییەکان هەوڵ دەدەن ئێمە لە کۆمۆنیزم بتۆقێنن و ئیزگە داردەستەکانیان، وەك ئیزگەکانی تاران و قاهیرە و ئەنقەرە و تەل ئەبیب دەیانەوێ دەستمان لە ڕێبازی دیموکراسی پێ هەڵبگرن) (۲۳۰).

هـ- ئیزگەی قاهیرە،

چواری حوەزیران،

لێدوانی حەفتانە،

مێژووی کورد و کوردستان،

ناوچەکانی ژێر دەستی دەوڵەتی مەروانی و دۆستەکی،

مێژووی کورد خاوێنترین و دێرینترین مێژووی سەر زەمینە (۲۳۱)، چۆن

---

(228) Ibid, P.17.

(229) Ibid,P.17.

(230) Ibid, P.17.

(۲۳۱) مەبەست ئەو ئیزگە کوردییەی قاهیرەیە کە جەمال عەبدولناسر ساڵی ۱۹۵۷ لەسەر داوای «بەرەی نیشتیمانیی یەکگرتووی عیراقیی» لە ڕێگەی صدیق شەنشەلەوە بڕیاری دامەزراندنی دا و هۆشیار بابان کە ئەوساکە قوتابی بوو لە میسر و کوردێکی دڵسۆزبوو بەڕێوی دەبرد. شایانی باسە ئەو ئیزگەیە فەرمانڕەوایانی ئەوسای تورکیا و ئێران و عیراقیان وەڕس کردبوو، باڵوێزی تورکی لە قاهیرە بە تایبەتی دیدەنیی جەمال عەبدولناسری کردبوو بۆ دەربڕینی

دەشێ ئێمەی کورد ئێستاکە هێندە چەوساوە بین، گشت گەلانی جیهان ئازاد بوون و تەنها ئێمە تاوەکو ئیمڕۆکەیش هەر کۆیلەین[٢٣٢].

و- (ئیزگەی قاهیرە،
ڕۆژی یازدەی حوزەیران،
مێژووی کورد و کوردستان،

جاری پێشوو باسی دەوڵەتە کوردییەکانی وەك بەنوعەیار و بەدرخانی و شوانکارە و شەدادیمان بۆ کردن و گوتمان ئەو دەوڵەتانە لە لایەن مەغۆل و توورانەوە ڕووخێنران. هەروەها باسی ئەوەیشمان کرد کە دەسەڵاتی کورد لە ڕۆژگاری ناصر ئەلدەولەدا گەیشتە قەوقاس و دیاربەکر و[٢٣٣] ئازەربایجان و ڕۆژهەلاتی مووسڵ[٢٣٤].

مێژوونووسان لەو بڕوایەدان کە ساڵی ٤٢٧ی کۆچی ناصرِ ئەلدەولە لەشکرێکی گەورەی بۆ ئازادکردنی کوڕێکی دیلی پێکەوە نا و دوای کۆششێکی زۆر توانیی شاری سعرد داگیر بکات و ئینجا ڕووی کردە شاری ئورفە و ئابلۆوقەی دا، بەلاّم پاشای ڕۆمەکان لەشکرێکی بۆ یاریدەی ئەو شارە نارد و لە لایەن کوردەوە بەزێنراو بەو جۆرە ئورفەیش لە ژێر چنگی پاشای ڕۆم قوتار کرا، لەو کاتەدا تورکمانەکانی ئێران یاخیبوون و ژمارەیەکی بێ شوماریان لە فارسەکان کوشت و ئینجا ڕوویان کردە کوردستان، کوردە ئازاکان هەوڵیان دا تورکمانەکان ناچار بکەن بکشێنەوە بەلاّم ئەو هەوڵە دادی نەدا و کوردستان کەوتە ژێر دەسەلاّتیانەوە.

---

نارەزایی ئەنقەرە لەو ئیزگەیە، عەبدولناسریش زیرەکانە لێی دەپرسێ بۆ کورد لە تورکیا هەیە، ئەوەی بالۆێزی بە ڕادەیەك شەرمەزار کردبوو کە ئیتر جارێکی دیکە لەگەڵ فەرمانڕەوایانی میسردا توخنی ئەو باسە نەکەوتبوو.

(232) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds, Confidential, P.17.

(٢٣٣) دیاربەکر ناوجەرگەی کوردستانە.

(٢٣٤) بە هەمان دەستوور ڕۆژهەلاتی مووسڵیش بەشێکی دانەبڕاوی کوردستانە.

بەو جۆرە کوردەکان ناچار بوون پەنا بەرنە بەر ناوچە شاخاوییەکان.
تاجەددینی برای توغرول کە دیی کوردەکان بەزێنراون لەشکرەکەی خۆی ئامادەکرد و هێرشی بردە سەر تورکمانەکان کە لەنزیك تارانەوە بلاّوەیان لێ کرد و ناچار بەرەو مووسڵ و دیاربەکر کەوتنە ڕێ و هەرچی ئەو گوندانەی لەو ڕێگەیەدا بوون تالاّنیان کردن و بەو جۆرە گەیشتنە بۆتان و لەوێ دابەش بوون، بەشێکیان بەردەوام ڕوویان کردە دیاربەکرو ئەو شارانەی وەك خەرپووت لە ڕێگەیاندا بوون تالاّنیان کردن، بەلاّم سلێمانی کوڕی ناصرِ ئەلدەولە و ئەحمەدی کوڕی مەڕوان کاتێك بەمەیان زانی نامەیەکیان نارد بۆ مەنصوری فەرماندەی هێزە کشاوەکان و داوایان لێی کرد پەیمانێکی ئاشتی ببەستن، ئەویش قایل بوو بەلاّم زۆری نەبرد ویستی هەردووکیان بکوژێ. کاتێك سلێمان بە پیلانەکەی مەنصوری زانی خۆی و ئەفسەرە گەورەکانی بانگهێشت کرد و لە ناکاودا دای بەسەریاندا و هەموویانی قڕ کرد.

ئەی کوردە خۆشەویستەکان– مێژووی کورد و کوردستان دێرینترین و پڕ لە شانازیترین مێژووی سەرجەمی جیهانە، کەوابێ چۆن دەشێ ئێوە وەها پەرش و بلاّو و دژ بە یەکتر بن؟، کەی دەبێ ئێمە وەخەبەر بێین؟، کەی لاوێکی بە جەرگی دیکەی وەك ئەحمەدی کوڕی مەڕوانمان لەنێودا هەڵدەکەوێ تاوەکو ئازادمان بکات؟[(٢٣٥)].

(هـ) (ڕۆژی چواردەی حوەزیرانیش ئێزگەی بەغدا ئەم لێدوانە سیاسییەی پێشکەش کرد:

کورد و عەرەبی عیراق ساڵەهای ساڵە لە لایەن ئیمپریالییەکانەوە حوکم دەکران، بەلاّم ئەوان ئازایانە دژیان وەستان. نیشتیمان و پارتییەکان باش ئەوە دەزانن تاوەکو زۆرداران لە نیشتیمانیاندا بن پتر و پتر لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە دەیانچەوسێننەوە.

---

[(235)] N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds, Confidential, P.21.

شۆڕشـەکەمان و حوکمەتەکـەمان بوونەتـە پەناگـەی گشـت نەتـەوە و ڕەگەزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست).

(و) (ڕۆژنامەی «البلاد» نووسـیوویە دەڵـێ: گشـت شۆڕشـەکانی جیهـان، وەك شۆڕشەکەی ئێمە، ڕوو بـەڕووی هەڕەشـەی دوژمنـان هـاتوون و هـەرگیز نابێ ئەوە لە یاد بکەین کە شۆڕشەکەی ئێمە گەورەترین قەلاّی ئیمپریـالیزمی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕووخاند، خۆ ئەگـەر هـاتوو ئێمـە لـە دوژمنـەکانمان خۆش بووین ئەوساکە ئەوان دیسانەوە پەنا دەبەنەوە بەر خیانـەتکارێکانیان و ئەوەیش بۆ ئێمە مەترسییەکی گەورەیە).

(هەرچی ڕۆژنامەی «إتحاد الشعب»یشە لە وتارێکیدا بە ناونیشـانی «هـیچ هێزێـك نییـە بتـوانێ جووتیـاران و ئاغایـانی کوردسـتان لـە بەرەیەکدا کـۆ بکاتەوە» نووسیویە دەڵێ:

«سـەدان سـاڵە جووتیـارانی کـورد وەك جووتیـارانی عـەرەب لـە لایـەن خـاوەن زەوییەکانـەوە دەڕووتێنرانـەوە بۆیـەکا وا بـە هـەژاری مانـەوە، ئـەو خاوەن زەوییانە لـە لایـەن سوپای بـەریتانی و عیراقییـەوە پشـتگیرییان لـێ دەکرا، بۆیـەکا کـەس نـاتوانێ بـیر لـەوە بکاتـەوە ئـەو جووتیـار و خـاوەن زەوییانە دەتوانن پێکڕا یەك بگرن)[٢٣٦].

(ز) (ڕۆژی پـازدەی حـوزەیرانی سـاڵی ١٩٥٩. لـە وتـاری ڕۆژنامـەکان، ڕۆژنامەی «إتحاد الشعب» نووسیویە دەڵێ: کورد بە درێژایی ساڵەها زۆری بـە دەسـت بیانییەکانـەوە چێشـتووە، تایبـەت لـە ڕۆژگـاری فـەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا، دوایی زۆریشیان بە دەست بەریتانییەکانەوە چێشت، بـەلاّم هەرگیز سەریان بۆ هـیچ زوڵموزۆرێك دانەنەواند و ئـەوەبوو ڕۆژانـی شۆڕشـی ساڵی ١٩٢٠ ژمارەیـەکیان لـە خۆفرۆشـەکان کوشت. لـە ژێـر سایەی ڕژێمـی پێشـوودا گـەلێك لـە کوردەکـان بەنـد کـران و ئەشـکەنجە دران. بـە هـەمان دەستوور کورد دژی ڕژێمی ڕەزاشای پەهلەوی بوون لە ئێـران، بۆیـەکا کـورد

---

(236) Ibid, P.22.

دەمێکە لە سەرانسەری کوردستان بە نەفرەتەوە دەڕواننە دوژمنەکانیان و ڕێگە نادەن ئیمپریالییەکان زەفەر بە کۆمارە خۆشەویستەکەمان بهێنن)[٢٣٧].

ڕۆژی شازدەی حوزەیرانیش ڕۆژنامەی «ئازادی» بە کوردی وتارێکی دوور و درێژی دەربارەی کشانەوەی عیراق لە کیتلەی ئیستەرلینی بڵاو کردۆتەوە، وێڕای وتارێکی دیکە بەم ناونیشانەوە «یەکیەتی و وریایی گەل پیلانەکان زیندەبەچاڵ دەکات» و تێیدا دەڵێ:

(لەم ڕۆژانەدا هەزاران کەس لە سەرۆک «عەبدولکەریم قاسم–ک.م.» داوا دەکەن تۆڵە لە دوژمنەکانیان بکاتەوە، ئەمەیش بۆ خۆی نیشانەی ئەوەیە گەلەکەمان تاوەکو چ ڕادەیەك پێ داگرە لەسەر تۆڵەسەندنەوە، ئەوەیش دەزانین لەوەتەی شۆڕشە سەرکەوتووەکەمان بەرپا بووە دوژمنان لەسەر پیلانگێڕیی خۆیان بەردەوامن، ئەوان نیازیانە هێرشمان بهێننە سەر، بەڵام یەکیەتی سۆڤیەت ڕێگەی لێ گرتوون، ئەگینا ئەوان هەوڵیان دەدا شەڕی براکوژی بنێنەوە، بەڵام نەیانتوانی، هەرچەندە پیلانەکانیان بەسەرپەرشتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا، وێڕای حوکمەتانی ئەنقەرە و تاران و نۆکەری وەك عەبدولناصر بەردەوامن. ئێمە ئاگاداری پیلانەکانیانین و دەزانین ئەوەی پێی دەڵێن مەترسیی شیوعی هیچ بایەخێکی نییە لە ئاستی ئەو هەژارییەدا کە باڵی بەسەر گشت وڵاتماندا کێشاوە، خۆ نووری سەعید و هاوەڵەکانیشی پەنایان بردە بەر هەمان بیانوو، لەو ڕێگەیەوە توانییان ڕژێمە نیشتیمانپەروەرەکانی وەك ڕژێمی دوکتۆر موصەدەق و نابلوسی سەرەونگوم بکەن، هەر لەبەر ئەوەیش عەبدولناصر سووریای زەوت کرد، خودی ئەم تاقیکردنەوانە فێریان کردووین بزانین مەبەست لە مەترسیی شیوعیی چییە، بۆیەکا ئەو جۆرە بەندوباوانە لە تێکۆشانی نەپساوی خۆمان ساردمان ناکاتەوە)[٢٣٨].

---

[237] Ibid, P.24.

[238] Ibid, P.25.

لە بەشی حەوتەمی هەمان فایلدا دەقی وەرگێڕانی وتارێکی دیکەی ڕۆژنامەی «ئازادی» بە ناونیشانی «بەیاننامەی کۆمەڵەی خوێندنکارانی کورد لە ئەورووپا دەربارەی کوردی سووریا» هەڵگیراوە. «ئازادی» لەو وتارەیدا دەڵێ:

(دوا بەدوای ئەوەی ئەو قوتابییانە نامەیەکی عەبدولناصریان پێ گەیشتووە کە تێیدا داوای یەکیەتیی کورد و عەرەب دەکات وەلامیان داوەتەوە و لە وەلامەکەیاندا دەڵێن:

«کورد پشتگیریی شۆڕشی عیراق دەکەن و یەکجار لەوە نیگەرانن کە کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو زۆر خراپ ڕەفتار لەگەڵ کوردی سووریا دەکات».

لە کۆتایی وەلامەکەیاندا ئەو خوێندکارانە گوتوویانە ئەوان بێ ئەندازە دڵتەنگن لەو شێوازی ڕەفتارە و داوایان لە جەمال عەبدولناصر کردووە چەند دەتوانێ ڕۆژێك زووتر ڕادەیەکی بۆ دابنێ و داواشیان لە کوردی عیراق کردووە کۆمارەکەیان بە جۆرێك بپارێزن کە عەبدولناصر بۆی نەکرێ وەك ئەتاتورکێکی نوێ هێرشیان بهێنێتە سەر) (٢٣٩).

پاش چەند هەواڵ و لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ڕووداوە جیهانییەکان لە هەمان بەشی حەوتەمی هەمان فایلدا ئەم وتارەی ڕۆژنامەی «إتحاد الشعب»ی ڕۆژی نۆزدەی حوزەیران بڵاو کراوەتەوە کە تێیدا دەربارەی پرسی کورد نووسیویە دەڵێ:

(چوار ئەفسەری بە جەرگی کورد لە لایەن کۆلۆنیالییەکانەوە تاوانبار کران، مێژوومان پڕییە لە قارەمانێتی لەو جۆرە. کوردەکان گیرۆدەی گەلێك نەهامەتی هاتن چونکە سەریان بۆ دەرەبەگایەتی شۆڕ نەکرد، ناوچەی بارزان بە درێژایی چەند سەدەیەك بووبووە مەڵبەندی بەرگری.

---

(239) Ibid, P.28.


ئیبراهیم خانی دەلۆ

ساڵی ١٩٤٣یش بە پێی بڕیارێکی ئیمپریالییەکان حوکمەتی بەریتانی جووتیارانی ناچار کرد بەرهەمی خۆیان بە نرخێکی هەرزان بدەنە سوپای بەریتانی و بەو جۆرە هەژاری باڵی کێشا و لە «ناوچەی بارزان–ک.م.» لە ئەنجامی ئەوەدا یاخیبوونێك هەڵگیرسا و لە دەست بەریتانییەکان هەڵهاتن و ژمارەیەکیان گیرۆدەی دەردەسەرییەکی زۆر هاتن و بەشێکیشیان هێند بەختەوەر بوون بتوانن بگەنە ناو خاکی قەڵای ئازادی، واتا یەکیەتی سۆڤیەت.

ساڵی ١٩٤٧یش نووری سەعید بەربووە گیانی منداڵانی کوردستان، بەڵام شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ توانیی کۆتایی بەم زوڵم و زۆرە بهێنێ)(٢٤٠).

پاش چەند لاپەڕەیەك دیسانەوە دێتەوە سەر ئەو بابەتە مێژووییەی ئێزگەی قاهیرە دەربارەی شوێنی کورد لە مێژووی ناوچەکەدا بڵاوی دەکردەوە و ڕۆژی بیست و پێنجی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ گەلێك بە شان و باهووی کورددا هەڵدەدات(٢٤١).

لە لاپەڕە چل و پێنجی هەمان بەشی هەمان فایلدا لێدوانێکی دوور و درێژی ئێزگەی کوردی بەغدای بە بۆنەی یادساڵی شۆڕشی بیستی عێراقییەوە لە ڕۆژی سیی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩دا دەربارەی شوێنی کورد لە شۆڕشی ناوبراودا بڵاو کردۆتەوە و تێیدا باسی هەڵوێستی ئیبراهیم خانی

---

(240) Ibid,P.29.

(241) Ibib,PP.37-39.

دەڵۆ و جووتیارانی شیروانە و کفری کردووە، وێڕای هەڵوێستی ژمارەیەك لە خۆفرۆشانی کورد[٢٤٢].

پاش چەند لاپەڕەیەك وتارێکی دیکەی ڕۆژنامەی «ئازادی» لە ساڵیادی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە کوردەکەدا بڵاو کراوەتەوە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(ڕۆژنامەی «ئازادی» لەژێر ناونیشانی «یادی ئەفسەرە کوردە قوربانییەکان»دا نووسیویە دەڵێ:

«ڕۆژی نۆزدەی ئەم مانگە ڕۆژێکی گرنگە لە بواری خەباتی کورددا چونکە لەو ڕۆژەدا بوو کە ئەو ئەفسەرانە لەسەر بیروباوەڕی نەتەوەیی و وەدیهێنانی مافە دیموکراسییەکانی (گەلدا–ك.م.) لە سێدارە دران.

دوازدە ساڵ لەمەوبەر لە ڕۆژێکی وەك ئیمڕۆدا ئەفسەرانی کورد عیزەت عەبدولعەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی[٢٤٣] لە سێدارە دران و ئەو ڕاستییەیان سەلماند هەر نەتەوەیەك ئامادەی قوربانیدان بێ هەرگیز نامرێ. هەر چواریان ئازایانە لە شەڕەکانی بارزانی ساڵی ١٩٤٥دا بەشدار بوون و خەباتیان دژی حوکمەتی فاشستی و[٢٤٤]ئەو زەویدارانە کرد کە بە یاریدەی جەنەڕاڵە بەریتانییەکان هێرشیان بردە سەر جووتیارە ساکارەکان. بەریتانییەکان لە ڕێگەی کوشتن و بڕینەوە بارزانییەکانیان ناچار کرد پەنا بەرنە بەر کۆماری دیموکراسیی کورد لە ئێران، چونکە لەو ڕۆژانە کۆماری ناوبراو ئاڵای کوردی لە زۆر ناوچەی کوردستاندا هەڵکردبوو، بەڵام ئەم کۆمارە نەیتوانی بەردەوام بێ چونکە ئیمپرپالیزمی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و حوکمەتی کۆنەپەرستیی ئێران و زەویدارە کوردەکان گەمارۆیان دا و ئەوانیش «ئەفسەرەکان–ك.م.»

---

(242) Ibid, P.45.

(٢٤٣) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە بریتی قودسی نووسراوە شەفیق کە دیارە هەڵەی چاپە.

(٢٤٤) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە لای وشەی فاشستییەوە پرسگەیەك بەم جۆرە دانراوە:
"the (?) Facist…"

بیانـەوێ و نەیانـەوێ ناچـار بـوون بگەڕێنـەوە و حوکمـەتی عیراقـیش بـە لەسێدارەدانیان پێشوازی لێ کردن.

لـەو ڕۆژانـەدا نـووری سـەعید گـوێی نەئەدایـە داواکـانی گـەل و ئـەوەبوو بەرەبەریانی ڕۆژی نۆزدەی حوزەیران ئـەو چـوار ئەفسـەرەی لـە سـێدارە دا، ڕاسـتە نۆکـەرانی ئیمپریـالیزم ئەوسـاکە دەیـانتوانی خـەڵکی بکـوژن، بـەڵام نەیاندەتوانی ڕەوڕەوەی خەباتی گەل بوەستێنن.

کـورد شانبەشـانی عـەرەب و گشـت نەتـەوەکانی عـیراق لەسـەر خـەباتی خۆیان بەردەوام بوون و ڕۆژی چواردەی تەمموزی[٢٤٥] ساڵی ١٩٥٨ ئازاد بوون و بارزانییە بەڕێزەکان گەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان. ئیمڕۆ کاتێـك یـادی ئـەو قوربانییانـە دەکەینـەوە دەبیـنین چـۆن دوژمنـەکانمان چـاوەڕوانی دەرفەتێکن بۆ ئەوەی هێرشمان بهێننە سەر و کۆمارەکەمان بڕووخێنن، بەڵام هـەموو ڕەنجیـان بـە فـیڕۆ دەڕوات، ئـەو کـوردەی وەحـی لـە قوربانییـەکانی نـۆزدەی حوزەیرانـەوە بـۆ دێ یـەکڕیزییان لەگـەڵ عەرەبـدا پتـەو دەکـەن و ئامادەن گیانی خۆیان بخەنە سەر لەپی دەستیان لە پێناو پاراستنی کۆمـارە دیموکراسییەکەیاندا.

با ئاڵای قوربانییەکانی نۆزدەی حوزەیران هەمیشە شەکاوە بێ) [٢٤٦].

بەشی هەشتی هەمان فایل بریتییە لە سێ لاپەڕە بەم ناونیشانەوە:

«بەشی ڕۆژهەڵات، گشتی، بابەت: کورد، ئەو عەفواتەی سەرەك وەزیـران دەربارەی ئەندامانی هۆزەکان و گوندنشینەکانی ناوچە شاخاوییەکانی عـیراق ڕایگەیاند، نهێنـی» [٢٤٧]. ئەمـەی لای خـوارەوەیش دەقـی وەرگێڕانـی یەکـەم بەڵگەنامەی ئەو بەشەیە:

---

[٢٤٥] لە دەقی بەڵگەنامەکەدا لە بریتی تەمموز بە هەڵە نووسراوە حوزەیران.

(246) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds, Confidential, PP.47-48.

(247) Ibid, Amnesty announecement by Prime Minister concerning tribesmen and villagers in mountainous area of Iraq, Confidential.

(نهێنی،

لە:

بەغداوە،

بۆ:

وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

دابەشکردنی وەزارەتی هەندەران و هۆڵی سپی،

بۆ:

سێر هـ. ترێڤێلیان،

ژمارە ٨٢٤،

٢٦ی حوزەیرانی ١٩٥٩،

بۆ ئاگاداری وێنەی لێ دەدرێتە ئەنقەرە و تاران و عەممان و بێرووت و بەحرەین و کوێت و ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و واشنتۆن،

وەزعی ناوخۆی عیراق.

١- دوێنێ شەو سەرەك وەزیران «عەبدولکەریم قاسم-ك.م.» لێبووردنێکی بۆ گوندنشین و ئەندامانی هۆزەکانی ناوچە شاخاوییەکانی عیراق ڕاگەیاند، ئەوانەی لە هەراو بگرەکەی ئەم دواییانەدا بەشدارییان کردبوو، سەرەك وەزیران داوای لێ کردن بەر لە ڕۆژی بیست و سێی تەمموز بگەڕێنەوە عیراق و لەوە دڵنیای کردن کە گشت ئاسانکارییەکیان پێشکەش دەکرێ، لەوانەیش تەنانەت پێوەندیکردن بە خۆیەوە.

٢- ئەم عافوواتە بۆ ئەو کوردانەیە کە سنووریان بڕیوە بۆ ناو خاکی ئێران و تورکیا، ئۆبالی ئەو کارەیشیان، وەك پیشەیان، خستە ئەستۆی ئیمپریالیزمەوە و داوای یەکیەتیی نیشتیمانییان کرد.

با وەزارەتی هەندەران ئەم نامەیە و ئەم بروسکانەم — ژمارە ٣٤ و ٣٣ و ١٢٨ و ١٤٧ و ٩٤ و ٦٨ و ١٧٢ و ٢١٤ بنێرن بۆ عەممان و بێروت و بەحرەین

و كوێت و ئەفسەری سیاسیی هێزەكانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و واشنتۆن) (٢٤٨).

لاپەڕەی دواتر بۆ دەقی وەرگێڕانی عافوواتەكەی عەبدولكەریم قاسم تەرخان كراوە كە لە ئێزگەی بەغداوە ڕۆژی بیست و پێنجی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ سەعات پێنجی ئێواریێ بە كاتی بەغدا لە لایەن یەكێك لە بێژەرانی ئێزگەوە خوێندراوەتەوە و دوو جار بە عەرەبی و جارێك بە كوردی پەخش كراوە (٢٤٩).

دوا لاپەڕەی هەمان بەشی هەشتەم بۆ ژمارەیەك لە هەواڵەكانی جیهان تەرخان كراوە كە یەكێكیان دەربارەی وەفدی میلليی عیراقییە بۆ بەنغازی لە ڕێگەی توونسەوە و بە سەرۆكایەتی عەزیز شەریف.

بەشی نۆیەمی هەمان فایل بۆ نامەیەكی دوو لاپەڕەیی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی سیاسەتی ئێران بەرانبەر ڕژێمی نوێی عیراق لەو ڕۆژگارەدا تەرخان كراوە و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

(نهێنی،
برووسكەیەكی ناوخۆ،
لە:
تارانەوە،
بۆ:
وەزارەتی هەندەران،
بە جانتای دیپلۆماسی،
دابەشكردنی وەزارەتی هەندەران و هۆڵی سپی،

---

(248) Ibid, Confidential, From: Baghdad, To: Foreign Office,, Cypher/OTP, Foreign Office and Whitehall Distribution, To: Sir H.Trevelyan, No. 824, June 26, 1959, P.51.

(249) Ibid, P.52.

له:
سێر گ. هاریسۆنەوە،
ژمارە ٢٨،
٢٣ی حوزەیرانی ١٩٥٩،
بۆ ئاگاداری وێنەی لێ دراوەتە هەر یەك لە ئەنقەرە و بەغدا و واشنتۆن و ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست.
نیشانە بە برووسکەی ژمارە بیست و پێنج دەربارەی کورد.
١- ئەو زانیارییە نوێیانەی لە سەرچاوەی هەمەجۆرەوە پێم گەیشتوون جەخت لەسەر ئەو بۆچوونەم دەکەن کە ئێستا لە هیچ ڕوویەکەوە شتێك لە ئارادا نییە کە ئێرانییەکان ئاژاوە لە کوردستانی عیراق دەنێنەوە، یاوەخود هانی لێشاوی پەنابەران دەدن.
٢- ژمارەیەك لە سەرەك هۆزە «کوردەکان-ك.م.» لە تاران بوون و لە لایەن گەورە بەرپرسیارانەوە پێشوازییان لێ کراوە و گوتوویانە ئەوان تووشی چەند کێشەیەك هاتوون بە هۆی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ «قانون الأصلاح الزراعي» و چالاکییەکانی بارزانی و شتی دیکەی لەو جۆرە کە بوونەتە کۆسپ لە ڕێگەی ئەوەدا بتوانن ژمارەیەکی زۆرتر لە پیاوەکانیان بهێننە ئێران. بەلام هەمان کات ئەوەیشم زانیوە ئەو کەسانە دوای ئەوەی بەڕێزەوە پێشوازییان لێ کراوە و پارەی پێویستیان پێ دراوە زۆر بەجیددی داوایان لێ کراوە بگەڕێنەوە ولاتی خۆیان و لەوێ بمێننەوە مەگەر بە ڕاستی ژیانیان بکەوێتە مەترسییەوە، دەشلێن گوایە ژمارەیەکیان بە چەکەوە نێردراونەتەوە مەلبەندەکانی خۆیان لەودیو سنوورەوە، بەلام من بۆخۆم هیچم بە دەستەوە نییە تاوەکو لە ڕێگەیەوە لە ڕاستیی ئەو دەنگوباوە دلنیا ببم.
٣- هەروەها پڕۆپاگەندەیەکی زۆریشم دەربارەی ئەوە بیستووە کە گوایە کاربەدەستە ئێرانییەکان لە ڕێگەی نامیلکە و ئەو جۆرە شتانەوە هەوڵ دەدەن وەهای نیشان بدەن کە بارودۆخی کوردستانی ئێران گەلێك لە

بـارودۆخی کوردسـتانی عـێراق باشـترە، بـەڵام ئەمـە ناگاتـە ڕادەی هانـدانی دامەزرانـدنی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ وەك ئـەوەی سـۆڤیەتییەکان هـانی دەدەن.

٤- پێم وایە ئەمە سیاسەتی دروستی ئێرانە و هەمان کاتیش تەواو لـەوە دڵنیـام کـە کاربەدەسـتە ئێرانییـەکان حسـاب بـۆ ئـەوە دەکـەن بـارودۆخی کوردستانی عێراق چیی بەسەردێ ئەگەر شیوعییەکان دەست بەسەر بەغدادا بگرن. ئێرانییەکان وا هەست دەکەن لە حاڵەتێکی وەهادا نـاتوانرێ کـەڵك لـە هەستی دژ بـە کۆمـۆنیزم لـە ناوچـەکەدا نـەبینرێ و هـەموو کـارێکی وەهـاش کـەمتر ئیسـتیفزازی و پـتر عەفەوییـە و ناگاتـە ڕادەی هەناردنـەوەی هـۆزە چەکدارەکان لە ڕێگەی سنوورەوە[٢٥٠].

دوا لاپـەڕەی بەشـی نۆیـەمی هـەمان فایـل بـۆ ژمارەیـەك هـەواڵ و دەنگوباسی جیهانی تەرخان کراوە[٢٥١]، بەڵام بەشی دەیەمی هەمان فایل بـۆ نامەیـەکی نهێنیـی باڵوێزخانـەی بـەریتانی لـە تـاران دەربـارەی پەنابـەرە کوردەکـانی عـێراق بـۆ نـاو خـاکی ئێـران تـەرخان کـراوە و ئەمـەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

(لە:

باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

تاران،

نهێنی،

ژمارە ١٨٢١/٥٩،

٧ی تەمموزی ١٩٥٩،

بۆ:

---

(250) Ibid, Confidential, Inward Saving Telegram. From: Tehran, To: Foreign Office, by Bag, Foreign Office and Whitehall Distribution, From Sir G,Harrison, No.28 Saving, June 23, 1959, PP.54-55.

(251) Ibid, P.56.

بەشی ڕۆژهەڵات،
وەزارەتی هەندەران،
لەندەن، س. دەبل یو. ١،
بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست،
نیشانە بە برووسکەی ژمارە بیست و هەشتی ڕۆژی بیست و سێی حوزەیران دەربارەی پەنابەرە کوردە عێراقییەکان بۆ ئێران.
١- مولحەقی سەربازی[٢٥٢] و کێلاس لەگەڵ کۆلۆنێل تۆمسدا مانگی حوزەیران دەوروبەری حەفتەیەکیان لە کوردستانی ئێران بردە سەر و داوایان لە حاکمی مەدەنی و سەرکردە سەربازییەکان و کەسانی دیکە کردووە ژمارەی پەنابەرە کوردەکان و باری ژیانیان و نیازەکانی حوکمەتی ئێران چین و ئەو زانیارییانەی کۆیان کردوونەتەوە بەم جۆرەی لای خوارەوەن:
٢- ژمارەی پەنابەرە «کوردە-ک.م.» عێراقییەکان خۆی لە چوار هەزار کەس دەدات و بەشی هەرە زۆریان لە هۆزی هەرکی و برادۆستن و زۆربەیان ئافرەت و منداڵن. ئەو پەنابەرانە لە ژێر فشاری بارزانییەکاندا هەڵنەهاتوون هێندەی لە دەست کاربەدەستە عێراقییەکان و هێزەکانی بەرگریی میللی «المقاومة الشعبية» هەڵهاتوون. ئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەیشیان بخەینە سەر کە بۆ لەوەڕگەکانی هاوینەهەوارەکانیان هاتوون ئەوساکە کۆی ژمارەی کوردەکانی عێراق خۆی دەدات لە پێنج هەزار کەس.
٣- ئەم ژمارەیە نەبووەتە بارێکی قورس بەسەر شانی حوکمەتی ئێرانەوە، چونکە ئەوان لە کوردستانی ئێران وەك لە ماڵی خۆیان بن وەهایە، بەشی هەرە زۆریان لە ناوچەکانی نزیك سنووری عێراقەوە نیشتەجێ بوون، بەڵام بەشێکیشیان لەکوێ کاریان دۆزیوەتەوە لەو ناوچەیدا گیرساونەتەوە.

---

[٢٥٢] ئەوساکە کۆلۆنێل ر.د.هـ.فایر (Colonel R.D.H. Phayre) مولحەقی سەربازیی بەریتانی بوو لە ئێران. بڕوانە:
"The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1958", London, P.65.

یەکێك لە جەنەڕاڵە خانەنشینکراوەکانی سوپای ئێرانی کاری نیشتەجێکردن و ئیش دۆزینەوەیانی پێ سپێردراوە و بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە پارەی تەواویشی خراوەتە بەردەست.

٤- لە ڕاستیدا کاری سەرپەرشتیی بالآی ئەو پەنابەرانە دراوەتە دەست لیوا کەریم ڤەرەهرامی و سەرکردەی تیپی سێی مەهاباد و جێگرەکەی جەنەڕاڵ موزەفەری زەنگەنەی سەرکردەی بەشی سوارە کە بۆخۆیشی کوردە. لەو کاتەوە کاروباری هۆزە پەنابەرەکان کەوتووەتە دەست کاربەدەستە سەربازییەکان و تایبەت لیوا کەریم ڤەرەهرامی کە کەسایەتییەکی چالاکە ئیتر سەیر نییە کە بەشێك لە کوردەکانی عیراق وایان لێ هاتووە زات بکەن بکەونە بەرەنگاربوونەوەی کاربەدەستە عیراقییەکان. لیوا کەریم ڤەرەهرامی دانی بەوەدا ناوە کە ئەو پێوەندیی بە سەرکردە کوردەکانی ئەودیو «سنووری عیراقەوە-ك.م.» هەیە، بەلآم ئەمە خۆی لە خۆیدا کارێکی ئاساییە بۆ هەر ئیستیخباراتێکی سەربازیی کە کارەکانی کەوتبنە نزیك ناوچە سنوورییە بیانییەکانەوە، تایبەت وەك ناوچە عیراقییە بێ ئارامەکان.

٥- کێلاس پێی وایە پەیامنێرانی ڕۆژنامەکان و چاودێرە سیاسییە دوورەکان کارەکەیان خستووەتە چوارچێوەیەکی بازرگانیی دوور لەوەی لە واقیعدا هەیە. لە لایەکی دیکەوە بالۆێزی عیراقی لێرە دەڵێ ژمارەی پەنابەرەکان لە چوار سەد تاوەکو پێنج سەد کەس تێناپەڕێ و بارودۆخی هێمنی ئێستا پاڵ بە هەموویانەوە دەنێ بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان، پێمولیە بالۆێزی ناوبراو کارەکەی خستووەتە چوارچێوەیەکی تەسکترەوە لەوەی هەیە.

ئێمە بۆخۆمان وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ ئەنقەرە و بەغدا و واشنتۆن و ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست.

هەمیشە دڵسۆتان.

بالۆێز

ئیمزا) [٢٥٣].

بەشی یازدەمینی هەمان فایل دیسانەوە بۆ بابەتی ئێزگە کوردییەکانی بەغدا و قاهیرە بەم ناونیشانەوە تەرخان کراوە «بەشی ڕۆژهەلات، گشتی، ژمارە إی ١٨٢١/٤٤/١٩٥٩، نهێنی، کورد، ئێزگە کوردییەکانی بەغدا و قاهیرە[٢٥٤].

ئەم بەشە لە یازدە لاپەڕە پێکهاتووە و باسی هەواڵە جیهانی و ناوچەییەکان دەکات لە ڕۆژی چواردەی تەممووزەوە تاوەکو ڕۆژی دەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٩. یەکێك لەو هەواڵانەی ڕۆژی چواری تەمموز ڕایگەیاندووە بریتییە لەمەی خوارەوە:

«ئەنقەرە، زۆرلۆی وەزیری هەندەرانی تورکیا بە هەواڵنێری «یەکیەتی ڕۆژنامەنووسانی» ڕاگەیاندووە کەوا تورکیا نایەوێ قاسم بڕووخێ. هەروەها گوتیشی قاسم ولاتەکەی خۆی لە هەر شت زۆرتر خۆش دەوێ و ئەو یەکجار ئاشتیخوازە بەرانبەر دراوسێکانی ولاتەکەی، لە کۆتاییشدا گوتی ئێرانیش لە هەمان بڕوا دایە» [٢٥٥].

هەر ئەو ڕۆژەیش لێدوانێکی ئێزگەی کوردیی قاهیرە بلاو کردۆتەوە کە تێیدا دەڵێ:

«ئیمپریالییەکان ئیسرائیل دەپارێزن و ناهێڵن کیشوەرانی ئاسیا و ئەفەریقا بەرەو پێش بڕۆن. لە ڕابردوودا کۆنفرانسەکانی باندۆنگ و ئەکرا بۆ ئەوە دەبەستران ئەو جۆرە ولاتانە نەکەونە ژێر کاریگەریی ئیمپریالییەکانەوە.

---

(253) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds,From: British Embassy,Tehran, Confidential, No.1821/59, July 7, 1959, To: Eastern Deparment, Foreign Office, London, S.W.1., P.57.

(254) Ibid, Eastern Deparment, General, No. E1821/44, 1959, Confidential,Kurds, Kurdish broadcasts from Baghdad and Cairo.

(255) Ibid, P.59.

سەرۆکی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو «جەمال عەبدولناصر—ك.م. » لە دیدەنییەکی ڕۆژنامەنووسیدا لەگەڵ هەواڵنێری ڕۆژنامەی «ألاهرام»دا گوتی ڕێگە نەدرایە ئیسرائیل لە کۆنفرانسی باندۆنگدا بەشدار بێ، ئەوەی بووە هۆی دوورخستنەوەی ئەو وڵاتە لە وڵاتە ئاسیاییەکان و گوتیشی ئیسرائیل داردەستی ئیمپریالییەکانە بۆیەکا ڕێگەی پێ دراوە پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ ژمارەیەك وڵاتی ئاسیایی دابمەزرێنێ و ئیسرائیل ناتوانێ بێ یاریدەی لایەنی دیکە بەرەو پێش بڕوات.

ساڵی ١٩٥٥ ئیسرائیل دژی سەربەخۆیی تونس لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەستا و ساڵانی ١٩٥٣ و ١٩٥٤یش هەر لەوێ دژی سەربەخۆیی مەراکیش دەنگی دا و ساڵی ١٩٥٧ – ١٩٥٨یش دژی سەربەخۆیی جەزائیر وەستا و «ساڵی ١٩٥٦یش—ك.م.» لەگەڵ فەرەنسە و ئینگیلتەرەدا هێرشی هێنایە سەر میسر.

ئیسرائیل لەو بڕوایەدایە ناتوانێ ناکۆکییەکانی نێوان عەرەب بۆ بەرژەوەندیی خۆی بقۆزێتەوە، بەڵام دەبێ ئەو باش لەوە تێبگات کە عەرەب وەخەبەر هاتوون و بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئەوان پێکڕا بەرەوپێش بۆ وەدیهێنانی یەك ئامانج دەڕۆن) (٢٥٦).

دیسانەوە وتارێکی ڕۆژنامەی ژینی ڕۆژی پێنجی تەمموزی ساڵی ١٩٥٩ی بە ناونیشانی «شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ی نیشتیمانیی» کردووە بە ئینگلیزی و ئەمجارەیش وەك جارەکانی دیکە باسی ڕۆڵی کوردی لەو شۆڕشەدا کردووە (٢٥٧).

ڕۆژی شەشی تەمموزی ساڵی ١٩٥٩یش وتارێکی گۆڤاری «نەورۆز»ی بڵاو کردۆتەوە کە لە سلێمانی دەردەچوو، «نەورۆز» لەو وتارەیدا باسی «یەکیەتی ڕۆژنامەنووسان»ی بەم جۆرە کردووە:

---

(256) Ibid, PP.59-60.

(257) Ibid,P.61.

(گومان لەوەدا نییە ڕۆژنامەنووسیی نیشتیمانی ڕۆڵێکی بایەخدار لە خزمەتی گەل و کۆمارە دیموکراسییەکەماندا دەبینێ، هەر لەبەر ئەوەیش ڕژێمی پێشوو سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامانەی بەند دەکرد.

ئیمپریالییەکان و پیاوە ئاڵقە لە گوێکانیان دژی ئەو کەسانە وەستان و هێند کۆسپیان دەخستنە بەردەم کە لە نۆکەرەکانی خۆیان بەو لاوە کەسێکی دیکە نەیدەتوانی ڕۆژنامە دەربکات.

ڕۆژی چواردەی تەممووزی ساڵی ١٩٥٨ کەسانی وەك نووری سەعید کە بە پارەی بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کۆمپانیاکانی نەوت بەڕێوە دەچوون کوژران و ئازادیی بیرو نووسین گشت وڵاتی گرتەوە و دوا بەدوای ئەوەیش «یەکیەتیی ڕۆژنامەنووسان» پێڕەوێکی بۆ خۆی دانا و داوای لە ڕۆژنامەنووسان کرد لە بەرهەمەکانیاندا هەوڵ بدەن ئەو یەکسانی و یەکیەتیی نیشتیمانییەی شۆڕشی چواردەی تەممووز وەدی هێناوە بە تینی بکەن» (٢٥٨).

هەر ئەو ڕۆژەیش وتارێکی ڕۆژنامەی «خەبات»ی کوردیی بەم ناونیشانەوە بلاو کردۆتەوە «یادی قوربانییەکان و ئەرکەکانی ئیمرۆمان» کە تێیدا گوتوویە:

(کورد وەك هەر گەلێکی خاوەن قوربانی لە تۆماری مێژووی جیهاندا وەك گەلێکی ئازا و خەباتکەر ناو دەبرێ. کورد هەر لەو ڕۆژەوەی سەربازە بەریتانییەکان پێیان نایە ناو خاکی عیراقەوە و چوونە کوردستان لە تەك برا عەرەبەکانیاندا کەوتنە خەبات بۆ دەرکردنیان و لە سێدارەدانی کەسانی وەك عیزەت و خۆشناو و قودسی و خەیروڵلا(٢٥٩) نموونەیەکی لە باری ئەو خەباتەن و بەو جۆرەش کورد یاریدەی نەتەوە ژێردەستەکانی جیهان

---

(258) Ibid, P.62.

٢٥٩ بەڵگەنامەکە ئەمجارەیان لە ناوی خەیروڵلا عەبدولکەریمدا کەوتووەتە هەڵەوە و لە بریتی خەیروڵلا (خیزی– Khizi) ی چاپ کردووە.

دەدەن)[٢٦٠].

هەمان ڕۆژ ڕۆژنامەی «إتحاد الشعب» وتارێکی بە ناونیشانی عەبدولکەریم قاسمی سەرۆکمان داوای یەکیەتی گەل دەکات» بڵاو کردووەتەوە و تێیدا دەڵێ:

(دوژمنانی کۆماری عێراق ئەوە دەزانن کە یەکێتیمان دەبێتە هۆی هەڵهاتنی ئەوان، بۆیەکا ئەوان پەنا دەبەنە بەر گشت توانایەکیان بۆ ئەوەی دووبەرەکیی لە نێو ڕیزەکانماندا بنێنەوە.

دوێنێ قاسم لە کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکەی خۆیدا هانی یەکیەتیی نیشتیمانیی دا و گوتی بێ گومان دوای ئەوەی ئێمە کۆتاییمان بە هەوڵەکانی ئیمپریالیزم هێنا دەبێ یەکیەتیی نیشتیمانیی پتەو بێ)[٢٦١].

یەکێك لە هەواڵە بڵاوکراوەکانی ئێزگەی کوردیی بەغدای ڕۆژی حەوتی تەمموزی ساڵی ١٩٥٩ بریتییە لە وتارێکی ڕۆژنامەی «البلاد» بەم ناونیشانەوە: «پێویستە چینی شیوعیی مافەکانی خۆی وەربگرێ»[٢٦٢].

هەر ئەو ڕۆژەیش ئێزگەی کوردیی بەغدا هەواڵی گەیشتنی عەبدولخالق حەسوونە و بەرپرسێکی سعوودی بۆ نیویۆرك ڕاگەیاندووە، «ناوبراوان بۆ وتوویژ لەگەڵ داگ هەمەرشۆڵدی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی پرسی نیمچە دوورگەی عەرەب هاتوون»[٢٦٣].

ڕۆژی هەشتی تەمموزی ساڵی ١٩٥٩ وتاری سەرەکیی ڕۆژنامەی «ئازادی» بە ناونیشانی «قوربانییەکانی کورد»ەوە بوو، «ئازادی» لە وتارەکەیدا نووسیویە دەڵێ:

(دوای ئەوەی لە جەنگی یەکەمی جیهاندا حوکمەتی عوسمانیی کەوت

---

(260) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds, P.62.

(261) Ibid, PP.62-63.

(262) Ibid,P.64.

(263) Ibid,P.65.

گەلەکەمان بۆ ئازادی و سەربەخۆیی کەوتە تێکۆشان، ئەوەبوو خوێندەوارانی کورد و عەرەب و ئەرمەن بە نهێنی کۆبوونەوە و پێکڕا ئەو نەخشەیەیان دارشت کە بۆ وەدیهێنانی داخوازییەکانیان پێویست بوون. پێویستە ئەوە بڵێین لە ساڵی ١٩١٦وە کاتێك شەڕ گەیشتە نەجەف و تاوەکو شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ کە گەیشتە ناوچەکانی ناوەڕاستی عیراق و مووسڵ لە زۆر شوێن هاوڵاتییان بەرەنگاری دوژمنە بەریتانییەکان هاتن. نیشتیمانپەروەرە بەناوبانگەکانی وەك سەلیم بەگ و سابیر بەگ و کەریم بەگ لە گشت ئەو شۆڕشانەدا بەشدار بوون، کە لە نێوان ساڵانی ١٩١٩ و ١٩٢٧دا قەومان، ئەوان ساڵی ١٩١٩ حاکمی سیاسیی زاخۆیان کوشت و ڕۆژی پازدەی تەممووزی هەمان ساڵ هێزەکانمان بە سەرکردایەتی حاجی ڕەسول بەگ هێزە بەریتانییەکانیان بەزاند، هەمان کات هۆزەکانی یووسفی بە ڕەهبەریی تاهیر ئاغا و شێخ ڕەوفی نەقشبەندی هێرشیان بردە سەر بەریتانییەکان. لەو ڕۆژانەدا نێوان بارزانی و زێبارییەکان خۆش نەبوو، بەڵام هەر دووك لا دەست لەناو دەستدا دژی بەریتانییەکان یەکیان گرت و ڕۆژی بیست و چواری تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ ناوچەکانی «بادینانیان– ك.م.» ئازاد کرد.

ژمارەیەك لە هۆزەکانی دیکەش لەو ڕۆژانەدا بە سەرۆکایەتی شێخ ڕاضی ڕاپەڕین.(٢٦٤) پێویستە ئەوەیش بهێنینەوە یاد کە ئەو هەموو خەباتە تەنها بۆ ئازادکردنی عیراق نەبوو، بەڵکو هەمان کات بۆ وەدیهێنانی مافە «نەتەوەییەکانی–ك.م.» خۆیشیان بوو، هەر لەو ڕۆژانەیشدا برایەتیی کورد و عەرەب دیاردەیەکی وەبەر چاو بوو. دوای دامەزراندنی حوکمەتی عیراقی کوردستان لەبەر خاتری کۆمپانیا نەوتییەکان لەت لەت کرا، بەڵام ئیمڕۆکەیش دیسانەوە کورد برایەتیی خۆیانیان لەگەڵ عەرەبدا لە بواری پاراستنی کۆمارەکەماندا سەلماند(٢٦٥).

---

(٢٦٤) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ناوەکە وەها نووسراوە– Sheikh Radheeh.

(265) N.A., F.O., 371/140682, Eastern Deparment, General, Subject: Kurds, P.65.

